



# دگەل صەحابییێن

## پێغەمبەری سلاڤ لێ بن




تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

جزیری

د گەل صەحابیێن

پێغەمبەرێ سلاڤ لێ بن




کتێب: د گەل صەحابییێن
پێغەمبەری سلاڤ لێ بن
نڤیسەر: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
بەرگ: أیوب گارە
چاپا سێیێ ۲۰۲۲
ژمارا سپارتنێ: ۲٦۸٤








# د گەل صەحابییێن پێغەمبەری سلاڤ لێ بن

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

چاپا سێیێ
یا زێدەکری و ڤەوژارتی

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾ ﴾ (الفتح: ٢٩)

# پێشگۆتن

هێشتا ژ زەمانێ ئەفلاتوونی وەرە و کتێبا وی یا ب ناڤێ (جمهووریەت) هاتییە ناسین، حەتا تو دگەهییە دەمێ سێر تۆماس موور و کتێبا وی (یۆتۆپیا)، و بەری هنگی و پشتی هنگی ژی مرۆڤینییێ خەون ب هەبوونا جیلەکێ نموونەیی ڤە ددیت، جیلەکێ وەسا کو ببتە جهێ چاڤلێکرنێ بۆ مرۆڤینییێ ل هەمی دەم و هەمی جهان..

چل سالان مووسایی -سلاڤ لێ بن- مللەتێ خۆ ل دەشتا سینائێ پەروەردە کر ب هیڤییا هندێ کو جیلەکێ نموونە ژ وان دورست بکەت، بەلێ ڕۆژا مووسا هەوجەیی وان بووی وان گۆتێ: ((هەرە تو و خودایێ خۆ شەڕی بکەن، و ئەم ل ڤێرێ دێ دروینشتی بین))!

مووسا مر.. و وی مرادا خۆ ب جه نەئینا.

ل چینێ (کۆنفۆشیووس) هات، ل درێژیا ژیێ خۆ هەمییێ ئەو لێ گەڕیا دا جیلەکێ وەسا پەیدا بکەت کو خۆ ژ ڕەشەداڤێن پەرستنا کوڕێ عەسمانی (ئمپراتۆری) رزگار بکەت، ئەو ل گەلەک دەڤەرێن چینێ گەڕیا و دووماهییێ زڤڕی دەست ژ پێیان درێژتر، کۆنفۆشیووس مر و چین هەر چینا بەرێ.

زەرادەشت ژی ب کتێبا خۆ ڤە چوو و جیلەکێ دلخواز پەیدا نەکر.. و فەیلەسووفێن یۆنانی ژی ب هەمی فەلسەفا خۆ ڤە نەشیا چو بکەن.

ل فلسطینێ، و ل سەر ڕێکا مووسایی، عیسا -سلاڤ لێ بن- هات و وی ئارمانجا خۆ کرە ئەو ئەو مللەتێ ئیسرائیلی یێ ڕێبەرزە بینتە سەر ڕێکەکێ، و جیلەکێ نموونە ژێ دورست بکەت، بەلێ وان نە ب تنێ

گوهـداريیا وی نـەكر بـەلكی بەرگـەڕيـان كـر كـو ئـەو وی ب دەسـتێن صەنەمپەرێسان بهلاویسن ژی!

هیڤی ما.. و ئومێد بوو خەونەكا دویردەست!

ل دەمـەكـی مرۆڤـیـنـیـیـا حێبـەتی مـایـی ل گـازییـەكێ هشـیاربوو، ژ نشكەكێ ڤە دیت خەون یا دبتە ڕاستی، و ئەو ئومێدا هندە سالە هیڤی، یا ب جهـ دئێت.

ل كولانێن مەكەهێ.. ئەوا نێزیكبـوو دیـرۆک نـاڤێ وێ ژ بیـر بكـەت ئەگەر ژ بەر مالا خودێ نەبا، و ب دەستێ مرۆڤەكێ نەخواندەڤا.. یێ ئێتیم و سێوی.. یێ چو كتێبـێن فەلسـەفێ نەخوانـدین، و ل سـەر دەسـتێ چـو سـەیدایان فێرنـەبووی.. ئوممەتـەک پەیـدابوو، د كێمتـر ژ پـازدە سـالان دا جیلەک ژێ زا، و بوو ئەو جیل یێ مرۆڤینییێ چاڤەرێیی بۆ دكر.

كـارەكێ عـەدەتی نینـە مرۆڤـەک ژ مللەتـەكێ دویـر ژ هـەمی ڕەنگـێن شارستـانـیـیـێ جیـلـەكێ چێ بكەت ببتە خودان شارستانییەكا نـموونـەیی د دیرۆكێ هەمییێ دا.. بەلێ ئەڤە یا عـەجێب نینـە ئەگەر ئـەم ل بیرا خۆ بیینـن كـو ئـەڤ جیلـە ل سـەر دەسـتێ خـودێ، و ل بـەر چـاڤێ وی دهاتـە ئامادەكرن دا بـەرێ خـەلكی ژ تـارییێ بدەتـە ڕۆنـاهییێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ۝ ﴾ (الأنفال: ٦٢-٦٣).

دیسـا یا عـەجێب نینە -ئەگەر چ یا عـەدەتی نـەبت ژی- ئـەگـەر ئـەم ل بیرا خۆ بینین كو ئەڤ جیلە ئەو بوو یێ ل سەر دەستێ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- هاتییە پەروەردەكرن، ئەو پێغەمبـەرێ دیرۆكـێ شاهدەیی بۆ دای كو ئەو مامۆستایێ هەمی پەروەردەكارانە.

ژ بەر ڤێ چەندێ، و چونکی مرۆڤی هەردەم پێ خۆشە ب سەرهاتی و سەربۆرا مرۆڤێن مەزن و ناڤدار ئاگەهدار ببت، دلێ مە چوویێ ئەم چەندەکێ د گەل ڤی جیلی بژین و هندەکێ ژ دیرۆکا وی ڤەگێڕین؛ دا بەلکی مفایی بۆ خۆ ژێ وەربگرین.

و دڤێت ژ بیر نەکەین کو نڤیسین و ڤەکۆلین ل دۆر جیلێ صەحابییان ڕێکێ بۆ جیلێن مە دورست دکەت، و تەرازییا لێڤەگەڕ و (مەرجعییەتێ) بۆ مە پەیدا دکەت؛ چونکی د وی جیلی دا بیر و باوەر بووبوونە (بەرنامە) بۆ ژینێ، هەر وەسا تشتێن (نەظەری) بووبوونە (عەمەلی).. دەمێ ئەم بەحسێ وان دکەین، و ل دۆر ژین و سەرهاتییا وان دنڤیسین، ئارمانج ئەوە ئەم چاڤ ل وان بکەین، نە د چارچووڤەیێ زارڤەکرنەکا شەکلی یا هشک دا، کو ئەم هزر بکەین (مەزنی) و (بلندی) تشتەکێ تایبەتێ مرۆڤێن مەزنێن وەکی وان ب تنێیە، مە ماف هەیە پێ (موعجب) ببین، بەلێ نە وەبت ئەم هزر بکەین کو ئەو تشتەکە ئەم ژی دشێین بگەهینێ! نەخێر.. دڤێت مە باوەری هەبت کو (مەزنی) و (قەهرەمانی) سالۆخەتەکە، هەر کەسەکێ کاری بۆ بکەت، بەلکی بشێت بگەهتێ. و دەمێ قورئان سەرهاتییێن قەهرەمانییێ ژ دیرۆکێ ڤەدگوهێزت، تشتێ سەرەنج ڕاکێش ئەوە گەلەک جاران ئەو هند (تەرکیزێ) ل سەر قەهرەمانان ناکەت، هندی تەرکیزێ ل سەر قەهرەمانییێ ب خۆ دکەت، بەلکی گەلەک جاران هەما هەر ناڤێن قەهرەمانان بۆ مە نابێژت، دا ئەو مە ب قەهرەمانییێ ب خۆ ڤە گرێ بدەت نە کو ب شەخصێ قەهرەمانی ڤە، زەلامەکێ باش د ڤێ چەندێ گەهشتی، ژ جیلێ تابعییان، دەمێ خۆ د کرنا عیبادەتی دا وەستاندی، گۆت: ئەم دێ ئێکا وەسا کەین، صەحابییێن موحەممەدی بزانن وان هندەک زەلام ییێن ل پاش خۆ هێلاین، ململانێ بۆ چوونا بەحەشتێ د گەل وان دکەن!

دەمێ ئەم بەحسێ جیلێ صەحابییان دکەین، و وان سالۆخەتان بەرچاڤ دکەین یێن چێتری و بلندی دایە وان، ئەو گازییەکە بۆ مە کو ئەم ژی وان سالۆخەتان ل نک خۆ پەیدا بکەین، و بۆ خۆ بکەینە بەرنامەیەکێ پەروەردەیی و ڕەوشەنبیری خۆ پێ بگەهینینە بەرهەمەکێ دلخواز.

دەمێ ئەم ل سەر صەحابییان دنڤیسین و لێ دگەڕێین ڤیانا وان د دلان دا بچینین، ژ بەر هندێیە چونکی صەحابی -ب باوەرییا مە- تەمامکەرێن کاروانێ پێغەمبەرینییێ بوون، و ئەو ئەو ڕێک بوون یێن دین پێ گەهشتییە مە، و هەر (تەشویهەک) بۆ وان و دەورێ وان، گومانەکە دکەڤتە د دینی دا، ژ بەر ڤێ چەندێ زانایێن مە یێن سەرڕاست هەر ژ سەری وەرە، ڤیان و (وەلائا) صەحابییان هژمارتییە ئێک ژ نیشانێن باوەرییێ، و ئەڤ چەندە د کتێبێن خۆ یێن عەقیدێ دا بنەجه کرییە. و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی بوویە هەر ئێکێ کار بۆ دوژمنییا ئیسلامێ کری، بەری هەر تشتەکی کار بۆ شکاندنا صەحابییان کرییە، و ڤیایە پەیوەندییێ د ناڤبەرا باوەرییێ و ڤیانا صەحابییان دا ببڕن؛ دا ڕێکێ بۆ نەڤیانا وان خۆش بکەن.

و دەمێ ئەم دیرۆکا صەحابییان دنڤیسین و دخوینین، دڤێت باش ل بیرا مەبت کو:

- خۆ شارەزاکرنا د دیرۆکا صەحابییان دا مرۆڤی ژ لادان و ئنحرافێ دپارێزت؛ چونکی مرۆڤ ب سەر ئیسلاما ڕاست و دورست هل دبت، ب ڕەنگێ وێ یێ عەمەلی، دەمێ ئەو دهاتە ب کارئینان.

- هەر وەسا ئەڤ خۆشارەزاکرنە مرۆڤی بەر ب تێگەهشتنەکا دورست ڤە بۆ وەرگرتن و ب کارئینانا ئیسلامێ دبەت، چونکی صەحابی جیلێ وەحییێ بوون ب هەردو لایێن وێ ڤە: کیتابێ و سوننەتێ.

- خواندنا دیرۆکا صەحابییان، و ژینا د گەل وان، مرۆڤێن نموونەیی بۆ چاڤلێکرنێ نیشا مە ددەت.. یێن نموونەیی د هەمی لایێن ژینێ دا، و پێ نەڤێت بێژین: ئەو جیلێ خودێ بۆ هەڤالینییا پێغەمبەرێ خۆ هلبژێرت، دڤێت جیلەکێ نموونەیی بت.

- و دەمێ ئەم دبێژین: جیلێ صەحابییان جیلەکێ نموونەیی و (عادل) بوو، دڤێت نەئێتە هزرکرن کو ئەم دبێژین: ئەو جیلەکێ بێ گونەھـ و (مەعصووم) بوو، و وان چو خەلەتی ژی نەبوون، نەخێر! عەدالەتا صەحابییان مەعنا وێ ئەو نینە ئەو د بێ خەلەتی و گونەھـ بن، و ئعترافا مە ب هەبوونا هندەک خەلەتییان ل نک وان ژی مەعنا وێ ئەو نینە ئەم رابین -وەکی هندەک نەزانێن مە دکەن- وان خەلەتییێن ژ هندەک ئجتهادێن صەحابییان پەیدابووین، ب تەرازییا ئەڤرۆ بکێشین، و وەسا وان نیشا خەلکی بدەین کو ئەو هندەک مرۆڤێن فێلباز و درەوین بوون، و وان دڤیا ب رێکا دینی دنیایێ بێخنە بن دەستێ خۆ.

ل دووماهیێ هیڤییا مە ئەوە ئەم شیابین ب ڤان دەلیڤەیێن کێم یێن ئەم د گەل صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژیاین هندەک ژ راستییا مەزن ل بەر چاڤان دانا بت، و خودێ هاریکارێ مە هەمییان بت.

تەحسین دۆسکی

دهۆک ٢٧ / ٧ / ١٩٩٨

# صەحابی.. و چێترینییا وان

بەری ئەم دەست ب ڤەگێرینا سەرهاتییا هندەک صەحابییان بکەین، یا باش ئەوە ئەم ڤی جیلێ نموونە ب هەوە بدەینە ناسین، و بهایێ وان د رێبازا (أهل السنة والجماعة) دا دەسنیشان بکەین.

صەحابی -وەکی زانا دبێژن- ئەو کەسە یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیت بت، و باوەری پێ ئینا بت، و ل سەر ئیسلامێ مر بت. و هەچییێ ب ڤی رەنگی بت ژ صەحابییان دئێتە هژمارتن، و صەحابییان ژ بەر کو هەڤالینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرییە، ئەو د بیر و باوەرێن مە موسلمانان دا چێترینێ مرۆڤانە -پشتی پێغەمبەران- و ئەو ژ هەمی کەسان هێژاترن مرۆڤ چاڤ لێ بکەت و حەز ژێ بکەت. و هەر کەسەکێ نەڤیانا صەحابییان د دلی دا هەبت، یان ئەزمانێ خۆ د دەرحەقا صەحابییەکی دا درێژ بکەت، ب دیتنا مە موسلمانان ئەو مرۆڤەکێ زەندیقە.

خودانێ (العقیدة الطحاویة) دبێژت: ((ئەم حەز ژ هەڤالێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەین، و د ڤیانا کەسەک ژ وان دا ئەم ژ توخیبان دەرناکەڤین، و ئەم خۆ ژ کەس ژ وان بەری ژێ ناکەین، و نەڤیانا ئێک ژ وان ژی ل نک مە نینە، و مە ئەو نەڤێت یێ حەز ژ وان نەکەت، و ژ باشییێ پێڤەتر ئەم بەحسێ وان ب تشتەکی ناکەین، و ڤیانا وان دین و باوەری و چاکییە، و نەڤیانا وان کافری و دورِوییاتی و سەرداچوونە)).

ئەڤە باوەرییا مەیە د دەرحەقا هەمی صەحابییان دا، و یێ ئەڤ باوەرییە ل نک نەبت ئەم وی ژ خۆ حسێب ناکەین.

و دەلیلێن مە سەر ڤێ باوەرییێ گەلەکن، ژ قورئانێ:

١- ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾ ﴾ (الفتح: ٢٩) یەعنی: موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە، و ئەوێن د گەل وی ل سەر دینێ وی ل سەر کافران ددژوارن، و د ناڤبەرا خۆ دا ددلۆڤانن، تو وان دبینی ئەو د نڤێژێ دا بۆ خودێ دچنە رکووعێ و سجوودێ، ئەو دخوازن خودایێ وان قەنجییێ د گەل وان بکەت، ڤێجا وان ببەتە بەحەشتێ، و ژ وان ڕازی ببت، نیشانا عەبدینییا وان بۆ خودێ ل سەر و چاڤێن وان یا دیارە ژ بەر شوینا سجوودێ و عیبادەتی، ئەڤە ئەو سالۆخەتێ وانە یێ د تەوراتێ دا هاتی. و مەتەلا وان د ئنجیلێ دا وەکی مەتەلا وی چاندییە یێ چەق و بستیکا خۆ دەرێخستی، پاشی تایێن وی زێدە بووین، و ب هێزکەفتی، و خۆ ل سەر بنا خۆ گرتی و جوان ڕابووی، ب ڕەنگەکێ وەسا کو کەیفا وەرازان پێ بێت؛ دا ئەو ب مشەبوونا ڤان خودان باوەران و جوانییا وان کەربێن کافران ڤەکەت. خودێ سۆزا دایە وان یێن باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینای و ئەو کری یا خودێ فەرمان پێ لێ کری ژ وان، کو گونەهێن وان ژێ ببەت، و خێرەکا بێ ڤەبڕین، کو بەحەشتە، بدەتێ.

ئەڤ ئایەتە مەزنترین مەدحە بۆ صەحابییان ژ لایێ خودێ ڤە هاتییەکرن. و ئەو دەلیلە ژی ل سەر کوفرا وان یێن نەڤیانا صەحابییان د دلی دا هەبت؛ چونکی هەچییێ خودێ ب صەحابییان کەربێن وی ڤەکەت، ئەو وی یێ خۆ هێژای کوفرێ کری.

٢- ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ (التوبة: ١٠٠) یەعنی: ئەوێن بۆ باوەری ئینانێ بەری مرۆڤان ڕاکرین، ژ وان مشەختان یێن مللەت و ئویجاخێن خۆ هێلاین و قەستا وارێ ئیسلامێ کری، و وان پشتەڤانێن پشتەڤانییا پێغەمبەری دژی کافران کری، و ئەوێن ب قەنجی دویکەفتنا وان کری، ئەو ئەون یێن خودێ ژێ ڕازی بووی ژ بەر گوهدارییا وان بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وی، و ئەو ژ وی ڕازی بوون ژ بەر خێرا مەزن یا وی دایە وان، و وی بەحەشتێن ڕویبار د بن دا دچن بۆ وان ئامادە کرینە هەر و هەر ئەو دێ تێدا بن، و ئەڤەیە سەرکەفتنا مەزن.

د ڤێ ئایەتێ ژی دا مەدح بۆ صەحابییان ژ (موهاجر و ئەنصارییان) هەیە، و ئەو دەلیلە کو ئەو یێن باوەرێنە.

٣- ﴿ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ﴾ (الفتح: ١٨) یەعنی: خودێ ژ خودان باوەران ڕازی بوو، دەمێ وان ل بن دارێ پەیمان دایە تە (و ئەڤە ئەو پەیمان بوو یا ل حودەیبییێ هاتییە بەستن)، ڤێجا خودێ زانی کانێ چ باوەری و ڕاستگۆیی و وەفاداری د دلێن ڤان خودان باوەران دا هەیە، ئینا خودێ تەناهی ب سەر وان دا ئینا و دلێن وان موکم کرن، و پێش وێ ڤە یا ژ بەر صولحا (حودەیبییێ) نەگەهشتییێ وی ڤەکرنەکا نێزیک دا وان، کو ڤەکرنا (خەیبەرێ) بوو.. و ئەڤە دەلیلەکێ ئاشکەرایە کو خودێ ژ صەحابییان رازیبوویە.

و ئایەت د ڤێ دەربارێ دا گەلەکن.

حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژی د ڤێ دەربارێ دا گەلەکن، ژ وان:

١- بوخاری و موسلم ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزن، دبێژت: ((خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)) یەعنی: باشترین مرۆڤ ئەون یێن ل سەر دەمێ من ژیاین، پاشی یێن پشتی وان، پاشی یێن پشتی وان.

ئەڤە شاهدەیەکا ئاشکەرایە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ جیلێ صەحابییان کو ئەو چێترینێ مرۆڤانە.

٢- نسائی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت، دبێژت: ((لا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ بايَعَ تحتَ الشَّجَرَةِ)) یەعنی: هەر ئێکێ ل نهالا حودەیبییێ بەیعە دای ناچتە ئاگری.

ئەڤە شاهدەییەکە بۆ وان صەحابییان کو ئەو هەمی بەحەشتینە.

٣- بوخاری و موسلم ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزن، دبێژت: ((لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ)) یەعنی: ئاخفتنێن کرێت نەبێژنە صەحابییێن من؛ چونکی ئێک ژ هەوە ئەگەر هندی چیایێ ئوحودێ زێڕی بکەتە خێر، ئەو ناگەهتە مستا ئێک ژ وان یان نیڤا وێ مستێ.

ژ ڤێ ژی دئێتە زانین کو حەرامە مرۆڤ ئاخفتنەکا نە د رێ دا بێژتە صەحابییەکی، و هندی ئەم خێران بکەین ژی ئەم نەشێین بگەهینە رێزا وان.

دیرۆکا ئیسلامێ ژی شاهدە کو حەتا نوکە جیلەکێ وەکی جیلێ صەحابییان نەهاتییە.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم -ل نک خودێ- دبەرینە ژ وان رافضییان ئەوێن ئەزمان درێژییا د دەرحەقا صەحابییان دا دکەن، و درەوان ژ کیسێ هندەک ژ وان دکەن، و ب نەڤیانا وان خۆ نێزیکی خودێ دکەن! هەر وەسا ئەم دبەرینە ژ هەر دەستەکەکێ، یان مرۆڤەکێ ژ بهایێ صەحابییەکی بینتە خوارێ، ئەگەر ئەو صەحابی کی بت.

## بۆچی ئەو دچێترن؟

ژ بناخەیێن بۆچوونا مە سوننییانە کو صەحابی هەمی دباشن و پێغەمبەر تێ نەبن کەس ژ وان چێتر نینە، لەو یا پێتڤی ل سەر مە موسلمانان هەمییان ئەوە ئەم چاڤ ل وان بکەین، و تێگەهشتنا وان بۆ ئیسلامێ ب پێش یا خۆ بێخین، و وان بۆ خۆ بکەینە نموونەیێ بلند یێ چاڤلێکرنێ د کارئینانا دینی دا.. و ل نک مە کۆمبوونا صەحابییان ل سەر هەر بۆچوونەکێ دەلیل و (حوججەتە)، و هەر کەسێ ژێ لا دەت ئەو ژ رێکا دورست یێ دەرکەفتییە. و ئەگەر د پشت چێترییا صەحابییان را گەلەکن، ژ وان:

١- هەڤالینییا وان بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و رابوون و روینشتنا وان د گەل وی، سالۆخەتەکێ وەسا ددەتە وان یێ کو ل نک کەسێ دی ژ بلی وان نەهەی.

٢- تێگەهشتنا وان بۆ قورئانێ ژ یا خەلکی هەمییێ پترە چونکی وان هەڤدەمییا هاتنەخوارا قورئانێ کرییە، و قورئان ب ئەزمانێ وان یا هاتییە خوارێ و ئەو دزانن کانێ هەر ئایەتەک کەنگی و بۆچی هاتبوو خوارێ.

٣- زانینا وان ب رێباز و سوننەتا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ژ زانینا هەر کەسەکێ دی پتر و دورستترە؛ چونکی ئەو د گەل پێغەمبەری

بـوون -سـلاڤ لـێ بـن-، و وان دیـن ئێکسـەر ژ وی وەرگرتبـوو، و ئـەڤ تایبەتییە ژی بۆ کەسێ دی نینە.

٤- وان ژ هەمی کەسان پتر زەحمەت ب دینی ڕا برییە حەتا وان ئەو بەلاڤکری و گەهاندییە خەلکێ وی سەردەمی، و خەلکێ پشتی وان هاتی ژی.

٥- ئەو ژ هەمی کەسان ئەزمان ڕاستتر و پاقژتر بوون، و گەهشتنا وان بۆ ڕاستییێ ژ گەهشتنا هەر کەسەکێ ژ بلی وان نێزیکترە، ژ بەر کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ وان دا بوو.

٦- ژێدەرێ وان بۆ وەرگرتنا زانینێ سەرەکانی ب خۆ بوو، وان دگۆت: خودێ دبێژت، پێغەمبەر دبێژت.. و ئەڤ چەندە خێرەکا مەزنە گەهشتییە وان.

٧- ڤیانا وان بۆ پێغەمبەری و چاڤلێکرنا وان بۆ وی و بەرەڤانییا وان ژ وی، تشتەکە دیرۆک ل سەر شاهدە.

٨- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د حەدیسەکێ دا، ئەوا ترمذی ژێ ڤەدگوهێزت، ئاشکەرا دکەت کو صەحابی یێ ل سەر وێ رێکا راست ئەوا هەر کەس ل دویڤ بچت دێ چتە بەحەشتێ، دەمێ دبێژت: ((تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إلا مِلَّةً واحِدَةً)) یەعنی: ئوممەتا من دێ ل سەر حەفتێ و سێ دەستەکا ژێکڤەبت، هەمی د ئاگری دانە ئێک تێ نەبت، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەو کیژ دەستەکە؟ وی گۆت: ((مَا أَنَا عَلَيْهِ وَ أَصْحَابِي))یەعنی: ئەو دەستەکە یا ل سەر وێ ڕێکێ دچت یا ئەز و صەحابییێن خۆ ل سەر چووین.

ژ بەر ڤان ئەگەران و گەلەكێن دی ئەم دبێژین: صەحابی ژ هەمی مرۆڤان چێترن، و ئەو هەژیترن مرۆڤ چاڤ ل وان بكەت و ل دویڤ رێكا وان بچت.

## سالۆخەتێن جڤاكا صەحابییان:

گەلەك جاران دەمێ ئەم دیرۆكا صەحابییان دخوینن، ژ بەر كو ئەم پتر ب ڤەگێرینا سەرهاتییێن كەسان ڤە مژویل دبین، ئەم ژ بیر دكەین كو سالۆخەتێن جڤاكا وان تێكدا دەسنیشان بكەین، ئەو سالۆخەتێن ئێكا هند ژ ڤێ جڤاكێ چێكری كو ببتە واقعەكێ بەرچاڤ بۆ ب كارئینانا بیر و باوەر و شەریعەتێ ئیسلامێ.

تشتەكێ گەلەكێ پێتڤییە دەمێ ئەم بەحسێ دیرۆكا جیلێ صەحابییان دكەین، ئەم ڤەكۆلینێ ل سەر جڤاكا وان ب خۆ بكەین، و سالۆخەتێن وان ب رەنگەكێ ئاشكەرا بەرچاڤ بكەین، دا دیمەن پتر ل بەر مە یێ روهن بت.

ڤێجا ژ وان سالۆخەتان یێن جڤاكا صەحابییان پێ هاتییە ناسین:

١- جڤاكا وان ب رەنگەكێ گشتی جڤاكەك بوو حسێب دكر دین ژین هەمییە، یەعنی: وان ژینا خۆ هەمی ب دینی ڤە گرێ ددا و هزر نەدكر دین ب تنێ تشتەكێ رووحییە جارجار بۆ بێهنڤەدان مرۆڤ قەست دكەتێ!

دین ب دیتنا وان نە ب تنێ هندەك رەنگێن عیبادەتی بوو، ل هندەك دەم و هندەك جهان دئینەكرن، وان ژینا خۆ هەمی ب دینی ڤە گرێدابوو، ئەخلاق، رەفتار، دیتن و هزر و بەرێخودان، پەیوەندییێن جڤاكی، یێن خێزانی، كرین و فرۆتن... و حەتا دووماهییێ ئەڤە هەمی وان ب دینی ڤە گرێدابوون، لەو ئەو چو دەمان ب هندێ نەدحەسیان كو ئەو و دین د ژێك دویرن.

ژ بەر ڤێ چەندێ مرۆڤ دشێت بێژت: جڤاکا صەحابییان ب دورستی جڤاکەکا موسلمان بوو ب هەمی رامانێن پەیڤا موسلمان ڤە!

و دەمێ ئەم ڤێ گۆتنێ دبێژین، مەبەستا مە پێ ئەو نینە ئەم بێژین: ئەڤ جڤاکە جڤاکەکا بێ گونەهـ بوو، و ژ بەراهیێ حەتا دوماهیێ یا بێ خەلەتی بوو، نەخێر! د ڤێ جڤاکێ دا گونەهکار هەبوون، دوڕوی هەبوون، مرۆڤێن سست و کێم باوەر ژی هەبوون، بەلێ ئەوێن هە بەرانبەر خودان باوەرێن ڕاست و دورست هەر نەدهاتنە هژمارتن.

د جڤاکا صەحابییان دا بەرێ هەر ئێکی ل هندێ بوو ژینا خۆ هەمییێ ب رەنگەکێ وەسا ببەتە سەری خودێ ژ خۆ رازی بکەت، لەو هەمی دەمان خودێ ل بیرا وان بوو، و ئەوێ چو جاران خودێ ژ بیر نەکەت زوی ب زوی ناکەڤتە د خەلەتی و گونەهێ دا، بیرا مە هەمییان ل سەرهاتییا عومەری دئێت د گەل وێ ژنکێ ئەوا گۆتییە کچا خۆ: هندەک ئاڤێ د ناڤ شیری هلدە دا ماستێ مە پتر لێ بێت بۆ فرۆتنێ. کچێ گۆتێ: ما تە نەزانییە کو عومەری ئەڤ تشتە یێ قەدەغە کری؟ دەیکێ گۆت: ئاخری ل ڤێ شەڤێ عومەری های ژ مە نینە و ئەو مە نابینت! کچێ گۆت: نێ ئەگەر عومەر مە نەبینت ژی، خودایێ عومەری مە دبینت! دەمێ بەحسێ خودایێ عومەری هاتییەکرن، ئێکسەر باوەری د دلێ دەیکێ ژی دا گەشبوو: دیسا مانێ خودێ یێ مە دبینت و بەری عومەری ڤی کاری قەدەغە بکەت خودێ ئەو یێ حەرامکری.

ئەڤە کچەکا سادەبوو د جڤاکێ دا هۆسا هەست ب بەرپرسییێ دکر.

ئەسمائا کچا ئەبووبەکری شوی ب زوبەیرێ کوڕێ عەووامی کربوو، دەیکا وێ ژنکەکا کافر بوو، ڕۆژەکێ دەیکا وێ ژ مەکەهێ هاتە مەدینێ دا سەرا وێ بدەت، ژێ خەریب بووبوو ژ بەر کو ئەو چەند سالەک بوو وان

ئێک و دو نەدیتبوو. دەمێ ئەسمائێ دەرگەهـ بۆ دەیکا خۆ ڤەکری، بەری بێژتە دەیکا خۆ: کەرەم کە وەرە ژۆر.. گۆتێ: کانێ بیست خەبەران ل بەر دەری ڕاوەستە! ئەسمائێ قەستا مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! دەیکا من یا هاتییە مالا من، و من ئەوا هێلایە ل بەر دەری، ئەرێ ڕێکێ بدەمێ بێتە ژۆر یان نە؟!

مەسەلە گەلەک یا عەدەتی بوو، بەلێ وێ دڤیا حوکمێ دینی تێدا بزانت، چونکی نەکو ئەو پێگاڤەکێ بهاڤێت نە ئەو بت یا دین دبێژت.. حەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەگۆتییە وێ: ڕێ بدێ.. وێ ڕێ نەدایێ.

مەعنا: ئەو جیلەک بوو ل هەمی دەمێن ژییێ خۆ د گەل ئیسلامێ دژیا.

٢- جڤاکا صەحابییان جڤاکەک بوو ب دورستی ڕامانێن ئوممەتێ د ناڤ دا ئاکنجی بووبوون. ئەو ئوممەت، یا کو ب تنێ بیر و باوەر وان دگەهینتە ئێک، دویر ژ پەیوەندیێن قەومی و ڕەنگی و نفشی.

د جڤاکا صەحابییان دا مللەت و ئویجاخ و ئەزمان ئەو تەرازی نەبوو یا چێتربیا مرۆڤان پێ دهاتە کێشان، بەلکی ب تنێ تەقوا بوو ئێک ژ یێ دی چێتر لێ دکر، و قورئان ڤێ چەندێ ئاشکەرا و بنەجهـ دکەت دەمێ دبێژت: ﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ (الحجرات: ١٣) یەعنی: یێ ژ هەمییان ب قەدرتر ژ هەوە ل نک خودێ ئەوە یێ ب تەقواتر بت.

ژ بەر ڤێ چەندێ جڤاکا صەحابییا براینییا ئیسلامێ ژ هەر براینییەکا دی هێژاتر ددیت، ل ڕۆژا شەڕێ بەدرێ مرۆڤەکێ ئەنصاری برایێ موصعەبێ کوڕێ عومەیری گرت، برایێ موصعەبی هزرکر موصعەب دێ بەرەڤانییێ ژێ کەت؛ چونکی برایێ وی یێ دەیبابییە، بەلێ ئەو حێبەتی بوو دەمێ گوهـ ل موصعەبی بووی گۆتییە زەلامێ ئەنصاری: دەستێن ڤی باش گرێدە! ئینا

وی گۆته موصعەبی: ما ئەز نە برایێ تەمە؟ موصعەبی گۆتێ: نەو! ئەوێ تو گرتی برایێ منە!

د ڤێ جڤاکێ دا ئێکێ وەکی عومەری، یێ عەرەب، یێ قورەیشی، یێ خەلیفە، دگۆتە ئێکێ وەکی بیلالی، یێ حەبەشی، عەبدێ ئازاکری، یێ فەقیر: بیلال سەییدێ مەیە!

ژ بلی جیلێ صەحابییان هەوە ئەڤ حنێرە ل نک کێ دیتییە؟

تشتێ ژ هەمییێ پیرۆزتر د چاڤێ عەرەبان دا ل دەمێ هاتنا ئیسلامێ تەعەصصوبا ئویجاخێ بوو، دبت مرۆڤێ عەرەب دەست ژ هەمی تشتان بەردابا، بەلێ تشتێ ئێکانە یێ وی نەدشیا دەستی ژێ بەردەت تەعەصصوبا ئویجاخێ بوو، شاعرێ وان ب سەربلندی ڤە و ب هەمی دەنگێ خۆ دگۆت: ئەز یێ د گەل ئویجاخا خۆ، بێتە سەر رێ دێ د گەل بم و د سەردا بچت ژی دێ د گەل بم!!

تشتەکێ ب ساناهی نەبوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- شیای براینییا دینی د دلێن وان دا ب پێش براینییا ئویجاخێ بێخت.. رۆژەکێ صەحابییەکی گۆتە هەڤالەکێ خۆ: کورێ ژنکا رەش! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوه لێ بوو، ئینا گۆتە وی: ((تو مرۆڤەکی رەنگەکێ جاهلیەتێ ل نک تە هەیە)) گاڤا وی ئەڤە زانی، راست رابوو، چوو گۆتە وی مرۆڤێ رەش: وەرە، ل پێش چاڤێن خەلکی پییێ خۆ بدانە سەر سەرێ من دا هەمی بزانن کو کورێ ژنکا سپی ژ کورێ ژنکا رەش چێتر نینە.

ئەڤرۆ، ل وان وەلاتێن دبێژن: ئەمین دیموقراتییەتێ و مافێن مرۆڤان نیشا خەلکی ددین ل سەر دەرگەهێن خوارنگەهێن خۆ دنڤیسن: چێ نابت صە و مرۆڤێ رەش بێتە ژۆر! و مەرحەبا دیموقراتییەت!!

٣- جڤاکا صەحابییان ل سەر بناخەیەکێ ئەخلاقی هاتبوو ئاڤاکرن، و دەمێ ئەم دبێژین: (بناخەکێ ئەخلاقی) مەبستا مە نە ب تنێ ئەو پەیوەندینە یێن د ناڤبەرا ژن و مێران دا، نە! قاعیدێ ئەخلاقی گەلەک ژ هندێ بەرفرەهترە. سیاسەتا وان ل سەر ئەخلاقی هاتبوو ئاڤاکرن، لەو جوداهی د ناڤبەرا مرۆڤێ بەرپرس و مرۆڤێ دی دا نەبوو. ڕۆژەکێ عومەری ل سەر مینبەرێ گۆت: ئەز خەلیفەمە دڤێت هوین گوهدارییا من بکەن.. مرۆڤەکێ عامی ڕابووڤە و گۆت: قەت ئەم گوهێ خۆ نادەینە تە.

- بۆچی؟

وی گۆت: چونکی ئەو قوماشێ خێرێ یێ تە ل سەر مە بەلاڤکری، پارچەیەکا پتر ژ یا مە تە یا بۆ خۆ هلگرتی.

گۆتێ: تو چاوا دزانی؟

وی گۆت: چونکی پارچەیێن مە هەمییان ب کۆتەکی تێرا مە یێن کرین، و پارچەیا تە باش تێرا تە یا کری و تو ژ مە هەمییان ب کەلەختری!

عومەری گۆتە کوڕێ خۆ: هلۆ مەسەلێ بۆ موسلمانان روهن بکە..

کوڕێ عومەری گۆت: ئەو پارچەیا گەهشتییە من، من یا دایە بابێ خۆ؛ چونکی یا وی تێرا وی نەدکر، و وی هەردو بۆ خۆ ب سەرێک ڤە یێن گرێدایین.

وی زەلامی گۆت: نۆکە باخڤە ئەم دێ گوهدارییا تە کەین!

ب ڤی ئەخلاقی وان سەرەدەرییێ د گەل ئێک و دو دکر، لەو دلێن وان د گەل ئێک و دو دپاقژبوون.

کڕین و فرۆتنا وان ل سەر بناخەکێ ئەخلاقی هاتبوو ئاڤاکرن، لەو بازارا وان یا بێ حیلە بوو، هەر ئێکی باوەری ب یێ دی هەبوو. کەسێ

ئەزمانێ خۆ یان دەستێ خۆ درێژ نەدکرە مافێ هەڤالێ خۆ، لەو جڤاکەکا تژی باوەری بوو، و تەناهی دوریشمێ وان بوو.

گاڤا ئەبووبەکر بوویە خەلیفە، وی عومەر کرە قازی، پشتی سالەکێ عومەر چوو نک خەلیفەی گۆتێ: ئەزێ هاتیم دا تو من ژ ڤی کاری عەفی کەی.

ئەبووبەکری گۆتێ: بۆچی؟

عومەری گۆت: ئەڤە سالەکە قەزیەکا ب تنێ ژی کەسێ نەئینایە نک من! ئەو میللەتێ ب ڤی رەنگی بت چو منەت ب هەبوونا قازی نابت.

٤- جڤاکا صەحابییان جڤاکەکا مجد بوو د هەمی کار و کریارێن خۆ دا، خۆ ب تشتێن بێ بها ڤە مژویل نەدکر دا وەختێ خۆ پێڤە ببۆرینن، هەر دەلیڤەکا ژییێ وان، وان هزار هزر بۆ دکرن، گاڤا دەلیڤەک بێ کارەکێ ب وج د سەر ئێک ژ وان را بۆریبا وی هزر دکر ئەڤە زیانەکا مەزن ب وی کەفت.

ئەو جڤاکا سستی رێیا خۆ د ناڤ دا ببینت و مجدی ژ ناڤ دەرکەفت دێ جڤاکەکا بێخێر بت، ئەو میللەتێ (یاریگەهـ) و (چایخانە) د ناڤ دا ژ مزگەفتان مشەتر لێ هاتن دەستان ژێ بشوو!

٥- جڤاکا صەحابییان جڤاکەک بوو هەردم یا ئامادەبوو بۆ کاری، وەکی وی لەشکەرێ هەر گاڤ هشیار و ئامادە بۆ خۆهاڤێتنا د ناڤ گەرا شەری دا.. جڤاکەکا (عەمەلی) بوو، کارێ گۆتبا دکر، و فەرمانا ژێ دهاتە خواستن ب جهـ دئینا، وەکی مە ل هێجەتا نەدگەریان و جرە نەدکێشان دا خۆ ژ بەرپرسییێ بدەنە پاش.

صەحابییەک دبێژت: ئەم ژ دەهـ ئایەتان نەدچووینە دەهێن دی، حەتا مە ئەو ب جهـ نەئینابان، مەعنا: زانینا بێ کریار ل نک وان نەبوو..

عائیشا دبێژت: ڕۆژا ئایەتا حیجابێ هاتییە خوارێ ژنکێن ئەنصارییان هند خۆ نەگرت حەتا بزڤرنە مال پێچان بۆ خۆ چێ کەن، هەما هێشتا ل مزگەفتێ هەر ئێکێ پارچەک ژ دەهمەنا خۆ ڤەکر و ب سەر سەرێ خۆ دادا.. هندە ئەو د (عەمەلی بوون)!

گاڤا ئایەت هاتییە خوارێ کو بەرێ خۆ ژ قودسێ وەرگێرنە مەکەهێ، صەحابییەک چوو دیت هندەک زەلام ل جهەکی یێ نڤێژا ب جماعەت دکەن، بەرێ وان یێ ل قودسێ، ئینا وی ئایەتا گوهۆڕینا قیبلێ بۆ وان خواند.. د گاڤێ دا ئەو ل سەر ملێ خۆ زڤڕین و بەرێ خۆ دانە مەکەهێ و نڤێژا خۆ تمام کر.

نەگۆتن: بۆچی؟ و چاوا؟ و کەنگی؟

مادەم ئایەتێ گۆت، پێغەمبەری گۆت، یا مە ب جهـ ئینانە.

موسلمانێن مە ڤێ گاڤێ بێژێ: خودێ دبێژن، یان پێغەمبەر دبێژت.. دێ ل سەد هێجەتا گەڕییێن دا خۆ ژ وێ گۆتنێ بدەنە پاش.

٦- جڤاکا صەحابییان ب چاڤێ عیبادەتی بەرێ خۆ ددا هەر تشتەکێ هەی، خۆ ئێک ژ وان دەمێ دچوو نڤینا خۆ، نیەتا هندێ دکرە دلێ خۆ کو خودێ زارۆکەکی بدەتێ جیهادێ د ڕێکا خودێ دا بکەت!

گاڤا دچوو بەر دکانا خۆ ب نیەتا عیبادەتی دچوو، گاڤا قەستا بیستانکێ خۆ دکر ب نیەتا عیبادەتی دچوو، خۆ گاڤا پارییێ نانی دکرە د دەڤێ خۆ دا ب نیەتا عیبادەتی ئەو چەندە دکر.

## پشكا ئێكێ

# ژ ناڤدارێن بنەمالا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن

- خەدیجایا كچا خوەیلدی و زارۆكێن وێ
- حەسەنێ كورێ عەلی
- حوسەینێ كورێ عەلی
- حەمزەیێ كورێ عەبدلموطەلبی
- عەبباسێ كورێ عەبدلموطەلبی

# دەیکا خودان باوەران
# خەدیجایا کچا خوەیلدی

خەدیجا ئێکەمین مرۆڤ بوو باوەری ب پێغەمبەرینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای لەو یا غەریب نینە ئەم ئێکەمین جار ژ وێ دەست پێ بکەین.

ئەو جهێ وێ بۆ خۆ د دلێ پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- کری کەسەک قەت و قەت نەگەهشتبوویێ، چو جاران پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەدحێن وێ نەدوەستیا، حەتا جارەکێ عائیشایێ ب ترانەڤە گۆتێ: هەر وەکی ژ وێ پێڤەتر چو ژنکێن دی د دنیایێ دا نەبووینە؟!

ژ بەر ڤێ چەندێ مە ڤیا گەشتا خۆ د گەل صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ ڤێ شێرەژنێ دەست پێ بکەین، دا بزانین کانێ دەمێ ژن خۆ دهاڤێتە گەڕا قوربانییێ چاوا ژ چیایی موکمتر و سەربلندتر لێ دئێت.

دەیکا خودان باوەران خەدیجا، بەرمالییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و دەیکا زارۆکێن وی، پیرا حەسەن و حوسەینی، دەیکا فاطمایێ، ژ لایێ دایێ و بابێ ڤە ژنەکا قورەیشی بوو، بابێ وێ خووەیلد کوڕێ ئەسەدێ کوڕێ عەبدلعوززایێ کوڕێ قوصەیێ کوڕێ کیلابییە، و دەیکا وێ فاطمایا کچا زائیدێ کوڕێ ئەصەممێ قورەیشییە، ئەو و زەلامێ خۆ پێغەمبەرێ خودێ ل بابێ چارێ دگەهنە ئێک، بەلێ ئەو ژ بابکێ ئەسەدییانە و پێغەمبەر ژ بابکێ هاشمییانە.

دەنـگ و باسـێن وێ -بـەرێ شـوی ب پێغەمبـەری بکـەت- ب فرەهـی نەهاتینە زانین، ل دۆر دەسنیشانکرنا سالا بوونا وێ پتر ژ گۆتنەکێ هەیە:

- گەلەک دیرۆکڤان دبێژن: دەمێ وێ شوی ب پێغەمبـەری کـری ژییـێ وێ چل سال بوون، مەعنا بەری پێغەمبەری ب پازدە سالان ئەو بووبوو.

- و هندەک پێـنج سالێن دی ل ژییـێ وێ زێدە دکـەن، و دبێـژن: ئـەو بیست سالان ژ زەلامێ خۆ مەزنتر بوو.

- پسمامێ پێغەمبەری عەبدللاهێ کورێ عەبباسی کو ئێک ژ زانایێن صەحابییانە، دبێژت: دەمێ خەدیجایێ شوی ب پێغەمبـەری کـری ژییـێ وێ بیست و هەشت سال بوون. مـەعنا: ئـەو ب تنێ سێ سالان ژ پێغەمبـەری مەزنتر بوو.

و هەر چەندە گۆتنەکا ئێکێ ژ هەمییان بەلاڤترە ژی، بـەلێ ئـەم گۆتنـا (ئبن عەبباسی) ڕاستتر دبینـین؛ چونکی ئـەو پسـامێ پێغەمبـەری بـوو، و مسـۆگەر ئـەو ب ڤـێ چەنـدێ دێ یـێ زانـاتر بـت، د سـەر وێ چەنـدێ ڕا خەدیجایێ شـەش زارۆک ژ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- هـەبوون، و دەمـێ وێ شـوی پـێ کـری ژییـێ وێ ل دۆرێـن سیهێ بت پتر یا بـەرعەقلـە کـو ل دۆرێن چلێ بت، و ئحتیمالا کو ژنکێ پشتی چل سالییێ شەش بچویـک ببن کێمترە نەخاسم ئەگەر ئەو ژن ل جەزیرا عـەرەبی ژییابت و دئێتـە زانـین کو مرۆڤ ل جهێن وەکی وێ یێن گەرم زویتر دگەهن.

ل بـاژێرێ مەکـەهێ، و د نـاڤ مالـەکا هـەیی و خۆدیتی دا، خـەدیجا هاتە دنیـایێ، ئەم چو ژ سـەر و بـەرێ زارۆکینـی و جحێلینییـا وێ نزانین، بەلێ تشتێ هاتییـە زانـین ئـەوە: خـەدیجا کچـەکا خودان جوانی و عـەقل و تێگەهشتن بوو، لەو هێشتا یا جحێل ئێک ژ مەزنترین مـاقویلێن مەکـەهێ کو دگۆتنێ: (أبو هالە) دلێ خۆ برێ و بۆ خۆ ژ بابێ وێ خواست.

ژ بلی جوانی و عەقلدارییێ، ئەو ب پاقژییێ ژی هاتبوو ناسین د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا، لەو وان ناسناڤێ (الطاهرە) دانابوو سەر وەکی کتێبێن دیرۆکی ڤەدگێرن.

بەری ئەو و پێغەمبەر پێک بێنەدەر، دو جاران خەدیجایێ شوی کربوو، بەلێ هەردو شوییێن وێ دەمەکی درێژ ڤەنەکێشابوو؛ چونکی هەردو زەلامێن وێ زوی مربوون:

- یێ ئێکێ (أبو هالە) بوو، و ئەڤە مرۆڤەکێ ماقویل و زەنگین بوو، خەدیجایێ کورەک ژێ هەبوو ناڤێ وی (هند) بوو، د مالا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هاتبوو ب خودانکرن.

- یێ دویێ عەتیقێ مەخزوومی بوو، و وێ کچەک ژ ڤی هەبوو دگۆتنێ: دەیکا موحەممەدی.

و هندەک دبێژن: (أبو هالە) زەلامێ وێ یێ دویێ بوو، و هەر چاوا بت خەدیجا دەمەکێ درێژ د گەل وان نەژیا بوو؛ چونکی هەردو زوی مرن.. پشتی مرنا زەلامێ خەدیجایێ یێ دویێ، ئەوێ هزرا شویکرنێ ژ سەرێ خۆ ئینادەرێ، و خۆ ب سەخبێرییا مالا خۆ ڤە مژویل دکر، و ژ لایەکێ دی ڤە چونکی ئەو ژنکەکا زەنگین بوو و مالەکێ باش د دەستی دا هەبوو، هەر سال دەمێ قورەیشی دچوونە کاروانی، چ ل هاڤینێ بت بۆ شامێ، یان ژی ل زڤستانێ بت بۆ یەمەنێ، ئەوێ داخواز ژ هندەک زەلامێن ئویجاخا خۆ دکر کو بۆ وێ بچنە کاروانی و کرین و فرۆتنێ ب مالێ وێ بکەن، و پشتی کاروان دزڤری دا رابت حسێبا مالێ خۆ کەت و کرێیا وێ مرۆڤی دەتێ ئەوێ بۆ چوویە کاروانی.

ب ڤی رەنگی خەدیجایێ ژیێ خۆ دبۆراند، و چونکی ئەو ژنکەکا ژێهاتی و زەنگین بوو، گەلەک زەنگین و سەر و مەزنێن مەکەهێ حەز دکر

خەدیجا شوی ب وان بکەت، و گەلەک ژ وان ئاشکەرا داخواز ژێ کربوو کو شوی ب وان بکەت، بەلێ وێ دل د ڤێ چەندێ نەبوو.. و هۆسا وێ ژیانا خۆ دبۆراند حەتا سالا ئەو و جحێلەکێ هاشمی ئەوێ دگۆتنێ: (موحەممەد) ب سەرێک هلبووین.

سەرهاتییا ب سەرێک هلبوونا وان یا چاوا بوو؟

موحەممەد -سلاڤ لێ بن- جحێلەکێ بیست و پێنج سالی بوو، یێ بێ مال و حال بوو، هێشتا نەبووی بابێ وی مربوو، دەمێ ژییێ وی شەش سال دەیکا وی ژی ب رێکا بابێ وی دا چووبوو، ئەو ما ئێتیم و سێوی، ژ دلۆڤانییا دەیکێ و بابێ بێبار بوو، و ب تنێ ئەو دزانت کانێ چەند یا ب زەحمەتە مرۆڤ بێ دەیک و باب بژیت ئەوێ ژ پەرداغێ ئێتیمی و سێویاتییێ ڤەخواری، پشتی دەیکا وی ژی مری ئەو ما ل نک باپیرێ خۆ، باپیرێ وی یێ ب ناڤسال ڤە چوویی زێدە چاڤێ خۆ ددایێ، و ژ هەمی عەیال و نەڤییێن خۆ پتر حەز ژ وی دکر، حەتا دبێژن: چی جهێ چووبایێ وی ئەو د گەل خۆ دبر.. بەلێ قەدەرێ دڤیا جارەکا دی دلێ وی نازک بکەت؛ چونکی ئەو بۆ شڤانییا ئوممەتەکێ دهاتە ئامادەکرن، ل هەشت سالییێ باپیر ژی لێ مر، هەما دهاتە بیرا وی دەمێ یێ بچویک و باپیرێ وی کەفتییە بەر مرنێ هنارتە ب دویڤ کورێ خۆ (ئەبوو طالبی) را و شیرەت لێ کر کو پشتی وی ئەو (موحەممەدی) ببەتە نک خۆ و چاڤدانا وی بکەت، هەر چەندە (ئەبوو طالب) مرۆڤەکێ عەیال بۆش و بەردەست تەنگ ژی بوو، بەلێ وی شیرەتا بابێ خۆ ب جهئینا و برازایێ خۆ یێ هەشت سالی برە مالا خۆ و پتر ژ کورەکێ خۆ چاڤێ خۆ دایێ.

ژ بەر کو مامێ وی مرۆڤەکێ بەردەست تەنگ بوو، و پشتی ئەو فاما بووی، وی داخواز ژ مامێ خۆ کر دەستوورییێ بدەتێ کو ببتە شڤان بۆ

خەلکێ مەکەهێ بەرانبەر کرێیەکێ دا بشێت پیچەکێ هاریکارییا وێ مالێ بکەت یا ئەو د ناڤ دا مەزنبووی.

هەر رۆژ موحەممەد ژ باژێری دەردکەفت و ئێڤاری دزڤری، ڤێ چەندێ کار لێ کر کو ئەو ژ جحێلێن سەردەمێ خۆ دویر بکەڤت و گەلەک تێکەلییا وان نەکەت و وەکی وان لێ نەئێت.. ب دەسپاکی و ڕاستگۆیێ ئەو هاتە ناسین، حەتا خەلکێ مەکەهێ هەمییان ناڤێ وی کرە: (الصادق الأمین).

گاڤا ژییێ وی بوویە بیست و پێنج سال، ڕۆژەکێ مامی وی گۆتێ:

- برازا، ئەز مرۆڤەکم من چو مال د دەست دا نینە، و زەمان ل سەر مە یێ دژواربووی، و سالێن گران ب سەر مە دا هاتینە، و چو د دەست مە دا نینە ئەم بازرگانییێ پێ بکەین، و ئەڤە کاروانێ ئویجاخا تە نێزیکە دەرکەفتە شامێ، و هەر جار خەدیجا هندەک زەلامێن ئویجاخا تە دهنێرت دا بازرگانییێ ب مالێ وێ بکەن و هندەک فایدەی بگەهیننە خۆ ژی، ڤێجا ئەگەر تو بچی داخوازێ ژێ بکەی ئەو دێ تە هلبژێرت؛ چونکی ناڤ و دەنگێن پاقژییا تە یێن گەهشتینێ.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ چەندێ دا پیچەکێ دودل ما، نەدویرە ژ بەر هندێ بت چونکی وی بەری هنگی چو جاران ئەڤ کارە نەکربوو، بەلکی چونکی وی ژ دل دڤیا هاری مامێ خۆ بکەت ئەو ب گۆتنا مامێ خۆ رازی بوو.. ئەبوو طالب رابوو چوو مالا خەدیجایێ و داخوازا خۆ گەهاندێ، خەدیجایێ د گاڤێ دا رازیبوونا خۆ دیار کر و گۆتێ: ئەگەر بۆ ئێکێ بیانی تە ئەڤ داخوازە کربا دا بۆ تە ب جهـ ئینین، ڤێجا پا چاوا بۆ مرۆڤەکێ نێزیک و خۆشتڤی؟!

خەدیجایێ هنارتە ب دویڤ ڕا، و پشتی ئەو پێک هاتینەدەر خەدیجایێ مالێ خۆ کرە د دەستان دا و خولامێ خۆ (مەیسەرە) دا د گەل،

و کاروانی دا ڕێ.. پشتی چەند هەیڤەکان کاروانی زڤڕین، (موحەممەد) و هەڤالێ خۆ (مەیسەرە) ئێکسەر ب نک مالا خەدیجایێ ڤە چوون، موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- سوحبەتا کڕین و فرۆتنێ بۆ وێ ڤەگێڕا، مالێ وێ هەمی دا ڤێ و کرێیا خۆ ژێ وەرگرت و زڤڕی نک مامێ خۆ ئەبوو طالبی.

خەدیجایێ بەرێ خۆ دایێ فایدێ وێ یێ ئەڤ سالە ژ یێ هەمی سالێن دی پترە، ئینا وێ پسیارا خولامێ خۆ مەیسەرەی کر کانێ مسەلە چیە؟

مەیسەرەی بۆ وێ بەحسێ جامێری و پاقژی و دەسپاکییا موحەممەدی کر، و کانێ ئەو چەند مرۆڤەکێ پیرۆز و ڕاستگۆیە، و بۆ وێ دیارکر کو بەرێ وی هەردەم ل هندێ بوو فایدەی بگەهینتە وێ، نە وەکی زەلامێن سالێن بۆرین ئەوێن بەری هەر تشتەکی ل فایدێ خۆ دگەڕیان.

موحەممەد کانێ چەند د چاڤێن خەدیجایێ دا یێ مەزنبوو، هندی دی مەزنتر لێ هات، ئەو پێ حسیا هەر وەکی دلێ وێ یێ ب لایێ وی ڤە دچت، ما چاوایە ئەگەر ئەو شوی ب وی بکەت؟ مادەم ئەو هندە زەلامەکێ دلپاکە و بەرێ وی ل مالێ وێ نینە، ئەو دێ ب کێر وێ ئێت. ئینا وێ ئەڤ هزرا خۆ بۆ هەڤالەکا خۆ یا نێزیک گۆت و ژێ خواست ب ڕەنگەکێ نە یێ ڕوی ب ڕوی وێ بگەهینتە موحەممەدی!

هەڤالا خەدیجایێ (نەفیسا) هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: بۆچی تو ژنێ نائینی؟ وی گۆت: ژ بەر نەبوونا مالی. وێ گۆت: و ئەگەر تو بۆ مالی و جوانییێ و هەڤکوفییێ هاتییە خواستن؟ وی گۆت: ئەو دێ کی بت؟ نەفیسایێ گۆت: ئەو خەدیجایە! ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بلا بۆ من بێژێ. و ب ڤی ڕەنگی هەردو پێک هاتنەدەر.

وەکی عەدەت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مامێ خـۆ خـواسـت کو ئەو ب رەنگەکێ رەسمی بچت خەدیجایێ بۆ وی بخوازت، مامێ وی کـەیف ب ڤێ چەندێ هـات، رابـوو ئـەو و برایـێ خۆ (حـەمزە) پێکڤە چوونـە مـالا بابێ خەدیجایێ، و هندەک دبێژن: بابێ وێ هنگی نەمابوو لەو چوونـە مـالا مـامێ وێ، هـەر چـاوا بـت خـەدیجا ژ مـرۆڤێن وێ هاتـە خواسـتن و ئـەبوو طـالبی گۆتە مرۆڤێن وێ:

- هندی موحەممەدە، جحێلەکێ وەکی وی د ناڤ قورەیشـیيان دا نینـە بۆ شەرەف و مالـمەزنییێ و عەقلدارییێ، ئەگەر وی نوکە چو مالـەکێ مەزن نەبت ژێ مال سیبەرەکە نامینت و ئێمانەتەکە دێ ئێتە زڤراندن..

مرۆڤێن خەدیجایێ گۆتنێ: تو راست دبێژی.

ب ڤی رەنگی ئەو هـەردو گەهشتنە ئێک و نـەختێ خـەدیجایێ -وەکـی د هندەک ریوایەتان دا هاتی- بیست حێشتر بوون.

خەدیجا ژنکا ئێکێ بوو د ژیانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- بیست و پێنج سالان ئەو مانە د گەل ئێک، پازدە ژێ بەری پێغەمبـەرینییێ بـوون، و دەهـ ژێ پشـتی پێغەمبـەرینییێ بـوون، د ڤـان سـالان دا خۆشـترین و تەناترین ژیان هەردویان پێکڤە بۆراند، حەتا خـەدیجا مـری ژێ زەلامـێ وێ چـو ژن ل سەر نەئینابوون، لـەو د ناڤبەرا دەیکێن موسلمانان هـەمییان دا ب تنێ وێ دەردێ هەوییاتییێ نەدیتبوو!

خەدیجا ژنکەکا تێگەهشتی بـوو، و وێ بـاش دزانـی سـەرمالێ ژنکێ یێ مەزنتر ئەوە مالا خۆ خۆش بکەت و دلـێ زەلامـێ خۆ ب لایـێ خۆ ڤـە بکێشـت، لـەو هـەر ژ رۆژا ئێکـێ وێ ئێکـا هنـد کـر مـالا خۆ بکەتـە ئـەو وارگـەهێ تـەنا یـێ زەلامـێ وێ تێـدا ب تامـا خۆشـییێ بحەسـیێت، ئـەوێ پشتی شوی ب موحەممەدی کری مـالێ خۆ هـەمی حسـێب کر مـالێ وی،

وێ دەست ژ کارێ بازرگانییێ کێشا و دەمێ خۆ هەمی بۆ مال و عەیالێ خۆ تەرخانکر.

تشتێ خۆشییا ڤێ مالێ زێدەکری ئەو بوو خودێ لێ هاتە رەحمێ و هژمارەکا زارۆکان دایێ: دو کوڕ و چار کچ.

خەدیجا نە ژ وی رەنگێ ژنان بوو یێن هزر دکەن خۆشییا دنیایێ پارە و زەنگینییە، لەو چو جاران ل دەمێن پێتڤی ئەوێ خۆ ژ دانا خێرێ پاشدا نەدبر، و هەر جارەکا زەلامێ وێ یێ خێرخواز بەرێ وێ دابا خێرەکێ دەلیڤەکا ب تنێ ژی ئەو دودل نەدبوو.. و زەلامێ وێ هندی یێ ساخ ئەڤ قەنجییا وێ ژ بیر نەکربوو، ڕۆژەکێ دەمێ وی مەدحێن خەدیجایێ بۆ عائیشایێ کرین، وی گۆت: دەمێ خەلکی ئەز زڕبار کریم وێ مالێ خۆ دا من.

ڕۆژەکێ حەلیما سەعدی، دەیکا پێغەمبەری یا شیری، هاتە مەکەهێ و قەستا مالا پێغەمبەری کر -ئەڤە بەری ئەو ببتە پێغەمبەر- و گۆتێ: کوڕێ من! ئەڤ سالە هشکاتییە و حالێ مە گەلەک یێ نەخۆشە، پێغەمبەری گۆتە خەدیجایێ: ئەگەر تو هاریکارییا وێ بکەی. خەدیجایێ د گاڤێ دا حێشترەک و چل پەز دانێ.

هندەک دیرۆکنڤیس دبێژن: پێغەمبەری ڤیا قەنجییا مامێ خۆ ئەبوو طالبی بۆ وی بزڤرینت، ئینا وی داخواز ژ خەدیجایێ کر کو ئەو قەبویل بکەت ئەو پسمامێ خۆ (عەلی) بینتە مالا خۆ؛ دا ئەو پێش مامێ خۆ ڤە وی ب خودان بکەت، و خەدیجا د گاڤێ دا ل بەر هات[1].

---

(١) هەر چەندە ئەڤ گۆتنە ل نک دیرۆکنڤیسان یا بەلاڤە ژی بەلێ ئەو ب ڕێکێن دورست نەهاتییە ڤەگوهاستن.

مەخسەد، تێگەهشتنەکا تمام د ناڤبەرا هەردویان دا هەبوو، و چونکی خەدیجا نە کچکەکا بچویک و کێم سەربۆر بوو، وێ دزانی ب عەقلێ خۆ یێ مەزن دێ چاوا ل پشت زەلامێ خۆ ڕاوەستت ل دەمێ تەنگاڤییێ، و ئەگەر ڕاست بت ئەو گۆتنا هندەک دبێژن: ((د پشت هەر مەزنەکی ڕا ژنەک هەیە))، مرۆڤ دشێت ب پشتڕاستی ڤە بێژت: خەدیجا ئەو ژن بوو یا د پشت موحەممەدی ڕا.

موحەممەدی و خەدیجایێ پازدە سال -بەری پێغەمبەرینییێ- د گەل ئێک بۆراندن، د ڤان سالان دا ئەوان مالەکا وەسا ئاڤاکر، بووبوو نموونێ مالا سەرکەفتی و خۆش و تەنا، تشتەک نەبوو عەورێن ڕەش ل هنداڤی ڤێ مالێ کۆم بکەن، یان خۆشییا خەلکێ وێ تێک بدەت.. سالا پازدێ هات، ژییێ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- گەهشتە چل سالییێ، ئەو دەمەک بوو ل بەر وی هاتبوو شرینکرن کو ژ بازێرێ مەکەهێ دەرکەڤت و بچتە شکەفتا (حرائێ) ئەوا دکەفتە وی چیایێ ب ڕەخ مەکەهێ ڤە، خەدیجا -نموونێ کابانییا سەرکەفتی- بەرانبەر ڤێ ڤیانا وی ڕانەوەستا، و وێ چو پتپت د سەری دا نەکر، بەلکی هاریکارییا وی ل سەر ڤێ چەندێ کر، مێدەکا وی بۆ تژی خوارن دکر و ب سەر و بەرێ وی ڕادبوو ل دەمێ دهات و دچوو.. ژ لایەکێ دی ڤە و دا کو ئەو زەلامێ خۆ یێ خۆشتڤی ژ هەر نەخۆشییەکێ بپارێزت وێ گۆتبوو خولامەکێ خۆ: چاڤێ تە ل موحەممەدی بت دەمێ ئەو دچت؛ دا چو نەخۆشی نەئێنە سەری.

عائیشا دبێژت: ((ئێکەمین تشتێ وەحییێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژێ دەست پێ کری خەونێن چاک بوون، وی خەونەک نەددیت ئەگەر وەکی گەشاتییا سپێدێ نەهاتبا، پاشی ل بەر وی هاتە شرینکرن کو ئەو یێ ب تنێ بت، ڤێجا ئەو دا چت و ب تنێ مینتە ل شکەفتا حرائێ بۆ کرنا

عیبادەتێ، چەند شەڤێن هژمارتی ئەو دما ل وێرێ، پاشی ئەو دزڤـرِی مـال ل نک خەدیجایێ و خوارن بۆ خۆ دادگرت و دزڤرِی ڤە، حەتا حەقی بۆ هاتی و ئەو ل شکەفتێ..)).

پاشی عائیشا ب بەرفرەهی بەحسێ هاتنا جبریلی بـۆ نـک پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- دکـەت، و کـانێ چـاوا پێغەمبـەر ژ ڤـێ چەنـدێ ترسـیا و هزرکـر ئەڤـە تشـتەکە لـێ هـاتی، عائیشـا دبێـژت: ((پێغەمبـەر زڤـرِی نـک خەدیجایێ و گۆتێ: من بپەچنن، من بپەچنن، وێ ئەو پەچنی و حـەتا ترسـا وی چووی، خەدیجایێ پسیار ژێ کر کانێ چ لێ قەومییە، وی سوحبەتا خۆ بۆ ڤەگێرِا و گۆت: ئەز ژ خۆ دترسم. خەدیجایێ گۆتێ: نـە ب خودێ، خودێ قـەت تـە شـەرمزار ناکـەت، هنـدی تـویی تـو یـێ ب مرۆڤـاینی یـی، و تـو هاریکـارییێ دکـەی، و دەسـتێ هـەژاری دگـری، و مێهڤـانی دحـەوینی، و پشتەڤانییا حەقییێ دکەی)).

ژ ڤێ گۆتنا عائیشایێ دیار دبت کانێ خەدیجا چەند ژنکەکا پشـتەڤان بوو بۆ زەلامێ خۆ، وێ هـەمی رێ ب کاردئینـان یـێن رحـەتییا زەلامـێ وێ تێـدا، بێهنـا خـۆ ل سـەر وی فرەهـ دکر، و گازنـدە ژ ڤـی عـەدەتێ وی -کـو چوونا شکەفتێ بوو ب تنێ- نەدکر، و خوارن بۆ وی ئامـادە دکـر، و ژ لایـێ خۆ ڤە وێ سەر و بەرێ بچویکێن خۆ ب رێڤـەدبر، حـەتا وێ رۆژا مـەزنترین گوهۆرِین د ژیانا وان دا چێبووی، نە د ژیانا وان ب تنێ دا، بەلکی د ژیانا مرۆڤینییێ هەمییێ دا.

وێ سپـێدەیا زوی، یـا موحەممەد تـێـدا زڤـرِییە مـال یـێ گوهشـی و ب ترس و لەرز، خـەدیجایێ ب دلـەکێ تـەنا و روویـەکێ گـەش ڤـە پێشـوازی لێ کر، ل سـەری وێ خـۆ نەترساند و پسـیار ژی ژێ نـەکر کـانێ وی چیـە؟ داخوازا وی بۆ ب جهئینا و پەچنی، پشـتـی وێ دیتـی ئـەو رحـەتبوو و ترسـا

وی چوو، ژ نوی وی گۆتێ: پسمام بێژە تە خێرە؟ پشتی وی سوحبەتا خۆ بۆ ڤەگێڕای، خەدیجایێ دلێ وی موکم کر، و ئەو پشتڕاست کر کو خودێ وی شەرمزار ناکەت؛ چونکی ئەو مرۆڤەکێ خێرخوازە، پاشی گۆتێ: من پسمامەکێ هەی ناڤێ وی وەرەقەیە کتێبێن جوهی و فەلەیان دخوینت، هلۆ دا بچینە نک وی، و سوحبەتا خۆ بۆ وی ڤەگێڕە کانێ ئەو دێ چ بێژت؟

پشتی ئەو و خەدیجا پێکڤە چووینە نک وەرەقەیی، وی پسیار ژ پێغەمبەری کر، کانێ وی چ دیتییە؟ پێغەمبەری سوحبەتا خۆ بۆ ڤەگێڕا ئینا، وەرەقەی گۆتێ: ئەڤە ئەوە یێ خودێ بۆ مووسایی ژێ دهنارت، خوزی ئەزێ جحێل بام، خوزی ئەز یێ ساخ بام دەمێ مللەتێ تە تو دەردئێخستی. پێغەمبەری گۆت: ما ئەو دێ من دەرێخن؟ وی گۆت: ئەرێ، زەلامەک ب وێ نەهاتییە یا تو پێ هاتی ئەگەر نەیارەتییا وی نەهاتبتەکرن، و ئەگەر ئەز بگەهمە ڕۆژا تە، ئەز ب رەنگەکێ موکم دێ پشتەڤانییا تە کەم.

پشتی هەردو زڤڕینە مال و جارەکا دی پێغەمبەری جبریل دیتی، خەدیجایێ گۆتێ: ئەگەر جارەکا دی تە ئەو دیت بێژە من، ڕۆژەکێ ل مال پێغەمبەری گۆتێ: ئەڤەیە هات، خەدیجایێ گۆتێ: تو دبینی؟ گۆت: ئە! گۆتێ: کانێ وەرە ڕەخێ من یێ ڕاستێ، ئەو هاتە ڕەخێ وی یێ ڕاستێ، گۆتێ: نوکە تو دبینی؟ گۆت: ئە! گۆتێ کانێ وەرە د کۆشا من دا روینە، پشتی وە کری، گۆتێ: نوکە تو دبینی؟ گۆت: ئە! خەدیجایێ خۆ سەرکول کر و پێغەمبەر د کۆشێ دا، گۆتێ: نوکە تو دبینی؟ گۆت: نە! ئینا خەدیجایێ گۆت: پسمام! ئەڤە شەیتان نینە، ئەو مەلائیکەتە، مزگینییا من ل تە، تو پێغەمبەری..

هنگی خەدیجایێ باوەری پێ ئینا، و ب ڤی رەنگی خەدیجا دبتە ئێکەمین کەس ل سەر روییێ عەردی باوەری ب پێغەمبەری ئینای.

ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ -ب رێکا جبریلی- فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ کر کو ئەو سلاڤان لێ بکەت، و مزگینییێ ب قسرەکا ژ لوئلوئی د بەحەشتێ دا بدەتێ، نە دەنگ بلندی تێدا هەیە و نە وەستیان.

پازدە سالان خەدیجا ب تەناهی د گەل زەلامێ خۆ ژییا بەری ئەو ببتە پێغەمبەر، و دەهـ سالان پشتی ئەو بوویە پێغەمبەر ژی، د ڤان دەهـ سالان دا کو سالێن دووماهییێ یێن ژییێ خەدیجایێ بوون، وێ گەلەک نەخۆشی و زەحمەت سەرا ئیسلامێ دیت، ئەو نەخۆشییا دهاتە سەرێ زەلامێ وێ ئەو د هەمییێ دا یا پشکدار بوو، بەلێ د گەل هندێ ژی وێ بێهنەکا زێدە فرەهـ هەبوو، هندی نەخۆشی لێ دژوار دبوو باوەرییا وێ موکمتر لێ دهات، و هەردەم وێ نەخۆشی ل سەر زەلامێ خۆ ژی سڤک دکر و پییێن وی پتر ل سەر حەقییێ موکم دکرن..

موحەممەد و خەدیجا و عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی سێ کەسێن ئێکێ بوون هاتینە د ئیسلامێ دا، پشتی وان، و ب رێکا وان چەند مرۆڤەکێن دی هاتنە د ئیسلامێ دا حەتا هژمارا وان ژ چل زەلامان بۆرین، و د ناڤ وان دا هندەک ژ زەنگین و ماقویلێن مەکەهێ هەبوون، وەکی: ئەبووبەکری، عوثمانی، عومەری، حەمزەی و چەندەکێن دی.

دەمێ گازییا ئیسلامێ ب رەنگەکێ بەرفرەهـ بەلاڤبووی قورەیشی ژ ڤێ گازییێ ترسیان و ب هەمی رێکا هاتنێ دا وێ بێدەنگ بکەن، هندەک گرتن و عەزابدان، هندەک بۆ خۆ مشەختبوونە حەبەشێ، هندەک د بن عەزابێ ڤە هاتنە کوشتن، پێگاڤا مەزن یا قورەیشییان هاڤێتی ئەو بوو وان بریار دا: یان بنەمالا هاشمییان دێ موحەممەدی دەنە وان دا ئەو وی بکوژن، یان ئەو دێ وان ژ خۆ ڤەدەر کەن و پەیوەندییێ د ناڤبەرا خۆ و وان دا ڤەبرن.

هاشمی -ژ بەر تەعەصصوبا عەشیرەتییێ- ل بەر نەهاتن و گۆتن ئەم و موحەممەد یان دێ پێکڤە ژین، یان پێکڤە دێ مرین!

دووماهییێ قورەیشییان پەیمانەک مۆرکر و ب دیوارێ کەعبێ ڤە هلاویست، تێدا بڕیار دا کو بنەمالا هاشمییان دڤێت ژ ناڤ بازێری بێنە دەرێخستن، نە کەس چو ژێ بکڕت نە چو بفرۆشتێ، نە ژنان ژێ بینن نەدەنێ.. و ل تەنشت مەکەهێ هندەک لات و گەلی هەبوون یێن ئەبوو طالبی بوون، بنەمالا هاشمییان هەمی ل وێرێ کۆمبوون، موسلمان و کافرێن وان، سێ سالان ل وێرێ مانە د بن حصارەکا دژوار دا، برس و ئێش د ناڤ دا بەلاڤبوو و تەنگاڤی زێدە مەزنبوو.

ل وی دەمی خەدیجایێ ژی خۆ دابوو د گەل ئویجاخا زەلامێ خۆ، هەر چەندە ئەو ژ بنەمالا ئەسەدییان بوو و وێ ماف هەبوو نەچت، بەلێ خەدیجا ل بەرنەهات زەلامێ وێ و موسلمان و بەنی هاشمی د بن برسێ ڤە بن و ئەو ل مەکەهێ د خۆشییان دا بت.

خەدیجا ئەوا هنگی بەر ب پیراتییێ ڤە دچوو، ژنکەک بوو ژیانا خۆ ب خۆشی بۆراندبوو، ژنکەکا زەنگین بوو، هندەک سالان تجارەتا وێ ب تنێ هندی یا خەلکێ مەکەهێ هەمییێ بوو، ئەوێ قوربانی ب ڤێ هەمییێ دا، د گەل زەلامێ خۆ هاتە گەلییێن ئەبوو طالبی، مالێ خۆ هەمی دانا بەر دەستێ زەلامێ خۆ یێ خۆشتڤی دا ل سەر هەژاران خەرج بکەت.

ژ بەر ڤێ چەندێ خەدیجایێ جهەکێ مەزن د دلێ پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هەبوو، چو ژن نەشیان بگەهنە وی جهی، ڕۆژەکێ عائیشایێ گۆتە پێغەمبەری: خودێ ئێکا ژ وێ چێتر دا تە.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لێ ڤەگێڕا و گۆتێ: ب خودێ، خودێ ئێکا

ژ وێ چێتر نەدایە من، دەمێ مرۆڤان کافری ب من کری وێ باوەری ب من ئینا، و دەمێ مرۆڤان ئەز درەوین دەرێختسیم وێ ئەز ڕاستگۆ دەرێخستم، و وێ ب مالێ خۆ هاریکارییا من کر دەمێ مرۆڤان ئەز بێبار کریم، و خودێ عەیال ژ وێ دا من..

دەمێ عائیشایێ ئەڤ ئاخفتنە بهیستی گۆت: ب خودێ ئێدی قەت ئەز بەحسێ وێ ناکەم.

ل گەلییێن ئەبوو طالبی، ل دۆرێن مەکەهێ، ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا دەهێ پشتی هنارتنا پێغەمبەری، سێ سالان بەری مشەختبوونێ، و پشتی سێ سالان ژ مانا ل بن حصارا کافرێن قورەیشییان، دەیکا موسلمانان خەدیجا چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، ل دویڤ گۆتنا ئبن عەبباسی ژیێ وێ هنگی پێنجی و سێ سال بوو، و ل دویڤ گۆتنا دی ژیێ وێ شێست و پێنج سال بوو.

ژ دەرڤەی مەکەهێ قەبرێ خەدیجایێ هاتە دورستکرن، و پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- ئەو ڤەشارت و د گەل چوو د قەبری دا حەتا جهێ وێ دورستکری.

هەر د وێ سالێ دا یا خەدیجا تێدا مری، مامێ پێغەمبەری ئەبوو طالب ژی مر، ئەبوو طالب ئەو بوو یێ بەرەڤانی ژێ دکر بەرانبەر سەر و گرگرێن قورەیشییان، و خەدیجا ئەو بوو یا د مالێ دا خەما وی ل سەر سڤک دکر، و ئەو پتر ل سەر ڤێ رێکێ موکم دکر.. ژ بەر ڤێ چەندێ دنیا ل پێغەمبەری هاتە ئێک و تەنگاڤی لێ زێدەبوو!

حەتا ئەبوو طالب نەمری قورەیشییا دەستێ خۆ درێژ نەکرە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و حەتا خەدیجا نەمری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هزرا دەرکەفتنا ژ مەکەهێ نەکر.

خەدیجا چوو مر، بەلێ ئەو د دلێ زەلامێ خۆ دا هەر یا زێندی بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەدحێن تشتەکی هند نەدکرن هندی مەدحێن خەدیجایێ دکرن، هەر کەسێ ل دۆرێن وی دژیا ئەڤ چەندە دزانی.. عائیشا ئەوا پشتی خەدیجایێ ب سێ سالان هاتییە د مالا پێغەمبەری دا، دبێژت: غیرەت بۆ من ل سەر ژنکەکا پێغەمبەری چێ نەبوو هندی بۆ من ل سەر خەدیجایێ چێبووی، هندی من گوهـ ل پێغەمبەری دبوو بەحسێ وێ دکر.

عائیشا دبێژت: جارەکێ (هالەیا کچا خووەیلدی) -خویشکا خەدیجایێ- هات دا بێتە نک پێغەمبەری، ئەڤە پشتی مرنا خەدیجایێ ب چەند سالەکان، دەنگێ وێ وەکی یێ خەدیجایێ بوو، ئینا بیرا پێغەمبەری ل خەدیجایێ هات، کەیفا وی گەلەک هات و گۆت: یارەبی هالە بت.

عائیشایێ گۆت: ئینا غیرەت بۆ من چێبوو، لەو من گۆت: ئەڤە چ بوو بیرا تە ل پیرەژنەکا قورەیشی ئینایەڤە یا ددان د دەڤی دا نە، ئەڤە چەند سالە ئەو مری و خودێ ئێکا ژ وێ چێتر دا تە!! هەر وەکی عائیشایێ بەحسێ خۆ دکر؛ چونکی ئەو کچک بوو و یا جحێل بوو.

پێغەمبەری لێ ڤەگێڕا و گۆت: ئەز ب خودێ کەمە، خودێ ئێکا ژ وێ چێتر نەدایە من.. و ب مەدحێن وێ ڕا چوو.

د حەدیسەکا دی دا عائیشا دبێژت: هندەک جاران مە پەزەک سەر ژێ دکر، ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دا هندەکێ ژێ ڤە کەت و بێژت: ئەڤێ بۆ فلان ژنکا هەڤالا خەدیجایێ ببەن! ڤێجا من جارەکێ گۆتێ: ئەڤە چیە؟ وی گۆت: من ئەو دڤێن یێن وێ دڤیان.

وەفادارییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خەدیجایێ نە ب تنێ هندە بوو، بەلکی ژ ڤێ چەندێ ژی مەزنتر بوو، و سەرهاتییا ڕستکا وێ ئەوا

وێ دایە کچا خۆ زەینەبێ دێ د گەل مە ئیت دەمێ ئەم بەحسێ زەینەبێ دکەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

ل سالا هەشتێ مشەختی، یازدە سالان پشتی مرنا خەدیجایێ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب لەشکەرێ خۆ ڤە هاتی دا مەکەهێ ژ کوفرێ پاقژ بکەت، بەری بێتە د مەکەهێ دا لەشکەرێ خۆ ل دۆرێن مەکەهێ دانا، هوین دزانن پێغەمبەری خیڤەتا خۆ ل کیرێ ڤەدا؟

ئیمامێ (طەبەری) د تاریخا خۆ دا ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خیڤەتا خۆ ل جهەکێ نێزیکی قەبرێ خەدیجایێ ڤەدا!

سلاڤ ل خەدیجایێ بن ل ڤێ دنیایێ، و ل دەمێ ب بەحەشتا خودایێ خۆ شاد دبت.

## زارۆكێن خەدیجایێ

پشتی مە بەحسێ دەیكا موسلمانان خەدیجایا كچا خووەیلدی كری، یا د جهێ خۆ دایە ئەم ب كورتی بەحسێ زارۆكێن وێ ژی بكەین، ئەوێن وێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بووین. و وەكی مە گۆتی: خەدیجایێ شەش زارۆك ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبوون، دو كوڕ و چار كچ: (القاسم) و (عبد الله) و (زينب) و (رقيه) و (أم كلثوم) و (فاطمه).

ب دورستی نەهاتییە زانین كانێ زارۆكێ ژ هەمییان مەزنتر كی بوو، (القاسم) بوو یان (زينب) بوو، بەلێ تشتێ مسۆگەر ئەو بوو كو (فاطمه) ژ هەمییان بچویكتر بوو.

نوكە ب كورتی دێ بەحسێ ڤان هەر شەش زارۆكان كەین.

**ئەلقاسم:**

ب نیشانان ڤە ئەو كوڕێ خەدیجایێ یێ نەخری بوو، و ئێكەمین زارۆك بوو خودێ دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ژ بەر هندێ پێغەمبەر ب ناڤێ وی دهاتە گازیكرن، دگۆتنێ: (أبو القاسم).

خودێ ژییەكێ كورت دابوو قاسمی، هند مابوو ساخ حەتا ب سەر پییان كەفتی.. بەری پێغەمبەرینییێ ئەو بووبوو، و مربوو.

**عەبدللاه:**

ئەڤە ژی بەری پێغەمبەرینییێ بووبوو و مربوو، (عبد الله) هەر ئەوە یێ كو دگۆتنێ: (الطيب) و (الطاهر)، و هندەك دیرۆكڤان دبێژن: ئەڤە دو كوڕێن دی بوون، بەلێ یا دورست ئەوە هەر سێ ئێك بوون.. ئەڤە ژی هێشتا یێ ساڤا مربوو.

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست ب بەلاڤکرنا ئیسلامێ د ناڤ قورەیشییان دا کری، کافران مەسەلا مرنا کورێن وی بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی و گۆتن: موحەممەد یێ بێ کورە دێ مال میرات بت، و بەحسێ وی نامینت، ئینا خودێ صورەتا (الكوثر) ئینا خواری و تێدا گۆت: ﴿ إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۞ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۞ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۞ ﴾ (الكوثر: ١-٣) یەعنی: ئەی پێغەمبەر، هندی ئەمین مە خێرەکا مەزن ل دنیایێ و ئاخرەتێ دا تە، و ڕویبارێ کەوثەرێ ژ وێ خێرێیە، کو ل هەردو لێڤان خیڤەتێن لوئلوئێ سمتینە، و ئاخا وی ژ مسکێیە. ڤێجا تو نڤێژا خۆ هەمییێ بۆ خودایێ خۆ ب تنێ بکە، و تو قوربانێ خۆ بۆ وی ب تنێ ڤەکوژە. هندی نەحەزێ تەیە ئەوە یێ بێ شوینوار دبت، و ژ هەمی خێرێ دبت.

**زەینەب:**

کچا مەزنا پێغەمبەری بوو، و هندەک دبێژن: ئەو ژ هەمی خویشک و برایێن خۆ مەزنتر بوو.

ل سالێن دەسپێکی یێن شویکرنا خەدیجایێ خودێ ئەو دابوویێ، و ئەو د کۆشا پاقژترین ژنکێ دا -کو خەدیجایە- هاتبوو ب خودانکرن و ل بەر دەستێ مەزنترین زەلام -کو پێغەمبەرە- هاتبوو پەروەردەکرن.

زارۆکینییەکا خۆش و تەنا وێ بربوو سەری، و دەیک و بابێن وێ هەردویان گەلەک حەز ژێ دکر، و دەیکا وێ خەدیجایێ ئەو پتر بۆ خۆ وەک هەڤال دزانی.

بەری پێغەمبەرینی بۆ بابێ وێ بێت ئەوێ شوی کربوو، و ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو پازدە سالان بەری پێغەمبەرینییێ پێغەمبەری خەدیجا مارە کربوو، دڤێت بێژین: ژییێ زەینەبێ دەمێ شوی کری گەلەک گەلەک

دێ چاردە سال بت، ئەڤە ئەگەر هات و ئەو ژ هەمی خویشک و براێن خۆ مەزنتر بت.

ل ڤێرێ من دڤێت مسەلەکێ روهن بکەم، ئەو ژی مسەلا ژنئینان و شویکرنێیە، و ژییێ (موناسب) ل دەڤەرا جەزیرا عەرەبان بۆ وێ چەندێ:

ئاشکەرایە کو ژییێ شویکرن و ژنئینانێ ژ جهەکێ بۆ جهەکی یێ جودایە، ئەڤە ل سەر عەدەت و مسەلا ژینگەهێ رادوەستت، ل جهەکێ وەکی مەکەهێ تشتەکێ گەلەکێ عەدەتی بوو کو کچ ل دەهـ سالییێ حەتا پازدە سالییێ شوی بکەت یان کورِ ژنێ بینت، و هندەک جاران باب یان دەیک ب تنێ یازدە سالان ژ عەیالێ خۆ مەزنتر بوو، و ئەڤ تشتە ئەگەر ل نک هندەک ژ مە یێ عەجێب بت، ل جهەکێ وەکی مەکەهێ ل وی دەمی تشتەکی گەلەکێ عەدەتی بوو.

دەمێ ئەم سەرهاتی و ژینەنیگارا صەحابییان دخوینین دڤێت ڤی تشتی باش ل بیرا خۆ بینین و ل دویڤ عەدەتێن خۆ یێن ئەڤرۆ حوکمی ل سەر وان نەکەین.

ل دوازدە سێزدە سالییێ زەینەبێ شوی کر، و شویکرنا وێ بەری هاتنا پێغەمبەرینییێ بوو، دەیکا وێ خەدیجایێ خوارزایێ خۆ (أبو العاص بن الربیع) هلبژارت؛ دا کچا خۆ زەینەبێ بدەتێ و پشتی رازیبوونا خویشکا خۆ هالەیێ وەرگرتی داخواز ژ زەلامێ خۆ کر -کو پێغەمبەر بوو- دا دەستویرییێ بدەت کو کچا خۆ زەینەبێ بدەتە کورِخالەتێ وێ (أبو العاص)ی.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەوێ چو جاران دلێ خەدیجایێ نەدهێلا ب ڤێ چەندێ رازیبوو.. دەمێ زەینەب هاتییە ڤەگوهاستن، دەیکا وێ خەدیجایێ رِستکا خۆ یا زێری وەک دیاری دایێ.

زەینەبێ ژیانەکا خۆش د گەل زەلامێ خۆ (أبو العاص)ی برە سەری، و (أبو العاص) ب خۆ مرۆڤەکێ رحەت و دەسپاک بوو، کارێ بازرگانییێ دکر و گەلەک جاران ئەو د گەل کاروانی دچوو شامێ.

گاڤا پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری هاتی، زەینەبێ هەر زوی باوەری پێ ئینا، و زەلامێ وێ (أبو العاص)ی باوەری نەئینا، بەلێ د گەل هندێ ژی وی گەلەک قەدرێ زەینەبێ دگرت و تشتەکێ سەقەت د دەر حەقا بابێ وێ دا نەدگۆت، هندەک کافرێن قورەیشییان ژێ خواست ئەو ژنا خۆ بەردەت دا بۆ بابێ وێ نەخۆش بکەت، و گۆتنێ: هەچی ژنکا تە بڤێت ئەم دێ دەینە تە. وی گوهداریا وان نەکر و گۆت: ئەز ئێکا ژ وێ چێتر د ناڤ قورەیشییان دا نابینم.

خودێ چەند زارۆک ژ زەینەبێ دانە (أبو العاص)ی بەلێ هەمی مرن و کەس ژ وان مەزن نەبوو.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ مشەختبووی و چوویە مەدینێ، زەینەب ما ل مەکەهێ ل نک زەلامێ خۆ، حەتا ئایەت هاتییە خوارێ کو چێ نابت ژنا موسلمان ل نک مێرێ کافر بت، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ زەلامێ وێ خواست ئەو رێ بدەتە زەینەبێ کو ژ مەکەهێ مشەخت ببت، ئینا زەلامێ وێ (أبو العاص)ی رێ دایێ کو ئەو فەرمانا بابێ خۆ ب جه بینت و د رێکا وێ دا نەبوو ئاستەنگ، دەمێ زەینەب د گەل هندەک مرۆڤێن خۆ ژ مەکەهێ دەرکەفتی و بەر ب مەدینێ ڤە چووی، کافران ب دەرکەفتنا وێ زانی، ئینا دو ژ وان دەرکەفتنە د رێکا وێ دا پێخەمەت ترساندنا وێ، زەینەبێ هنگی بچویکەک د زکی دا بوو، ئێک ژ وان رمێ خۆ کرە د ناڤ چاڤان را، و یێ دی حێشترا وێ ڤەهژاند.

دیرۆکڤان دبێژن: زەینەبێ ژ ترسان دا بچویکێ خۆ هاڤێت، و پشتی گەهشتییە مەدینێ ژی دەمەکێ درێژ نساخبوو.

مشەختبوونا زەینەبێ ژ مەکەهێ بۆ مەدینێ پشتی شەڕێ بەدرێ بوو ب هەیامەکێ؛ چونکی دەمێ شەڕێ بەدرێ قەومی هێشتا ئەو ل نک زەلامێ خۆ (أبو العاص)ی بوو، و ل ڤێرێ دیرۆکڤان سەرهاتییەکا تێر مەعنا ڤەدگوهێزن.. دبێژن: (أبو العاص) ژ وان مرۆڤان بوو یێن د شەڕێ بەدرێ دا ئێخسیربووین و کەفتینە دەستێ موسلمانان، و ئاشکەرایە کو موسلمانان بڕیار دابوو کو هەر ئێخسیرەکێ قورەیشییان ئەگەر بڤێت بزڤڕیتە مالا خۆ دڤێت هندەک مالی بدەت و خۆ بکڕت، یان ژی ئەگەر یێ خواندەڤان بت ئەو دەه زارۆکێن موسلمانان فێری خواندنێ بکەت.

(أبو العاص) ئەوێ د شەڕی دا ئێخسیربووی، هنارتە مەکەهێ ل نک ژنکا خۆ زەینەبێ دا هندەک مالی فرێ کەت حەتا ئەو خۆ پێ بکڕت، زەینەبێ چو مال د دەستان دا نەبوو، ڕابوو ڕستکا خۆ یا زێڕی، ئەوا دەیکا وێ خەدیجایێ ل ڕۆژا داوەتا وێ دایی هنارتە مەدینێ دا زەلامێ خۆ پێ بکڕت، گاڤا ڕستک گەهشتی، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ڕستک دیتی، وی ئەو نیاسی، و زانی ئەڤە ڕستکا خەدیجایێیە، ئینا سەر خاترا خودانا ڕستکێ وی گۆتە موسلمانان: ئەگەر هوین حەز بکەن ئێخسیرێ وێ بەردەن، و ڕستکا وێ ژی بۆ بزڤڕینن.. وان گۆت: بلا، ئینا پێغەمبەری ژێ خواست ئەگەر ئەو زڤڕی مەکەهێ ئەو زەینەبێ فرێکەتە مەدینێ.. و پشتی (أبو العاص) زڤڕییە مەکەهێ، وی سۆزا خۆ ب جهئینا و ڕێ دا زەینەبێ کو ئەو بچتە مەدینێ، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا مەدحێن وی کرن و گۆت: وی سۆزا خۆ د گەل من ب جهئینا.

وەکی مە گۆتی: (أبو العاص) مرۆڤەکێ بازرگان بوو، پترین سالا ئەو د گەل کاروانێ قورەیشییان دەردکەفت، سالەکێ دەمێ ئەو د گەل هندەک ژ هەڤالێن خۆ ژ شامێ دزڤڕی کەفتە دەستێ هندەک موسلمانان، وان ئەو گرت و ئینا مەدینێ، ل مەدینێ وی خۆ گەهاندە نک زەینەبێ و گۆتێ: بەختێ خۆ بدە من دا ئەو چو ل من نەکەن!

زەینەبێ گۆتێ: بلا.

ل دەمێ نڤێژا سپێدێ، پشتی صەحابییان نڤێژ ب دووماهی ئینای، زەینەب ڕابووڤە و ب دەنگەکێ بلند گۆت: گەلی زەلامان هوین هەمی بزانن من بەختێ خۆ دا (أبو العاص)ی..

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل صەحابییان زڤڕی و گۆت: من ژی وەکی هەوە ژ نوی گوهـ لێ بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەختدانا وێ قەبویل کر.

ب ڤی رەنگی زەینەبێ قەرێ زەلامێ خۆ بۆ وی زڤراند و قەنجییا وی ژ سەر خۆ راکر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە زەینەبێ: کچا من بلا ئەو ل نک تە بت، بەلێ وە نەبت نێزیکی تە بت؛ چونکی ئەو یێ حەلال نینە بۆ تە.

دەمێ (أبو العاص)ی ئەڤ سەرەدەرییە ژ وان دیتی دلێ وی چوویێ موسلمان ببت، بەلێ چونکی هندەک دەین و ئێمانەتێن خەلکێ مەکەهێ ل نک بوون، وی دیارکرنا موسلمانەتییا خۆ گیرۆکر حەتا زڤڕییە مەکەهێ، گاڤا ئەو زڤڕی وی دەینێن خۆ هەمی دان و ئێمانەت ل خودانان زڤراندن، و د ناڤ قورەیشییان دا گازی کر: گەلی قورەیشییان کێ ژ هەوە تشتەک ل نک من مایە؟

وان گۆت: کەسێ چو نەمایە.

وی گۆت: هوین بزانن کو ئەز یێ موسلمانبوویم، و ئەڤە ئەز دێ چمە مەدینێ، و ژ بەر هندێ من موسلمانەتییا خۆ ل مەدینێ ئاشکەرا نەکر دا هوین نەبێژن: (أبو العاص) ژ بەر دەین و ئێمانەتان یێ رەڤی.

ب ڤی رەنگی (أبو العاص) موسلمانبوو و هاتە مەدینێ، و هنگی سالا شەشێ مشەختی بوو.

گاڤا (أبو العاص) هاتییە مەدینێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژنکا وی زەینەب بۆ زڤڕاندەڤە بێی جارەکا دی ئەو وێ لێ مارە بکەت.

زەینەب و زەلامێ خۆ مانە د گەل ئێک حەتا سالا هەشتێ مشەختی، وێ سالا مەکەهـ تێدا هاتییە ڤەکرن، ل وێ سالێ زەینەب چوو بەر دلۆڤانییا خودێ ل مەدینێ.

ل وێ هەیاما زەینەب تێدا مری، خویشکا وێ فاطمایێ کچەک بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وێ کرە زەینەب، و ئەڤ زەینەبە (زەینەبا کچا ئیمام عەلی) ئەوە یا دبێژنێ: قەهرەمانا رۆژا کەربەلائێ، خویشکا حوسێنێ شەهید.

**روقەییە:**

روقەییە، کچا خەدیجایێ یا دویێ بوو، بەری پێغەمبەرینی بۆ بابێ وێ بێت، بابێ وێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دابوو پسمامێ خۆ عوتبەیێ کوڕێ ئەبوو لەهەبی، بەلێ هێشتا وی ئەو نەڤەگوهاست بوو، پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە هنارتن و ئەبوو لەهەبی دوژمناتییا وی کری و سوورەتا (تبت یدا أبی لهب) هاتییە خوارێ، ئەبوو لەهەبی ژ کوڕێ خۆ عوتبەیی خواست ئەو روقەییایێ بەردەت، بەری وێ ڤەگوهێزت، پشتی روقەییا و عوتبە ژێک خلاس بووین، بابێ وێ ئەو دا عوثمانێ کوڕێ عەففانی، کو ئێک ژ وان کەسان بوو یێن هەر زوی باوەری ب پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- ئینا، و ئێک ژ ماقویلێن مالبتان (ئومەیەیی) بوو، کو ئێک ژ بابکێن قورەیشییانە، نێزیکی پازدە سالان ئەو د گەل ئێک مان حەتا روقەییا مری.

عوثمان و کابانییا وی روقەییە ئێکەمین دو کەس بوون د رێکا خودێ دا مشەختبووین و قەستا وەلاتێ حەبەشە کرین، و د حەدیسەکێ دا هاتییە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((هندی عوثمانە ئێکەمین کەسە پشتی لووطی -سلاڤ لێ بن- ب بچویک ڤە مشەختبووی)).

روقەییا چەند سالەکا ژ دەیبابێن خۆ دویرکەفت و د گەل زەلامێ خۆ ما ل حەبەشێ، پاشی ئەو د گەل موسلمانان زڤڕینە مەکەهێ، و پشتی هنگی جارەکا دی پێکڤە مشەختبوون و قەستا مەدینێ کرن.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ دەرکەفتییە بەدرێ ل سالا دویێ مشەختی، کچا وی روقەییا یا نساخ بوو، لەو وی دەستویری دا عوثمانی کو ئەو بمینتە ل مال؛ دا چاڤدێرییێ ل کابانییا خۆ بکەت. خودێ وەسا حەزکر بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی سەرفەراز بزڤڕنەڤە مەدینێ پشتی وێ سەرکەفتنا مەزن یا ل بەدرێ دیتی، خودێ ئێمانەتێ خۆ ژ روقەییایێ ستاند، دەمێ عوثمان و هندەک زەلام ل سەر زیارەتان، وان گوهـ لێ بوو ئێکی ب دەنگەکێ بلند گازی کر: (الله أكبر)، عوثمانی گۆتە ئوسامەی: سەح کێ مەسەلە چیە؟

ئوسامە چوو و هات گۆت: ئەڤە بابێ منە یێ هاتی مزگینییێ ددەتە موسلمانان کو ئەو ل بەدرێ یێن ب سەرکەفتین.

روقەییا ل سالا دویێ مشەختی، نێزیکی پێنج سالان پشتی مرنا دەیکا خۆ، چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ و ژییێ وێ هێشتا نەبووبوو سیهـ سال.

## (أم كلثوم):

ئەڤێ ژی -وەکی خویشکا خۆ روقەییایێ- شوی ب پسمامێ بابێ خۆ عوتەیبەیێ کورێ ئەبوو لەهەبی کربوو، بەلێ وەکی عوتبەیی عوتەیبەیی ژی ژنکا خۆ (ئوم کولثووم) بەری ڤەگوهاستنێ و ل دویڤ داخوازا بابێ خۆ بەردا، مەخسەدا بابێ وی ئەو بوو دلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڤێ چەندێ بێشینت.

ئوم کولثووم بەری ڤەگوهاستنێ هاتەبەردان، لەوا ئەو ما د مالا بابێ خۆ دا، حەتا پشتی مشەختبوونێ، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ مشەختبووی (أم کلثوم) و چەند مرۆڤەکێن دی ژ بنەمالا وی مابوونە ل مەکەهێ، لەو پشتی ئەو گەهشتییە مەدینێ هندەک مرۆڤ هنارتنە ب دویڤ مرۆڤێن خۆ یێن مایی کو ئێک ژ وان (أم کلثوم) بوو.

ل مەدینێ ئوم کولثووم ما ل نک بابێ خۆ، پشتی خویشکا وێ روقەییا مری، ئەوێ شوی ب عوثمانێ کورێ عەففانی کر، و نێزیکی شەش سالان ئەو و عوثمان مانە د گەل ئێک.

ل سالا نەهێ مشەختی، ل مەدینێ، ئوم کولثووم چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و ژییێ وێ ژی هێشتا نەبووبوو سیه سال، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ ل سەر وێ کر و عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی و فەضلێ کورێ عەبباسی و ئوسامەیێ کورێ زەیدی جەنازێ وێ داهێلابوو د قەبری دا.

## فاطمە:

سەروەرا ژنکێن جیهانێ، خۆشتڤییا ل بەر دلێ بابێ خۆ، دەیکا ئیمامان، فاطما، کچا خەدیجایێ یا ژ هەمییان بچویکتر بوو.

گەلەک تشت هەبوون فاطما ژ هەر سێ خویشکێن خۆ یێن دی جودا کرین، و تشتێ ژ هەمییان مەزنتر ئەو بوو: خودێ دووندەها پێغەمبەرێ خۆ

د عەيالێ وێ دا كۆم كربوو، فاطما دەيكا حسەن و حوسەينى بوو، و خودێ ب وان دووندەها پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- پاراست.

پشتى خەديجايێ شوى ب پێغەمبەرى كرى ب دەهـ سالان، دەمێ ژيێ پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- سيهـ و پێنج سال، پێنج سالان بەرى پێغەمبەرينى بۆ وى بێت، و ب دورستى ل وێ سالێ يا قورەيشييان كەعبە تێدا سەر ژ نوى ئاڤاكرى، پشتى ئاڤاهييێ وێ بێ سەر و بەر بووى، ل سالا هەژدێ بەرى مشەختبوونێ، خودێ كچەك دا خەديجايێ و ئەو كچ زاڕۆكێ وێ يێ دووماهييێ بوو.. دەيبابان ناڤێ ڤێ كچا خۆ كرە (فاطمە) و دوير نينە خەديجايێ ناڤێ دەيكا خۆ ڕاكريت؛ چونكێ ناڤێ دەيكا وێ: فاطما بوو.

فاطما ژ بەر كو بچويكا مالێ بوو ئەو گەلەك يا نازداركرى بوو، و دەيبابێن وێ زێدە حەز ژێ دكر، زاڕۆكينييەكا رحەت و تەنا وێ بۆراندبوو، و وەكى مەزنان هاتبوو ب خودانكرن، ئەو و خويشكا خۆ (ئوم كولثووم) و براماكێ خۆ (هند) ب تنێ د مالێ دا دژيان، د گەل دەيك و بابان، و چونكى خويشك و براماكێ وێ ژ وێ مەزنتر بوون وێ هەست ب هندێ نەكر كو ئەو يا د گەل دو زاڕۆكان دژيت، لەو ژينا وێ هەر ژ زاڕۆكينييا وێ ژينەكا ب مجداهى بوو، و نە وەكى زاڕۆكێن دى دەمێ خۆ ب مژويلاهى و يارييان ڤە دبۆراند.

دەمێ بابێ فاطمايێ بوويە پێغەمبەر، ژيێ فاطمايێ ل دۆرێن پێنج سالييێ بوو، هنگى ژ نوى ئەو د دنيايێ دگەهشت و تشت فام دكرن، وێ هەست ب ڤێ گوهۆرينا مەزن كر ئەوا د مالا وان دا چێبووى، بەلێ مەژييێ وێ يێ هنگى بچويك، هەمى تشت شرۆڤە نەدكرن، گوهـ لێ دبوو بابێ وێ و دەيكا وێ و عەلى پێكڤە يێ دچنە كەعبێ و تشتەكى يێ دكەن دبێژنێ:

نڤێژ! بەلێ ئەو نەدشیا ب دورستی د مەسەلێ بگەهت.. رۆژ بۆ رۆژێ ئەو مەزن دبوو، و مەژییێ وێ ژی مەزن دبوو، و تێگەهشتنا وێ پتر لێ دهات، وێ زانی کو ئەڤ بارێ کەفتییە سەر ملێ بابێ وێ بارەکێ سڤک نینە، لەو وێ لێ نەگرت کو ئەو چەندەکێ ژێ دویر کەفتی و ب کارێ گازیکرنا بۆ ڤی دینێ نوی ڤە مژویل بووی.

فاطمایێ ب چاڤەکێ بلند بەرێ خۆ ددا بابێ خۆ ئەوێ شیای خۆ ل بەر هەمی نەخۆشی و گەفێن کافران بگرت، و قەت ل دویڤ وان بەرنەدەت، هەر ژ رۆژا ئێکێ یا فاطمایێ تێدا فام کری، وێ باوەری ب پێغەمبەرینییا بابێ خۆ ئینا و ل سەر دەنگێ ئایەتان مەزنبوو. فاطمایێ هەر وەسا ب چاڤەکێ بلند بەرێ خۆ ددا دەیکا خۆ ژی، ئەوا ب هەمی هێز و شیانا خۆ ل پشت زەلامێ خۆ راوەستای و هاریکارییا وی کری حەتا بشێت گازییا خۆ بەلاڤ بکەت.. و ژ بلی ڤێ چەندێ ژی فاطما ژ دەیکا خۆ فێری رێڤەبرنا مالێ بوو، فێری هندێ بوو دێ چاوا مالا خۆ کەتە هێلینەکا خۆش و تەنا کو زەلامێ وێ تێدا هەست ب خۆشی و رحەتییێ بکەت.

فاطما هەر ژ سەری دەمێ د دنیایێ گەهشتی خۆ دیت د مالەکێ دا قەت سستی و خاڤییێ نانیاست، لەو هەر ژ رۆژا ئێکێ ئەو فێری مجدییێ بوو، فێری هندێ بوو کو رحەتییا مەزن ئەوە دلێ مرۆڤی یێ رحەت بت، و دل هنگی دێ رحەت بت گاڤا مرۆڤی ب دورستی ئەو کار کر یێ مرۆڤ بۆ هاتییەدان.

فاطما وەکی هەر ئەندامەکێ دی ژ ئەندامێن مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکداری د خۆشی و نەخۆشییێن ڤێ مالێ دا کر، حەتا پێنج شەش سالییێ چو ژ دنیایێ نەدزانی، پشتی پێنج سالییێ وێ خۆ دیت

کچا زەلامەکێ دڤێت بەرێ خەلکی ژ دینەکێ خەلەت بدەتە دینەکێ دورست، و کارەکێ ب ڤی رەنگی بت -وەکی ئەم هەمی دزانین- یێ بێ زەحمەت و قوربانی نابت!

فاطمایێ ژی وەکی گەلەک کچێن دی یێن ل ژییێ وێ ل مەکەهێ هاریکارییا دەیکا خۆ خەدیجایێ د رێڤەبرنا سەروبەرێ مالێ دا دکر، هەر چەندە هەبوونا خویشکەکا ژ وێ مەزنتر د مالێ دا کو (ئوم کولثووم) بوو دبت ئەڤ کارە چەندەکێ ل سەر وێ سڤک کربت.. د هێلینا باوەرییێ دا، و ل سەر دەستێ فێرکەرێ باوەرییێ، و دەیکا خودان باوەران، ئەو هاتە ب خودانکرن، لەو عەجێبگرتی نەمینن ئەگەر هوین ئەوێ ل پاشەرۆژێ ببینن چیایەک ژ چیایێن باوەرییێ!

پشتی نێزیکی حەفت سالان ژ گازییا ئیسلامێ، دەمێ ژییێ فاطمایێ بوویە دووازدە سال، کافرێن مەکەهێ بریار دا بنەمالا هاشمییان دۆرپێچ بکەن، ئینا ئەو بوو بنەمالا هاشمییان هەمی دەرکەفتنە گەلییێن ئەبوو طالبی ل دۆرێن مەکەهێ، و سێ سالان ل ژێر حصارەکا دژوار و نەخۆش و ب زەحمەت مان، فاطمایێ ژی د گەل دەیک و باب و ئویجاخا خۆ پشکداری د ڤێ خۆراگرتنێ دا کر..

حەتا هەر سێ سالێن حصارێ ب دوماهی هاتین، د ڤان هەر سێ سالان دا مسۆگەر فاطمایێ ژی وەکی هەمی زارۆک و جحێلێن دی گەلەک نەخۆشی دیتن، بەلێ تشتێ ئەڤ نەخۆشییە هەمی ل بەر وێ سڤککرین ئەو بوو وێ خۆ ددیت د ناڤبەرا دەیک و بابەکان دا قەت نیشانێن تەنگاڤی و نەخۆشییێ ل سەر دێمی دیار نەدبوون، ب تایبەتی ئەگەر ئەو نەخۆشی د رێکا خودێ دا هاتبنە سەری.

دەمێ هەر سێ سالێن حصارێ ب دووماهی هاتین زێدە کەیفا هاشمییان هات بەلێ تشتێ دلێ فاطمایێ و دلێ بابێ وێ ژی نەخۆش کری ئەو بوو ل وان ڕۆژێن حصارا زۆردار ب دووماهی هاتی ژییێ خەدیجایێ ژی -د گەل یێ ئەبوو طالبی ژی- ب دووماهی هات.

دەمێ دەیکا فاطمایێ خەدیجا مری، ژییێ فاطمایێ ل دۆرێن پازدە سالییێ بوو، لەو وێ ب دورستی هەست ب بەرپسیارییێ دکر، و باش دزانی ئەو بارێ کەفتییە سەر ملێن وێ و یێن بابێ وێ زێدە گرانتر لێ هات، حەتا ڤێ گاڤێ وان هەڤالەک هەبوو هاری وان خەم هل دگرت، نوکە ئەو هەڤال ژی نەما، لەو فاطمایێ زەند و باسکێن خۆ هلدان و کانێ چاوا دەیکا وێ مال ب ڕێڤەدبر، وێ ژی وەسا مال ب ڕێڤەبر، ب دەستەکی وێ د گەل خویشکا خۆ یا دی کارێ مالێ دکر، و ب دەستێ دی برینێن بابێ خۆ دەرمان دکرن؛ چونکی پشتی مرنا ئەبوو طالبی کافرێن مەکەهێ ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بستەبوون، وان ژ نوی د خۆ ڕا دیت کو نەخۆشییێ بگەهیننێ و بەران تێ وەرکەن و ئاخێ ب سەری دا کەن.. و هتد ژ دەست درێژییێن وان.

گەلەک جاران پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دا زڤڕیتە مال جلکێن وی دتۆزەوی دەست و پییێن وی دسەلخی ژ بەر وێ ئاخ و وان بەر و دارێن دین و بێ عەقل و زارۆکێن کافران تێ وەرکرین، فاطما ب دو چاڤێن تژی رۆندک ڤە ل شوینا دەیکا خۆ دا ڕابت تۆزێ ژ سەر و جلکێن بابێ خۆ داقوتت.. (بوخاری) و (موسلم) ژ عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی -خودێ ژێ رازی بت- ڤەدگوهێزن، دبێژت: من نەدیت جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نفرینەک ل قورەیشییان کربت ڕۆژەکێ تێ نەبت، وێ ڕۆژێ ئەو ڕابووبوو نڤێژ دکر کۆمەکا قورەیشییان ژ وی وێڤەتر دروینشتی بوون، ئینا

وان گۆت: کی دێ ڤی عویرگیشی بەت هاڤێتە سەر پشتا موحەممەدی؟ (عقبه بن أبی معیط) ڕابووڤە گۆت: ئەز. ئەو ڕابوو ئەو عویرگیش هلگرت و چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گاڤا پێغەمبەر چوویە سوجدێ وی ئەو پیساتی هاڤێتە سەر پشتێ، پێغەمبەر ما د سوجدێ دا و سەرێ خۆ ڕانەکر حەتا فاطما -سلاڤ لێ بن- هاتی و ژ سەر پشتێ ڕاکری.. پشتی پێغەمبەری سەرێ خۆ راکری، نفرینەک ل وان کر.

عەبدللاهێ کوڕێ مسعوودی دبێژت: ئەوێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێن وان ئینایین هەمی ل ڕۆژا بەدرێ من دیتن دکوشتی.

ژ ڤێ گۆتنا عەبدللاهێ کوڕێ مسعوودی دئێتە زانین کو فاطمایێ نە ب تنێ د مال دا های ژ بابێ خۆ هەبوو، بەلکی گوهێ وێ ل سەر وی بوو دەمێ ئەو دەردکەفت ژی؛ دا ل دەمێ پێتڤی د هەوارێ بچت!

ل هەر سێ سالێن پشتی مرنا خەدیجایێ، کو ژ سالا دەهێ حەتا سێزدێیە پشتی هاتنا ئیسلامێ، بارەکێ گران کەفتە سەر ملێن فاطمایێ، ژیێ وێ ل وی دەمی ژ پازدە سالییێ بۆری بوو، خەمێن دەیکا وێ ژی بۆ وێ مابوون، ژ لایەکی ڤە بەرێ وێ ل سەر و بەرێ مالێ بوو، و ژ لایەکێ دی ڤە گوهێ وێ ل بابێ وێ بوو ئەوێ ل وی دەمی ژ خەلکێ مەکەهێ بێ هیڤی بووی، ئینا قەستا ژ دەرڤەی مەکەهێ کری و چوویە طائفێ؛ دا خۆ بۆ وان پێشکێش بکەت، نێزیکی هەیڤەکێ یان پتر ما ل وێرێ بەلێ ژ گۆتنێن زڤر و قسێن سەقەت پێڤەتر وی چو ژ دەستێ خەلکێ طائفێ نەدیت، ئینا ئەو نەچار بوو ب وان سەر و دلان ڤە زڤڕی مەکەهێ.. و پشتی ئەو زڤڕی و هەر سال ل دەمێ عەرەب بۆ حەجێ دهاتنە کەعبێ، ئەوی عەشیرەت عەشیرەت خۆ خۆ بۆ پێشکێش دکر دا ئێک ئامادەبوونا خۆ بۆ وی دیار بکەت کو دێ بەرەڤانییێ ژ وی کەن ئەگەر ئەوی قەستا وان کر، ئەو بوو ئەو

و خەلكێ يەثربێ ب سەر ئێک و دو هلبوون و وان سۆز ب پشتەڤانییێ دایێ.

ل سالا سێزدێ ژ هاتنا ئیسلامێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خۆ ژ مەکەهێ ڤەدزی و بەر ب مەدینێ ڤە مشەختبوو، ل مەدینێ ئاکنجیبوو و مالا خۆ دانا ب رەخ مزگەفتا خۆ ڤە. و پشتی ئەو گەهشتییە مەدینێ، وی هنارتە ب دویڤ مرۆڤێن خۆ را ئەوێن ماینە ل مەکەهێ دا بێن و ب وی را بگەهن، کچا وی فاطما ئێک ژ وان بوو.. و فاطما دەمێ ژ مەکەهێ مشەختبووی ژییێ وێ هەژدە سال بوون.

ل مەدینێ فاطما د مالا پێغەمبەری دا بوو -سلاڤ لێ بن- و ژیيەکێ خۆش و تەنا د گەل بابێ خۆ و خویشکا خۆ یا مەزنتر بۆراند، بەلێ تشتێ دلێ وێ گڤاشتی ئەو بوو وێ دیت هندەک ژن -ل جهێ دەیکا وێ- هاتنە د ڤێ مالێ دا، راستە صەحابی خودان رەوشتەکێ پاک و بلند بوون و ب دلەکێ ساخ سەرەدەری د گەل ئێک و دو دکر، بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو ئەو ژی وەکی مە مرۆڤ بوون، و ب وێ دئێشان یا مرۆڤ پێ دئێشت، و ب وێ بێنتەنگ دبوون یا مرۆڤ پێ بێنتەنگ دبت.

ل مەدینێ پشتی موسلمانان جڤاکا خۆ دانای، پتر ژ صەحابییەکی دڤیا فاطمایێ بۆ خۆ بخوازت، و هندەک ژ وان ئاشکەرا ئەو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست بەلێ پێغەمبەری بەرسڤا وان نەددا؛ چونکی وی کربوو دلێ خۆ کو کچا خۆ فاطمایێ بدەتە پسمامێ خۆ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی.. و هەر چەندە عەلی مرۆڤەکێ فەقیر بوو ژی، و یێ بەردەست تەنگ بوو، بەلێ ئەو زەلامەکێ زانا و کارینەجهـ و نەرم و حەلیم بوو، وی جەرگێ شێران هەبوو، ترسێ قەت رێکا خۆ ل نک نەددیت.

دیرۆکڤان دبێژن: عەلی حێشترەک و هندەک هویر و مار هەبوون، وی ئەو هەمی ب چارسەد دەرهەمان فرۆتن و ئەو دەرهەم ل ژنئینانا خۆ خەرجکرن..

دەمێ فاطما چوویە د مالا عەلی دا، وێ مالێ ب تنێ ئەڤ ناڤمالییە تێدا هەبوو: تەختەک، دۆشەکەک، تستەکا سەرشویشتنێ، کونەکێ ئاڤێ، مۆخلەک، خاولییەک، پەرداغەک، دو دستار و دو جەرکێن ئاڤێ.. و دڤێت ژ بیر نەکەین مالا عەلی و فاطمایێ مەزەلکەکا ب تنێ ژی بوو!

ژ کورِ و کچێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فاطما ژ هەمییان پتر ب وی ڤە چووبوو، دەیکا موسلمانان عائیشا کچا ئەبووبەکری دبێژت: من نەدیتییە مرۆڤەک هندی فاطمایێ ب پێغەمبەری ڤە چووبت، خۆ رێڤەچوونا وێ ژی وەکی رێڤەچوونا وی بوو.

د سەر هندێ را پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەمی مرۆڤێن خۆ پتر حەز ژ فاطمایێ دکر، و هندی هند وی حەز ژێ دکر صەبرا وی نەهات فاطما پشتی شویکرنێ ژێ دویرکەفت؛ و چونکی مەزەلکا عەلی یا دویر بوو ژ مەزەلکا پێغەمبەری.. یان ژی بلا بێژین: مالا وی یا دویربوو ژ مالا پێغەمبەری، حارثێ کورێ نوعمانی مەزەلکەک هەبوو دکەفتە ب رەخ مەزەلکا پێغەمبەری و عائیشایێ ڤە، گاڤا وی زانی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێ نەخۆشە فاطما ژێ دویرکەفتی، ئەو رابوو گۆتە پێغەمبەری: ئەز دێ مەزەلکا خۆ دەمە عەلی بلا ئەو بێتە جهێ من و ئەز دێ چمە جهەکێ دی. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەیف ب ڤێ چەندێ هات و فاطما -د گەل زەلامێ خۆ- زڤرینە ب رەخ پێغەمبەری ڤە، و د ناڤبەرا مەزەلا عائیشایێ و فاطمایێ دا کولەکەک هەبوو. دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن-

ڕادبوو نڤێژا سپێدێ، سەرێ خۆ دبرە بەر کولەکێ و گازی عەلی و فاطمایێ دکر دا ڕابنە نڤێژێ.

هەر جارەکا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ شەرەکی یان هەر کارەکێ هەبیت ژ مەدینێ دەرکەفتبا، پاشی زڤڕیبا مەدینێ، وی ژ مالا فاطمایێ دەست پێ دکر، ئێکەمین جار ئەو دهاتە نک وێ، پاشی دچوو مالا خۆ، جارەکێ دەمێ ئەو زڤڕی وی دیت فاطمایێ دو بازنکێن زیڤی د گەل ڕستکەک و دو گوهارکان یێن کرینە بەر خۆ، و پاتەیەکێ ب دیواری ڤە هلاویستی.. گاڤا پێغەمبەری ئەو ب ڤی ڕەنگی دیتی ل سەر پێ خۆ زڤڕی، فاطمایێ تێ ئینادەر کو ئەو ژ بەر ڤی سەر و بەری یێ عێجزە، ئینا ئەو ڕابوو چەکێ خۆ یێ زیڤی ژ بەر خۆ کر، و پاتە ژی ژ دیواری ڤەکر، و هەمی پێکڤە هنارتنە نک پێغەمبەری، و گۆتە قاصدی: بێژێ کچا تە سلاڤان ل تە دکەت و دبێژتە تە: ڤان تشتان بلا د ڕێکا خودێ دا خەرج بکەت، گاڤا پێغەمبەری ئەڤ کارێ وێ دیتی کەیف پێ هات و گۆت: دنیا نە یا موحەممەدی و بنەمالا وییە!

فاطما د گەل زەلامێ خۆ ب فەقیری دژیا، هندەک ڕۆژ ب سەردا دهاتن ژ دانەکێ خوارنێ پێڤەتر ب دەست نەدکەفت، و ئەو دان ژی هندەک قەسپ بوون، یان پرتەکا نانێ ڕەق د گەل هندەک زەیتێ.. و ئەڤ حالە پتر جاران حالێ پێغەمبەری ب خۆ ژی بوو!

جارەکێ عەلی هاتە مال دیت فاطما ب دەستەکی یا دستاری دهێرت و ب دەستەکی یا بچویکێن خۆ ب ڕێڤە دبەت، ل وان ڕۆژا مالەکێ مەزن یێ خێرێ د دەستێ پێغەمبەری دا هەبوو، ئینا عەلی گۆتە فاطمایێ: ئەگەر تو بێژییە بابێ خۆ بلا هندەک پارا بدەتە تە دا خدامەکێ بۆ خۆ پێ بگری پیچەکێ هاری تە بکەت. فاطمایێ ب یا وی کر، گۆتە بابێ خۆ، بەلێ

بابێ وێ، مەزنێ دەولەتا ئیسلامێ، گۆتێ: ئەی فاطما! ب خودێ ئەز مالی نادەمە تە هندی خەلکێ بەرسفکێ (صوففەیێ) زکێ وان یێ برسی بت.. و خەلکێ بەرسفکێ فەقیر و ژارێن مەدینێ بوون ئەوێن بێ مال و حال ڤێجا دهاتنە بەرسفکا مزگەفتێ، ل وێرێ دنڤستن!

پشتی شویکرنا فاطمایێ ب سالەکێ خودێ کەرەم د گەل کر کورەک دایێ، گاڤا کورک بووی بابێ وی عەلی ناڤێ وی کرە (حەرب) پێغەمبەری -سلاف لێ بن- زێدە کەیف ب ڤی زارۆکی هات لەو زوی گۆت: کانێ کورێ من نیشا من بدەن، هەوە ناڤێ وی کریە چ؟ گۆتن: (حەرب).. وی گۆت: نە ئەو (حەسەنە).

ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا سییێ مشەختی، یەعنی: هەیڤەکێ بەری شەرێ (ئوحودێ) حەسەن هاتبوو سەر دنیایێ، و ل هەیڤا شەعبانێ ژ سالا دی، فاطمایێ کورەک دی بوو، پێغەمبەری -سلاف لێ بن- ناڤێ وی کرە حوسەین. ژ بلی (حەسەن) و (حوسەینی) فاطمایێ کورەکێ دی ژی بووبوو پێغەمبەری ناڤێ وی کر بوو (موحسن) بەلێ ئەڤ کورە هێشتا یێ ساڤا مربوو. و وێ دو کچ ژی هەبوون: (زەینەب) و (ئوم کولثووم) و دیارە وێ ناڤێن هەردو خویشکێن خۆ ڕاکربوون.

حەسەن و حوسەین ژ هەمی مرۆڤێن خۆ پتر ب پێغەمبەری ڤە چووبوون، ئەنەس -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: کەس هندی حەسەن و حوسەینی ب پێغەمبەری ڤە نەچووبوو.. پێغەمبەری -سلاف لێ بن- گەلەک حەز ژ وان هەردویان دکر لەو گەلەک جاران دچوو مالا فاطمایێ و وی ب دەستێ خۆ یێ پیرۆز خوارن ددا حەسەنی، و ل سەر سنگێ خۆ دهلاڤێت و دەمێ حەسەن ب سەر پییان کەفتی هندەک جاران ئەو دچوو مزگەفتێ ددیت پێغەمبەر -سلاف لێ بن- یێ چوویە سوجدێ ڤێجا دچوو ل پشتا

پێغەمبەری سویار دبوو و پێغەمبەری دل نەددا وی ژ سەر پشتا خۆ بدانت لەو وی سوجدا خۆ درێژ دکر!

ئەگەر جارەکێ دەنگێ گریبا وی هاتبا پێغەمبەری، ئەو دا بێژتێ: ئەڤ بچویکە بۆچی دگریت؟ ما تو نزانی گریبا وی من دئێشینیت.

هندەک جاران ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر مینبەرێ خوتبە دخواند، دا بینت هەردو نەڤییێن وی ب ژۆر کەفتن و دهلنگفتن، ئینا دا ژ سەر مینبەرێ ئێتە خوار و هەردووان هلگرت و بەتە نک خۆ دانتە سەر مینبەرێ، و دگۆت: خودێ ڕاست دبێژت: ﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾ (الأنفال: ٢٨).

ژیانەکا خۆش بوو، ڕاستە یا تژی فەقیری بوو، بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو چو جاران زەنگینی نەشێت دلخۆشییێ بۆ خودانی چێ کەت، مالەکا رحەت و تەنا بوو، ڕاستە مەزەلەکا ب تنێ بوو، ئەگەر مرۆڤی پیچەکێ خۆ بلند کربا سەرێ مرۆڤی دا ب بانی کەڤت، یان گەلەک خۆ ژێک ئینابادەر دا پییێن وی ب دیواری کەڤن، بەلێ د چاڤێن خودانان دا ئەو هند یا بەرفرەهبوو ژ دنیایێ هەمییێ فرەهتر بوو؛ چونکی دلەکێ فرەه ل هنداڤ بوو.. وەکی هەر مالەکێ هندەک جاران نەخۆشییێ سەرێ خۆ لێ هلددا، بەلێ چی گاڤا سوحبەت گەهشتبا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گاڤێ دا مسەلە ب دوومـاهی دهات! ئەرێ هوین چ دبێژن بۆ مالەکێ مالخۆیێ وێ عەلی بت و کابانی فاطما بت و مەزن پێغەمبەرێ خودێ بت؟!

سال هاتن و سال چوون.. نێزیک بوو دەه سال د سەر شویکرنا فاطمایێ ڕا ببۆرن، ژیێ وێ بەر ب سیه سالییێ ڤە دچوو، ب دورستی هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سالا یازدێ مشەختی هات، خەمەکا مەزن ب سەر

خەلکێ مەدینێ دا هات، سوحبەتا نساخییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبوو، مەسەلە گەهشتە هندێ پێغەمبەر کەفت، نەشیا خۆ ل سەر پییان بگرت، ل مەزەلا عائیشایێ هاتە دانان، گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کەفتی هنارتە ب دویڤ کچا خۆ را، عائیشا دبێژت: هەر جارەکا فاطما هاتبا مالا مە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب بەر ڤە دچوو و کەیفا خۆ پێ دئینا، بەلێ ڤێ جارێ وەکی هەر جار نەبوو، ئێشا گران ئەو ئێخستبوو، لەو وی ب دەڤی کەیفا خۆ ب فاطمایێ ئینا، و ژێ خواست کو بچت ل بەر سەرێ وی روینت، دیارە ب فاطمایێ بیرا وی ل خودانا دلێ فرەھ و روییێ گەش خەدیجایا مەزن دهاتەڤە.

پێغەمبەری دەڤێ خۆ برە بەر گوهێ فاطمایێ تشتەک بۆ گۆت، وێ کرە گری، پاشی تشتەکێ دی بۆ گۆت، وێ کرە کەنی، عائیشایێ پسیار ژێ کر: ئەرێ بابێ تە چ گۆتە تە؟

وێ گۆت: سررا پێغەمبەری ئەز ئاشکەرا ناکەم، عائیشا دبێژت: پشتی مرنا پێغەمبەری من داخواز ژ فاطمایێ کر کو وێ گۆتنا بابێ خۆ بۆ من بێژت، وێ گۆت: نۆکە ئەز دێ وێ بێژم.. جارا ئێکێ وی گۆتە من: مرنا من یا نێزیکبووی، ئینا ئەز گریم، جارا دویێ وی گۆتە من: بەری هەمی مرۆڤێن من تو دێ گەهییە من، ئینا ئەز کەنیم.

و وەسا چێبوو، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دووازدەی مەها (ربیع الأول)ێ مر و فاطما ل مەها رەمەزانێ مر، شەش مەها پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و د ناڤبەرا هەردویان دا کەس ژ مرۆڤێن پێغەمبەری نەمربوو. پێنج سالا بەری هاتنا ئیسلامێ فاطما بووبوو و ل سالا یازدێ مشەختی مربوو، یەعنی ژییێ وێ بیست و نەھ حەتا سیھ سالییێ بوو.

د حەدیسەکێ دا هاتییە کو چێترین ژنکێن دنیایێ فاطمایە، مەریەما کچا عیمرانی تێ نەبت، و ئێک ژ مەزنترین خێرێن وێ یێن کو چو خویشک و براێێن وێ پشکدارییا وێ تێدا نەکری ئەو بوو، وێ موصیبەتا مرنا بابێ خۆ دیت بوو، ب ڕاستی موصیبەتەکا هندا مەزن بوو ب ساناهی نائێتە وەصفکرن..

فاطمایێ هژمارەکا شعران ب ڤێ موصیبەتێ گۆتبوون، ئەو شعر هندێ دگەهینن کو فاطما زێدە زێدە ل سەر مرنا بابێ خۆ یا کۆڤاندار بوو، و حەقێ وێ بوو! و ژ لایەکێ دی ڤە ئەو هندێ دگەهینت کو ئەو ژنکەکا رەهوان و ب دەڤ و ئەزمان بوو، و ئەڤە ژی نە یا غەریبە چونکی ئەو کچا رەهوانترین مرۆڤی بوو. و فاطما ژنکەکا شاعر بوو، هەر چەندە ئەو شعرێن وێ یێن کو گەهشتینە مە گەلەک دکێمن ژی، و هەمی -یان بارا پتر- ل دۆر مرنا بابێ وێنە، بەلێ هەر چاوا بیت ئەو ژنکەکا شاعر بوو.

ژ بلی هندێ ژی فاطما ژنکەکا زێدە ب جەرگ ژی بوو، د گەل هژمارەکا دی ژ ژنکێن صەحابییان پشکداری د شەڕان دا دکر بۆ بەلاڤکرنا ئاڤێ و دەرمانکرنا بریندااران، و ل ڕۆژا (ئوحودێ) فاطمایێ د گەل زەلامێ خۆ عەلی برینێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرمان دکرن.

و ژ سالۆخەتێن فاطما پێ هاتییە ناسین: ڕاستگۆیی بوو، ئەو ژنکەکا ڕاست بوو، عائیشا دبێژت: مرۆڤەک ژ فاطمایێ ڕاستگۆتر من نەدیتییە بابێ وێ تێ نەبت! و فاطما -وەکی ئەو کەسێن دیتی دبێژن- ژنکەکا زراف بوو، یا زەعیف بوو، و ڕەنگێ وێ یێ ئەسمەر بوو، پیچەکێ ب سەر زەراتییێ ڤە دچوو.

دبێژن: جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرا وێ دا، ئەو یا نساخ بوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: کچا من تو یا چەوانی؟ وێ

گۆت: ئەز یا دئێشم.. پاشی ب شەرم ڤە گۆت: و ئێشا من پتر لێ دئێت؛ چونکی ئەز یا برسیمە و من چو نینە ئەز بخۆم.. چاڤێن پێغەمبەری تژی رۆندک بوون و گۆت: کچا من ما تە نەڤێت تو سەییدا ژنکێن جیهانێ بی؟!

بەلێ.. ئەڤە دەرسەکە ژ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن-، سەییداتییا جیهانێ ب ساناهی ب دەست مرۆڤی ناکەڤت!

جارەکا دی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوو نک فاطمایێ دیت کراسەک ژ هریا حێشتری یێ زڤر یێ د بەر و یا دستاری دهێرت، ب دلەکێ کسیرە ڤە گۆتێ: ئەی فاطما تام بکە نەخۆشییا دنیایێ دا ل ئاخرەتێ تام بکەیە خۆشییێ.

ئەڤە فاطما بوو، و ئەڤە بابێ وێ بوو ئەوێ هەر دەم دوعا ژ خودێ دکرن کو رزقێ وی و یێ بنەمالا وی هند بت تێرا ئەڤرۆ بکەت!

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری فاطما حەتا مری جارەکا ب تنێ تێ نەبت نەگرنژی بوو، ئەو جار ژی هنگی بوو دەمێ کەفتییە بەر مرنێ، هەڤالا وێ ئەسمائا کچا عومەیسی دبێژت: فاطمایێ سەرێ خۆ شویشت و گۆتە من: جلکێن من یێن نوی بۆ من بینە، ئینا وێ جلکێن خۆ یێن نوی کرنە بەر خۆ و پشتی هنگی ئەو کەفتە بەر سەکەراتێ، و گۆتە من: من باش بپەچنن، گۆت: دەمێ وێ دیتی مە ئەو باش پەچنی گرنژی و گۆت: هەوە ئەز ستارە کرم خودێ هەوە ستارە کەت.. و مر.

مرنا وێ ل شەڤا سێشەنبێ بوو سێیێ هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا یازدێ مشەختێ، و هەر وێ شەڤێ ل (بەقیعێ) ئەو هاتە ڤەشارتن.

# حەسەنێ کوڕێ عەلی

سەروەرێن جحێلێن خەلکێ بەحەشتێ، ئیمامێن ئوممەتێ و بابێن ئیمامان، هێڤێنێ ئێکێ یێ (آل البیت)، هەردو رحانێن باپیرێ خۆ: حسەن و حوسەین، کوڕێن فاطمایێ و عەلی، سەرکێشێن ئێکەمین کاروانێ خۆگۆریکرنێ د دیرۆکا بنەمالا پاک دا..

بەری نوکە -دەمێ مە بەحسێ دەیکا ئیمامان فاطمایێ کری- مە ب کورتی ئیشارەت دا وێ مالا پیرۆز یا کو حسەن و حوسەین تێدا مەزنبووین و هاتینە پەروەردەکرن، و مە دا خویاکرن کانێ چاوا ئەو مالەک بوو ل سەر بناخەیێ باوەرییێ هاتبوو ئاڤاکرن و ل سەر (مەبدەئێ) خۆگۆریکرنێ هاتبوو ڕاگرتن.. دەرسێن ئێکێ یێن قوربانیدانا د ڕێکا دینێ خودێ دا ڤان هەردو تیشکە شێران ژ باپیرێ خۆ، پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- وەرگرتبوون، پاشی ژ دەیکا خۆ فاطمایێ و بابێ خۆ ئیمامێ شەهید عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی.. و ئەوێ ل سەر دەستێ ڤان توخمە مرۆڤان مەزن ببت و ب دەستێ وان فێر ببت تە دڤێت یێ چاوا بت؟

نوکە حەتا ڕێ پتر ل بەر مە یا روهن و ئاشکەرا بت، کەرەم کەن دا پێکڤە قستا بازێرێ مەدینێ بکەین، و ب دورستی ل مالا فاطمایێ ئامادە ببین، دا د گەل خەلکێ ڤێ مالێ د وان دەلیڤان دا بژین یێن کەیف تێدا ب سەر وان دا هاتی، دەمێ خودێ لێ هاتییە کەرەمێ و مال ب شوینوارەکێ پیرۆز ئاڤاکری.

جهـ: وەكى مـە گۆتى بـاژێڕێ مەدينێيـە، ل مـەزەلكا فاطـمـايێ، ئـەوا دكەفتە تەنشتا مزگەفتا پێغەمبەرى، ب رەخ مەزەلكا عائيشايێ ڤـە، جهێ نوكە پيرۆزە زيارەتێ پيغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- دكەفتێ.

دەم: سالا سييێ مشەختييە، هەيڤا رەمەزانێ، دورست سالەكێ پشتى شەڕێ بەدرێ، و هەيڤەكێ بەرى شەڕێ ئوحودێ.

ل رۆژا پازدێ ژ هەيڤا رەمەزانێ، مزگينى گەريا كو فاطـمايێ كورەك يێ بووى، هەر كسەكێ گوهـ ل ڤێ مزگينييێ بووى كەيفا وى گەلەك هات، بەلێ يێ ژ هەمييان پتر كـەيف ب ڤـێ مزگينييـێ هـاتى پێغەمبـەرێ خودێ بوو -سلاڤ لێ بن- ئەوێ هنگى ژييێ وى بەر ب پێنجى و شـەش سـاليێ ڤە دچوو.

پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- داخواز كر نەڤييێ وى بيننە نـك دا بـەرێ خۆ بدەتێ، ئێكەمـين جار پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- پسيارا ناڤێ وى كـر، هندەكا گۆتێ: عەلى ناڤێ وى يێ كرييە (حەرب) ئينا گۆت: نـە، نـاڤێ وى دێ (حسەن) بت. پاشى پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- د گوهى دا بانگ دا.

هـەر ژ سـەرى ديـاربوو كـو حسـەن دێ ب پێغەمبـەرى و دەيكـا خـۆ فاطـمايێ ڤە چت، نە كـو ب بـابێ خۆ عـەلى ڤـە، لـەو دەمـێ هێژ ئـەو يێ ساڤا دەيكا وى فاطـمايێ ئەو دهلاڤێت و شعرەك پێ دگۆت، تێدا دگۆت: كورێ من يێ ب پێغەمبەرى ڤە چووى و ب عەلى ڤە نەچوويە.

وەكى بەرى نوكە ژى مە گۆتى: پێغەمبـەرى -سـلاڤ لـێ بـن- گەلـەك حەز ژ حسـەنى دكر لـەوا گەلـەك جاران وى ب خـۆ ب دەسـتێ خۆ خوارن ددايـێ، و ددانـا ب رەخ خـۆ ڤـە ل سـەر مينبـەرێ دەمـێ خوتبـە دخوانـد، و هندەك جاران گاڤا ئەو دچوو سوجدێ حسەن دچوو سەر پشتێ، ڤێجا ئـەوى زوى سەرێ خۆ ڕانەدكر دا دلێ حسەنى نەمينت.

یازده هەیڤا پشتی بونا حسەنی، یەعنی ل هەیڤا شەعبانێ ژ سالا چارێ مشەختی، خودێ کورەکێ دی دا فاطمایێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وی کرە حوسەین، و وەکی حسەنی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک حەز ژ حوسەینی ژی دکر، و هندەک جاران ئەو دا هەردویان دەتە بەر سنگێ خۆ و بێژت: ئەڤ هەردویە کورێن منن، هەچییێ حەز ژ وان بکەت ئەو وی حەز ژ من کر.

حوسەین ژی گەلەک ب پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- چووبوو، بەلێ حوسەین ب بەژنێ ڤە و حسەن ب سەر و چاڤان ڤە.

دەمێ پێغەمبەر و فاطما -سلاڤ لێ بن- چوونە بەر دلۆڤانییا خودێ، حسەن و حوسەین دفاما بوون، حسەن یێ هەشت سالی بوو و حوسەین یێ حەفت سالی بوو، لەو هەردو ژ صەحابییێن بچویک دئێنە هژمارتن، ژ تەخەیا پێنجێ، وەکی (ابن عباس) و (ابن الزبیر)ی و گەلەکێن دی.

حسەنی هندەک حەدیس ژ باپیرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- ب رەنگەکێ ئێکسەر ڤەگوهاستینە، و وی د گەل برایێ خۆ حوسەینی هژمارەکا دی یا حەدیسان ژ صەحابییێن ژ خۆ مەزنتر ڤەگوهاستینە.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویە بەر دلۆڤانییا خودایێ خۆ، و موسلمان هەمی ل سەر خیلافەتا ئەبووبەکری کۆمبووین، حسەن و حوسەین هەردو دبچویک بوون، عوقبەیێ کورێ حارثی دبێژت: پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب چەند رۆژەکان ئەز د گەل ئەبووبەکری ژ نڤێژا ئێڤاری دەرکەفتم، عەلی ژی د گەل مە بوو، مە حسەن دیت د گەل بچویکان یاری دکرن، ئینا ئەبووبەکر ب نک ڤە چوو و ئەو هلگرت دانا سەر ملێن خۆ و گۆت: وەکی پێغەمبەرییە وەکی عەلی نینە، و عەلی دکەنی.

پشتی مرنا فاطمایێ عەلی چەند ژنەکێن دی ئینابوون و هژمارەکا کوڕ و کچان هەبوون، بەلێ سەرێ کەسێ ژ وان ب سەر عەیالێن فاطمایێ نەدکەفت.

ل سەر دەمێ ئەبووبەکری و عومەری، حسەن و حوسەین و بابێ وان عەلی ل مەدینێ دژیان، و عەلی ئێک ژ زاناترین مرۆڤان بوو یێن گەلەک جاران هەردو خەلیفان پسیارێن خۆ پێ دکرن.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەری ژ دنیایێ وەغەر بکەت وەصیەت نەکربوو ئێک ل جهێ وی ببتە خەلیفە، لەو دەمێ ئەو مری موسلمان د ناڤبەرا خۆ دا ب خیلاف چوون ل سەر سێ بۆچوونان:

١- هندی خەلکێ مەدینێ بوون گۆتن: ئەم ئەنصارینە دڤێت مەزنی د دەستێ مە دا بت.

٢- مشەختان گۆت: ئەم موهاجرینە، ئەم فەرترین خەلیفە ژ مە بت.

٣- ئیمام عەلی گۆت: یا باشتر ئەوە خەلیفە ژ بنەمالا پێغەمبەری بت -سلاڤ لێ بن- دا خەلک هەمی خۆ بێخنە بن دەستی.

پاشی هەمی ل سەر هندێ کۆمبوون کو چێترینێ ئوممەتێ پشتی پێغەمبەری ئەبووبەکرە، و دڤێت ئەو ببتە خەلیفە، و هەمی پێکڤە ل سەر ڤێ چەندێ رازیبوون، بەری ئەبووبەکر بمرت وی وەصیەت کر کو عومەر پشتی وی ببتە خەلیفە، و ب ڤێ چەندێ ئەبووبەکری دا زانین کو دورستە خەلیفە مرۆڤەکی پشتی خۆ بۆ خیلافەتێ هلبژێرت، بەلێ ب شەرتەکی ئەو مرۆڤەکێ ب کێر هاتی بت.

خەلک هەمی ب عومەری رازی بوون، عومەری ژی دەمێ خۆ بۆراند، و گاڤا ئەو هاتییە برینداركرن و بەری بمرت عومەری گۆت: ئەگەر ئەز کەسێ نەدانمە شوینا خۆ، ئێکێ ژ من چێتر یێ وە کری، و مەخسەدا وی

پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن-، و ئەگەر ئەز ئێکی بدانمە شوینا خۆ ئێکێ ژ من چێتر یێ وە کری، و مەخسەدا وی ئەبووبەکر بوو، بەلێ ئەز دێ تشتەکێ دی کەم.. پاشی عومەری شەش مرۆڤ هلبژارتن، ئەو هەر شەش ژ وان دەهـ کەسان بوون یێن مزگینی ب بەحەشتێ بۆ هاتییەدان، ئەو ژی ئەڤە بوون: عوثمان، سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی، عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی، طەلحە، زوبەیر، عەبدررەحمانێ کورێ عەوفی.

عومەری گۆت: ئەز کەسێ ژ ڤان هەر شەشان چێتر نابینم، ڤێجا گەلی موسلمانان ئێکی ژ وان بۆ خۆ هلبژێرن.. و ئەو بوو وان عەبدررەحمانێ کورێ عەوفی هلبژارت، و عەبدررەحمانی گۆت: ئەز نە یێ ڤی کاریمە، بلا عوثمان ل شوینا من بت، موسلمان ب گۆتنا وی رازیبوون.. و عومەر ژی چوو نک خودایێ خۆ.. و بەری ئەم خۆ ڤەگوهێزینە خەلیفێ سییێ، سەرهاتییەکا هەی ب تنێ بۆ عیبرەت من دڤێت بۆ هەوە ڤەگوهێزم:

عوثمان بوو خەلیفە، و وی دوازدە سالان حوکم کر، شەش سالێن ئێکێ ئوممەت یا رحەتبوو، پشتی شەش سالان، و ژ بەر گەلەک ئەگەران -پاشی پشتی دەلیڤەیەکا دی دێ بەحس ژێ کەین- هندەک کەس دژی عوثمانی رابوون، و مەسەلە گەهشتە هندێ وان خۆ دانە ئێک و کرنە دلێ خۆ بچن ب سەر مەدینێ دا بگرن، و عوثمانی ب کوتەکی بێخن، دەمێ موعاویەی ئەڤ چەندە زانی، و هنگی ئەو والییێ شامێ بوو، عومەری ئەو کربوو والی، لەشکەرەک لێکدا و هاتە مەدینێ، و گۆتە عوثمانی تشتەکێ هۆسا من یێ گوهـ لێ بووی، ئەز یێ هاتیم دا بەرەڤانییێ ژ تە بکەم، عوثمانی گۆتێ: لەشکەرێ تە بێهنا خەلکێ مەدینا پێغەمبەری یێ تەنگ کری، بزڤرە جهێ خۆ.. موعاویە نەچاربوو زڤری، و ئەو چێبوو یا موعاویە ژێ دترسیا؛ فتنەچی ب لەشکەرێ خۆ ڤە هاتنە د مەدینێ دا و عوثمان

د مالا وی ڤە موحاصرەکر، و گەفێن کوشتنێ لێ کرن ئەگەر دەستی ژ خیلافەتێ نەکێشت، عوثمانی ب یا وان نەکر و گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتبوو من: خودێ کراسەکی دێ کەتە بەر تە هندەک دێ ئێن دا ژ بەر تە بکەن تو گوهێ خۆ نەدە وان.

د وان ڕۆژان دا مەدینە د حالەکێ زێدە نەخۆش دا دژیا، عوثمان نەدشیا ژ مالا خۆ دەرکەڤت، بابێ حسەنی عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی، هەردو کوڕێن خۆ حسەن و حوسەین هنارتنە بەر دەرگەهێ عوثمانی دا زێرەڤانییێ لێ بکەن، و نەهێلن کەس نەخۆشییێ بگەهینتە عوثمانی.. هنگی ژییێ حسەنی نێزیکی سیهـ و دو سالان بوو، جارەکێ عوثمان هاتە بەر دەری حسەن و حوسەین دیتن، گۆتێ: هوین ل ڤێرێ چ دکەن؟ وان گۆت: ئەم یێن هاتین زێرەڤانییێ ل تە بگرین.. وی نەرازیبوونا خۆ دیارکر و گۆت: بزڤڕنە مالا خۆ، سویاهی ئەز دێ چ بێژمە باپیرێ هەوە ئەگەر گۆت: تە هەردو نەڤییێن من بۆ خۆ کربوونە زێرەڤان؟

هەردو زڤڕین و گۆتنە بابێ خۆ: حال و مەسەلێن عوثمانی ئەڤەنە.. عەلی گۆت: هەرن زێرەڤانییێ لێ بگرن بێی ئەو پێ بحەسییێت.

مەخسەدا عەلی ئەو بوو گۆت: ئەگەر هندەکان ڤیا بچنە عوثمانی ژی ژ بەر نەڤییێن پێغەمبەری بستە ناکەن بچن.

هندەک صەحابییێن دی ژی وەکی: (طەلحە) و (زوبەیری) کوڕێن خۆ هنارتنە بەر دەرگەهێ مالا عوثمانی، گاڤا فتنەچییان ئەڤ چەندە دیتی ترسیان مەسەلە ژ دەستێ وان دەرکەفت ڕابوون هندەک تیر د دەرگەهی وەرکرن حسەن برینداربوو، و خوین ما ب سەر و چاڤان ڤە، وان گۆت: خەلک حسەنی هۆسا ببینن دێ دژی مە ڕابن، ئینا ئەو چوون ل پشتا مالا عوثمانی دیوار سمت و چوونە ژۆر عوثمان کوشت، ژنکا عوثمانی چوو سەر

بـانی و کـره هـموار، خـهلک د هـمواریٚ هـاتن، عـهلی هـات وهکـی دینـان، کولمـهک ل نـاڤ چـاڤێن حسـهنی دا و مسـتهک دانـا سـنگێ حوسـهینی و ئاخفتنێن زڤر گۆتنه یێن دی، و گۆت: مه بۆ چ هوین دانابوونه ڤێریٚ؟

عهلی -ب زانینا خۆ یا بهرفرهه- تێگههشت کـو کـوشتنـا عوثمانی ب ڤی رهنگی دێ دهرگـههێ فتنـهکا مـهزن د نـاڤ ئومـمـهتێ دا ڤهکـهت لـهو هنده قههری.

ئهو صهحابییێن ل مهدینێ ههمی چوونه نک عـهلی و گۆتـنـێ: کـهس ژ تـه پێڤـهتر ب کێر خـهلیفاتییێ نائێت، عـهلی ل بـهر نـههات، بـهلێ ئـهو گـهلـهک مـانـه پێڤه و گۆتنێ: چێ نابت خهلک بمیننه بێ ئـهمیر، و کـهس ژ ته پێڤهتر ب کێر ڤی کاری نائێت، ئینا عهلی قانع بوو!

ل ههیڤا (ذو الحجه) ژ سالا (٣٥)ێ مشـهختی، موسلمانان بهیعـه دا ئیمـام عـهلی، و عـهلی ئێکـهمین خهلیفـه بـوو ژ بنـهمالا هاشـمییان حـوکم وهرگرتی.

نێزیکی پێنج سالان عـهلی حوکم کـر، د ڤـان هـهر پێـنج سـالان دا وی رحــهتی نــهدیت ژ بــهر وێ دوبــهرهکییا د ناڤبــهرا وی و هــهڤرکێن وی دا چێبووی سهرا کوشتنا عوثمانی، حهتا دووماهییێ ئهو ب خۆ ژی ب دهستێ خهوارجان هاته کوشتن، ل ههڤدهی رهمهزانا سالا (٤٠)ێ مشـهختی.

عــهلی ل بــاژێرێ کووفــه هاتــه شــههیدکرن، حسـهن و حوسـهینی و پسمامێ وان عهبدللاهێ کـورێ جـهعفـهری ئـهو شویشت و حسـهنی نڤێـژ ل سهر کر، و ب شهڤێ ل جههکێ بهرزه هاتـه ڤهشـارتن ژ ترسێن خـهوارجان دا؛ کو قهبرێ وی هلکۆلن!

دبێژن: بهری عـهلی شـههید ببت دوعایـهک کریـوو و گۆتبـوو: ((**اللهم ابدلني بهم خيرا لي منهم، وأبدلهم بي شرا لهم مني**)) هندی هند وان

بێهنا وی تەنگ کربوو، وی گۆت: یا رەبی هندەکێن ژ وان چێتر بۆ من ب وان بگوهۆرە، و ئێکێ ژ من خرابتر بۆ وان ب من بگوهۆرە!

و وەسا چێبوو!

سوحبەتا مە ل دۆر حسەنییە، مە دڤێت بێژین: هندی بابێ حسەنی یێ ساخ، حسەن ل بن ئەمرێ وی بوو، ب گۆتنا وی دکر و فەرمانا وی ب جهـ دئینا، و هندی عەلی یێ ساخ، حسەن و حوسەین ل رێزا دویێ بوون، گاڤا عەلی چووی، و هنگی ژییێ حسەنی سیهـ و حەفت سال بوون، حسەن هاتە پێش.. خەلکێ کووفە گۆتە حسەنی: تو ل شوینا بابێ خۆ ببە خەلیفە. و دئێتە زانین کو عەلی وەصیەت ب کەسێ نەکربوو کو پشتی وی ببتە خەلیفە.

ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا (٤٠) مشەختی حسەن بوو خەلیفە، و ب نەصا وێ حەدیسا دورست ئەوا دبێژت: ((الْخِلَافَةَ بَعْدِي ثَلَاثُونَ سَنَةً)) یەعنی: خیلافەت پشتی من سیهـ سالن. حسەن ژی دئێتە هژمارتن خەلیفە، و حسەن خەلیفێ راشدی یێ پێنجێیە.

شەش هەیڤان حسەنی حوکم کر، ژ رەمەزانا سالا (٤٠) حەتا (ربیع الأول)ێ ژ سالا (٤١)ێ، ل ڤێ هەیڤێ و ب دورستی سیهـ سالان پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی تەنازول بۆ موعاویەیی کر، و وی ل سەر موعاویەیی کرە شەرت خەلکی هەمییێ عەفی کەت، و پشتی وی موسلمان ب کەیفا خۆ خەلیفەکی بۆ خۆ هلبژێرن.. و موعاویە ل بەر هات!

خەلکێ کووفە ئەوێن خۆ ب تاگیرییا عەلی دئینادەرێ ئەو ئینا سەرێ عەلی یا ئینایە سەری، و پشتی ئەو شەهید بووی وان ئێکا مەزنتر ئینا سەرێ حسەنی، حەتا دووماهییێ ئەو گلدکا ل بن وی ژی ژێ دزی!

حسەنی زانی کو ئەڤ مرۆڤە نە یێن هندێنە مرۆڤ پشتا خۆ پێ گەرم بکەت، ئەو بوو وی هنارتە ب دویڤ موعاویەیی ڕا ل شامێ و خیلافەت دایێ، و خەلکێ کووفە ژی موبایەعا موعاویەیی کر، و ب دەستێ حسەنی فتنە ژ ناڤ ئوممەتێ ڕابوو لەو ناڤێ وێ سالێ -سالا ٤١ ێ - کرنە: سالا کۆمبوونێ (عام الجماعة).

پشتی موسلمانان هەمییان موبایەعا موعاویەی کری، و حسەن و حوسەین ژی ژ وان بوون، موعاویە چوو شامێ و حسەن د گەل بنەمالا خۆ زڤڕی مەدینێ.

حسەنی ب ڤی کارێ خۆ ڕاستییا گۆتنا باپیرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا دەمێ بەحسێ حسەنی کری و گۆتی: ((إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللّٰه تعالى أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ))یەعنی: کوڕێ من ئەڤە سەییدە (سەروەرە) و بەلکی خودێ ب وی دو کۆمێن ڤێ ئوممەتێ پێک بینت.

ژ لایەکێ دی ڤە وی دا زانین کو دورستە بۆ خەلیفەی تەنازولێ بکەت ئەگەر دیت مەصلحەتەکا مەزن یا د ڤێ چەندێ دا هەی.

دەمێ حسەنی تەنازولکری لەشکەرێ وی چل هزار زەلام بوون، ب سەرکێشییا (قەیسێ کوڕێ سەعدێ کوڕێ عوبادەی)، و ئەگەر حسەنی ڤیابا دشیا ب ڤی لەشکەری بەرهنگارییا موعاویەی بکەت، بەلێ حسەن ب تبیعەتێ خۆ مرۆڤەکێ ئاشتیخواز بوو، نەدڤیا ببینت خوینا موسلمانان بێتە ڕێتن، تەنازول ژ حەقێ خۆ کر ب تنێ دا ڕێزا موسلمانان جارەکا دی ببتە ئێک؛ دا لەشکەرێ موسلمانان ل شوینا ب ئێک و دو ڤە مژویل ببن جارەکا دی دەست ب بەلاڤکرنا ڕۆناهییا ئیسلامێ بکەن.

گەلەک کەس -ژ هەڤالێن حسەنی- هەبوون ب ڤی کارێ وی درازی نەبوون، وان هزر دکر ئەڤە بۆ وان کێماسییە، و ئێک ژ وان حوسەین ب خۆ

بوو، حوسەینی گۆتێ: خوزی من تو د خانییەکی ڤە گرێدابای و دەرگەهـ حشکێ ل تە گرتبا و من نەهێلابا تو دەرکەڤی حەتا من ئەو کربا یا من دڤێت!

بەلێ حسەنی گوهێ خۆ نەدا وان و ئاشتی ل سەر وان فەرکر.. پشتی پێکهاتنێ، حسەن هاتە بازێرێ باپیرێ خۆ و ل وێرێ ئاکنجی بوو، حەتا مرنا وی ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سالا (٥٠) مشەختی.

نەهـ دەهـ سالەکان پشتی (عام الجماعە) حسەن ما زێندی، و د ڤان سالان دا ئەوی ژییێ خۆ ب تەناهی بۆراند، وی و برایێ خۆ حوسەینی حەلەقەکا علمی ل مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبوو، ب سەدان و بەلکی ب هزاران خەلک لێ کۆم دبوون، و زانین بۆ خۆ ژێ وەردگرت، و گەلەک جاران صەحابییێن ژ حسەنی مەزنتر ژی دچوونە نک دا حەدیسان ژێ ریوایەت بکەن، وەکی عائیشایێ.. و ژ تابعییان: کورێ وی حسەن، و ئبن سیرین، و ئیمامێ شەعبی، و گەلەکێن دی.

هەر سال موعاویەی بارەکێ مەزن ژ دیارییان د گەل هژمارەکا مەزن ژ پاران بۆ حسەن و حوسەینی و (آل البیت) دهنارتە مەدینێ، رۆژەکێ دەمێ موعاویەی کاروانێ دیارییان بۆ صەحابییان دورستکری دا بهنێرتە مەدینێ، گۆتە هەڤالێن خۆ:

((ئەگەر هەوە بڤێت ئەز دێ بۆ هەوە بێژم کانێ هەر ئێک دێ چ ل ڤی مالی کەت، هندی حسەنە هندەکێ دێ بۆ ژنکێن خۆ هێلت پاشی یێ مای هەمییێ دێ ل سەر خەلکێ دەور و بەرێ خۆ بەلاڤ کەت، هندی حوسەینە دێ ژ وان ئیمامان دەست پێ کەت یێن بابێن وان ل رۆژا (صفینێ) هاتینە کوشتن، د گەل بابێ وی، و ئەگەر تشتەک ما دێ حەیوانان پێ سەر ژێ کەت و شیری پێ کرت و دەتە خەلکی)).

ئەڤ شاهدەیە مەزنترین شاهدەییە ژ لایێ موعاویەی ڤە -خودێ ژێ رازی بت- بۆ حەسەن و حوسەینی کو بەرێ وان ل مالێ دنیایێ نەبوو و دەستێ وان بۆ دانا خێرێ یێ ڤەکری و درێژبوو، و ئەڤە یا عەجێب نینە ما ئەو نە کورێن فاطمایێ و عەلینە؟ ما نە بەرهەمێ دارا پێغەمبەرینییێنە؟

مەردینییا حەسەنی گەهشتبوو پێکەکێ وی بێ پسیار مالێ خۆ پێشکێش دکر، جارەکێ حەسەن د بەر مرۆڤەکی را چوو وی دوعا دکرن و دگۆت: یا رەبی تو دەهـ هزاران بدەیە من، ئینا حەسەن چوو مال دەهـ هزار د گەل مرۆڤەکێ خۆ بۆ وی هنارتن.

گەلەک جاران مەسەلە دگەهشتە هندێ حەسەنی مالێ خۆ هەمی دئینا و ب نیڤی دکر، نیڤەک دکرە خێر و نیڤەک بۆ عەیالێ خۆ دهێلا، حەتا ئەگەر وی دو نەعال هەبان ئێک دکرە خێر، و هندەک جاران ژی مالێ خۆ هەمی دکرە خێر و چو بۆ خۆ نەدهێلا، و بابێ وی عەلی ژی یێ وەسا بوو.

باوەرییا حەسەنی ب خودێ، و رازیبوونا وی ب وێ قەدەرا خودێ بۆ وی دانایی گەلەک ژ هندێ مەزنتر بوو ئێکێ وەکی مە بەحس ژێ بکەت.. کێم کەس هەنە باوەرییا وان بگەهتە پێکەکێ وەسا ب قەدەرا خودێ رازی ببت کو حەز نەکەت ب رەنگەکێ دی بێتە گوهارتن.. جارەکێ مرۆڤەکی گۆتە حەسەنی: ئەبووذەر دبێژت: ل نک من فەقیری ژ زەنگینییێ خۆشترە، و نساخی ژ ساخییێ خۆشترە. حەسەنی گۆت: خودێ رەحمێ ب ئەبووذەری ببەت، هندی ئەزم ئەز دبێژم: هەچییێ خۆ بهێلتە ب هیڤییا هلبژارتنا خودێ ڤە خوزییێ راناهێلت کو د حالەکێ دی دا بت ژ بلی وی حالی یێ خودێ ئەو کرییە تێدا، و ئەڤەیە حەددێ رازیبوونا ب قەدەرێ.

تشتەکێ دی یێ حەسەن پێ هاتییە ناسین ئەو بوو: وی گەلەک ژن دئینان هەیامەکێ دمانە ل نک و وی ئەو بەرددان.. جەعفەرێ کورێ

موحەممەدی ژ بابێ خۆ ڤەدگوهێزت، دبێژت: عەلی گۆتە خەلکێ کووفە: گەلی خەلکێ کووفە ژنا نەدەنە حسەنی، هندی حسەنە زەلامەکە ژنان بەردەدەت، ئینا زەلامەکێ هەمەدانی گۆت: ب خودێ دێ هەر ژنان دەینێ یا وی ڤیا بلا بگرت و یا وی ڤیا بلا بەردەت!

ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سالا (٥٠) مشەختی ل باژێرێ مەدینێ حسەن چوو بەر دلۆڤانییا خودێ پشتی هاتییە ژەهردان.

دبێژن: بەر هنگی حسەنی خەونەک دیتبوو، وی دیت هەر وەکی سوورەتا (قل هو الله أحد) ل سەر ئەنییا وی یا نڤیسییە، کەیفا مرۆڤێن وی ب ڤێ خەونێ هات، هندەکان ئەو خەون بۆ سەعیدێ کورێ موسەییبی گۆت: ئینا سەعیدی گۆت: ئەگەر خەونا وی یا ڕاست بت عەمرێ وی گەلەک نەمایە.

ئەو بوو پشتی هنگی ب چەند ڕۆژەکان هندەکان ژەهر بۆ کرە د ناڤ خوارنا وی دا، گاڤا حسەن کەفتییە بەر مرنێ، برایێ وی حوسەین هاتە نک، گەلەک ما پێڤە دا بێژتێ کانێ ئەو شکێ ژ کێ دبەت کو ئەو ژەهر دابت، حسەنی گۆتێ: بۆچییە؟ دا پێش مـن ڤە وی بکوژی؟ گۆتێ: ئە! حسەنی گۆت: ئەگەر ئەو بت یێ ئەز هزر دکەم خودێ تێرا هەیە، و ئەگەر نە، مـن نەڤێت چو بێ گونەهـ پێش مـن ڤە بێنە کوشتن.. ژ ڤێ گۆتنا حسەنی دئێتە زانین کو ئەوی ب خۆ ژی ب دورستی نەدزانی کانێ کێ ئەو ژەهردایە..

ل ڤێرێ دێ بێژین: هندەک کەسێن نەڤیانا صەحابییان بۆ خۆ کرییە دین، و ئەزمان درێژییا د دەرحەقا صەحابییان دا بۆ خۆ کرییە تبیعەت، وەکی هەر جار ل ڕێکا درەوێ دبەزن و دبێژن: موعاویە د پشت ژەهردانا حسەنی ڕایە. ئەڤ گۆتنا وان یا کەچ ژ دلێن وان یێن ئێشەوی و تژی کین

دەردکەفت.. جارێ یا **ئێکێ:** ئاشکەرایە کو چو ریوایەت ب رێکێن دورست نەهاتینە وی کەسی دەسنیشان بکەن یێ ب تاوانا ژەهردانا حسەنی رابووی، و ل نک مە موسلمانان تاریخ ب رێکا ریوایەتێن دورست دئێتە وەرگرتن نەکو ب رێکا شرۆڤەکرنێن شەخصی، یان هزر و بۆچوونێن ڤی و وێ هە.

یا **دویێ:** حوسەینی ب خۆ نەدزانی کێ برایێ وی ژەهر دایە، و حەتا حوسەین مری ژی کەسێ ژێ گوهـ لێ نەبوو ئەوی ئێک ب ڤێ تاوانێ گونەهبار کریت، ڤێجا نزا چاوا حوسەینی نەدزانی و ئەوان پشتی هنگی ب سەدان سالان زانی؟!

یا **سییێ:** موعاویە صەحابی بوو، و ئێک ژ نڤیسەرێن وەحییێ بوو، و یا بەرعەقل نینە ئەڤ کارە ژ وی چێ ببت ب تایبەتی پشتی حسەن چووی ل مالا خۆ روینشتی و وی و بنەمالا خۆ موبایەعا وی کری.

یا **چارێ:** هەمی زانا و دیرۆکنڤیسێن موسلمان یێن (موعتەبەر) وەکی: ئیمام ئەحمەد و ئبن تیمیە و ئبن کەثیری و گەلەکێن دی، ئەڤ بێبەختییە درەو دەرێخستییە و موعاویە و کورێ وی یەزید ژ ڤێ گونەهێ دویرکرینە.

دبێژن: گاڤا حسەن کەفتییە بەر مرنێ، حوسەینی گۆتێ: ما تو ژ چ دترسی؟ تو دێ چییە نک پێغەمبەرێ خودێ، و عەلی و ئەو هەردو بابێن تەنە، و نک خەدیجایێ و فاطمایێ و ئەو هەر دو دەیکێن تەنە، و نک حەمزەی و جەعفەری و ئەو هەردو مامێن تەنە. ئینا حسەنی گۆت: ئەی برا، ئەز دێ چمە د ناڤ ئەمرەکی ژ ئەمرێن خودێ دا چو جاران ئەز نەچوویمە د ناڤ ئەمرەکێ وەکی وی دا، و هندەک چێکرییێن خودێ دێ بینم من چو جاران یێن وەکی وان نەدیتینە!

پاشی وی گۆت: برایێ من، هندی بابێ ته بوو بەر ل ڤی کاری بوو -یەعنی خیلافەتێ- بەلێ خودێ ئەو دا ئەبووبەکری، و وی پشتی خۆ دا عومەری، و ڕۆژا مەسەلە بوویە (شوورا) وی باوەر نەدکر دێ بۆ ئێکێ دی بت ژ بلی وی، بەلێ ئەو گەهشتە عوثمانی، گاڤا عوثمان هاتییە کوشتن موبایەعا عەلی هاتەکرن، پاشی هەڤڕکییا وی هاتەکرن، و بۆ وی ب تنێ نەما، ڤێجا ئەز دبێژم خودێ پێغەمبەراتییێ و خیلافەتێ ل نک مە کۆم ناکەت، ئێدی وە نەبت بێ عەقلێن کووفە تە دەربێخن.. و من ژ عائیشایێ خواست بوو کو دەستویرییێ بدەت ئەز ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێمە ڤەشارتن و وێ گۆتبوو بلا، ڤێجا ئەگەر ئەز مرم جارەکا دی ژێ بخوازە، و ئەز هزر دکەم ئەو -یەعنی مەروان و زەلامێن وی- ناهێلن، ڤێجا ئەگەر وان نەهێلا ل دویڤ وان درێژ نەکە.

پشتی حەسەن مری، حوسەین چوو نک عائیشایێ، عائیشایێ گۆت: بلا سەر چاڤان! بەلێ مەروانی نەهێلا، ئینا حوسەینی و هەڤالێن خۆ دەست دا شیرێن خۆ، ئەبوو هورەیرە چوو بەراهییێ و ئەو زڤڕاندن دا چو فتنە چێ نەبن.

ئینا حوسەین هاتەبرن بۆ بەقیعێ، و ب رەخ دەیکا وی فاطمایێ ڤە هاتە ڤەشارتن، و ڕۆژا مرنا وی ل پێنجی هەیڤا (ربيع الأول)ێ بوو ژ سالا پێنجییێ و ژییێ وی دەمێ مری چل و حەفت سال بوون.

هەڤالەکێ حەسەنی دبێژت: دەمێ حەسەن کەفتییە بەر مرنێ وی گۆت: جهێ من دەربێخنە حەوشێ، پشتی جهێ وی دەرێخستی وی گۆت: ((اللهم إني أحتسب نفسي عندك فإني لم أصب بمثلها غير رسول الله صلى الله عليه وسلم)).

پشتی مرنا حەسەنی، حوسەین بوو مەزنێ (آل البيت).

# حوسەینێ کوڕێ عەلی

ئیمامێ شەهید، قەهرەمانێ ڕۆژا عاشوورائێ ل کەربەلائێ، بابێ عەبدللاهی، حوسەینێ کوڕێ عەلی، نەڤییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کوڕێ فاطمایێ یێ دویێ بوو.

پشتی برایێ خۆ حەسەنی ب سالەکێ، و ب دورستی ل شەعبانا سالا چارێ مشەختی ل باژێرێ مەدینێ هاتبوو سەر دنیایێ.. و ئەو ژی پشکدارێ برایێ خۆیە د وان هەمی (مەناقبان)دا یێن د دەرحەقێ دا هاتینە ریوایەتکرن، و دەمێ باپیرێ وی پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و دەیکا وی فاطما چووینە بەر دلۆڤانییا خودێ ژییێ حوسەینی حەفت سال بوون.

حوسەین ل بەر دەستێ باپیرێ خۆ و دەیکا خۆ، پاشی ل بەر دەستێ بابێ خۆ، هاتە پەروەردەکرن، و ئەو ژ وان فێری زانینێ و زیرەکییێ و مەردینییێ بووبوو.

د حەدیسێن دورست دا ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا هاتییە ڤەگوهاستن کو: ((الحَسَنُ والحُسَيْنُ سَيِّدا شَبابِ أَهْلِ الجَنَّةِ)) یەعنی: حەسەن و حوسەین، سەییدێن گەنجێن بەحەشتێنە، هەر وەسا هاتییە ڤەگوهاستن کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییە: ((من أَحَبَّها فقد أَحَبّني ومن أبغضها فقد أبغضني)) یەعنی: هەچییێ حەز ژ وان بکەت ئەو وی حەز ژ من کر، و هەچییێ کەرب ژ وان ڤەببت، ئەو وی کەرب ژ من ڤەبوو.

هەر ژ رۆژا حوسەینی فامکری و حەتا مرنا برایێ وی حەسەنی ل سالا (٥٠)یێ مشەختی، حوسەین ل سەر (دەپێ شانۆیێ!) -وەکی دبێژن- ل رێزا ئێکێ نەبوو، هندی بابێ وی یێ زێندی، رەئیا وی و یا برایێ وی حەسەنی رەئیا بابێ وان عەلی بوو.. تشتێ بابێ وان گۆتبا ئەو بوو.

د جحێلینییا خۆ دا حوسەینی ژی وەکی برایێ خۆ حەسەنی داخوازا زانینێ کر، و قورئان و حەدیس ژ گەلەک صەحابییێن ژ خۆ مەزنتر وەرگرت، و ب تایبەت بابێ خۆ بەحرا علمی ئیمامێ شەهید عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی، لەو پشتی هنگی ب چەند سالان حوسەین بوو ئێک ژ زانایێن مەدینێ یێن ب ناڤ و دەنگ، و ل دەمەکی وی دەرسەکا علمی ل مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەبوو ب سەدان و هزاران خەلک لێ ئامادە دبوون، و گوهداریا دەرسێن وی دکر، و گەلەک جاران ژی صەحابییێن ژ وی ب عەمرتر دهاتنە نک زانین ژێ وەردگرت.

دەمێ ژییێ حوسەینی سیه و ئێک سال، ل سالا (٣٥) مشەختی دەمێ فتنەچییان دۆر ل ئیمام عوثمانی گرتی، و گەف و گوڕ ب کوشتنێ لێ کرین، حوسەین د گەل برایێ خۆ حەسەنی -ب فەرمانا بابێ خۆ- چوون حەرەسی ل عوثمانی گرت؛ دا کەس چو دەست درێژییان ل سەر نەکەت، بەلێ فتنەچی ژ پشتا خانی ڤە هاتنێ، و عوثمان د مالا وی دا کوشت. و پشتی شەهیدبوونا عوثمانی، صەحابییان ئیمام عەلی هبژارت بۆ خیلافەتێ، و پێنج سالان ژ سالا (٣٥) حەتا (٤٠) عەلی خیلافەت ب رێڤەبر.

ژ تشتێن ئاشکەرایە کو خەلکێ شامێ، ب سەرکێشییا موعاویەی، بەیعە نەدابوو عەلی، ب هێجەتا هندێ کو دڤێت ئەو تۆلا عوثمانی ڤەکەت، دا پاشی ئەو خۆ بێخنە بن دەستی و بەیعێ بدەنێ.. خودێ وەسا تەقدیرکر

پشتی شەهیدبوونا عوثمانی فتنەکا مەزن د ناڤ ئوممەتێ دا پەیدابوو، فتنەکا وەسا شوینوار و سەرێشکێن وێ حەتا ئەڤرۆ ژی د ناڤ ئوممەتێ دا د ئاشکەرانە!

د ئەنجامێ ڤێ فتنێ دا دو شەڕێن ناڤدار د دیرۆکا ئوممەتێ دا قەومین ل سەر دەمێ خیلافەتا ئیمام عەلی، شەڕێ ئێکێ: (معركة الجمل) بوو ل هەیڤا (ذو الحجة) ژ سالا (٣٦)، و شەڕێ دوێ: (معركة صفين) بوو ل هەیڤا (صفر) ژ سالا (٣٧).

د ئەنجامێ شەڕێ دوێ دا کۆمەک ژ هەڤالێن عەلی ژێڤەبوون، و ئەو ئەو بوون یێن د دیرۆکێ دا ب ناڤێ (خەوارجان) هاتینە ناڤکرن، ئەڤان خەوارجان لادان ژ ڕێکا ڕاست کر و عەلی ب هەمی ڕێکان هاتی کو وان ل ڕاستییا ئیسلامێ بزڤرینت بەلێ چو فایدە نەکر، ل دووماهییێ ئەو بوو شەڕەک د ناڤبەرا وی و وان دا پەیدابوو ل سالا (٣٨)، ئەو شەڕێ ب ناڤێ (معركه النهروان) هاتییە ناڤکرن. د ڤی شەری دا ئیمام عەلی کوشتنەکا مەزن ئێخستە ناڤ ڕێزێن خەوارجان، لەو خەوارج ئاریان و هنگی ڕاوەستیان حەتا ئیمام عەلی ل ڕەمەزانا سالا (٤٠) کوشتی.

ل ڤی دەمی هەمییێ عەلی ل باژێرێ کووفە بوو ل ژێرییا عیراقێ، و خەلکێ کووفە ئەوێن خۆ ب تاگیرییا عەلی دئینادەرێ و دگۆتێ: ئەم شیعێن تەینە! ب سەر ڕەقی و مەژی هشکییا خۆ دلێ وی تژی کول و کەسەر کر، هەر چەندە عەلی ل سەر حەقییێ ژی بوو، بەلێ هەڤالێن وی پترین جاران گوهدارییا وی نەدکر و زوی ب زوی خۆ ب دەست وی ڤە بەر نەددا، لەو دەمێ کوڕێ وی حەسەن پشتی وی بوویە خەلیفە، وی پشتا خۆ ب ڤان مرۆڤان گەرم نەکر، و هنارتە ب دویڤ موعاویەی ڕا و تەنازول بۆ وی کر،

و بەری مرنێ ژی شیرەت ل برایێ خۆ حوسەینی کر کو یێ ل خۆ هشیار بت، و ب فەند و فێلێن خەلکێ کووفە نەئێتە خاپاندن.

ل دەمێ خیلافەتا ئیمام عەلی هەمییێ حوسەین ژی وەکی برایێ خۆ حسەنی، د گەل بابێ خۆ بوو، و وەکی هەر لەشکەرەکێ دی د بن ئەمرێ وی ڤە بوو، و دەمێ عەلی ژ مەیدانێ دەرکەفتی و خەلکێ برایێ وی حسەن بۆ خیلافەتێ هلبژارتی ئەوی خۆ دا د گەل حسەنی، شەش هەیڤان حسەن خەلیفە بوو، و گاڤا حسەنی (تەنازول) کری، حوسەین ئێک ژ وان کەسان بوو یێن نەرازیبوونا خۆ ل سەر ڤێ چەندێ دیارکری، و وی ئاشکەرا گۆتە برایێ خۆ: خوزی من تو د خانییەکی ڤە گرێدابای و دەرگەهـ حشکی ل تە گرتبا، و من نەهێلابا تو دەرکەڤی حەتا من ئەو کربا یا من دڤێت!

ل ڤێرێ پێتڤییە مەسەلەکێ بەرچاڤ بکەین:

جوداهییا مەزن د ناڤبەرا حسەن و حوسەینی دا ئەو بوو: هندی حسەن بوو مرۆڤەکێ رحەت و ئاشتیخواز بوو، ژ شەڕی و کوشتنێ دڕەڤی، گەلەک جاران قوربانی ب حەقێ خۆ ب خۆ ددا پێخەمەت کو ئوممەتێ ببینت ئێک ڕێز، یێ بێهنفرەهبوو، ل نک وی ژێکڤەکرنا ڕێزا موسلمانان گەلەک کارەکێ کرێتتر بوو ژ هەبوونا زۆرداریيا مەزنەکی، لەو وی دگۆت: بۆ پاراستنا یا ئێکێ بلا مرۆڤ چاڤی ژ یا دویێ بنقینت!

حوسەین یێ وەسا نەبوو، وی ب تبیعەتێ خۆ حەز ژ زۆرداریيێ نەدکر، و نەدشیا تەعدایی و زێدەگاڤییێ ببینت و خۆ بێ دەنگ بکەت، وی دگۆت: خۆ بێ دەنگکرنا ل سەر زۆرداریيا مەزنێن زالم ڕێکێ بۆ وان فرەهـ دکەت کو ئەو ژ پیێێ خۆ دەرکەڤن و بەرێ ئوممەتێ بدەنە هیلاکێ، هنگی فتنە دێ گەلەک مەزنتر لێ ئێت.

حسـەن ل سـالا (٤١)ێ ژ كووفـە زڤـڕی مـەدینێ، مـرۆڤێن خـۆ ژی هـەمی د گـەل خـۆ ئینـان، و حوسـەین ئێـک ژ وان بـوو، حـەتا سـالا (٥٠) حسەن مەزنێ (أهل البيت) بوو، و گۆتنـا وی ل سـەر وان ب ڕێڤـە دچوو، پشتی حسەن ژی ژ مەیدانێ دەرکەفتی ژ نوی حوسەین هاتە ڕێزا ئێکێ!

ل سەر دەمـێ خیلافـەتا موعاویـەی -خودێ ژێ رازی بت-، و ل سالا (٥٠)یێ حسەن ل مەدینێ مـر، و ل بـەقیعێ ب رەخ دەیکا وی فاطـمایێ ڤە هاتە ڤەشارتن، حوسەینی جهێ وی گرت و بوو مەزنێ بنەمالێ.

پشـتی مرنـا حسـەنی ب شـەش سـالان، ل سـالا (٥٦) مشـەختی، موعاویەی بڕیار دا بەیعێ بۆ کوڕێ خۆ یەزیدی وەرگرت؛ دا پشتی مرنا وی ئەو ببتە خەلیفە، و وی دو هێجەت بۆ خۆ گرتن ل سەر ڤی کارێ خۆ:

ئێک: (ولایە العهد) تشتەکێ دورستە؛ چونکی ئەبووبەکر و عومـەری هەردویان ئەڤ چەندە کربوو.

دو: وی هزرکـر یەزیـد ژ هـەمی کەسـان پتـر ب کێـر ڤـی کـاری دئێـت؛ چونکی ئەو دێ شێت دەولەتێ ڕاگرت، و جارەکا دی فتنـە د نـاڤ ئوممـەتێ دا پەیدا نابت.

ژ بەر ڤێ چەندێ موعاویـەی پشـتی بەیعـە بـۆ یەزیـدی سـتاندی، چوو سـەر مینبـەرێ و گـۆت: ئـەی خودێ! ئەگـەر تـو بزانـی مـن ئـەو کـرە (ولـی العهد) چونکی ئەز دبینم ئەو ب کێـر دئێـت تـو مەسـەلێ بـۆ پێـک بینـە، و ئەگەر تو بزانی من ئەو کرە (ولی العهد) چونکی ئەو کوڕێ منە و ئەز حەز ژێ دکەم تو وی نەگەهینێ.

بەلێ هەر چاوا بت دڤیا موعاویەی ئەڤ چەندە نەکربا، ژ بەر:

ئێـک: حسـەنی -دەمـێ تـەنازول بـۆ کـری- ل سـەر وی کربـوو شـەرت پشتی وی مەسەلە جارەکا دی ببتە شوورا.

دو: ئەبووبەکری و عومەری دەمێ د ژینا خۆ دا ئێک دانایە شوینا خۆ، ئەو ئێک کورێ وان نەبوو، بەلکی هەر ژ بنەمالا وان ژی نەبوو.. لەو دەمێ موعاویەی -ل مەدینێ- ئەڤ هێجەتە بۆ خۆ گرتی و گۆتی: ئەڤە رێکا ئەبووبەکری و عومەرییە، هندەک صەحابییان گۆتێ: نەخێر ئەو رێکا کیسرای و قەیصەرییە!

سێ: ئەگەر خۆ بێژین یەزید مرۆڤەکێ ب کێرهاتی ژی بوو، گەلەک صەحابی مابوون ژ یەزیدی چێتر و باشتر و ب کێرهاتیتر، بۆچی ئێک ژ وان نەدبوویێ؟ و دڤێت ژ بیر نەکەین کو یەزید صەحابی نەبوو، ل سەر دەمێ خیلافەتا عوثمانی ل سالا (٢٥) بووبوو!

هەر چەندە موعاویە صەحابییە ژی، و قەت چێ نابت مرۆڤ هزرا خراب ژێ بکەت، بەلێ وی ب ڤی کارێ خۆ دەرگەهێ شوورایێ د هلبژارتنا خەلیفەی دا گرت، و دەرگەهێ مەلکاتییێ ڤەکر -خودێ ل مە و وی ببۆرت-.

ل سالا (٥٦) موعاویەی بەیعە بۆ کورێ خۆ ژ خەلکێ شامێ وەرگرت، و کاغەز بۆ والییێن خۆ هنارتن دا هەر ئێک ل جهێ خۆ بەیعێ بۆ یەزیدی وەرگرت، و جهێ وی هزرەک بۆ کری و ترسیای ل بەر ئاسێ ببت مەدینە بوو؛ چونکی گەلەک صەحابییێن مەزن ل مەدینێ مابوون، لەو موعاویە ب خۆ هاتە مەدینێ، و داخواز ژ خەلکێ وێ کر بەیعێ بدەنە یەزیدی.. پێنج کەس ل بەر نەهاتن: حوسەینێ کورێ عەلی، عەبدللاهێ کورێ عومەری، عەبدررەحمانێ کورێ ئەبووبەکری، عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، و عەبدللاهێ کورێ عەبباسی.

هندەک ژ ڤان گۆت: یەزید ب کێر نائێت، و هندەکان گۆت: ئەم بەیعێ نادەینە دو کەسان پێکڤە.

پشتی ڤێ سەرهاتییێ ب چار سالان، یەعنی ل سالا (٦٠)مشەختی موعاویە چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و ل دیمەشقێ هاتە ڤەشارتن، و کورێ وی یەزید ل شوینا وی بوو خەلیفە. و دەمێ یەزید بوویە خەلیفە، بەیعە بۆ وی هاتە نویکرن، ڤێ جارێ ب ناڤێ خیلافەتێ، ژ دل بت یان ژ دل نەبت هەمییان بەیعە دایێ و خەلکی گۆت: خەلیفەکێ ب کێر نەهاتی چێترە ژ هلکرنا ئاگرێ فتنێ جارەکا دی د ناڤ ئوممەتێ دا.. ڤێ جارێ دو کەسان ب تنێ موبایەعا یەزیدی نەکر، ئەو هەردو: حوسەین، و عەبدللایێ کورێ زوبەیری بوون.

یەزیدی کاغەزەک بۆ والییێ خۆ ل مەدینێ هنارت و گۆتێ: بەیعێ بۆ من ژ خەلکی بستینە و هەچییێ ل بەر نەهات کوتەکییێ لێ بکە.

ئەو ڕابوو هنارتە ب دویڤ حوسەینی و عەبدللاهی ڕا، هندی عەبدللاه بوو نەچوو نک وی، خۆ گرت حەتا بوویە شەڤ ڕابوو ب دزی ڤە ژ مەدینێ دەرکەفت و قەستا مەکەهێ کر.. حوسەینی هندەک زەلامێن بنەمالا خۆ دانە د گەل خۆ و چوو نک والی، گۆتە زەلامان: هوین ل بەر دەرگەهی بن گاڤا هەوە دیت تشتەک چێبوو د هەوارا من وەرن.

حوسەین ب ژۆر کەت، والی گۆتێ: (أمیر المؤمنین) موعاویە یێ مری و کورێ وی یەزید ل شوینا وی یێ بوویە خەلیفە، و وی یێ ژ من خواستی ئەز بەیعێ بۆ وی ژ تە وەرگرم. حوسەینی گۆت: یێن وەکی من بەیعێ ب دزی ڤە نادەن، خەلکی کۆم بکە بلا بەیعێ بدەن و ئەز ژی دێ سەحکەمێ!

حوسەین ژ نک وی زڤڕی، هندەکان گۆتە والی: حوسەینی بگرە و بکوژە ئەو ژ خۆ وە دبێژت بەیعێ نادەت. والی گۆت: ب خودێ ئەوێ

ل رۆژا قیامەتێ بێت حسێبا خوینا حوسەینی د گەل بێتەکرن ئەو مرۆڤەکە تەرازییا وی دێ ل نک خودێ یا سڤک بت.

حوسەین ژ نک وی زڤڕی و کارێ دەرکەفتنا ژ مەدینێ کر، هەر سێ برایێن خۆ: (أبو بكر، و العباس، و جعفر) د گەل هەردو خویشکێن خۆ (زینب، و أم كلثوم) و د گەل عەیالێ برایێ خۆ (حسەنی) د گەل خۆ برن و قەستا مەکەهێ کر، برایێ وی (محمد بن الحنفیە) د گەل دەرنەکەت، چونکی دەرکەفتن ب دلێ وی نەبوو، و وی شیرەت ل حوسەینی ژی کر کو دەرنەکەڤت، بەلێ حوسەینی ب یا وی نەکر.

حوسەین ب بنەمالا خۆ ڤە گەهشتە مەکەهێ، و مەکەهـ باشترین جهـ بوو حوسەین و (ابن الزبیر) بەرهنگارییا یەزیدی لێ بکەن، بەلێ خەلکێ کووفە ئەوێن هەردەم ل فتنان دگەڕیان، بەلا خۆ ژ حوسەینی ڤەنەکر، کاغەز ل دویڤ کاغەزێ بۆ هنارتن، و قاصد ل دویڤ قاصدی فرێکرن: وەرە کووفە دێ هاری تە کەین، شیرێن مە دێ د گەل تە بن دژی یەزیدی، بەس تو بێی کەسێ ژ تە پیڤەتر ئەم ناهلبژێرین. و حوسەینی ڤیا خۆ پشت ڕاست بکەت کو ئەو ڕاست دبێژن، ڕابوو پسمامێ خۆ (مسلم بن عقیل) هنارتە کووفە دا بزانت کانی مەسەلە ب دورستی یا چاوایە.

موسلم گەهشتە کووفە، و هنگێ والییێ کووفە (النعمان بن بشیر) بوو -خودێ ژێ رازی بت- کو ئێک ژ صەحابییێن ناڤدارە، موسلم گاڤا گەهشتی، خەلکێ کووفە ل دۆران کۆمبوون و بەیعە دا حوسەینی، حەتا دبێژن: پتر ژ هەژدە هزار کەسان بەیعە بۆ حوسەینی دا موسلمی.

ل وی دەمی یەزیدی بڕیار دا (النعمان بن بشیر)ی ژ والیاتییێ بێخت، و ل شوینا وی (عبید الله بن زیاد)ی والییێ بەصرا ڤەگوهێزتە کووفە، (عبید الله) مرۆڤەکێ خوینڕێژ و دلرەق بوو، گاڤا هاتییە کووفە و

ب سەر و بەری حسیای ل (مسلم بن عقیل)ی گەڕیا و هنگی راوەستیا حەتا ئەو گرتی و کوشتی. و موسلمی بەری هنگی هنارتبوو ب دویڤ حوسەینی ڕا ل مەکەهێ کو: وەرە هەمی تشت ددورستن!

حوسەینی بڕیار دا دەرکەڤت، ئەڤ دەرکەفتنا وی، بوو جهێ نەرازیبوونا گەلەک ژ هەڤال و نیاسێن وی، بەری هەمییان برایێ وی (محمد بن الحنفیه) ب ڤێ چەندێ یێ رازی نەبوو، پسمامێ بابێ وی عەبدللاهێ کوڕێ عەباسی چوو نک، گۆتێ: پسمام من یێ ژ خەلکی گوهـ لێ بووی تو دێ چیە عیراقێ، ئەرێ ڕاستە؟

گۆت: بەلێ، ئەڤرۆ حەتا سوباهی دێ چم.

عەبدللاهی گۆتێ: نەچە، خەکێ کووفە دبێ سۆزن، بمینە ل مەکەهێ و ئەگەر تە بڤێت دەرکەڤی ژی هەرە یەمەنێ.

حوسەینی گۆت: ئەز دزانم دلێ تە یێ ب من ڤە، بەلێ من چوون یا کرییە دلێ خۆ و هەر دێ چم.

عەبدللاهـ گەلەک بێتەنگ بوو و گۆت: ئەگەر کەیفا خەلکی ب مە نەهاتبا ئەز دا سەرێ تە کێشم و من نەدهێلا تو بچی.. بەلێ ئەگەر هەر دێ چی ژنک و بچویکێن خۆ نەبە، ئەز دترسم تو ژی وەکی عوثمانی ل بەر چاڤێن وان بێیە کوشتن.

(جابر بن عبدالله)ی و (أبو سعید الخدری) ژی گۆتێ: نەچە، خۆ (فرزدق)ێ شاعر ژی گۆتێ: دلێن خەلکی یێن د گەل تە، بەلێ شیرێن وان یێن د گەل نەیارێن تە.

حوسەینی گوهێ خۆ نەدا وان و دەرکەفت، پشتی دەرکەفتنا وی ب دو سێ ڕۆژان (عەبدللاهێ کوڕێ عومەری) پێ حسیا ڕابوو ل دەوارا خۆ سویار بوو و ب دویڤ دا چوو حەتا گەهشتییێ، گۆتێ: دێ کیڤە چی؟

حوسەینی گۆت: دێ چمە کووفە و ئەڤە کاغەزێن خەلکێ وێنە بەیعە یا دایە من و ئەز دێ چمە نک وان.

کورێ عومەری گۆتێ: ئەز دێ حەدیسەکێ بۆ تە بێژم، جبریل هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: تە دنیا یان ئاخرەت؟ ئەوی ئاخرەت هلبژارت و دنیا نەڤیا، و تـو پـارچـەکـی ژ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ب خودێ ئێـک ژ هەوە ناگەهیتێ -یەعنی: ویلایەتێ- و بۆ باشییا هەوە خودێ ئەو ژ هەوە دویرکر.

حوسەینی گۆت: ژ نوی ئەز نازڤرم.

ئینـا عەبـدللاهێ کـورێ عومـەری حوسـەین دا بـەر سـنگێ خۆ، پێڤـە ماچی کر و ب گری ڤە گۆتێ: ئەی کوشتی! ئەز تە دهێلمە ب هیڤییا خودێ ڤە.

د گـەل ڤـێ هـەمییێ حوسـەین ژ چوونێ لێڤەنـەبوو، ل دەهکـێن (ذو الحجـە) هـەیڤا دوازدێ ژ سـالا (٦٠) مشـەختی حوسـەین ژ مەکـەهێ دەرکەفت، و هەڤالێن وی ب ژن و بچویـک ڤـە هـەمی دبوونـە حەفتێ و دو کەس.

و بەری ئەم هەڤالینییا بـابێ عەبدللاهی و سـەروەرێ شەهیدان د ڤـێ وەغەرا وی یا دووماهیییێ دا بکـەین، مـە ڕاوەسـتانەک د گـەل مسـەلەکێ هەیە:

دویر نینە هندەک کەس هەبن بێژن: ئەرێ حوسەین بۆچی چوو کووفـە و گوهدارییا وان هەمی صەحابییان نەکر ئەوێن گۆتینێ نەچە؟

ل ڤێرێ دڤێت ئاشکەرا بکـەین کـو دەرکـەفتنا وی مسـەلەکا شەخصـی نەبوو، بەرێ وی ل هندێ نەبوو ئەو ببتە خەلیفە یـان نـە، چونکی حوسەین ژ وان کسـان نـەبوو یـێن بـەر ل دنیـایێ، مسـەلە بـەرەڤانییا ژ پاشـەڕۆژا

ئیسلامێ بوو، حوسەین ئیمامەکێ (مجتهد) بوو و ئجتیهادا وی ئەو گەهاندە وێ باوەرێ کو یەزید مرۆڤەکێ زۆرداره و ب کێر خیلافەتێ نائێت و ئەگەر ئەو ژی ل سەر رێکا بابێ خۆ بچت، (شوورایا ئیسلامی) دێ بن ئاخ کەت و خیلافەتێ دێ کەتە مەلکاتی و دەولەتا ئیسلامێ دێ کەتە ملکێ بنەمالا خۆ.. مەعنا پاشەرۆژا ئیسلامێ و موسلمانان دێ بەر ب کۆره رێکەکێ ڤە چت، ڤێجا مادەم مەسەلە یا هۆیە دڤێت کەسەک هەبت دەنگێ خۆ بلند کەت و بێژتە زۆرداری: نە!

ئەڤ چەندە ب کێڤە دئێت؟

ب وی ب تنێ ڤە، چونکی ئەو نەڤییێ پێغەمبەرییە و کورێ عەلییە، و ئەڤە ب هزاران خەلکێ کووفە بەیعە دایێ وەکی پسمامێ وی موسلمی بۆ نڤیسی، و وان ئامادەبوونا خۆ ئاشکەراکر کو د گەل وی بەرهنگارییا زۆرداری بکەن، مەعنا: ئەگەر وی خۆ بێ دەنگ کر، و ل مەکەهێ روینشت، ئەو هنگی وی خیانەت ل ئوممەتێ کر و (فرض عین)ەک ب جهـ نەئینا.

ئەڤە ئجتیهادا حوسەینی بوو، و (مجتهد) چ یێ دورست بت چ یێ خەلەت -ب نەصا حەدیسێ- مرۆڤەکێ خودان خێره، و چونکی ئجتیهادا موجتەهدی بۆ هەمی موجتەهدان یا مولزەم نینە وەکی ئصوولی دبێژن، صەحابییێن دی د ڤێ بۆچوونێ دا د گەل حوسەینی نەبوون و گۆتن: دەرکەفتنا ل سەر ئیمامی ئەگەر خۆ یێ زۆردار ژی بت خرابییا وێ ژ باشییێ پترە، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەم یێن ژێ داینە پاش.

حوسەین ژ مەکەهێ دەرکەفت، و ل وان رۆژێن ئەو دەرکەفتی پسمامێ وی (موسلمێ کورێ عەقیلی) ب دەستێن (ئبن زیادی) هاتە کوشتن، حوسەینی ب ڤێ چەندێ نەزانی حەتا نێزیکی کووفە بووی، هنگی وی مرۆڤەک دیت ژ لایێ کووفە ڤە یێ دئێت، ئینا پسیارا حالێ کووفە ژێ کر،

وی زەلامی گۆتێ: موسلم یێ هاتییە کوشتن، و خەلکێ کووفە موبایەعا (ئبن زیادی) کرییە.

چو د دەست حوسەینی دا نەما وی زانی ئەوا پسمامێ وی موسلمی کری ئبن زیادی هەمی یا پویچکری، لەو وی گۆت: (إنا لله وإنا إليه راجعون) پشتی وی چو خێر د ژینێ دا نینە.

حوسەینی رێکا خۆ ژ کووفە ڤەگوهاست و ب ژۆرییا رۆژئاڤایێ دا چوو، حەتا نێزیکی دەشتا کەربەلائێ بووی ب رەخ رویباری فوراتی ڤە، دەم دەسپێکا هەیڤا موحەررەمێ بوو ژ سالا (٦١)مشەختی، ئبن زیادی لەشکەرەکێ بۆش ب قومانداریا عومەرێ کورێ سەعدی ب دویڤ حوسەینی دا هنارت، گاڤا ئەو لەشکەر گەهشتییە ئیمامی، عومەرێ کورێ سەعدی گۆتێ: بۆچی تو دەرکەفتی؟

حوسەینی گۆت: ل دویڤ داخوازا خەلکێ ڤی بازێری ئەز یێ هاتیم، ب رێڤە ژ نوی من زانی ئەو یێن لێڤەبووین، بەلێ وە رێ نەدا من ئەز بزڤرم.

کورێ سەعدی کاغەزەک بۆ مەزنێ خۆ ئبن زیادی هنارت تێدا داخوازا فەرمانا وی کر، ل سەری ئبن زیادی گۆتێ: داخوازێ ژێ بکە بەیعێ بدەتە یەزیدی و ئەگەر وە نەکر لێ بشدینە و ئاڤێ ژێ ببڕە، کانێ چاوا وان ئاڤ ژ ئیمام عوثمانی بڕیبوو!

و ژ بیرا ئبن زیادێ ئەحمەق چووبوو کانێ رۆژا ئاڤ ژ عوثمانی هاتییە بڕین حوسەین و برایێ خۆ و بابێ خۆ ل کیڤە بوون، ما نە هەر حوسەین و برایێ خۆ بوون شیرێن خۆ هلگرتین و چووین بەرەڤانی ژ عوثمانی کری؟ ما نە هەر عەلی بوو ئاڤ بۆ عوثمانی داگرتی و کۆمەکا جحێلێن بنەمالا هاشمییان هنارتین و گۆتییێ: یان نەزڤرن یان ڤێ ئاڤێ

بگەهیننە عوثمانی! بەلێ ئەگەر مرۆڤ ژ ڕێ دەرکەفت یا عەجێب نینە تاریخێ ژی ڤاژی بخوینت!

حوسەینی گۆت: ئەوا ئبن زیاد دخوازت ئەز قەت ناکەم، ئەگەر مرنە بلا ب خێر بێت.

ئبن زیادی بەرسڤ دا: ئەگەر ئەو وێ نەکەت یا مە ژێ دڤێت، و خۆ ب دەست هەوە ڤە بەرنەدا هێرشێ ببەنە سەر حەتا هوین وی بکوژن.

ل دەهی هەیڤا موحەررەمێ، ل ڕۆژا عاشوورائێ، دیرۆکێ مەزنترین ڕویرەشی بۆ ئبن زیادی و دەستەکا وی تۆمار کر، ل ڤێ ڕۆژێ ڕۆژا کەربەلائێ قەهرەمانێن (آل البیت) خۆ گۆریکرنەکا دی یا مەزن تۆمارکر.

ل عاشوورائێ شەڕی دەست پێ کر، ئەوێن حوسەین داخوازکری کو بێت دا موبایەعا وی بکەن، ئەڤرۆ ب شیرێن خۆ لێ ڕاوەستییان، و پشتی حوسەینی و حەتا ئەڤرۆ ژی هەر سال جارەکێ ئەو ڕوییێن خۆ ڕەش دکەن، کانێ چاوا جلکێن خۆ ڕەش دکەن، وەک کۆڤاندارى ل سەر وێ قبحەتا وان ب خۆ ب دەستێن خۆ کری!

ڕۆژا عاشوورائێ ل هنداڤی کەربەلائێ ئاڤا نەبوو حەتا پیرۆزە تەرمێن هەڤدە شەهیدێن بەختەوەر نەکەفتینە سەر ئاخا کەربەلائێ.. و ئیمامێ وان بابێ عەبدللاهی حوسەینێ کوڕێ عەلی بوو، سلاڤێن خودێ ل وی و بابێ وی و بنەمالا وی بن.

ل دووماهییێ ب تنێ من دڤێت ئێک مەسەلێ ڕوهن بکەم: ئەرێ هەلویستێ یەزیدی ژ ڤێ تاوانا مەزن چ بوو؟ و دیتنا مە موسلمانان بۆ وی دڤێت یا چاوا بت؟

ل سەری دێ بێژین: دڤێت باش ل بیرا خۆ بینین کو ڕافزییێن شەرمزار گەلەک درەو و بێبەختییان ژ نک خۆ ب دویڤ یەزیدی و بنەمالا وی

ڤەدنن، بەلکی ب دویڤ هەر کسەکی ڤەدنن یێ نە د گەل وان بت، ئەگەر وەکی میاکەتان ژی بت! چونکی دینێ وان ل سەر بێبەختیییێ یێ ئاڤاکرییە، ئەڤێ دڤێت ل بەر چاڤ بدانین.. بەلێ د گەل هندێ ژی ئەم یەزیدی ئێکجار بێ گونەهـ ناکەین ژ ڤێ تاوانێ، ڕاستە وی فەرمان ب کوشتنێ نەدابوو، و دەمێ وی ب کوشتنا حوسەینی زانی تێکچوو و پێ نەخۆش بوو، و دەنگێ گرییێ ژ مالا وی هاتە بهیستن، بەلێ وی تۆلا حوسەینی ژ وان تاوانباران نەستاند، حەتا نەگۆت دا ئبن زیادی ژ ویلایەتێ بێخم ژی! پشتی ڤێ چەندێ، باوەرییا مە (أهل السنة والجماعة) د دەرحەقا یەزیدی دا ئەوە: یەزید مەلکەک بوو ژ مەلکێن موسلمانان، ژ خەلیفێن راشد نەبوو، و وی چاکی ژی هەبوون و خرابی ژی هەبوون، و حسێبا وی ل سەر خودێیە.
ئەڤە و دەستەکێن موسلمانان د دەرحەقا وی دا یێن بووینە چار پشک:

١- هندی رافزینە دبێژن: ئەو مرۆڤەکێ کافر بوو و لەعنەتێ لێ دبارینن، و ڤێ گۆتنێ وەکی خودانێن وێ چو بهایێ خۆ د تەرازییا حەقییێ دا نینە.

٢- بەرانبەر بۆچوونا بۆری و وەک (رد فعل) هندەکان ژ پشکا سوننییان گۆت: یەزید ئێک ژ چاک و خاسێن خودێ بوو، و مرۆڤەکێ موجاهد بوو و یێ بەرییە ژ گونەها کوشتنا حوسەینی، و ئێکەمین کەس بۆ ڤێ بۆچوونێ چووی شێخ (عدی بن مسافر الاموی) بوو، و پشتی وی دویکەفتیییێن وی ئەوێن ل سەری ب ناڤێ (ئادییان) هاتینە ناڤکرن زێدە (غلو) د دەر حەقا یەزیدی دا کر حەتا دووماهییێ گۆتن: یەزید -یان سلتان ئێزد وەکی ئەو دبێژن- خودێیە.. و ئەو کوردێن ئێزدی یێن نوکە ئەم دبینین بەرمایێن وانە!

٣- هندەكان ژی گوٚت: یەزید كافر نینە بەلێ مرۆڤەكێ فاسق و فاجرە، دورستە مرۆڤ لەعنەتا لێ بكەت چونكی گەلەك تاوانێن مەزن ل سەر دەمێ وی هاتبوونەكرن.

٤- بۆچوونا ژ هەمییان دورستتر ئەوە: چێ نابت لەعنەت لێ بێنەكرن؛ چونكی ئەو مرۆڤەكێ موسلمانە، و ئەگەر وی چەند گونەهێن مەزن هەبن ژی، ئەڤ گونەهە وی كافر ناكەن و هێژایی هندێ ناكەن لەعنەت لێ بێنە باراندن، و دەمێ ئەم د دوعاییێن خوٚ دا داخوازا ژێبرنا گونەهان بوٚ موسلمانان دكەین ئەو ژی دكەڤتە د بن دا، و د گەل هندێ ژی زانایێن ئیسلامێ حەدیس ژێ ریوایەت نەكرینە و د علمێ (الجرح والتعدیل) دا یەزید مرۆڤەكێ باوەرێ نینە!

زڤرین بوٚ بابەتێ سەرەكێ دێ بێژین: دەمێ ئیمام حوسەین هاتییە شەهیدكرن ژییێ وی نێزیكی پێنجی و حەفت سالان بوو، ل شەعبانا سالا (٤) ل مەدینێ بووبوو، و ل موحەررەما سالا (٦١) ل كەربەلائێ شەهید بووبوو.

سلاڤ لێ بن.

# سەروەرێ شەهیدان
# حەمزەیێ کوڕێ عەبدلموطەلبی

بابێ عومارەی، شێرێ ڕۆژا بەدرێ و ئوحودێ، سەروەرێ شەهیدان، حەمزەیێ کوڕێ عەبدلموطەلبێ قورەیشی، شێرێ خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مژارا پەیڤا مە یا ڤێ جارێیە.

ل دەسپێکێ: پێتڤییە ئەم وێ مالێ بدەینە ناسین یا کو ئەڤ شێرە لێ مەزنبووی؛ دا ذیمەن ل بەر چاڤێن مە پتر یێ روهن و ئاشکەرا بت.

حەمزە کوڕێ عەبدلموطەلبییە.. و عەبدلموطەلب -و ناڤێ وی یێ دورست شیبەیە- کوڕێ هاشمییە -و ناڤێ وی یێ دورست عەمر بوو- و هاشم کوڕێ عەبدمەنافییە، و عەبدمەناف کوڕێ قوصەیە.

ئەڤ بنەمالە د ناڤ قەبیلا قورەیشییان دا ئێک ژ بنەمالێن شەریف و ماقویل بوو، و قورەیشی ئێک ژ مەزنترین و ناڤدارترین قەبیلێن عەرەبان بوو، و ل نیڤا جزیرا عەرەبان ل باژێرێ مەکەهێ دژیا.

هاشم، ئەوێ بنەمالا هاشمییان ب وی دئێتە ناڤکرن، هەر چەندە بچویکێ چار برایان بوو، بەلێ ل سەر دەمێ خۆ ئێک ژ پێشکێشترین زەلامێن قورەیشییان بوو، ژنکا وی (سەلما) ژ باژێرێ یەثربێ بوو، ل دەمەکی بۆ بازرگانییێ دەرکەفتە شامێ، ژنکا خۆ ئەوا هنگی ب بچویکێ خۆ یێ نەخری یا گران، د گەل خۆ برە مالبابا وێ ل یەثربێ و ئەو چوو شامێ، چوو.. بەلێ نەزڤری! ل شامێ مر، ژنکا وی ل یەثربێ، ل مالبابێ، بچویکێ خۆ یێ نەخری دانا، وێ ناڤێ کوڕێ خۆ کرە (شیبە).

دەهـ سالان شیبەیێ كورێ هاشمی، ل نك خالێن خۆ ما، و دەمێ ژییێ وی بوویە دەهـ سال، مامێ وی موطـطـەلبێ كورێ عەبد مەنافی هاتێ و د گەل خۆ زڤراندە مەكەهێ، ڕۆژا هەردو گەهشتینە مەكەهێ موطـطـەلبی برازایێ خۆ یێ دەهـ سالی ل پشت خۆ سویار كربوو، خەلكی پسیار ژێ كر: ئەڤە چ زارۆكە د گەل تە؟ وی گۆت: عەبدێ منە، ئینا خەلكێ مەكەهێ گۆتە شیبەی: (عبد المطلب).

موطـطـەلب ئێك ژ مەزنێن قورەیشییان بوو، و تشتێ ئەو ب سەر هەمی مەزنێن دی دئێخست ئەو بوو: (السقاية) و (الرفادة) و مەبەست پێ دانا ئاڤێ و خوارنێیە بۆ حەجییان، هەردو د دەستێ وی دا بوون، و ئەڤ هەردو مەنصەبە د چاڤێن عەرەبان دا گەلەك دمەزن بوون.. پشتی موطـطـەلب مری برازایێ وی شیبەیی (عەبدلموطـطـەلبی) جهێ وی گرت و چونكی ئەو مرۆڤەكێ عەقلدار و زیرەك و خێرخواز بوو، ئەو زوی هاتە پێش و ناڤ و دەنگێن وی نە د ناڤ قورەیشییان ب تنێ دا بەلكی د ناڤ هەمی عەرەبان دا بەلاڤبوون.

تشتێ ژ هەمییان مەزنتر چێبووی ل سەر زەمانێ عەبدلموطـطـەلبی یێ كو ئەو پتر د چاڤێن خەلكێ مەكەهێ دا مەزنكری كۆلانا بیرا زەمزەم بوو.. زەمزەم ئەو بیرا ئاڤێ بوو یا خودێ بۆ ئیسماعیل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پەقاندی، بەری زەمانی عەبدلموطـطـەلبی ب چەند سەد سالەكان ئەڤ بیرە بن ئاخ بووبوو و كەس ب جهێ وێ نەدكەفت، جارەكێ عەبدلموطـطـەلبی د خەونێ دا دیت هندەكان دگۆتێ: هەرە فلان جهی بكۆلە دێ بیر لێ دەركەڤت.. و وەسا چێبوو، و دەمێ وی بیر دەرێخستی و كۆلای ئاڤ ژێ زا، و وی ب ئاڤا ڤێ بیرێ حەجی ئاڤ ددان. ڤی تشتی عەبدلموطـطـەلب د چاڤێن خەلكێ مەكەهێ دا گەلەك مەزن كر.

عەبدلموطـطـەلبی پتـر ژ ژنـەکێ ئینـابوون و عەیالـەکێ بۆش هـەبوو، دوازدە کـورِ د گـەل شـەش کچـان.. کـورِێ وی یـێ ژ هـەمییان مـەزنتر (الحارث) بوو، لـەو دگۆتنێ: (أبـو الحـارث) و کورِێ وی یێ ژ هەمییان بچویکتر (العباس) بوو. یێن دیتر ئەڤەنە: الزبیر، ضرار، أبو طـالـب - عبد منـاف-، أبـو لـهـب -عبـدالعزی-، المقـوم، عبـد الكعبـة، حجـل، الغیـداق، عبداللـه، حمـزة. و کچـێن وی ئەڤـە بـوون: أروی، بـره، أمیمـة، صـفیة، عاتكة، البیضـاء. ئەڤە هەژدە، و ژ ڤـان هــەژدان ب تـنـێ سـێیان بـاوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینابوو و ژ صەحابییان دئێنە هژمارتن، ئـەو ژی ئەڤەنە: حەمزە، و عەبباس، و صەفییە.

ژ مـامێن پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ب تنێ چـار گەهشـتبوونە زەمانێ پێغەمبەرینییێ، دویان بـاوەری پێ ئینـابوو: حەمزە و عەبباسی، و دویان باوەری پێ نەئینابوو و ل سەر کوفرێ مربوون ئەو ژی (أبو طـالـب) و ئەبوولەهەب بوون.

نوکە دێ پتر خۆ نێزیکی حەمزەی کەین.

حەمزە مە گۆت کـورِێ عەبدلموطـطـەلبێ کـورِێ هاشمییە، دەیکا وی ناڤێ وێ (هالە)یە کچا ئوهەیبێ کورِێ عەبدمـەنافێ کـورِێ زوهرەیـە، دەیکا وی دۆتماما (ئامینا)یا کچا وەهبێ کورِێ عەبدمەنافییـە، یـەعنی: دەیکا حەمزەی و دەیکا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- دۆتمـامێن ئێکـێن ژ راسـتا بوون.

بەری پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بن- بێتـە سـەر دنیـایێ ب چـار سـالان، حـەمزە ل مەکـەهێ بووبـوو، و ثووەیبایـا جاریـا ئەبوولەهـەبی شـیرێ خـۆ دابـوویـێ، و چـونکی ثووەیبایێ پشتی هنگی شیر دابوو پێغەمبـەری ژی -سلاڤ لێ بن- پێغەمبەر و حەمزە هەردو دبنە برایێن ئێک یێن شیری!

حەمزە د مالا بابێ خۆ عەبدلموطـطـەلبی دا مـەزنبوو، و ژ وی فێری زیرەکی و عەقلدارییێ بوو، سەر وبەری ب خودانکرنا وی ب بەرفرەهی مە نەزانییـە، بـەلێ تشـتـەکێ ئاشـکـەرایـە کـو ئـەو ژی وەکـی هـەمی زارۆکـێن سـەردەمێ خـۆ هـەر ژ بچویکـاتییێ فێـری دلـمـوکمی و فێرسـییێ بووبـوو، چونکی جهەک و دەمەکێ وەکی وی جهی و وی دەمی یێ حەمزە لـێ ژیـای زەلام ژ هەمی تشتان پتر یێ هەوجەی عەگیدییێ بـوو دا خـۆ و کـەسـێـن ل دەور و بەرێن خۆ بپارێزت.

ژ بلـی زیرەکییـێ، حـەمزە فێـری مـەردینی و ئـەزمان رەهـوانییێ ژی بووبوو، و ئەڤ چەندە یا عەجێب نینە ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو حەمزە کورێ سەییدێ قورەیشییان بوو و د مالا وی یا خانەدان دا مەزن بووبوو.

گاڤا عەبدلموطـطـەلب مری، کورێ وی حەمزە یێ دووازدە سالی بـوو، و هەر چەندە کورێن عەبدلموطـطـەلبی و ب تایبەتی ئەبوو طـالبی بهایـەکێ مـەزن د نـاڤ قـورەیـشـیـیـان دا هـەبـوو ژی بـەلێ کسـەک ژ وان نەشیا ب دورستی جهێ بابێ خۆ بگرت و مـەزنییا قورەیشییان چەندەکێ ژ دەست وان دەرکەفت.

حەمزە و برایێ وی عەبباس و برازایێ وان موحەممەد -سلاڤ لێ بن- د ئێـک عـەمر دا بـوون، هـەر ئێـک دو سـالان ژ یـێ دی مـەزنتر بـوو، لـەو پێکڤە هاتبوونە ب خودانکرن، و دڤێت ژ بیـر نەکـەین چـونـکـی موحەممـەد -سلاڤ لێ بن- ئێتیمەکێ پاشباب بوو، باپیرێ وی عەبدلموطـطـەلبی ئـەو بربوو نک خۆ ب خودان دکر، و ژ کورێن خۆ پتر چاڤێ خۆ ددایێ.

حـەتا ژییـێ حـەمزەی ژ چـل و چـار سـالییێ بـۆری ژی چـو زانینێن بەرفرەهـ مە ژ ژین و سەرهاتییا وی نەزانییە، تشتێ هاتییە زانـین ب تـنـێ ئـەو بوویـە: حـەمزە مرۆڤـەکێ زێـدە زیـرەک و سـەگڤان بـوو، بـۆ سـویاری و

عەگیدییێ کەسێ د ناڤ قورەیشییان دا دەستێ وی نەدگرت، پتر دەمێ خۆ وی ل دەشتێ و چۆل و بەیاران دبۆراند، دچوو نێچیرێ، و ل ئێڤارا درەنگ دەمێ دزڤڕی ئێکەمین جار دهاتە کەعبێ تەوافا خۆ دکر پاشی دچوو مالا خۆ، و ل ڕۆژا دی سەرێ سحارێ رادبوو دچوو نێچیرێ، لەو حەمزە د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا ب نێچیرڤانییێ هاتبوو ناسین.. و حەتا حەددەکی ژی ئەو ژ خەلکی یێ دویربوو، و پشتی هەمییان ژ نوی وی تشت دزانین.

ئێکەمین جار دیرۆکێ دەرگەهـ بۆ حەمزەی ل تاق کری، و ناڤێ وی ل سەر بەریەرێن خۆ ئاشکەرا نەخشاندی، ل سالا شەشێ بوو پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنگی ژیێ حەمزەی چل و شەش سال بوون، ڕۆژ ڕۆژەکا دیرۆکی بوو، نە ب تنێ بۆ بازێرێ مەکەهێ، بەلکی بۆ گشت دنیایێ!

ئەو شەش سال بوون پێغەمبەرینی بۆ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- هاتی، د وان سالان دا نێزیکی سیهـ و هەشت مرۆڤان ژ ژن و مێران، بچویک و مەزنان باوەری ب دینێ نوی ئینا، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێن خۆ ل مالا (الأرقم ابن أبي الأرقم)ی ب دزی ڤە کۆم دبوون، ڕۆژەکێ پێغەمبەر و هندەک صەحابی دەرکەفتنە کەعبێ، ئەبووبەکر د ناڤ خەلکی دا ڕابووڤە ب دەنگەکێ بلند ئاخفت و ژ خەلکی خواست ئەو بێنە د ئیسلامێ دا، و ئەڤ خوتبا ئەبووبەکری دئێتە هژمارتن ئێکەمین خوتبە ب رەنگەکێ ئاشکەرا د دیرۆکا ئیسلامێ دا دئێتە خواندن.

کافرێن قورەیشییان دینبوون! چاوا مرۆڤەک بستە بکەت و ل نک وان داخوازێ بکەت کو خەلک دینێ باب و باپیرا بهێلن! ئەڤە نابت.. ڕابوون ب موسلمانان وەر هاتن و هەر ئێکی ژ لایێ خۆ ڤە درب وەشاندنێ و ئاخفتنێن کرێت و سەقەت گۆتنێ!

يێ ژ هەمييان پتر تويشی نەخۆشييێ بووی ئەبووبەکر بوو، پتر ژ وان ب ئەبووبەکری وەرهاتن و هند ب ئەبووبەکری دادان حەتا درێژکرييە عەردی و (عتبە بن ربيعە) چوو سەر زکێ وی و هەر ل سەر و چاڤان دا، حەتا وە لێ هاتی کەسێ دفنا وی ژ روييێ وی جودا نەدکر.. گاڤا ئويجاخا ئەبووبەکری -کو بابکێ تەيميان بوو ژ قورەيشييان- ب ڤێ چەندێ زانی د هەوارا ئەبووبەکری هاتن و ئەو ژ بن دەست و پێيێن خەلکی ئينادەرێ و برە مال، هنگی ئەبووبەکر يێ دلگرتی بوو و ئەزمان لێ شکەستبوو، تەيمی چوونە کەعبێ و گۆتن: هەما تشتەک ل ئەبووبەکری هات ئەم دێ عوتبەی پێش وی ڤە کوژين.

هەر ل وێ رۆژێ ئەبووجەهلی گەلەک گۆتنێن پيس و کرێت گۆتنە پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن-، موسلمان ب برينێن خۆ ڤە زڤرينە مالێن خۆ، سەربۆرەکا نەخۆش و گران بوو بەلێ يا بێ فايدە نەبوو، دو فايدێن مەزن تێدا هەبوون:

ئێک: خەلکێ مەکەهێ هەمييان زانی کو موسلمان يێن وە لێ هاتين بشێن بێژن: ئەم ژی يێن هەين، و هەر جارەکا حەقی شيا بێتە مەيدانێ بلا ل بەرچاڤ بشکێت ژی، دێ يا سەرکەفتی بت.

دو: عەگيدێ بنەمالا هاشمييان کو حەمزە بوو هاتە د ناڤ رێزا موسلمانان دا.

چاوا؟

ل ئێڤارا وێ رۆژێ يا کو موسلمان بۆ جارا ئێکێ دەرکەفتينە کەعبێ و ب دەستێن کافران هاتينە قوتان، حەمزە ژ نێچيرا خۆ زڤری، وەکی عەدەتێ وی هەر رۆژ بەری شيرێ خۆ بدانت و تيروکڤانێ خۆ ژ ملێ خۆ ڤەکەت، هات قەستا کەعبێ کر، ئەو جهێ بەری هنگی بوويە مەيدانا

خۆلێکدانێ، حەمزە ل دۆر کەعبێ زڤڕی و چوو قستا مالا خۆ کر، ب ڕێ ڤە مرۆڤەکی خۆ ڤێ ڕا گەهاند:

- ئەبوو عومارە دێ کیڤە چی؟

حەمزەی گۆت: دێ چمە مال.

گۆتێ: تە زانییە ئەڤرۆ چی یێ چێبووی؟

گۆت: نە، چ چێبوویە؟

گۆتێ: ئەبولحەکەمی گەلەک گۆتن و ئاخفتنێن سەقەت و کرێت یێن گۆتینە برازایێ تە موحەممەدی.

- ئەو چاوا؟

گۆت: بەلێ، حال و مەسەلێن وان ئەڤە بوون!

حەمزەی ڕێکا خۆ گوهاڕت، زڤڕی ڤە کەعبێ، چونکی وی ئەبووجەهل بەری هنگی ل وێرێ دیتبوو، حەمزە ب ژۆر کەفت دیت ئەبووجەهل و هژمارەکا دی یا سەر و گرگرێن مەکەهێ ل (دار الندوە) دروینشتینە، حەمزە ڕاست ب نک ئەبووجەهلی ڤە چوو، خەلکێ دیوانێ حێبەتی مان دەمێ وان دیتی حەمزەی کڤانێ خۆ ژ ملێ خۆ ڤەکر و ڕاکرە ڤە و ل سەرێ ئەبووجەهلی دا حەتا خوینێ تێ هاڤێتی! ئەبووجەهلی خۆ تەعل و ترش کر، حەمزەی گۆتێ: وە لێ هات تو خەبەران بێژییە برازایێ من، ئەگەر تو زەلامی ڕابە ل من بزڤڕینە. هندەک مرۆڤێن ئەبووجەهلی ڕابوون دا بێنە حەمزەی ئەبووجەهلی گۆتە وان: ئەبوو عومارەی بهێلن، ب ڕاستی من ئاخفتنێن کرێت گۆتبوونە برازایێ وی.

هندەکان گۆتە حەمزەی: دیارە تو ژی یێ خڕیای؟ یەعنی: یێ چوویە سەر دینێ موحەممەدی! حەمزەی هند دیت ژ دەڤی دەرکەفت و گۆت: بەلێ، کی دێ من مەنعە کەت؟! و زڤڕی مال.

وێ شەڤێ هەمییێ حەمزە یێ دودل بوو، ئەڤە من چ گۆت؟ ئاخری ئەز نەچوویمە سەر دینێ موحەممەدی، چاوا من وە گۆت؟ چاوا دینێ باب و باپیرێن خۆ بهێم و بچمە د دینەکێ نوی دا؟ نە ئەز دینێ خۆ ناهێلم، بەلێ پا.. من د ناڤ مەزنێن قورەیشییان دا گۆت: ئەزێ موسلمانبوویم، و نوکە ئەڤ سوحبەتە ل بازێری هەمییێ بەلاڤبوویە، شەرمە بۆ من ئەز ل گۆتنا خۆ لێڤە بم.

ب ڤی رەنگی حەمزە د گەل خۆ کەفتە دان و ستاندنێ، سپێدێ بڕیار دا نەچتە نێچیرێ، ڕابوو کارێ خۆ کر و قەستا وی جهی کر یێ برازایێ وی لێ، هندەکان گۆتێ: یێ ل مالا ئەرقەمی.

حەمزە هاتە نک و گۆتێ: برازا، ئەز یێ کەفتیمە د کارەکی دا نزا دێ چاوا خۆ ژێ دەربێخم، ئەز حەز دکەم تو پیچەکێ بۆ من باخڤی بەلکی ئەز ڕێکەکێ بۆ خۆ ببینم.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا وی دا و پیچەکێ بۆ ئاخفت، ئینا دلێ وی فرەهبوو و شاهدە دا، کەیفا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و یا موسلمانان گەلەک پێ هات، و ب موسلمانبوونا وی خودێ ئیسلام و موسلمان سەرفەرازکرن.

ئەڤە وەکی مە گۆتی ل سالا شەشێ ژ هنارتنا پێغەمبەری بوو، ل هەیڤا (ذو الحجە)یێ، دەمێ ژییێ حەمزەی چل و شەش سال.

پشتی حەمزە هاتییە د ئیسلامێ دا، ل ڕۆژا چارشەنبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعایەک کر کو خودێ ئێک ژ دو عومەران بینتە د ئیسلامێ دا: عەمرێ کوڕێ هشامی (ئەبووجەهلی) یان عومەرێ کوڕێ خەططابی، چونکی هەردو گەلەک د زیرەک بوون. ل ڕۆژا د دویڤ دا، ل پێنج شەمبێ، دەمێ موسلمان د مالا ئەرقەمی ڤە، وان هند دیت

مرۆڤەکی حێل دەرگەهـ قوتا و هژهژاند، ئێکی د کونا دەرگەهی ڕا بەرێ خۆ دایێ، دیت عومەرە شیرێ وی یێ د دەستان دا.. ئەو نەوێریا دەرگەهی ڤەکەت زوی زڤڕی و گۆت: عومەرە!

حەمزەی شیرێ خۆ ڕاکر و گۆت: دەرگەهی ڤەکە، ئەگەر وی حەقی بڤێت ب خێر بێت، ئەگەر نە کوشتنا وی ل بەر مە یا ب ساناهییە!

ئەو بوو عومەر ب ژۆر کەفت و شاهدە دا.. گاڤا عومەری شاهدە دای پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل موسلمانان گۆت: (الله أكبر) حەتا دبێژن: دەنگێ وان ب سەر خانی کەفت.

گاڤا عومەر ژ مالا ئەرقەمی دەرکەفتی، ل مەکەهێ هەمییێ گەڕیا و چی جهێ چووبایێ دگۆت: ئەز یێ موسلمانبوویم! ل سەری چوو نک خالێ خۆ ئەبووجەهلی گۆتێ: ئەز یێ موسلمانبوویم و کا تو چ دکەی بکە.. پاشی هاتە کەعبێ تەواف کر و چوو نک مەزنێن قورەیشییان و ب دەنگەکێ بلند شاهدە دا هندەک پێ وەرهاتن، ئێک ژ وان عوتبە بوو، ئەوێ چوویە سەر زکێ ئەبووبەکری، عومەری دەست دایێ عوتبە دانا بن دەست و پییێن خۆ و چوو سەر زکی و تبلێن خۆ کرنە د چاڤان ڕا و عوتبەی دکرە هاوار، ئینا خەلک هەمی ڕەڤین و عوتبە هێلا د دەستان دا، و حەتا عومەری تێر پێ دادا‌ین بەردا و زڤڕی نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و سەحبەتا خۆ بۆ ڤەگێڕا.

ل وێ نیڤرۆیێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مالا ئەرقەمی دەرکەفتە کەعبێ، حەمزە و عومەر هەردو ل بەراهییێ بوون، چوو د کەعبێ ڤە ل پێش چاڤێن کافران نڤێژکر و حەمزەی و عومەری حەرەسی لێ دگرت ئینا کەسێ نەوێریا خۆ نێزیک بکەت.

ب ڤی رەنگی خودێ ئیسلام ب حەمزە و عومەری زالکر و موسلمان ب وان سەرفەرازکرن.. و ل رۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایە صەحابییێن خۆ کو دەرکەڤن، موسلمانان خۆ کرە دو رێز، رێزا ئێکێ حەمزە ل بەراهییێ بوو، و رێزا دویێ عومەر ل بەراهییێ بوو.. عومەر د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: گاڤا قورەیشییان ئەز و حەمزە دیتین، چ رۆژان وەکی وێ رۆژێ ئەو تێک نەچوون!

پشتی حەمزە موسلمانبووی یازدە سالان ل مەکەهێ مابوو، د ڤان یازدە سالان دا چ تشتێ بەرچاڤ د ژینا وی دا نینە مرۆڤ بەحس ژێ بکەت، ب تنێ پێتڤییە بێژین: حەمزە ژ وان موسلمانێن ب هێز بوو لەو کافران نەدشیا چو نەخۆشییان بگەهیننێ، و حەمزە ژ وان صەحابییان نەبوو یێن مشەختبووینە حەبەشە، و دەمێ قورەیشییان بنەمالا هاشمییان ل گەلییێ ئەبوو طالبی دۆرپێچکرین حەمزە ژی ئێک ژ وان بوو یێن هاتینە موحاصرەکرن.

ل سالا سێزدێ پشتی هاتنا ئیسلامێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا صەحابییێن خۆ کو بەر ب مەدینێ ڤە مشەخت ببن. و حەمزە ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن زوی -بەری پێغەمبەری- مشەختبووین، و دئێتە زانین کو پیرا حەمزەی سەلما دەیکا عەبدلموطەلبی ژ خەلکێ مەدینێ بوو، کچا عەمرێ کورێ زەیدێ خەزرەجی بوو سەییدێ (بنی النجار).. حەمزە دەمێ مشەختبووی ژییێ وی پێنجی و حەفت سال بوون.

حەمزە د گەل هندەک هەڤالێن خۆ ژ مەکەهێ دەرکەفت و بەر ب مەدینێ ڤە چوو حەتا گەهشتییە (قوبائێ)، ئەو و زەیدێ کورێ حارثەی، و ئەبوو مەرثەدێ غەنەوی، و هندەکێن دی.. ل قوبائێ ئاکنجیبوون، بوونە مێڤانێن (کلثوم بن الهدم)ی و هندەک دبێژن: حەمزە ل مالا (أسعد بن

الـزراره)ی بـوو حـەتا پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- مشـەختبووی و هاتییـە مەدینێ.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- (سیستەمێ براینییێ) ل مـەدینێ دانای حەمزە و مەولایێ خۆ زەید کرنە برایێن ئێک، لەو ل رۆژا ئوحـەدێ حەمزەی وەصیەت بۆ زەیدی کر.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ گەهشـتە مـەدینێ، پشتی نێزیکی یازدە هەیڤا، و ب دورستی ل هـەیڤا صـەفەرێ ژ سـالا دویـێ مشـەختی، پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- بـۆ ئێکـەمین غـەزایێ ژ مـەدینێ دەرکـەفت، ئـەوا دبێژنـێ: (غـزوه الأبـواء)، د ڤـێ غـەزایێ دا ئـالایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ سپی بوو، و د دەستێ حەمزەی دا بوو.

پشتی لەشکەر زڤرییە مەدینێ بێی چو شەڕ چێ ببت و ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سـالا دویـێ مشـەختی پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- سـەرییەک ژ سیهـ زەلامـێن موهاجری پێکئینا و حەمزە کرە سەرۆکێ وێ و ب لایێ بـەحرێ ڤـە هنـارت.. و دیرۆکڤـان دبێـژن: حـەمزە ئێکـەمین کـەس بـوو پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئـالا کرییـە د دەسـتی دا و کرییـە مـەزنێ سەرییەکێ.

غەزایا دویێ یـا پێغەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- پـێ ڕابووی ئەو بـوو یـا دبێژنێ: (غزوه بواط) د ڤێ غەزایێ دا ئالا د دەسـتێ سـەعدێ کوڕێ ئـەبوو وەقاصی دا بوو.

د غـەزایـا سییێ دا (غزوه العشیره) ئەوا ل هەیڤا (جمـادی الاولـی) ژ سالا دویێ چێبووی، ئـالایـێ پـێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بـن- جارەکا دی د دەستێ حەمزەی دا بوو.

ڕۆژ و هەیڤ چوون.. حەتا بوویە ڕەمەزان ژ سالا دویێ، چەند ڕۆژەک ژ ڕەمەزانێ بۆرین ئەو بوو پێغەمبەر و سێسەد و تشتەک ژ هەڤالێن خۆ دەرکەفتنە بەدرێ، ئالایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ مەزن و سپی بوو و د دەستێ (مصعب بن عمیر)ی دا بوو، و دو ئالایێن دی یێن بچویکتر ژی هەبوون ئێک د دەستێ ئیمام عەلی دا بوو و یێ دی د دەستێ (سعد بن معاذ)ی دا بوو.

شێرێ خودێ و پێغەمبەرێ وی حەمزە ئێک ژ وان فێرسان بوو یێن دەرکەفتینە بەدرێ. ب ڕێ ڤە حەمزە و زەید و دو مرۆڤێن دی پێکڤە حێشترەک د گەل بوو هەر بێنەکێ ئێک ژ وان لێ سویار دبوو.

ل هەڤدەی ڕەمەزانێ لەشکەرێ موسلمانان و لەشکەرێ کافران ل نێزیکی کانییێن بەدرێ گەهشتنە ئێک، بەری ڕۆژ ئاڤا ببت مەسەلە ب دووماهی هات ڕەڤ کەفتە ناڤ ڕێزێن کافران، حەفتێ کوشتی و حەفتێ ئێخسیر مانە ل مەیدانێ، و هژمارەکا نە یا کێم ژ کوشتییان سەر و گرگرێن وان بوو، وەکی: عوتبە و کوڕێ وی وەلید و برایێ وی شیبە و ئەبووجەهل و ئومەیە و... گەلەکێن دی.

گەلەک ژ ڤان کوشتییان ب دەستێ حەمزەی هاتبوونە کوشتن، چونکی ل وێ ڕۆژێ ب دورستی حەمزەی دا زانین کو ئەو شێرێ خودێیە یێ قەت ترس ڕێکا خۆ بۆ دلێ وی نابینت.. ژ وان یێن کو حەمزەی ل ڕۆژا بەدرێ کوشتین: مامێ جوبەیرێ کوڕێ موطعەمی بوو ئەوێ دگۆتنێ: طوعەیمە. جوبەیری بەنییەک هەبوو زێدە یێ سەگڤان بوو بۆ هاڤێتنا ڕمان، دگۆتنێ: وەحشی. جوبەیری گۆتێ: هەما تو مامێ موحەممەدی پێش مامێ من ڤە بکوژی ئەز دێ تە ئازا کەم.

وەحشی ل بەر هات، ل سالا سییێ دەمێ کافرێن مەکەهێ بۆ ئوحودێ دەرکەفتین، وەحشی ئەڤ دەرکەفتنە بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی، د گەل کافران دەرکەفت نە کو دا شەڕی بۆ وان بکەت، ئەڤە تشتەک بوو وی شۆل پێ نەبوو، بەلێ دا حەمزەی بکوژت و خۆ ژ عەبدینییێ ئازا کەت.

هەردو لەشکەر ل ئوحودێ گەهشتنە ئێک، کافر سێ هزار بوون و موسلمان حەفت سەد بوون، ل دەسپێکا شەڕی لەشکەرێ کافران شکەست، ڕەڤ کەفتە ناڤ ڕێزێن وان و موسلمانان دا پ دویڤ ڤە، پاشی مەسەلە دەرنشیڤ بوو پشتی هندەک ڕمبازێن موسلمانان پشتا لەشکەری بەردای و سویارێن کافران ل پشت لەشکەری زڤڕین، حەفتێ صەحابی ل وێ ڕۆژێ هاتنە شەهیدکرن، ئێک ژ وان حەمزە بوو، وەحشی سۆزا خۆ ب جهئینا!

شەڕ هێدی هێدی بەر ب دووماهییێ ڤە چوو، مەسەلە ل بەر هەردو لایان بەرزەبوو.. کی یێ ب سەرکەفتی بوو و کی یێ شکەستی بوو؟ ئەڤە مەسەلەکا ئالۆز بوو! کی هاتییە کوشتن و کی مایە ساخ؟ ئەڤە ژی ب ساناهی نەدهاتە زانین ژ بەر وان هەردو شلقێن مەزن یێن ب هەردو لایان کەفتین.. لەشکەرێ موسلمانان ل دەمەکی خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشا و ب لایێ چیایێ ئوحودێ ڤە چوون، کافران هزرکر ئەڤە ڕەڤینە، هەمی کۆمبوونە سەرک و ب دلێ خۆ یاری ب لەشێن شەهیدان کرن، گوهێن وان برین، دفنێن وان ژێڤەکرن، و زکێن وان دڕاندن.. و ئەڤە کارەک بوو عەرەبان ب چاڤەکێ کێم بەرێ خۆ ددایێ و ب فهێتی دزانی، لەو بەری لەشکەرێ کافران خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشت مەزنێ وان ئەبوو سوفیان هاتە ڕاستا موسلمانان و گازی کر:

- هندەک تشت یێن هاتینەکرن ب دلێ من نەبووینە، بەلێ ژنکان ئەو یێن کرین.

ئەڤ ژنکە هەمی ئەو بوون یێن ل ڕۆژا بەدرێ مرۆڤێن وان هاتینە کوشتن، لەو ل ڕۆژا ئوحودێ دلێن وان ب کوشتنێ ب تنێ هوین نەبوون، ڕابوون یاری ژی ب لەشێن کوشتییان کرن.

پشتی لەشکەرێ کافران خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشای پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل صەحابییێن خۆ ژ چیای هاتنە خوارێ دا شەهیدێن خۆ بناسن، و ڤەشێرن، و بزانن کانێ کافران هندەک ئێخسیرکرینە یان نە، پشتی ب سەر جەنازێ گەلەک شەهیدان هلبووین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بۆ من ل حەمزەی بگەڕیێن، پشتی جەنازێ حەمزەی ژی هاتییە دیتن پێغەمبەر هاتە هنداف، دیمەنەکێ زێدە دلئێش بوو، چاڤێن وی تژی رۆندک بوون، و ب دلەکێ پڕ کوڤان ڤە گۆت: ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا کو صەفییا دێ عێجز بت، و خەلک دێ چاڤ ل من کەت من ئەو نەدڤەشارت.. پاشی وی سویند خوار چی ڳاڤا ئەو جارەکێ شیا قورەیشییان دێ کەلەخێن سیهـ ژ وان وەکی حەمزەی لێ کەت، ئینا ئایەت هاتە خوارێ:

﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ ﴾

(النحل: ١٢٦) یەعنی: ئەگەر هەوە ڤیا تۆلێ ژ وی بستینن یێ تەعدایی ل هەوە کری، هوین ژ وێ زێدەتر نەکەن یا وی د گەل هەوە کری، و ئەگەر هوین صەبرێ بکێشن ئەو بۆ سەرکەفتنا د دنیایێ دا و بۆ خێرا مەزنا ل ئاخرەتێ بۆ هەوە چێترە.

ل وی دەمێ پێغەمبەر و هندەک صەحابی ل هنداف جەنازێ حەمزەی، زوبەیر دبێژت: مە دیت صەفییا -دەیکا من- ژ دویر ڤە یا ب نک مە ڤە دئێت، پێغەمبەری گۆتە من: هەرە بەراهییێ نەهێلە بێت.. هەر وەکی پێغەمبەری نەدڤیا ئەو بێت و برایێ خۆ ب ڤی رەنگی ببینت. گۆت: ئەز چوومە بەراهییێ دا نەهێلم بێت، ئینا وێ پالەک ب من ڕادا ئەز پاشدابرم،

من گۆتێ: پێغەمبەری یێ گۆتییە من نەهێلە بێت. ئینا ئەو د جهـ دا راوەستیا و گۆت: من یا زانی وان یێ چ ل برایێ من کری، ئەوا ب سەرێ برایێ من هاتی تشتەکێ گەلەکێ کێمە د رێکا خودێ دا بێتە سەرێ مرۆڤی.

پێغەمبەری گوهـ ل دەنگێ وێ بوو، زانی ئەڤە وەکی هەمی ژنکان نینە ئینا گۆت: رێکێ بدەنێ!

حەمزە د گەل شەهیدێن دی ل مەیدانا ئوحودێ هاتە ڤەشارتن، و دەمێ حەمزە شەهیدبووی ژیێ وی پێنجی و نەهـ سال بوون، و سێ عەیال هەبوون، دو کوڕ: (یەعلا) و (عامر) و کچکەک: (ئومامە)، و هندەک دبێژن ناڤێ وێ (عومارە) بوو. عەیالێ حەمزەی هەر سێ بێ دووندەهـ مربوون.

جابرێ کوڕێ عەبدللاهێ ئەنصاری -و بابێ وی ئێک ژ شەهیدێن ئوحودێ بوو- دبێژت: ل سەر زەمانێ موعاویەی -یەعنی: نێزیکی چل سالان پشتی شەڕێ ئوحودێ- رێکا ئاڤێ د سەر قەبرێن شەهیدێن ئوحودێ ڕا هاتەبرن، ئینا مە کەلەخێن وان ژ وی جهی ڤەگوهاستنە جهەکێ دی مە دیت کەلەخێن وان ددورست بوون تو دا بێژی دنڤستینە، دبێژت: مەرکا ئێک ژ مە ب پیەکێ حەمزەی کەفت خوین ژێ هات! د حەدیسەکا دورست دا هاتییە کو حەمزە سەروەرێ (سەیید)ێ هەمی شەهیدانە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مامێ خۆ حەمزە د گەل خوارزایێ وی عەبدللاهێ کوڕێ ئومەیما کچا عەبدموطەلبی، کو دبتە کوڕێ مەتا پێغەمبەری د ئێک قەبری دا ڤەشارتن.

سلاڤ ل حەمزەی بن ڕۆژا وی بەرەڤانی ژ دینێ خودێ کری، و ڕۆژا وی رحا خۆ گۆری کری، و ڕۆژا ئەو سەرفەراز دچتە بەحەشتا خودایێ خۆ.

# باپیرێ خەلیفەیان
# عەبباسێ کوڕێ عطەلبی

بابێ فەضلی، عەبباس کوڕێ عەبدلموطـطـەلبێ کوڕێ هاشمییە، و ئەو بچویکترین کوڕێن عەبدلموطـطـەلبی بـوو، ناڤێ دەیکا وی نوتـەیلایا کچا خەببابی بوو.

دو یـان سـێ سالان بەری پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بن- ئـەو بـووبـوو ل مەکەهێ، و نێزیکی حشتێ و هشت سالان عەمر بربوو، چونکی ل سالا سیهـ و دویێ مشەختی مربوو.

دەمێ بابێ وی عەبدلموطـطـەلب مری ئەو یێ دەهـ سالی بـوو، بـەلێ د گەل هندێ ژی ئاڤدانا حەجییان و ڕابوونـا ب کـارێ کـەعبێ (السقایة و العمارة) عەبباسی ژ بابێ خۆ وەرگرت و د دەسـتێ وی دا بـوو د جاهلیـەتێ و ئیسـلامێ ژی دا، و پشـتی وی ژی ئـەڤ هـەردو کـارە مانـە د دەسـتێن عەیالێ وی دا، و ئەڤ کارە د چاڤێن عەرەبان دا بـەری ئیسـلامێ و پشـتی ئیسلامێ ژی ژ کارێن زێدە ب قەدر بوون و ب دەست کەسێ نەدکەفتن.

عـەبباس ل مەکـەهێ مـەزن بـوو، و ژ بلـی کـارێ ئاڤـدانا حـەجییان و ڕابوونا ب سەر و بەرێ کەعبێ، ئەوی دەست ب کارێ بازرگانییێ ژی کربوو و بووبوو ئێک ژ مالدار و زەنگینێن مەکەهێ.

حەتا هاتنا ئیسلامێ ژی دەنگ و باسێن وی نینن، و پشـتی برازایـێ وی بۆ پێغەمبەرینییێ هاتییـە هلبژارتن و خودێ فـەرمان لـێ کـری کـو ئـەو گازییا خۆ بگەهینتە مرۆڤێن خۆ یێن نێزیـک، ئـەو ڕابـوو مـام و پسـمامێن خۆ هـەمی داخوازکرنـە خوارنـەکێ ل مـال و گازییـا خـۆ گـەهاندێ، وێ گـاڤێ

چار مامێن وی مابوون: ئەبوو طالب و ئەبوو لەهەب و حەمزە و عەبباس، د ڤێ سەرهاتییێ دا بەحسێ عەبباسی بۆ ئێکەمین جار دئێتەکرن.

ژ ڤان هەر چار مامێن وی ب تنێ حەمزە بوو یێ هێشتا زوی باوەری پێ ئینای، ئەبوو لەهەب گەلەک کرێت و زڤر ئاخفت، ئەبوو طالبی گۆتێ: ئەز دینێ باب و باپیرێن خۆ ناهێلم بەلێ هندی ژ من بێت دێ بەرەڤانییێ ژ تە کەم.. عەبباسی ژی باوەری -هنگی- پێ نەئینا، بەلێ یێ دیار بوو کو ئەو د دەرحەقا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- یێ نەرم بوو لەو گۆتنێن زڤر نەگۆتنێ، بەلکی بەرەڤانی ژی هندەک جاران ژ وی و هەڤالێن وی دکر دەمێ کافران نەخۆشی دگەهاندێ.

ل سالا حەفتێ پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ کافرێن مەکەهێ بڕیار دای بنەمالا هاشمییان بێخنە بن حیصارێ، عەبباس ژی -هەر چەندە هنگی یێ کافر ژی بوو- بڕیار دا خۆ بدەتە د گەل پێغەمبەری و بنەمالا هاشمییان و نەهێلت چو نەخۆشی بگەهنە پێغەمبەری، و کوڕێ وی (عەبدللاهـ) صەحابییێ ب ناڤ و دەنگ ئەوێ ب لەقەبێ (ابن عباس، حبر الأمة) دئێتە ناسین ل وی دەمی ل گەلییێ ئەبوو طالبی بووبوو. سێ سالان عەبباس و مالا خۆ، د گەل بنەمالا هاشمییان، مانە ل بن حیصارێ، و هنگی عەبباس زڤری حەتا هاشمی هەمی زڤڕینە مەکەهێ.

پشتی مرنا ئەبوو طالبی ل سالا دەهێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و حەتا سالا سێزدێ دەمێ پێغەمبەر ژ مەکەهێ دەرکەفتی و مشەختبووی، عەبباسێ مامێ وی ل دویڤ شیانا خۆ چاڤێ خۆ ددایێ، و هەر چەندە ئەو یێ کافر ژی بوو بەلێ باوەرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک پێ دهات، و د هندەک مەسەلێن گرنگ دا گۆتنا وی وەرگرت و

دچوو مالا وی دا کافر بەلا خۆ ژێ ڤەکەن. و سەرهاتییا ژ هەمییان مەزنتر یا کو پشتەڤانییا عەبباسی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تێدا ئاشکەرا بووی، سەرهاتییا (بیعة العقبه) بوو.

دیرۆکڤان دبێژن: ل سالا (١١) پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ هندەک موسلمانێن خەلکێ یەثربێ هاتینە مەکەهێ دا ژ پێغەمبەری بخوازن کو دەرکەڤیتە نک وان، هندەک ژ وان ب دزی ڤە خۆ گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ژێ خواست ژڤانەکی بدەتە وان دا ئەو و ئەو پێکڤە کۆم ببن و ل دۆر دەرکەفتنا پێغەمبەری باخڤن، هنگی پێغەمبەر ل مالا مامێ خۆ عەبباسی بوو ئینا ئەو ل سەر هندێ پێک هاتن کو ل شەڤەکێ ژ وان شەڤان ل وی جهێ دبێژنێ: (العقبه) کۆم ببن.

ئەو شەڤ هات، زەلامێن ئەوس و خەزرەجی یێن موسلمان ل درەنگی شەڤ خۆ ژ هەڤالێن خۆ ڤەدزی و هاتنە جهێ ژڤان پێ هاتییەدان، هژمارا وان حەفتێ و سێ زەلام و دو ژن بوون. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل ژڤانێ هات، مامێ وی عەبباس د گەل بوو، عەبباس هنگی زەلامەکێ کافر ژی بوو بەلێ د گەل هندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- باوەری پێ هەبوو لەو د گەل خۆ بربوو.

بەری هەمییان عەبباسی دەست ب ئاخفتنێ کر و گۆت: گەلی خەزرەجییان، هوین دزانن جهێ موحەممەدی د ناڤ مە دا چەندە، و ب ڕاستی مە ئەو ژ مللەتێ خۆ یێن کو ل سەر ڕەئیا مە پاڕاستییە، مەعنا ئەو ل باژێرێ خۆ و د ناڤ مللەتێ خۆ دا یێ پاڕاستی و بێ منەتە، بەلێ وی ژ ناڤبەرا خەلکی هەمییێ هوین یێن هەلبژارتین دا بێتە نک هەوە، ڤێجا ئەگەر هوین د خۆ ڕا نەبینن وی بپارێزن و هوین هزر بکەن کو دێ وی شەرمزار کەن پشتی دەردکەڤیتە نک هەوە، هەما هەر ژ ڤێ گاڤێ بهێلن؛

چونكى ئەو ل بازێرێ خۆ و د ناڤ مللەتێ خۆ دا یێ بێ منەتە.. عەبباسی ب ڤێ گۆتنا خۆ دڤیا ئەوس و خەزرەجییان تێ بگەهینت كو برازایێ وی یێ بێ خودان نینە، و هندەك یێن هەین وی بپارێزن ئەگەر لێ بوو تەنگاڤی..

ئەو د عەبباسی گەهشتن، لەو گۆتن: مە گوهـ لێ بوو یا تە گۆتی، ئەی پێغەمبەرێ خودێ ڤێجا تو باخڤە.. ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ نوی ئاخفت و شەرتێن خۆ گۆتن، و پشتی ڤێ كۆمبوونێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا صەحابییان كو بەر ب یەثربێ ڤە مشەخت ببن.

ئامادەبوونا عەبباسی ل ڤێ كۆمبوونا ب دزی ڤە نیشانا هندێیە كو ئەو دەمێ هێژ یێ كافر پشتەڤانێ موسلمانان بوو.

ل سالا دویێ پشتی مشەختێ، ل هەیڤا رەمەزانێ، شەرێ بەدرێ چێبوو، دەمێ خەلكێ مەكەهێ زانی موسلمان یێن هاتینە د رێكا كاروانێ وان دا رابوون خۆ لێكدان، و ب لەز د هەوارێ دەركەفتن، د ناڤ لەشكەرێ كافران دا هندەك كەس هەبوون ئەڤ دەركەفتن ب دلێ وان نەبوو، بەلێ وان نەڤیا د مالا خۆ دا رونن؛ دا دلێ مللەتێ وان ژێ نەمینت ژ لایەكی ڤە، و ژ لایەكێ دی ڤە دا كەس نەبێژت: دیارە ئەڤە دترسن و نەوێرن دەركەڤن.. ئێك ژ ڤان رەنگە مرۆڤان عەبباسێ مامێ پێغەمبەری بوو.

دو گۆتن د دەرحەقا عەبباسی دا هەنە ل وی دەمی:

یا ئێكێ: (ابن اسحق) ژ (أبو رافع)ی ڤەدگوهێزت، دبێژت: ئەز خولامێ (عەبدێ) عەبباسێ كورێ عەبدلموطەلبی بووم، و ئیسلام هاتبوو د ناڤ مالا مە دا، عەبباس و دەیكا فەضلی و ئەز، ئەم موسلمان بووبووین. پاشی پێدا دچت و ئەگەرێ دەركەفتنا عەبباسی بۆ شەرێ بەدرێ دیار دكەت و دبێژت: عەبباس ژ مللەتێ خۆ دترسیا و نەدڤیا خۆ ژ وان جودا بكەت لەو موسلمانەتییا خۆ ڤەدشارت.

ژ ڤێ گۆتنێ دیار دبت کو عەبباسی هێشتا بەری شەڕێ بەدرێ باوەری ب ئیسلامێ ئینابوو، بەلێ مابوو ل مەکەهێ مشەخت نەبووبوو و ئیسلاما خۆ ژی ئاشکەرا نەدکر.

یا دویێ: و ئەڤەیە یا مەشهوور، وەکی (ابن حجر) د (فتح الباری) دا دبێژت حەتا بەری فەتحا مەکەهێ ب دەمەکێ کێم ژ نوی عەبباس موسلمان بووبوو و مشەخت نەبووبوو، لەو (عومەرێ کوڕێ خەططابی) ئەو نەکربوو ژ (أهل الشوری) هەر چەندە عومەری گەلەک قەدرێ وی دگرت و ب دورستی بهایێ وی دزانی ژی.

هەر چاوا بت عەبباس ل سالا دویێ ژ مشەختێ د گەل لەشکەرێ کافران دەرکەفتبوو شەڕێ بەدرێ، و (ابن اسحق) ژ عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل ڕۆژا بەدرێ گۆتە صەحابییان: هەچییێ ژ هەوە (أبو البختری) و (عەبباس) دیتن نەکوژن، چونکی ئەو بێی دلێ خۆ یێن هاتینە ئینان.

ئەگەر ئەڤ ریوایەتە یا دورست بت ئەو دێ هندێ گەهینت کو عەبباس ژ شەرمێن قورەیشییان دا هاتبوو شەڕی نە کو ژ دل هاتبوو، تشتەکێ دی دڤێت ژ بیر نەکەین: کافر دەمێ ژ مەکەهێ دەرکەفتین دا د هەوارا کاروانێ ئەبوو سوفیانی دەرکەڤن، ئەو دپشتڕاست نەبوون کو شەڕ دێ ئێتەکرن، و گەلەک ژ وان ل وێ باوەرێ بوون کو ب تنێ د حالەتەکی دا شەڕ دێ ئێتەکرن، ئەو ژی ئەگەر کاروانێ قورەیشییان کەفتە دەستێ موسلمانان، و دویر نینە عەبباس ب خۆ ژی ئێک ژ وان کەسان بت یێن هزرکری کو شەڕ نائێتەکرن، و ئەگەر زانیبا شەڕ دێ ئێتەکرن دەرنەدکەفت، و تشتێ مە پال ددەت کو ڤێ هزرێ بێژین، ئەوە: ل ڕۆژا ئوحودێ دەمێ کافر بۆ شەڕی ژ مەکەهێ دەرکەفتین، عەبباس دەرنەکەفت، و نەوەبت بێتە هزرکرن کو

عەبباس ژ شەڕی دترسیا، نە! ل ڕۆژا (حونەینێ) عەبباس زەلامێ ئێکانە بوو یێ کو د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مایە ل سنگێ شەڕی دەمێ خەلک هەمی ڕەڤین، عەبباس نە ئەو زەلام بوو یێ ژ شەڕی دڕەڤی، بەلێ شەڕێ پێغەمبەری و موسلمانان تشتەک بوو عەبباسی قەناعەت پێ نەبوو، ما عەبباس نە هەر ئەو بوو یێ گۆتییە خەلکێ مەدینێ: ئەگەر هوین بەرەڤانییێ ژ برازایێ من نەکەن بهێلن ئەم دێ بەرەڤانییێ ژێ کەین؟ ڤێجا چاوا ئەو ب خۆ شیرێ خۆ ڕاکەت و بچتە شەڕێ برازایێ خۆ؟!

ل ڕۆژا شەڕێ بەدرێ عەبباس ب دەستێ موسلمانان هاتە ئێخسیرکرن، و ئەوێ عەبباس گرتی (أبو اليسر كعب بن عمرو) بوو، پاشی عەبباسی خۆ و دو برازایێن خۆ ژ موسلمانان کڕین، و زڤڕی مەکەهێ.

پشتی شەڕێ بەدرێ ل سالا دویێ مشەختی و حەتا ڕۆژا مەکەهـ تێدا هاتییە ڤەکرن ب دەستێ موسلمانان ل سالا هەشتێ مشەختی، نێزیکە جارەکا دی دەنگ و باسێن عەبباسی نەبن، د هندەک ژێدەران دا هاتییە کو ئەو بەری ڤەکرنا مەکەهێ موسلمان بووبوو و مشەخت بووبوو مەدینێ، بەلێ هندەک ژێدەرێن دی بەرۆڤاژیا ڤێ چەندێ ددەنە زانین و دبێژن: عەبباس مشەخت نەبووبوو مەدینێ حەتا مەکەهـ هاتییە ڤەکرن ژی، و بەری ڤەکرنێ ب دەمەکی ژ نوی ئەو موسلمان بووبوو.

ل دویی هەیڤا ڕەمەزانێ ژ سالا هەشتێ مشەختی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هژمارەکا مەزن ژ موسلمانان -کو نێزیکی دەهـ هزار کسان بوون- ب ئنیەتا ستاندنا مەکەهێ ژ مەدینێ دەرکەفتن، و ل ڕۆژا سێزدێ گەهشتنە مەکەهێ، و هندەک دبێژن: ل دەهێ دەرکەفت بوو و ل بیستێ گەهشت بوو، بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بچتە د مەکەهێ دا ب لەشکەرێ خۆ ڤە، ل جهەکی دانا دبێژنێ: (مر الظهران).

ئبن ئیسحاق ژ عەبباسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل (مر الظهران)ێ دانای من گۆت: ب خودێ ئەگەر پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب زۆردەستی بچتە د مەکەهێ دا بەری خەلکێ وێ بێنە نک ئێمناهییێ ژێ بخوازن حەتا حەتایێ قورەیشی دێ تێ چن.

گۆت: ڤێجا ئەز ڕابووم ل هێسترا پێغەمبەری (البیضاء) سویار بووم و ئەز دەرکەفتم حەتا ئەز هاتیمە (الأراک) من گۆت بەلکی ئەز هندەک مرۆڤان ببینم هاتبنە داران یان ئێک ب کارەکی هاتبت دا بێژمێ دا بچت بێژتە خەلکێ مەکەهێ بێنە نک پێغەمبەری ئێمناهییێ ژێ بخوازن بەری ئەو بچتە د مەکەهێ دا.

ژ ڤێ گۆتنا عەبباسی دئێتە زانین کو ئەو هنگی یێ موسلمان بوو و د گەل لەشکەرێ موسلمانان بوو.

عەبباس دبێژت: ڤێجا دەمێ ئەز دچووم من گوهـ ل دەنگێ (أبو سفیان) و (بدیل بن ورقاء)ی بوو د گەل ئێک و دو دئاخفتن، (أبو سفیان)ی گۆت: چو ئاگر وەکی ئاگری ئەڤ شەڤە من نەدیتییە و چو لەشکەر ژی. (بدیل)ی گۆت: ب خودێ ئەڤە قەبیلا (خزاعه)یە بۆ شەڕی دەرکەفتی. (أبو سفیان)ی گۆت: (خزاعه) ژ ڤێ چەندێ کێمترە.

گۆت: من دەنگێ وی ناسی، ئینا من گازی کرێ، وی ژی دەنگێ من ناسی، ئەز ب نک ڤە چووم و من گۆتێ: (أبو سفیان) ئەڤە پێغەمبەرێ خودێیە دەرکەفتی د گەل مرۆڤان. وی گۆت: نەمان بۆ قورەیشییان بت چارە چییە؟ من گۆت: ب خودێ تو ب کەڤییە لەپان دێ سەرێ تە لێ دەت، وەرە د گەل من سویار ببە دا بچینە نک و ئێمناهییێ ژێ بخوازە، وی گوهێ خۆ دا من و د گەل من هات. ئینا من ئەو بر، ڤێجا هەر جارەکا ئەم د بەر ئاگرەکی ڕا بۆری باین، ئەو دا پسیار کەن: ئەڤە کییە؟ دەمێ هێسترا

پێغەمبەری ددیت و ئەزێ لێ سویار دگۆتنە ئێک و دو: مامێ پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-. حەتا ئەم د بەر ئاگرێ عومەرێ کورێ خەططابی ڕا بۆرین، وی گۆت: ئەڤە کییە؟ پاشی هاتە بەرا من، گاڤا ئەبوو سوفیان د گەل من دیتی، گۆت: دوژمنێ خودێ ئەبوو سوفیان! حەمد بۆ وی خودایێ تو ئێخستییە دەستێ من.

گۆت: مە کرە غار و عومەری دا ب دویڤ مەڤە حەتا ئەم گەهشتینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەڤە خودێ ئەبوو سوفیان ئێخستە دەستێن تە ڤێجا دەستویرییێ بدە من دا سەرێ وی لێ بدەم!

عەبباس دبێژت: ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەبوو سوفیان یێ ل سەر بەختێ من.. پاشی ئەز چووم و من هێدی بۆ پێغەمبەری ئاخفت، دووماهییێ پێغەمبەری گۆتە من: هەرە وی د گەل خۆ ببە و سپێدێ بینە نک من.

گۆت: سپێدێ من ئەو برە نک وی، و ئەبوو سوفیانی ل وێرێ شاهدە دا و هاتە د ئیسلامێ دا.

عەبباسی گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ هندی ئەبوو سوفیانە زەلامەکە حەز ژ مەزنییێ دکەت ڤێجا ئەگەر تو تشتەکی بدەیێ.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەچییێ بچتە د مالا ئەبوو سوفیانی ڤە ئەو یێ ئەمینە.

پشتی ئەبوو سوفیانی لەشکەرێ ئیسلامێ دیتی زڤری مەکەهێ و د ناڤ خەلکی دا گازی کر: گەلی قورەیشییان ئەڤە موحەممەدە هات و هند یێن د گەل دا هوین نەشێنی، ڤێجا هەچییێ بچتە مالا ئەبوو سوفیانی ئەو یێ ئەمینە! و پشتی هنگی موسلمان هاتنە د مەکەهێ دا.

ژ ڤێ سەرهاتییێ دئێتە زانین کو عەبباسی پاشی ئەبوو سوفیانی دەورەکێ مەزن هەبوو کو مەکەهـ بێ شەڕ ل بەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییە ڤەکرن.

پشتی مەکەهـ هاتییە ڤەکرن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا (سقایە الحاج) وەکی بەرێ هەر د دەستێ مامێ وی عەبباسی دا بت، و ب ڤێ چەندێ عەبباس دبتە ئێکەمین کەس ب ئاڤدانا حەجییان ڕابووی د جاهلیەتێ و ئیسلامێ ژی دا.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەکەهـ ڤەکری، جەواب گەهشتێ کو ئویجاخا (هەوازن) و (ثەقەفییان) ل طائفێ یا خۆ دایە ئێک و دێ ئێنە شەڕێ وی، ئینا بڕیار دا ب لایێ وان ڤە دەرکەڤت، ل دووماهییا هەیڤا ڕەمەزانێ دەرکەفت، و هژمارا لەشکەرێ موسلمانان ژ دووازدە هزار کەسان پتر بوو، لەو هندەک ژ موسلمانان گۆت: ئێدی د چو شەڕان دا ئەم ناشکێین.. و ئەڤەیە دەمێ ئایەت دبێژت: ﴿ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾ (التوبة: ٢٥).

دەمێ کافران ب دەرکەفتنا موسلمانان زانی ئەو بەرێ دەرکەفتن و هاتنە نهالا (حونەینێ) د ڕێکێ دا، و وان ل وێرێ ڕێ گرت.. دەمێ لەشکەرێ موسلمانان گەهشتییە وێ نهالێ، سپێدە زوی بوو هێشتا دنیا باش زەلال نەبووبوو، کافران ژ هەمی لایان ڤە تیر و ڕم د موسلمانان وەرکرن، خافلەتی ب لەشکەرێ موسلمانان کەفت، ژ دوازدە هزار مرۆڤان سەد نەمانە ل مەیدانا شەڕی هەمی پاشپاشکی زڤڕین و ڕەڤین، ئەوێن ل سنگی ماین ئەڤە بوون: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەو ل بەراهییا هەمییان بوو، پشتا خۆ نەدا کافران و ما ل سنگی و گازی موسلمانان کر

کو نەرەڤن و دگوت: (أنا النبي لا كذب أنا ابن عبدالمطلب). و ژ وان صەحابییێن کو ماینە د گەل دا ل سنگێ شەڕی: مامێ وی عەبباس و پسمامێن وی: فەضلێ کوڕێ عەبباسی، ئەبوو سوفیانێ کوڕێ حارثی، و برایێ وی رەبیعە، عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی، قوثەمێ کوڕێ عەبباسی، و عوتبە و موعتب کوڕێن ئەبوو لەهەبی.. ئەڤە حەفت پسمامێن وی.

و ژ موهاجرییان: ئەبووبەکر و عومەر و ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی و دەیکا وی (أم أيمن) و ئەیمەن.

یەعنی هەمی نەدبوونە پازدە مرۆڤ!

پاشی نێزیکی حەشتێ مرۆڤان ژ موهاجری و ئەنصارییان زوی زڤڕین و د هەوارا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتن، و گاڤا موسلمانێن دی دیتی کو موسلمانان ب ڤێ هژمارا خۆ یا کێم خۆ ل بەر سنگێ کافران گرت پەشێمانبوون و زڤڕینە مەیدانێ.. و دووماهییێ سەرکەفتن یا موسلمانان بوو.

شەڕێ حونەینێ ل سالا هەشتێ مشەختی ئێکەمین شەڕ بوو عەبباسێ مامێ پێغەمبەری پشکداری تێدا کری د گەل موسلمانان و ب ڕاستی وی ناڤێ خۆ ئینادەر ئەو د گەل برازایێ خۆ ئەبوو سوفیانێ کوڕێ حارثی هەڤسارێ هێسترا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گرتبوو و کەسەک ل پێشییا وان هەرسێیان نەبوو، و هەر چەندە خافلەتی یا مەزن بوو، و شکەستنەکا کرێت ژی کەفتە لەشکەری بەلێ ئەو نەترسیان و پشتا خۆ نەدانە دوژمنی و ل مەیدانێ مان حەتا شەڕ ب دووماهی هاتی.

ژ ڤێ دئێتە زانین کو عەبباس مرۆڤەکێ ب جەرگ بوو و ئیخلاصەکا مەزن بۆ پێغەمبەری و ئیسلامێ د دلێ وی دا هەبوو.

وەسا دئێتە زانین کو پشتی ڤەکرنا مەکەهێ ل سالا هەشتێ عەبباسی خۆ ژ مەکەهێ ڤەگوهاستبوو مەدینێ، و ل وێرێ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاکنجی بووبوو، و پشتی هنگی ب بیست و چار سالان ژی حەتا مری ئەو هەر ل وێرێ یێ ئاکنجی بوو.

دەورێ عەبباسی و نێزیکییا وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکا دی دیار دبت ل دەمێ وەغەرکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ دنیایێ.. دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نساخبووی نساخییا پێ مری.

ل وێ رۆژا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ حسیای کو پیچەکێ لەشێ وی یێ سڤکبووی، ژ مامێ خۆ عەبباسی و پسمامێ خۆ عەلی خواست کو ملێن وی بگرن و وی ببەنە مزگەفتێ دا نڤێژێ بکەت.

د حەدیسەکێ دا، بوخاری ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نساخبووی مە دەرمانەک کرە دەڤێ وی، ئینا وی ب ئیشارەتان گۆتە مە: نەکەنە دەڤێ من، یا ژ مە ڤە ژ بەر نەخۆشییا دەرمانی ل سەر نساخی وی دەرمان نەڤێت، ئینا مە دەرمان کرە دەڤی، گاڤا هشیاربووی عێجزبوو و گۆت: ما من هوین ژ هندێ نەدانەپاش؟ عەبباس تێ نەبت ئەڤێن دی هەمییان دەرمانی بدەنێ!

ژ ڤێ حەدیسێ بهایێ عەبباسی ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئیتە زانین.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ عەبباس ئێک ژ وان مرۆڤان بوو یێن پێغەمبەر شویشتی: عەبباس و هەردو کورێن وی (الفضل) و (قثم) و عەلی ب شویشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رابوون، و ئوسامەی و صالحێ مەولایێ پێغەمبەری ئاڤ بۆ لێ دکر، و هەر وان کفن ژی کرە بەر.

پشتی پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- عەبباس مابوو ل مەدینێ ل سەر زەمانێ ئەبووبەکری و عومەری و چەند سالەکان ژی ژ زەمانێ عوثمانی.

ل سالا هەژدێ مشەختی، ل سەر دەمێ خیلافەتا عومەری باران نەهاتن و خەلایەکا مەزن ل مەدینێ چێبوو، عومەری گۆتە صەحابییان: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەسا بەرێ خۆ ددا عەبباسی وەکی کوڕ بەرێ خۆ ددەتە بابێ خۆ، و ئەڤرۆکە ئەگەر پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ مە دا نەبت ژی مامێ وی عەبباس یێ د ناڤ مە دا ڤێجا وەرن بلا ئەو نڤێژێ ل بەرا مە بکەت، و دوعا بۆ مە بکەت؛ دا خودێ بارانێ ل مە ببارینت.

گاڤا هەمی کۆمبووین عومەری گۆت: ئەی خودا، مە ب دوعایێن پێغەمبەرێ تە هەوار دکرە تە، تە باران ددا مە، و ئەم ئەڤرۆ ب دوعایێن مامێ پێغەمبەرێ تە هەوار دکەینە تە، ڤێجا تو بارانێ بدە مە، و عەبباس ب بەرا وان کەفت و ئەڤ دوعایە کر: (اللهم لم ينزل بلاء إلا بذنب، ولم يكشف إلا بتوبة، وقد توجه القوم بي إليک لمكاني من نبيک وهذه أيدينا إليک بالذنوب ونواصينا إليک بالتوبة فاسقنا الغيث). هێشتا مرۆڤ ژێک نەڤەرەڤین عەوران خۆ لێک دا و بارانەکا بۆش باری.

ژ ڤێ سەرهاتییێ ژی قەدر و بهایێ عەبباسی باش دیار دبت.

عەبباس -وەکی مە گۆتی- مابوو ساخ حەتا زەمانێ ئیمام عوثمانی، و مرنا وی ل ڕۆژا ئەینییێ بوو چاردەی هەیڤا رەجەبێ ژ سالا سیهـ و دویێ، و دەمێ ئەو مری ژییێ وی حەشتێ هەشت سال بوون، و ئەو ل بەقیعێ هاتبوو ڤەشارتن.

عەبباسی عەیالەکێ بۆش ل پشت خۆ هێلابوو: نەهـ کوڕ و سێ کچ، و ناڤێن وان ئەڤە بوون: الفضل، و ئەڤە ژ هەمییان مەزنتر بوو، عبد الله، و

ئەڤە صەحابییێ ب ناڤ و دەنگە، عبید الله، عبدالرحمن، قثم، معبد، کثیر، تمام، و الحارث.

و کچێن وی: حبیبه، صفیه، أمیمه، بوون.

عەبباس ل دووماهییا عەمرێ خۆ کۆرە بوویوو، و دبێژن: گاڤا عومەری عەبباس ددیت ژ دەوارا خۆ دهاتە خوار و بۆ رادوەستیا حەتا ئەو دچوو.

وی سیهـ و پێنج حەدیس ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن ریوایەتکرین.

و نە ژ تشتێن ڤەشارتییە کو خەلیفێن عەبباسی ئەوێن ژ سالا (١٣٢ حەتا ٦٥٦) مشەختی حوکم ل جیهانا ئیسلامی کری ژ دووندەها ڤی صەحابییێ خودان قەدرن.

## پشکا دویێ

# هەر چار
# خەلیفەیێن راشدی

- ئەبوویەکرێ صددیق
- عومەرێ کورێ خەططابی
- عوثمانێ کورێ عەففانی
- عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی

## خەلیفێ ئێکێ
## ئەبووبەکرێ صددیق

ڤێ جارێ مە ل بەرە ڕێ بۆ زەلامێ ئێکێ د ئوممەتێ دا -پشتی پێغەمبەری- ڤەکەین.. ئەڤە زەلامە پێغەمبەر نەبوو، بەلێ ئەو بوو یێ دەورێ پێغەمبەری تمامکری، مرۆڤەک بوو خودێ دای و بۆ دەورەکی هلبژارتی، ئەگەر ئەو نەبا خودێ ژی دزانت کەسەکێ دی ژ بلی وی نەبوو ب وی دەوری ڕابت، زەلامەک بوو ئەگەر باوەرییا وی و یا ئوممەتێ هەمییێ د گەل ئێک بێتە کێشان باوەرییا وی دێ باوەرییا ئوممەتێ هەمییێ هلکێشت، صەحابییەک بوو ئەگەر نە ژ بەر هندێ با کو مە دڤیا ڤێ گەشتا خۆ د گەل صەحابییان ژ بنەمالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ بکەین، بێ گومان ئەم دا ژ وی دەست پێ کەین. مژارا پەیڤا مە یا ڤێ جارێ ئەبووبەکرە جێگرێ پێغەمبەری-سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی یێ ئێکێ، و پشتەڤانێ وی یێ خۆشتڤی.

ئەبووبەکر، ناڤێ وی یێ دورست (عبد الكعبه) بوو، و پشتی ئەو موسلمانبووی وی ناڤێ خۆ کرە (عبد الله)، بابێ وی ئەبوو قوحافە عوثمانێ کوڕێ عامرێ تەیمییە، ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل بابێ حەفتێ (موررەیێ کوڕێ کەعبی) دگەهنە ئێک، ئەبووبەکر ژی قورەیشییە بەلێ ژ بابکێ تەیمییانە، و دئێتە زانین کو قورەیشی عشیرەتەکا مەزن بوو و ژ گەلەک بابکان یا پێکهاتی بوو.

دەیکا ئەبووبەکری ژی هەر ژ ئویجاخا بابێ وی بوو، ناڤێ وێ سەلما بوو، کچا صەخرێ کورێ مالکێ کورێ عامرێ تەیمییە، یەعنی دەیکا وی و بابێ وی ل عامری دگەهنە ئێک.

ناڤەکێ دی ژی ئەبووبەکری هەبوو پێ دهاتە ناسین ئەو ژی (عەتیق) بوو، و عەتیق ب دو مەعنا دئێت: یێ جوان، و یێ ئازاکری. هندەک دبێژن: هندی ئەو یێ خوشکۆک بوو دگۆتنێ: عەتیق، و هندەک دبێژن: کورێ بۆ دەیکا وی نەدمان ڤێجا دەمێ ئەو بووی دەیکا وی ناڤێ وی کرە عەتیق دا ژ مرنێ بێتە ئازاکرن.

ب ناسناڤێ (الصدیق) ژی دئێتە ناسین، یەعنی: یێ گەلەک راستگۆ؛ چونکی هەر تشتەکێ وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوهـ لێ ببا بێ دودلی دگۆتێ: تو راست دبێژی، ئینا پێغەمبەری ناسناڤێ وی کرە: (الصدیق).

ئەبووبەکر ل دۆرێن سالا ٥٧٣ ز، پشتی بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دو سێ سالان، ل باژێرێ مەکەهێ، هاتە سەر دنیایێ، و د مالەکا خودان قەدر و بها دا هاتە ب خودانکرن، سەر و بەرێ ژیێ وی بەری موسلمان ببت ب بەرفرەهی مە نەزانییە، بەلێ تشتێ ژێ هاتییە زانین ئەو بوو: ئەو مرۆڤەکێ خوشکۆک و ب هەیبەت بوو، باوەرییا خەلکێ مەکەهێ هەمییان پێ دهات؛ چونکی ئەو مرۆڤەکێ راستگۆ و دەستپاک بوو، ئەزمانێ خۆ ژ گۆتنێن سەقەت دپاراست و خۆ ژ کریارێن کێم و نە ژ هەژی ژی ددا پاش، بەری ئەو موسلمان ببت ژی وی خۆ ژ ڤەخوارنا مەیێ ددا پاش، جارەکێ پسیارا ڤێ چەندێ ژێ هاتەکرن، وی گۆت: من نامویسا خۆ و زەلامینییا خۆ دپاراست، و هەچییێ مەیێ ڤەخۆت عەقلێ خۆ و زەلامینییا خۆ بەرزە دکەت.

کارێ شەرم تێدا با، یان مرۆڤ پێ شکەستبا وی -هێشتا موسلمان نەبووی ژی- نەدکر، و گۆتنا دورست نەبا ژ دەڤێ وی دەرنەدکەفت، و سۆزا وی دابا لێڤە نەدبوو ئەگەر مرنا وی تێرا با، لەو بهایێ وی د چاڤێن خەلکی دا یێ مەزن بوو. و وی دەمێ خۆ -وەکی پترییا زەلامێن تەیمییان- ب بازرگانییێ ڤە دبۆراند، و ژ بەر کو ئەو مرۆڤەکێ دستپاک بوو، و وی خۆ ژ خرابییێ ددا پاش مالێ وی بەرەکەت کەفتبوویێ و بووبوو ئێک ژ زەنگین و دەولەمەندێن مەزن د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا.

ژ کارێن ئەو پێ هاتییە ناسین د ناڤ خەلکێ مەکەهێ دا ئەو بوو ئەو گەلەک ب کەفالەتکرنا خەلکی ڕادبوو، و هەچییێ ئەبووبەکر ببا کەفیلێ وی باوەرییا خەلکی پێ دهات، و گاڤا خوینەک کەفتبا سەر بنەمالەکێ ئەو دا وێ دەنەف ئەبووبەکری، و ئەبووبەکری ئەو بۆ خودانێ کوشتی دبر، و ئەڤە نیشانا هندێیە کو باوەرییا هەردو لایان ب وی دهات.

هەر ژ جحێلینییا خۆ ئەبووبەکر ب زیرەکییێ هاتبوو ناسین، یێ زیرەک بوو بۆ دەستێ خۆ و شیرێ خۆ، و یێ زیرەک بوو بۆ ئەزمانێ خۆ و دیارکرنا بیر و بۆچوونێن خۆ، وی گەلەک حەز ژ پرێژییێ نەدکر، و ئەگەر ئاخفتن نەهاتبا بەرۆکا وی ئەو نەدئاخفت، و خۆ پشتی موسلمانبووی ژی و بوویە خەلیفە وی دگۆتە والییێن خۆ: ئەگەر هەوە وەعظەک کر، کورت ڤەبرن؛ چونکی ئاخفتن ئەگەر درێژبوو هندەک هندەکێ ژ بیرا مرۆڤی دبەت.

دبت ئەڤ سالۆخەتێن هەبن ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەهاندینە ئێک، و هەڤالینی د ناڤبەرا وان دا پەیداکری هێشتا بەری پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێت، چونکی دئێتە زانین کو هەڤالینییەکا موکم د ناڤبەرا وان هەردویان دا هەبوو هێژ بەری ئیسلامێ، و هەما بەسە بێژین: دەمێ پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی، بەری

پێغەمبەر سوحبەتا خۆ بۆ مامێ خۆ ئەبوو طالبی بکەت، ئەو چوو بۆ هەڤالێ خۆ ئەبووبەکری کر، و پترین دیرۆکزان ل وێ باوەرێنە کو ئەبووبەکر ئێکەمین زەلام بوو باوەری ب پێغەمبەری ئینای، کانێ چاوا خەدیجا ئێکەمین ژن بوو باوەری پێ ئینای.



بازێرێ مەکەهێ ئەوێ دکەفتە جەرگێ گزیرتا عەرەبان، بووبوو رووگەها هەمی ئویجاخ و عەشیرەتێن عەرەبان و بهایێ وێ د چاڤێن وان دا زێدە بلند بووبوو و ب تایبەتی پشتی لەشکەرێ ئەبرەهەیێ حەبەشی ب وی رەنگێ پەردەدڕ و نەعەدەتی ژێ هاتییە پاشڤەبرن. (مەکەه) ئەو بازێرێ ل سەردەمێ ئیسماعیلێ کورێ ئیبراهیمی هاتییە ئاڤاکرن و پیچ پیچە بەرفرەهبووی حەتا بوویە بازێرەکێ مەزن و هێدی هێدی رەنگ و روییێ خۆ ئەوێ دینێ ئیبراهیم و ئیسماعیلی دایێ، ژ دەستدا حەتا دەمەک ب سەر دا هات ئەو کەعبەیا وان هەر دو پێغەمبەران ئاڤاکری؛ دا ببتە جهێ تەوحیدێ، ب دەستێ هندەک مرۆڤێن خۆ ب تاگیر بۆ ئیبراهیمی دزانی بوو بوتخانە و جهێ بوتپەرێسییێ، هەر کونجەکا تە بەرێ خۆ دابایێ صەنەمەکێ چکلاندی دا لێ بینی، ئەو زەلامێن هەر ئێکی ژ وان عەقلێ خۆ ب دنیایەکێ نەددا، سەرێن خۆ بۆ هندەک دار و بەرێن رەق و هشک دچەماندن.

د ناڤ گێلشۆکا ڤێ بەرزەبوونێ دا، ل وی دەمێ خەلکێ مەکەهێ رێ ل بەر خۆ بەرزەکری، چەند زەلامەکێن ب تبلێن دەستەکێ ب تنێ دهاتنە هژمارتن مابوون، ب عەقلێ خۆ و ب وی میراتێ ژ باب و باپیرێن کەڤن گەهشتییێ، گەهشتبوونە وێ باوەرییێ کو ئەڤ رێکا خەلکێ مەکەهێ ل سەر دچن نە ئەو رێکە یا کو ئیبراهیم و ئیسماعیل پێ هاتینە هنارتن، بەلێ یا رێکا راست ژی ب دورستی ل بیرا وان نەمابوو! تشتێ د دەست

وان دا مای ب تنێ ئەو بوو عەقلێ وان قەبویل نەدکر بەرەکێ بچویک جهێ خودایەکێ مەزن بگرت، لەو بوتپەرێسی ب دیتنا وان کارەکێ بێخێر بوو.

مەکەهییان ب حێبەتی ڤە بەرێ خۆ ددا ڤان کێمە مرۆڤان، و مرۆڤێ دین ئەگەر تو یا د سەرێ وی دا بخوینی، دێ بینی ئەو هزر دکەت ئەو هەمی خەلکێ هشیار ل دەور و بەرێن وی ددینن! و د سەر هندێ ژی را بوتپەرێسێن مەکەهێ مایێ خۆ د ڤان مرۆڤان نەدکر و ژێ نەدخواست بێنە سەر دینێ وان، و هندەک جاران رێ ل وان نەدگرت کو ئەو ئاشکەرا د ناڤ خەلکی دا رابن و نەکامییا دینێ قورەیشییان بکەن؛ چونکی ئەو دپشتراست بوون کو ڤیانا خەلکێ مەکەهێ بۆ بوتپەرێسییێ دێ بتە سکرەکێ ئاسێ د ناڤبەرا خەلکی و گۆتنا ڤان مرۆڤان دا.

ئەبووبەکرێ تەیمی، وەکی هەڤالێ خۆ یێ نێزیک موحەممەدێ هاشمی، ژ وان عەقلمەندان بوو یێن ئاخفتنێن (قس بن ساعدة الإيادی) و (زيد بن عمرو بن نفيل)ی و (ورقة بن نوفل)ی کەفتینە دلی، دیسا.. ئەو خودایێ ئەم هەمی داین و عەرد و عەسمان ژی ئافراندین دڤێت گەلەک ژ هندێ پاک و بلندتر بت وەکێ قورەیشی ژێ دبێژن، قەت تشتەکێ بەرعەقل نینە ئەڤ دینێ قورەیشی ل سەر دینێ ئیبراهیم و ئیسماعیلی بت.

ئەبووبەکر مرۆڤەکێ بازرگان بوو، گەلەک جاران د گەل کاروانی بۆ کرین و فرۆتنێ دچوو شام و یەمەنێ، ل وێرێ ئەوی هندەک مرۆڤ ددیتن ل سەر دینەکێ دی بوون نە وەکی دینێ قورەیشییان، و د گەل هندێ ژی وان دگۆت: ئەم یێ ل سەر دینێ ئیبراهیمی. ڤێ چەندێ ئەبووبەکر پال ددا کو هزرێن خۆ بکەت: ئەرێ راستی ل کیڤەیە؟ دینێ ئیبراهیمی یێ دورست چ بوو؟ و پشتی دەمەکێ درێژ ژ لێگەریان و هزرکرنێ، ئەبووبەکر دەست ڤا دزڤری.. وی ژی پشت دابوو بوتپەرێسییا مللەتێ خۆ، هەر چەندە ئەو

مرۆڤەکێ زێدە (جڤاکی) بوو و تێکەلییا وی ژی د گەل خەلکی گەلەک یا باش بوو، بەلێ کێم کەس هەبوون ئەبووبەکر ژ دل هەڤالینییێ د گەل بکەت و ژ ڤێ هەڤالینییێ یێ ب هیڤی بت، و هەڤالێ وی یێ ژ هەمییان نێزیکتر -وەکی مە گۆتی- جحێلەکێ د حینێ وی دا بوو، ب تنێ دو سالان ژ وی مەزنتر بوو، هەر چەندە نە ژ بابکێ تەیمییان ژی بوو، بەلێ یێ ئەو هەردو دیتبان دا هزر کەت ئەو هەردو برایێن دەیبابینە، هەڤالێ وی نەڤییێ عەبدلموطەلبێ مەزنێ بابکێ هاشمییان بوو، موحەممەدێ کورێ عەبدللاهی، پتر جاران هەردویان دەمێ خۆ پێکڤە دبۆراند، و هزر و بیرێن خۆ بۆ ئێک و دو ڤەدگێران.

دەمەکی ئەبووبەکری خۆ دیت یێ ب تنێیە، هەڤالێ وی یێ خۆشتڤی لێ بەرزەبوو، چەند رۆژ ب سەرڤە چوون دیار نەبوو، ژ هندەک مرۆڤان گوهـ لێ بوو کو موحەممەد یێ بەحسێ دینەکێ نوی دکەت، ئینا رابوو قەستا هەڤالێ خۆ کر دا بزانت کانێ سوحبەتا وی چییە؟ ئەبووبەکری گۆتێ: ئەبوولقاسم، تو ل دیوانخانەیان نە یێ دیاری و مللەتێ تە یێ تە ب هندێ گونەهبار دکەن کو تو یێ عەیبێ د باب و باپیر و دینێ وان دئینییەدەر، ڤێجا تو چ دبێژی؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ ئەبووبەکر، خودایێ من ئەز یێ کریمە پێغەمبەر و بۆ هەمی مرۆڤان هنارتیم. ئەبووبەکری گۆتێ: ب خودێ من چو جاران درەو ژ تە نەدیتییە، و تو یێ ژ هەژی پێغەمبەرینییێ یی، دەستێ خۆ بدە من، پێغەمبەری دەستێ خۆ ب نک ڤە درێژکر، ئەبووبەکر چوو دەستی و باوەری پێ ئینا، و ب ڤێ چەندێ ئەو بوو ئێکەمین زەلام باوەری ب پێغەمبەری ئینای، و پشتی هنگی ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر دگۆت: من کەسەک بۆ ئیسلامێ گازی نەکرییە و دودلییەک ل نک نەبووبت، ئەبووبەکر تێ نەبت

گاڤا من ئەو بۆ ئیسلامێ گازی کری ئێکسەر و بێ دودلی وی باوەری ئینا.

دبت مروڤ -ل ڤێرێ- پسیارەکێ ژ خۆ بکەت: ئەرێ بۆچی موسلمانبوونا ئەبووبەکری هۆسا یا ب ساناهی بوو؟

بەری مروڤ هزرا خۆ د وان ئەگەران دا بکەت یێن ئەو پالدای کو ب ساناهیتر ژ هەر کەسەکێ دی موسلمان ببت، پێتڤییە بیرا خۆ ل هندێ بینین کو ئەو ئاستەنگێن ل وی دەمی دکەفتنە د ناڤبەرا زەلامێن قورەیشییان و هاتنا د ئیسلامێ دا، چو ژ وان ل نک ئەبووبەکری نەبوون، چاوا؟

د بەرسڤێ دا دێ بێژین: دەمێ مروڤ ل سەر دینەکی یان بیر و باوەرەکێ دئێتە مەزنکرن، پاشی بۆ دینەکێ دی یان بیر و باوەرەکا دی دئێتە گازیکرن، دێ خۆ ژ یا نوی دەتە پاش ژ بەر ئێک ژ ڤان ئەگەران:

١- ژ بەر دفنبلندییەکا وە ل مروڤی بکەت کو گوهدارییا کەسەکێ دی نەکەت و ب دویڤ نەکەڤت.

٢- یان ژ بەر وێ مەزنییا مروڤی هەی، ڤێجا بترست ئەگەر چوو د دینەکێ دی دا ئەو مەزنی ژ دەستی بێتەدەر.

٣- یان ژ بەر بەرژەوەندییەکا شەخصی کو دبت پشتی هاتنا دینێ نوی بۆ مروڤی نەئێتە ب جهئینان.

٤- یان ژ بەر هزرەکا هشک و عەقلەکێ گرتی یێ کو وی ژ هەر بۆچوونەکا نوی دویر بێخت.

٥- یان ژ بەر تەعەصوبەکا کۆرە یا کو مروڤی وەسا تێ بگەهینت کو دەرکەفتنا ژ رێکا باب و باپیران تاوانەکا بێ وێنەیە.

٦- یان ترسەکا زێدە یا کو مرۆڤی ژ هندێ پاشدا ببەت کو حەقییێ بێژت دا چو نەخۆشی نەئێنە رێکێ.

٧- یان پیراتییەکا مرۆڤی دکەتە دوژمنێ گوهورینێ، یان جحێلینییەکا رێ نەدەتە خودانی کو ب سەربخۆیی هزرەکێ بکەت.

ئەڤە ئەو ئەگەر بوون یێن قورەیشی ژ دینێ نوی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ هاتی ددانە پاش، و ئاشکەرایە کو چو ژ ڤان ئەگەران ل نک ئەبووبەکری نەبوون، د سەر هندێ ژی را رەوشت و رەفتارێ وی یێ پاک ئەو پالددا کو ئێکسەر قەستا ئیسلامێ بکەت.

* * *

ئەو دەمەکێ درێژ بوو ئەبووبەکر ل هیڤییا رۆژەکا هۆسا بوو، ل هیڤییا راستییا بەرزە بوو، گوهێ وی ل دەنگەکی بوو بێتێ رێکێ نیشا وی بدەت.. و چەند کەیفا وی یا مەزن بوو دەمێ وی دیتی ئەو دەنگ دەنگێ نێزیکترین هەڤالێ وییە، ئەگەر مرۆڤ ب چاڤەکێ ماددی بەرێ خۆ بدەتە ئەبووبەکری دێ بینت چو تشتەکێ ژ وی کێم نەبوو، مال د دەستی دا یێ مشە بوو، عەیال هەبوو، قەدر و بهایێ وی ژی د ناڤ خەلکی دا گەلەک بوو، هەمییان باوەری پێ دهات و ب گۆتنا وی دکر، بەلێ تشتەکێ ژ وی کێم بوو ئەو مالێ وی هەمییێ نەدشیابوو ب جهـ بینت، یێ ژێ کێم بوو بزانت دینێ ئیبراهیمی یێ دورست یێ چاوا بوو، چ رێکە مرۆڤی دگەهینتە خودێ، لەو دەمێ هەڤالێ وی موحەممەدی گۆتییێ: ئەز پیغەمبەرێ خودێمە، ئێکسەر وی باوەری پێ ئینا، وەکی وی مرۆڤی یێ تشتەکێ خۆ بەرزە کەت و گەلەک لێ بگەرییت، پاشی ژ نشکەکێ ڤە ببینت ڤێجا ب سەر و چاڤ ڤە خۆ تێ وەر بکەت.

ئەبووبەکری باوەری ئینا و ژ نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زڤری مال، وەکی وی مرۆڤێ بارەکێ مەزن و گران ژ سەر ملێ خۆ بدانت و هست ب سڤکییێ بکەت، ئەبووبەکر یێ وەسا بوو.. دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو ئەبووبەکر زڤری نک پیغەمبەرێ خۆ، بەلێ ڤێ جارێ ئەو یێ ب تنێ نەبوو، چار زەلامێن دی د گەل دا بوون: (عوثمانێ کورێ عەففانی) و (طەلحەیێ کورێ عوبەیدوللاهی) و (زوبەیرێ کورێ عەووامی) و (سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی).

و رۆژا پاشتر وی پێنج زەلامێن دی د گەل خۆ ئینان؛ دا باوەرییا خۆ ل نک پیغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا بکەن: (عوثمانێ کورێ مەظعوونی) و (ئەبوو عبیدەیێ کورێ جەرراحی) و (عەبدررحمانێ کورێ عەوفی) و (ئەبوو سەلەمە) و (ئەرقەمێ کورێ ئەبوو ئەرقەمی) ئەڤە نەهـ زەلام، د گەل ئەبووبەکری دەهـ، پێغەمبەر و خەدیجا و عەلی و زەید ئەڤە چاردە.. دەستەکا ئێکێ یا کاروانێ پیرۆزێ ئیسلامێ پێ دەست پێ کری، ژ سێزدە مرۆڤان نەهـ ل سەر دەستێ ئەبووبەکری هاتنە سەر رێ!

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: هەچییێ قەنجییەک ل مە کربت، مە خەلاتێ وی یێ دایێ، ئەبووبەکر تێ نەبت خودێ ل رۆژا قیامەتێ خەلاتێ وی دێ دەتێ.

ل ڤی دەمێ هژمارا موسلمانان هێدی هێدی زێدە دبوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەڤالێن خۆ خواست کو ل مالا ئەرقەمی هەر جار کۆم ببن دا ئەو وان ئایەتان بۆ وان بخوینت یێن نوی دئێنە خوارێ، و هێشتا هژمارا وان نەگەهشتییە چل کسان ئەبووبەکری گەلەک جاران ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دخواست کو ئەو دەرکەڤنە کۆلانێن مەکەهێ و گازییا خۆ بێ ترس بەلاڤ کەن، جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

دەستویری دا، دو سال د سەر گازییا ئیسلامێ ڕا بۆری بوون، و هژمارا موسلمانان گەهشتبوو سیهـ و هەشت مرۆڤان، کاروانێ وان یێ بچویک گەهشتە کەعبێ، ئەبووبەکر د ناڤ خەلکی دا ڕابووڤە و بۆ جارا ئێکێ د دیرۆکا ئیسلامێ دا وی خوتبەک ب دەنگەکێ بلند خواند، ژ خەلکێ مەکەهێ خواست بێنە د ئیسلامێ دا، کافر ژ خوتبا وی دین و هار بوون، ب موسلمانان وەرهاتن و لێدان، و بارا ئەبووبەکری ژ لێدانێ ژ یا هەمییان پتر بوو، گاڤا ئویجاخا ئەبووبەکری ئەڤ چەندە دیتی د هەوارا وی هاتن و ئەو ژ بن دەست و پییێن کافران ئینادەر، و هەمی هزرا وان ئەو بوو ئەبووبەکر یێ مری، پاشی وان بەرێ خۆ داینێ هێشتا ڕحا تێ مای، ڕابوون ئەبووبەکر هلگرت و برە مال، و هەمییان سویند خوار ئەگەر تشتەک ل ئەبووبەکری هات ئەو عوتبەیێ کوڕێ ڕەبیعەی پێشڤە بکوژن.

ئەبووبەکر هند هاتبوو قوتان دفنا وی ژ ڕوییێ وی نەدهاتە جوداکرن، ئەو دلگرتی بووبوو و ئەزمان ژی لێ شکەستبوو، مرۆڤێن وی ل هنداڤ کۆم بووبوون و حەتا نێزیکی ڕۆژئاڤایێ وی چاڤێن خۆ ڤەنەکرن، گاڤا رح هاتییە لەشی و ئەزمانێ وی گەڕیای، ئێکەمین پسیارا وی کری ئەو بوو وی گۆت: چ ل پێغەمبەری هاتییە؟ مرۆڤێن وی خەلەت ئاخفتن و لۆمە لێ کرن، و گۆتنە دەیکا وی: خوارنەکێ یان ڤەخوارنەکێ بدێ، و ژ نک وی دەرکەفتن. گاڤا دەیکا وی ب تنێ مایە د گەل وی هندی ئەو هاتێ کو ئەو تشتەکێ بخۆت وی گۆتێ: حەتا ئەز نەزانم کانێ چ ل پێغەمبەری هاتییە ئەز تشتەکێ ناخۆم. دەیکا وی گۆتێ: ئەز چو ژ هەڤالێ تە نزانم، وی گۆتێ: هەڕە نک فاطمایا کچا خەططابی ئەو دێ تشتەکی ژێ زانت، دەیکا وی ب یا وی کر، بەلێ فاطمایێ باوەری پێ نەهات گۆتێ: نە ئەز ئەبووبەکری دنیاسم نە ژی موحەممەدی، و ئەگەر تە بڤێت دێ د گەل تە

ئێمە نک کورێ تە کانێ مسەلا وی چییە؟ پشتی هەردو هاتینە نک ئەبووبەکری، ئەبووبەکری پسیار ژێ کر: حالێ پێغەمبەری چییە؟ کچا خەططابی بەرسڤا وی نەدا، گۆتێ: دەیکا تە یا ل ڤێرێ. گۆتێ: نەترسە هەما بێژە. وێ گۆت: پێغەمبەر یێ ب سلامەتییە و یێ ل مالا ئەرقەمی. ئەبووبەکری گۆت: پا من سویند یا خواری حەتا ئەز پێغەمبەری نەبینم ئەز تشتەکێ نەخۆم و نەڤەخۆم.

پشتی خەلک ڤەرەڤین و کەس نەمایە ل کۆلانێ، دەیکا وی و کچا خەططابی رابوون ملێن وی گرتن، و ئەو برە مالا ئەرقەمی ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ل وێرێ ئەبووبەکری ژ پێغەمبەری خواست ئەو دوعایێ بۆ دەیکا وی بکەت دا موسلمان بیت، و وەسا چێبوو وەکی ئەبووبەکری ڤیای و دەیکا وی موسلمانبوو.. ئەڤ رۆژە ئەو بوو یا حەمزە ژی تێدا موسلمانبووی.

ئەڤە نەخۆشییا ئێکێ بوو سەرا ئیسلامێ هاتییە رێکا ئەبووبەکری، بەلێ ئەو نەخۆشییا دووماهییێ نەبوو، ئەبووبەکر ل وان سێزدە سالێن ل مەکەهێ ژیای بەری مشەختبوونێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی سیبەرێ بوو، گەلەک جاران دەمێ کافرێن مەکەهێ دهاتنە پێغەمبەری دا نەخۆشییێ بگەهیننێ ئەبووبەکری خۆ ددا بەر و بەرەڤانی ژێ دکر و سنگێ خۆ بۆ خۆشتڤییێ خۆ دکرە مەطالەکێ پیلایی.

ل مەکەهێ.. هژمارەکا عەبدێن هەژار و بێ خودان هەبوون باوەری ب ئیسلامێ ئینابوو، کافران ئەو گرتبوون و ل سەر خیزێ ئاریای و ل بەر چاڤێ رۆژا شاریای گرێدابوون و عەزاب ددان، ئەبووبەکری بریار دا وان هەمییان ب پارێ خۆ بکرِت و ئازا کەت؛ دا ئەو وان ژ عەزابا کافران رزگار بکەت، و ئێک ژ ڤان عەبدان بلالێ حەبەشی بوو، و ژ بەر ڤێ چەندێ ئەڤ

ئایەتە د دەرحەقا ئەبووبەکری دا هاتە خوارێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ۝ ﴾ (اللیل: ٥-٧).

هەر چەندە ئویجاخا تەیمییان گەلەک بەرەڤانی ژ ئەبووبەکری دکر ژی، بەلێ د گەل هندێ ژی کافران گەلەک حالێ وی نەخۆش دکر، لەو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایە هەڤالێن خۆ کو مشەخت ببن و بچنە حەبەشە، ئەبووبەکری ژی دەستویری ژ پێغەمبەری خواست کو قەستا حەبەشە بکەت، و پشتی ئەو ژ مەکەهێ دەرکەفتی و چەند قویناغەکان دایە رێ، ب رێ ڤە (ابن الدغنە) مەزنێ ئویجاخا (القارە) کەفتە رێکا وی، گۆتێ: دێ کیڤە چی؟ ئەبووبەکری گۆت: مللەتێ من ئەز یێ دەرێخستیم، دێ بۆ خۆ چمە وەلاتەکی بشێم عیبادەتێ خودایێ خۆ لێ بکەم. (ابن الدغنە)یی گۆتێ: یێن وەکی تە نەدەردکەڤن و نەدئێنە دەرێخستن، تو هاریکارییا کەسێن پێتڤی دکەی، و مێڤانان دحەوینی، و تو یێ ب مرۆڤاینی یی، و هاریکارییا حەقییێ دکەی، بزڤرە بارێ خۆ و ئەز دێ بەختێ خۆ دەمە تە.. ل سەر بەختێ وی ئەبووبەکر زڤڕی مەکەهێ.

ئەبووبەکری ل حەوشا مالا خۆ جهەکێ نڤێژان بۆ خۆ چێکربوو، گاڤا راوەستیابا نڤێژێ و قورئان خواندبا، نەدشیا خۆ بگرت رۆندکێن وی دهاتنە خوارێ، ژ بەر دەنگێ وی و خۆشییا قورئانێ، ژن و بچویکێن جیرانان لێ کۆم دبوون و گوهێ خۆ ددانە دەنگێ وی، کافر ترسیان بچویکێن وان بچنە سەر دینێ ئەبووبەکری، رابوون چوونە نک (ابن الدغنە)یی و گۆتنێ: بێژە ئەبووبەکری یان بلا بچتە د ژۆرڤە نڤێژێن خۆ بکەت، یان ژی بەختێ خۆ ڤەگەرینە ئەگەر دێ د ناڤبەرا مە و تە دا نەخۆش بت.. ئەو هاتە نک ئەبووبەکری و گۆتنا کافران بۆ وی ڤەگێرا، ئەبووبەکری گۆتێ: دێ بەختێ تە ل تە زڤرینم و بەختێ خودێ تێرا من هەیە.

سێزدە سالان ئەبووبەکری ل مەکەهێ بۆ دینێ خۆ و پێغەمبەرێ خۆ کار کر، بارەکێ مەزن ل سەر ملێن وی بوو، ژ لایەکی ڤە ب دەستێ خۆ و مالێ خۆ بەرەڤانی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، و ژ لایەکێ دی ڤە هاریکارییا موسلمانێن هەژار دکر و خەمێن وان سڤک دکرن، و ژ لایەکێ دی ڤە ئەو یێ بەردەوام بوو د موسلمانکرنا خەلکی دا.. وی ژی نەخۆشی ژ دەستێ کافران ددیت، بەلێ باوەرییا وی یا موکم ئەو وەکی چیایەکی لێ کربوو چو هەرەبایان ئەو نەدهەژاند.

پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و خەلکێ یەثربێ ب سەرێک هلبووین، و پێغەمبەری دەستویری دایە موسلمانان کو مشەخت بینە مەدینێ، ئەبووبەکری ژێ خواست دەستویرییێ بدەتە وی دا ئەو ژی مشەخت ببت، بەلێ پێغەمبەری گۆتێ: لەزێ نەکە، بەلکی خودێ هەڤالەکێ بۆ تە ببینت. ئەبووبەکر تێ گەهشت کو وی بەحسێ خۆیە، لەو راببوو دو حێشتر گرێدان و چار هەیڤان ئالف دایێ حەتا باش قەلەو بووین، دەمێ دەستویری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتییەدان کو مشەخت ببت، چوو مالا ئەبووبەکری و ئاگەهداریا وی کر کو هەردو پێکڤە دێ دەرکەڤن. عائیشا دبێژت: ئەبووبەکری ژ کەیفان دا کرە گری!

سەرهاتییا مشەختبوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو دئێتە هژمارتن مەزنترین سەرهاتی، بارێ مەزنتر ژێ کەفتبوو سەر ملێن ئەبووبەکری و بنەمالا وی: ئەبووبەکر د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفت، و بەری دەرکەڤت هندەک دەرهەم دانە کچا خۆ ئەسمائێ و ئەو هنگی یا فاما بوو و گۆتێ: هندەک خوارنێ بۆ مە پێ بکڕە.. هەردو ل ئێڤارەکا درەنگ ژ مالا ئەبووبەکری دەرکەفتن و ب لایێ ژێرییا مەکەهێ ڤە چوون حەتا گەهشتینە شکەفتا (ثور) جهێ وان بەری هنگی بۆ خۆ دەسنیشانکری، ب رێ ڤە

ئەبووبەکر هندەک جاران بەری پێغەمبەری دچوو، و هندەک جاران ل پشت، جار ل لایێ وی یێ ڕاستێ دچوو، و جار ژی ل لایێ چەپێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەڤە چییە؟ وی گۆت: هندەک جاران ئەز دبێژمە خۆ نە کو کافر ژ سینگی ڤە بێنە تە ڤێجا ئەز ب بەر تە دکەڤم، و جار ئەز دبێژم نە کو ژ پشتێ ڤە بێنە تە ڤێجا ئەز ل دویڤ تە دئێم، و هندەک جاران ئەز دبێژم نەکو ژ لایەکی ڤە بێن..

ب ڤی ڕەنگی هەردو چوون حەتا گەهشتینە دەرێ شکەفتێ، ئەبووبەکری گۆتێ: ئەز دێ بەری تە چمە ژۆر، ئەگەر تشتەک ل ژۆر هەبت ژی دا چو ل تە نەئێت.. ئەبووبەکر ب ژۆر کەت ب سێرا دەستان لێ گەڕیا، پشتی زانی شکەفت یا ب سلامەتییە گازی پێغەمبەری کر.. سێ ڕۆژان ئەو هەردو مانە د شکەفتێ ڤە، ل ڤان سێ ڕۆژان کافر ژێ بێ هیڤی بوون، ل وێ شەڤا دەرکەفتین، کافران ل بەر دەرگەهێ مالا پێغەمبەری ل بەر دانابوو، پشتی بۆ وان دیاربووی کو ئەوێ ل سەر جهێ وی عەلییە نە ئەوە، ڕابوون قەستا مالا ئەبووبەکری کرن، گاڤا زانی ئەو ژی نەمایە، ل نک وان مسۆگەر بوو کو هەردو پێکڤە یێن دەرکەفتین، وان جهەک نەهێلا و ب سەر هل نەبوون، خەلاتەکێ مەزن دەسنیشانکرن بۆ هەچییێ تشتەکێ ژ وان بزانت، و چو دیار نەبوو، هندەک مرۆڤێن شارەزا ئینان ئەوێن ل دویڤ شوینپێیان دچن حەتا گەهشتینە بەر دەرێ شکەفتێ و ل سەربانێ وێ، ئەبووبەکری گۆتە پێغەمبەری: ئەگەر ئێک ژ وان ڤێ گاڤێ بەرێ خۆ بدەتە بن پێیێن خۆ دێ مە بینت، ب دلەکێ رحەت ڤە پێغەمبەری گۆتێ: ئەبووبەکر تو چ دبێژی بۆ دویان خودێ د گەل وان یێ سێیێ بت؟

ل وان سێ ڕۆژان کوڕێ ئەبووبەکری (عەبدللاهـ) ئەوێ هنگی هێشتا زارۆک دچوو ل مەکەهێ دگەڕیا کانێ چ بەحسی و خەبەر هەنە و ئێڤاری

دهاتە شکەفتێ دا وی تشتێ وی گوه لێ بووی بۆ بابێ خۆ و پێغەمبەری بێژت.

ئەسمائا کچا ئەبووبەکری خوارن ل مال چێ دکر و ب دزی ڤە بۆ بابێ خۆ و پێغەمبەری دئینا شکەفتێ، و پشتی ئەو و برایێ خۆ دزڤڕین، شڤانێ ئەبووبەکری پەزێ خۆ د بەر دەرێ شکەفتێ ڕا دزڤڕاند، هندەک شیر بۆ پێغەمبەری و ئەبووبەکری ددۆت، و شوین پێیێن ئەسمائێ و عەبدللای ژێ خراب دکرن؛ دا کافر ل دویڤ نەئێن.

ب ڤی ڕەنگی وان هەر سێ ڕۆژێن خۆ بۆراندن، و وێ ئێڤارا دا ئەو ژ شکەفتێ دەرکەڤن ئەسمائێ هندە خوارن بۆ ڕێکی بۆ وان دورستکر، و چونکی چو مێدەک نەبوون خوارنێ بکەتە د ناڤ دا، ڕابوو شیتکا خۆ کرە دو پرت: پرتەک د پشتا خۆ ئالاند، و یا دی کرە مێدەک، ژ بەر هندێ دبێژنێ: (ذات النطاقين) یەعنی: خودانا دو شیتکان.



ڕۆژەکا مەزن بوو ل بەر خەلکێ مەدینێ، ئەو ڕۆژا پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- د گەل ئەبووبەکری گەهشتینە مەدینێ، دوشەنب بوو دووازدەی هەیڤا (ربيع الاول)ێ، ئەنەسێ کوڕێ مالکی دبێژت: دو ڕۆژ بوون چو ڕۆژێن وەکی وان من نەدیتینە، ڕۆژا پێغەمبەر هاتییە مەدینێ، و ڕۆژا مری.. ڕۆژا ئێکێ هندی یا خۆش و گەش و ڕۆهن بوو، و ڕۆژا دویێ هندی یا کرێت و تاری و نەخۆش بوو.

گاڤا پێغەمبەر و ئەبووبەکر گەهشتینە مەدینێ و خەلک هاتییە بەراهییێ، بارا پتر ژ خەلکی نەزانی کی پێغەمبەرە و کی ئەبووبەکرە لەو هەر ئێکی پسیار ژ هەڤالێ خۆ دکر: کی ژ هەردویان پێغەمبەرە؟

گاڤا هەردو ڕوینشتین حەتاڤێ ل پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- ئەبووبەکر ڕابووڤە ب کراسێ خۆ سیبەر ل پێغەمبەری کر، ئینا هنگی خەلکێ مەدینێ ئەو هەردو ژێک جوداکرن.

ل مەدینێ ژی -وەکی مەکەهێ- مالا ئەبووبەکری ل نێزیکی مالا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و مالا هەردویان ل تەنشتا مزگەفتێ بوو، ل درێژیا دەه سالان ل مەدینێ ئەبووبەکر نێزیکترین مرۆڤ بوو بۆ پێغەمبەری تو دا بێژی سیبەرا وییە، دەمێ ل مال و دەمێ ل سەفەرێ یێ د گەل بوو، ل فرەهی و تەنگاڤییێ ژێ دویر نەدکەفت.

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای مزگەفتا خۆ ل مەدینێ ئاڤا کەت و عەرد دەستنیشانکری، پسیارا خودانێن عەردی کر دا ئەو عەردی ژ وان بکڕت، وان گۆت: مە چو نەڤێت، بەلێ پێغەمبەری قەبویل نەکر، دووماهییێ دەه دینار بهایێ عەردی ئەبووبەکری ژ مالێ خۆ دان.

ل شەڕێ بەدرێ ئەبووبەکر صەحابییێ ئێکانە بوو یێ ملێ وی ب ملێ پێغەمبەری ڤە ل بن وێ کەپرا بۆ هاتییە چێکرن، و گاڤا شەڕ هاتییەکرن ژی ئەو ل سنگی بوو، کوڕێ وی (عەبدوررەحمان) ئەوێ هنگی هێشتا موسلمان نەبووی د گەل لەشکەرێ کافران بوو، پشتی ئەو موسلمانبووی ڕۆژەکێ وی گۆتە بابێ خۆ: ل ڕۆژا بەدرێ تو کەفتییە بەر ستێرکا من، بەلێ من بەرێ خۆ ژ تە وەرگێڕا.. یەعنی: من نەڤیا تە بکوژم. ئەبووبەکری گۆتێ: پانێ ئەگەر تو کەفتبایە بەر ستێرکا من، من بەرێ خۆ ژ تە وەرنەدگێڕا.

ل ڕۆژا شەڕێ ئوحودێ ژی ملێ ئەبووبەکری ب ملێ پێغەمبەری ڤە بوو، و دەمێ شکەستن کەفتییە ڕێزا موسلمانان، و دەستێن وان ژ کرنا شەری سستبووین پشتی بەلاڤبووی کو پێغەمبەر یێ هاتییە کوشتن،

ئەبووبەکر ئێک ژ وان کێم مرۆڤان بوو یێن ماینە د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بەرەڤانی ژێ کری حەتا شەر ب دووماهی هاتی.

ل رۆژا حودەیبییێ ئەبووبەکری هەلویستەک هەبوو پێتڤییە نەئێتە ژ بیر کرن.. ل سالا شەشێ دەمێ موسلمان د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەر ب مەکەهێ ڤە هاتین بۆ کرنا عومرێ، و کافران چەکدارێن خۆ هنارتینە بەراهییا وان و ل نهالا حودەیبییێ گەهشتینە ئێک، پاشی ب سەر چەند مەسەلەکا پێکهاتین و بریار هاتییەدان کو موسلمان ئەڤ سالە بزڤرنە مەدینێ و سالەکا دی بێنە عومرێ.. گەلەک موسلمانان هزرکر ئەڤ صولحا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل کافران مۆرکری، صولحەکا ب عەدالەت نەبوو، عومەر ئێک ژ وان کەسان بوو، عومەر چوو نک پێغەمبەری، ئەبووبەکر ژی یێ روینشتی بوو، عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما تو نە ب دورستی پێغەمبەرێ خودێیی؟ گۆت: بەلێ. عومەری گۆت: ما ئەم نە ل سەر حەقییێینە و ئەو ل سەر باطلی؟ گۆت: بەلێ. عومەری گۆت: پا بۆچی ئەم دێ یا کێم بۆ دینێ خۆ دانین؟!

یا کێم!! ئەڤە عومەر چ دبێژت؟ پێغەمبەر یا کێم بۆ دینی بدانت، ئەرێ ما غیرەتا پێغەمبەری ل سەر دینی ژ غیرەتا عومەری کێمترە؟ یان عومەر مەصلەحەتا دینی ژ پێغەمبەری پتر دزانت؟

نە.. بەلێ زەلامێن تەنگاڤییا دکێمن!

بەرێ خۆ بدەنە هەلویستێ ئەبووبەکری: پێغەمبەری گۆتە عومەری: ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، و ئەز بێ ئەمرییا وی ناکەم، و ئەو دێ من ب سەر ئێخت. عومەری گۆت: ما تە نەگۆتبوو ئەم دێ چینە بەیتێ و طەوافێ کەین؟ گۆت: من گۆتبوو تە ئەڤ سالە؟ گۆت: نە، پێغەمبەری گۆت: تو دێ ئێیە بەیتێ و دێ طەوافێ کەی.. ل ڤێرێ ئەبووبەکر هاتە مەیدانێ،

ئەبووبـەكری گۆتـە عومـەری: ئـەی زەلام! ئـەو پێغەمبـەرێ خودێیـە، و بـێ ئەمرییا وی ناكەت و خودێ دێ وی ب سەر ئێخت، ڤێجا ب یا وی بكە ئەز ب خودێ كەمە ئەو یێ ل سەر حەقییێ.

ئەبووبەكر ئێكێ دزانت.. پێغەمبەر یێ ل سەر حەقییێ و تشتێ ئەو بێژت و بكەت یێ دورستە، بەلا ل بەر چاڤ مرۆڤ هزر بكەت ئەو یێ دورست نینە ژی، ئەڤە هەلویستێ دورستێ خودان باوەرییە، گاڤا گۆتنا پێغەمبەری هات دڤێت مە چو گۆتن نەبن؛ چونكی حەقی هەر ئەوە یا وی گۆتی.

ل رۆژا موصیبەتا مەزن ژی ب سەر صەحابییان دا هاتی، ل وێ رۆژا مەدینـە هـەمی مەنـدەهۆش مـای، دل هـەمی هژیـاین، و گـاڤ ل خـەلكی شكەستین جارەكا دی ئەبووبەكر هاتە پێش:

ل سالا یازدێ، ل هەیڤا سێیێ، خەلكێ مـەدینێ هەمی، هویر و گر، ژن و مێر، گاڤ دهژمارتن و بەرێ وان ل مالا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، دەنگ و باس بەلاڤبووبوون كو پێغەمبـەر یێ نساخە، و رۆژ بۆ رۆژێ ئێش یا لێ گران دبت، حەتا وە لـێ هاتی ئێدی ئەو نشیای خۆ ل سەر پییان بگرت و بچت نڤێژێ ل بەرا موسلمانان بكەت.. پێغەمبـەری گۆتـە كابانییا خۆ عائیشایا كچا ئەبووبەكری: بێژنە ئەبووبەكری بلا نڤێژێ ل بەرا خـەلكی بكـەت.. هـەر وەكـی وی ب ڤـێ چەنـدێ دڤیـا صـەحابییان تـێ بگەهینت كو ئەگەر ئێك د ناڤ وان هەبت بشێت ل جهێ وی راوەستت دێ ئەبووبەكر بت و كەسێ دی نە.

عائیشایێ گۆتێ: هندی ئەبووبـەكرە مرۆڤـەكێ دلنازكە، ئەگەر ل جهێ تە راوەستیا نشێتە خۆ ژ بەر گرییێ، ڤێجا ئەگەر تـو بێژییـە عومـەری ئـەو نڤێژێ ل شوینا تە بكەت.. بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- قـەبویل نـەكر

کسەکێ دی ژ ئەبووبەکری پێڤەتر ل جهێ وی ڕاوەستت، ئەبووبەکر ل جهێ پێغەمبەری بوو ئیمام و هەمی صەحابییان نڤێژ ل دویڤ وی کر.

ل وان ڕۆژێن نساخییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دژواربووی صەحابی هەمی د خەمەکا گران دا دژیان، بەلێ یێ ژ هەمییان خەم گرانتر ئەبووبەکر بوو، ڕۆژەکێ ئێش ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پیچەکێ سڤکبوو، لەو صەحابییان هزرکر ئەو یێ بەر ب ساخلەمییێ ڤە دچت، هنگی ئەبووبەکری دەستویری ژێ خواست کو بچتە وی خانییێ خۆ ئەوێ ل (سنح) ژ دەرڤەی مەدینێ، ئینا پێغەمبەری دەستویری دایێ.

ل سپێدەیا ڕۆژا دوشەنبییێ دوازدەی مەها (ربیع الاول)ێ ژ سالا یازدێ، ئەبووبەکر ل وی خانییێ خۆ بوو ئەوێ ژ دەرڤەی مەدینێ، جەواب گەهشتێ کو پێغەمبەر نەمایە، ئەبووبەکر ڕابوو ل دەوارا خۆ سویاربوو و قەستا مەدینێ کر، دیت مزگەفت یا تژی زەلامە، هەمی دحێبەتینە، هندەک یێ دبێژن: پێغەمبەر یێ مری، و هندەک یێ دبێژن: ئەو نەمرییە، و هەمییان پێکڤە نەڤێت باوەر بکەن کو ئەو یێ مری، ئەبووبەکر ب بێ دەنگی ڤە پێشڤەچوو، خەمێ گاڤێن وی گران کربوون، ئەبووبەکری نەدا و نستاند، قەستا مەزەلا کچا خۆ عائیشایێ کر، جهێ پێغەمبەری لێ وەغەر کری.

عائیشا دبێژت: ئەبووبەکر ب ژۆرکەفت، پێغەمبەر یێ درێژکری بوو و پاتەک ل سەر بوو، ئەبووبەکر ب نک ڤە چوو پاتە ژ سەر چاڤان ڕاکر و ماچی کرە ب ناڤ چاڤێن وی ڤە، و گۆت: دەیک و بابێن من گۆری تە ببن، خودێ دو مرنان ل سەر تە کۆم ناکەت، و ئەو مرنا وی ل سەر تە نڤیسی ئەڤە تە دیت، و چاڤێن وی تژی ڕۆندک بوون، و پاتە جارەکا دی ب سەر دادا.

ژ دەرڤەی مەزەلا عائیشایێ، ل مزگەفتێ، مەوقف دژوارتر و نازکتر لێ هاتبوو، بەرێ هەمییان ل دەرگەهی بوو کانێ کەنگی ئەبووبەکر دێ دەرکەڤت، و گۆتنەکا بنجهـ بێژت، دلێن هەمییان ب لەز خۆ دهلاڤێت، و ترسێ خۆ ب سەر دادابوو.. ئەبووبەکر دەرکەفتە مزگەفتێ، عومەری شیرێ خۆ رویس کربوو و ل خەلکی دخورِی، و دگۆت: پێغەمبەر نەمرییە، هەچییێ بێژت پێغەمبەر یێ مری دێ وی ب ڤی شیری کوژم، ئەبووبەکری گازی کرێ: ئەی عومەر بێ دەنگ بە، بەلێ عومەر بێ دەنگ نەبوو، جارەکا دی ئەبووبەکری ژێ خواست ئەو بێ دەنگ بیت بەلێ عومەر بێ دەنگ نەبوو، ئینا ئەبووبەکر ب سەر مینبەرا پێغەمبەری کەفت.. مینبەر ژ سێ دەرەجکان پێک دهات، پێغەمبەری گاڤا خوتبە دخواند دچوو سەر دەرەجکا سێیێ، ئەبووبەکر ب سەر دەرەجکا دویێ کەفت و راوەستیا، حەتا مری ژی کەسێ ئەو ل سەر دەرەجکا سێیێ نەدیت، و پشتی وی عومەری خوتبە ل سەر دەرەجا ئێکێ دخواند حەتا ئەو ژی مری.

گاڤا صەحابییان دیتی ئەبووبەکر ب سەر مینبەرێ کەفت، هەمییان عومەر هێلا و هاتن ل دۆر ئەبووبەکری کۆمبوون، ئەبووبەکری حەمدا خودێ کر و شاهدە دا پاشی گۆت: ئەگەر هەوە عیبادەت بۆ موحەممەدی دکر ئەڤە موحەممەد مر، و ئەگەر هەوە عیبادەتێ خودێ دکر، خودێ یێ زێندییە و نامرت، و خودێ دبێژت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ (آل عمران: ١٤٤).

عومەر دبێژت: گاڤا ئەبووبەکری ئەڤ ئایەتە خواندی، یا ژ من ڤە ئەڤ ئایەتە ژ نوی هاتە خوارێ، هەر وەکی من چو جاران ئەو نەخواندی،

دەست و پێییێن من ساربوونِ و ئەز کەفتمە عەردی، و من زانی ڕاستە پێغەمبەر یێ مری.

دەنگێ گرییێ تژی مزگەفتێ بوو..

مەوقفەکێ ب ساناهی نەبوو، (صەدمە) ژ هندێ مەزنتر بوو ئەڤ کۆما مرۆڤان خۆ ل بەرانبەر بگرت، پێغەمبەر بمرت؟ پا کی دێ ئێدی دلێن وان ئاڤدەت و چاڤێن وان تێرکەت؟ ئێدی کی د ناڤ وان دا دێ قورئانەکا زیندی بت ئێت و چت، ڕۆژەکێ صەحابییەک هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەکی بیهەکا زەر لێ هاتبوو، پێغەمبەری پسیار ژێ کر: تە خێرە؟ وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، من هزرێن خۆ کرن ل ڕۆژا قیامەتێ د بەحەشتێ دا، تو دێ د گەل پێغەمبەران بی ل جهێن بلند، و ئەم دێ د بن هەوە دا بین، و هنگێ ئەز تە نابینم، ڤێجا ئەز یێ وێ هزرێ دکەم هنگی چاوا دێ صەبرا من ئێت؟!

ئەڤ زەلامە بوون بوو.. هێشتا پێغەمبەر یێ زێندی د ناڤ وان دا، ئەو ژ ترسێت دویرکەفتنا ژ وی نساخ دبوون، ڤێجا چاوا ئەڤرۆ ئەو ل کۆلانێن مەدینێ خۆ ب تنێ ببینن؟ چاوا صەبرا وان بێت؟

پیرەژنەک ل مەدینێ هەبوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەلەک جاران دچوو مالا وێ سەرا ددا، پشتی پێغەمبەری، ئەبووبەکری گۆتە عومەری: وەرە دا بچین سەرا فلان پیرەژنێ بدەین ئەوا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرا ددا.. مێهڤانێن پیرێ گاڤا ب ژۆر کەفتین، بیرا وێ ل مێهڤانەکێ دی یێ عەزیز ئیناڤە، ئینا پیرێ گری، وەسا گری حەتا گرییا هەردو مێهڤانێن خۆ ژی ئینای، ئینا ئەبووبەکری گۆتێ: ئەو جهێ پێغەمبەری بار کرییێ بۆ وی ژ وی جهی چێترە یێ ژێ بارکری. ئینا پیرەژنێ گۆتێ: گرییا من ژ بەر هندێیە چونکی وەحی پشتی وی هاتە برین.

خەما وان ب تنێ خەما مرنا پێغەمبەری نەبوو، خەما وان یا هندێ ژی بوو کو ب مرنا پێغەمبەری رۆناهییا وەحییێ ژ عەردی هاتە برین.

عومەری.. دەمێ زانی مرن ڕاستە و خۆشتڤییێ دلی بارکر، چۆکێن وی شکەستن، پێیێن وی نەشیان وی ڕاگرن، کەفتە عەردی، و صەحابییێن دی ژی وەکی وی.. ڕۆژەکا ڕەش بوو، نەخۆشترین ڕۆژ بوو ب سەر مەدینێ دا هاتی وەکی ئەنەسی گۆتی. ئەبووبەکر جارەکا دی هاتە پێش، بەری ئەبووبەکر ب سەر مینبەرێ بکەڤت، یا ژ مرۆڤی ڤە دێ ڕابت هندەک شیرەتان ل هەڤالێن خۆ کەت دا ئەو صەبرێ بکێشن، بەلێ وی وە نەکر؛ چونکی مەوقفی ئەو نەدخواست، مەوقفی دخواست ئەبووبەکر وان ل ڕاستییەکا مەزن هشیار بکەت، دا کەس ژێ بێ ئاگەهـ نەبت: **((أيها الناس: من كان يعبد محمدا فان محمد قد مات، ومن كان يعبد الله فان الله حي لا يموت))**.

ئەبووبەکر تێ نەبت کێ هزرا ڤێ گۆتنێ دکر؟ خودێ یێ زێندییە و نامرت، ئەو تشتێ وی فەرمان پێ ل هەوە کری دەمێ پێغەمبەر یێ ساخ، ئەڤرۆ ژی پشتی مرنا وی ئەو فەرمانێ پێ ل هەوە دکەت.

خودێ.. کانێ چاوا (موحەممەد) هلبژارتبوو دا کو پەیاما وی بگەهینت وەسا (ئەبووبەکر) ژی هلبژارتبوو دا دەورێ پێغەمبەری تمام بکەت.. و زەلامێ ب ڤی ڕەنگی بت دڤێت ل پێشییێ بت.

و وەسا چێبوو.. خودێ وەسا حەزکر صەحابی هەمی ل سەر وێ گۆتنێ کۆمکرن کو خەلیفێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دڤێت ئەبووبەکر بت، ڤێ جارێ ژی ئەبووبەکر ب سەر مینبەرێ کەفت بەلێ دا ڕەنگ و ڕوییێ سیاسەتا خۆ بۆ خەلکی ئاشکەرا بکەت، ئەبووبەکری گۆت: ((گەلی مرۆڤان: ئەز بۆ مەزنییا هەوە هاتمە هلبژارتن و ئەز ژ هەوە مەزنتر نینم،

ئەگەر مـن باشـی کـر هـاری مـن بکەن، و ئەگەر مـن خرابـی کـر مـن ڕاست بکەن، ئەوێ د ناڤ هەوە دا لاواز، ل نک من یێ ب هێزە حەتا ئەز مـافێ وی بۆ وی بستینم، و ئەوێ د نـاڤ هەوە دا ب هێـز ل نـک مـن یـێ لاوازە حەتا ئـەز مـافی ژێ دستینم، گوهدارییا مـن بکـەن هندی ئـەز گوهـدارییا خودێ و پێغەمبەری بکەم، و ئەگەر من گوهداری نەکر من مافێ گوهدارییێ ل سەر هەوە نینە)).

و ئەبووبەکر هاتە خوارێ.. گەلەک ئاخفتن درێژ نەکر؛ چونکی ئـەو نـە ژ وان مـەزنان بـوو یـێن گـۆتنێن وان ژ کریـارێن وان پتـر، هاتـە خـوارێ دا دەست ب کاری بکەت، و (سەد گۆتن گۆری کریارەکێ بن)!

دو سال و سێ هـەیڤان ئەبوویـەکر خەلیفـە بـوو، و ژ وان کـارێن مـەزن یێن ل سەر دەمێ خلافەتا وی چێبووین:

١- هنارتنا لـەشکەرێ ئوسامەی بۆ شامێ، ئەو لـەشکەرێ پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- بـەری مرنـا خـۆ دورسـتکری و نەگەهشـتی فـڕێ کـەت. ئەبووبەکری بەری هەر تشتەکی ئەو لەشـکەر هنـارت، و ئـەڤ هنارتنـە وەکـی کولمەکا دژوار بوو ب ناڤ چاڤێن وان منافقان کەفتی ئەوێن هزرکری پشتی مرنا پێغەمبەری ئیسلام دێ هلوەشیێت و نامینت.

٢- کرنـا شـەڕی د گـەل وان کەسـێن ل کـوفرێ زڤـڕین و پشـت دایـە ئیسـلامێ، و وان کەسـێن ژ درەو خـۆ ب پێغەمبـەراتییێ ئینایـەدەر وەکـی (موسـەیلەمەی) و هنـدەکێن دی، و ڤـێ چەنـدێ هێـزا موسلمانان د چاڤێن خەلکی دا مەزنکر.

٣- کرنـا شـەڕی د گـەل وان کەسـێن گـۆتی: ئـەم زەکـاتێ نـادەین. ئەبووبەکری فەتوا ب کوفرا وان دا و کوشتنا وان حەلالکر؛ چونکی وان کوفر ب دانا زەکاتێ کر.

٤- دەستپێکرنا فتوحاتان ل لایێ رۆژهەلاتێ ل جهێ دگۆتنێ: (بلاد فارس)، ئەبووبەکری (المثنى ابن حارثه) هنارتێ پاشی (خالد بن الولید) پاشی (القعقاع بن عمرو التمیمی).

٥- دەستپێکرنا فتوحاتان ل لایێ رۆژئاڤایێ ل جهێ دگۆتنێ (بلاد الشام)، وی (خالد بن سعید) هنارتێ، پاشی (عکرمه) و (عمرو) و (أبو عبیده) ب دویڤ دا هنارتن، پاشی (خالد بن الولید) بۆ هاریکارییا وان هنارت.

٦- کۆمکرنا قورئانێ د ئێک (مصحف)ێ دا؛ دا بێتە پاراستن، و ئەو موصحەف ل نک ئەبووبەکری، پاشی ل نک عومەری بوو، و پشتی عومەری ئەو ل نک کچا وی (حەفصایێ) بوو، و ل سەر دەمێ عوثمانی وی ئەو موصحەف ژ حەفصایێ وەرگرت.



گەلەک تشت هەبوون ئەبووبەکر ژ صەحابییێن دی جودا دکر، ژ وان تشتان:

١- ئەو ئێکەمین زەلام بوو باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای، بێی ڤەمان یان دودلی.

٢- ئەو ئێکەمین کەس بوو ئیسلاما خۆ ئاشکەراکری، و د ناڤ خەلکی دا رابووی خوتبەک خواندی و تێدا ژ وان خواستی باوەرییێ ب ئیسلامێ بینن.

٣- ئەو موهاجرێ ئێکانە بوو دەیک و بابێن وی موسلمانبووین.

٤- ئەو صەحابییێ ئێکانە بوو یێ پێغەمبەری هلبژارتی کو د گەل وی مشەخت بیت.

٥- مرۆڤێ ژ هەمییان پتر پێغەمبەری حەز ژێ دکر ئەو بوو، وەکی د حەدیسێن دورست دا هاتی.

٦- وی ژ هەمی صەحابییان پتر مالێ خۆ د رێکا خودێ دا خەرج کربوو، و پتر ژ جارەکێ وی مالێ خۆ هەمی دئینا دکرە خێر و چو بۆ خۆ نەدهێلا.

٧- د هندەک حەدیسێن دورست دا هاتییە کو ئەو چێترینێ ئومەتێیە پشتی پێغەمبەری، و باوەرییا وی هەی هندی یا ئومەتێ هەمییێیە.

٨- ئەو صەحابیێ ئێکانە بوو یێ ل سەر دەمێ پێغەمبەری و ل حضوورا وی فەتوا ددان.

٩- ئەو ئێکەمین کەس بوو بڕیارا کۆمکرنا قورئانێ د ئێک موصحەفێ دا دای.

١٠- د هندەک حەدیسان دا هاتییە کو ئەو ئێکەمین کەسە -پشتی پێغەمبەری- دچتە بەحشتێ.

١١- ئەو صەحابیێ ئێکانە بوو یێ پێغەمبەری هلبژارتی کو ببتە ئەمیرێ حەجێ و هێشتا پێغەمبەر یێ ساخ.

١٢- ئەو صەحابیێ ئێکانە بوو یێ ل جهێ پێغەمبەری نڤێژ ل بەرا صەحابییان دکر، ل دەمێ پێغەمبەر نە یێ ئامادە. و ژ صەحابییان کەسێ ژ بلی وی نڤێژ ل بەرا پێغەمبەری نەکرییە.

١٣- ئەو ئێکەمین صەحابی بوو بوویە خەلیفێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

گەلەک تشتێن دی ژی ل نک وی هەبوون دبنە نیشانێن چێترینییا وی.

ل رۆژا دوشەنبیٚ ب شەڤێ، پشتی نڤێژا مـەغرەب، ل بیست و دویـێ هـەیڤا (جمـادى الآخـره) ل سـالا سێزدێ ئەبووبـەكری خـاترا خـۆ ژ دنیـایێ خواست، پشتی چەند رۆژەكا نساخبووی، و بـەری ئـەو بمرت وی هنارتـە ب دویڤ عومەری را و وەصیەت كر كو پشتی وی عومـەر ببتە خەلیفـە. و دەمێ ئەو یێ نساخ هندەک هەڤالێن وی چوون سەرا دا، ئێكی گۆتێ: ما نەهنێرینە ب دویڤ دختۆرەكی را دا بەرێ خۆ بدەتـە تـە، ئەبووبـەكری گۆت: دختـۆری بـەرێ خـۆ یـێ دایـە مـن، وان گۆتێ: وی چ گۆتـە تـە؟ ئەبووبـەكری گۆت: وی گۆتە من: ((إني فعال لما أريد)) ئەز وێ دكەم یا من دڤێت!

پشـتی ئەبووبـەكر مـری ل تەنشـت پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- هاتـە ڤەشارتن. و دەمێ مری ژییێ وی شێست و سێ سال بوون.

ئەبووبەكری شەش زارۆک هەبوون: سێ كوڕ و سێ كچ. كوڕێ وی یـێ مەزن ناڤێ وی (عبد الله) بوو ل سەر دەمێ خلافەتا ئەبووبـەكری مربـوو، و كـوڕێ وی یـێ دی (عبـد الـرحمن) بـوو ل سـالا (٥٣) مربـوو، و (عبـد الـرحمن)ی كـوڕەک هـەبوو نـاڤێ وی (محمـد) بـوو صـەحابی بـوو، و ئـەڤ (محمـد)ە صـەحابییێ ئێكانەیـە یـێ ئـەو و بـابێ وی و بـاپیرێ وی و بـابێ باپیرێ وی هەر چار صەحابی، و كوڕێ ئەبووبەكری یێ سێیێ (محمد) بوو.

كچێن ئەبووبەكری ژی سێ بوون: یا مەزن (ئەسماء) بوو و ڤـێ شـوی ب(الزبير بن العوام)ی كربوو، و ئەو دەیكا (عبد الله بن الزبير)ییـە. و یـا ژ وێ بچویكتر (عائیشا) بوو و ئاشكـەرایـە كـو وێ شوی ب پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- كربـوو، و كچا وی یـا بچویـک (ام كلثـوم) بـوو و ئەڤـە یا پاشباب بوو، و شوی ب (طلحە)ی كربوو.

## خەلیفێ دویێ
## عومەرێ کوڕێ خەططابی

ڤێ جارێ دۆر دۆرا عومەرییە.. و گاڤا مرۆڤی گۆتی: عومەر، هەر وەکی مرۆڤی گۆتی: ڕۆژا خزیرانێ، ما هەوجە دکەت تو ڕۆژێ بۆ خودان چاڤەکی بدەیە تەعریفکرن؟

ب ڕاستی دەمێ مرۆڤی بڤێت بەحسێ عومەری بکەت، حێبەتی دبت کانێ ژ کیڤە دەست پێ بکەت، ئەگەر یا موستەحیل بت مرۆڤ بشێت ئاڤا دەریایەکێ د ئامانەکی دا کۆم بکەت، ئەز دبێژم: یا ژ وێ موستەحیلتر ئەوە مرۆڤ بشێت بەحسێ عومەری د پەیڤەکێ دا کۆم بکەت.

عومەر خودانێ دلەکی بوو گەلەک ژ کەڤرێن هشک رەقتر بوو، مرۆڤەکێ بەرزە بوو ل کۆلانێن مەکەهێ، وی عەقلەکێ وەسا هەبوو پەیکەرەک ژ خورمێ چێکربوو و دگۆت: ئەڤە خودێ منە! و گاڤا برسی دبوو ڕادبوو خودایێ خۆ ددا بەر لەڤان!

پاشی ڕۆژ بۆرین و سال هاتن، ئەڤ عومەرە ژ بایێ سەرێ سحاران نازکتر لێ هات، بوو ئەو هەیڤا گەش یا شەڤا خەلکی روهنکری و ڕێ نیشا بەرزەبوویان دای.. بوو ئەو عومەر یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دەر حەقا وی دا گۆتی: ئەگەر پشتی من پێغەمبەرەک هەبا دا عومەر بت. ڤێجا کەرەم کەن دا دەلیڤەیەکێ پێکڤە خۆ بدەینە بەر سیبەرا ڤی چیایێ بلند ئەوێ خودێ حەقی و نەحەقی پێ ژێکجوداکری.

ناڤێ وی د جاهلیەتێ و ئیسلامێ دا عومەر بوو، بابێ وی خەطاب کورێ نوفەیلێ کورێ عەبدلعوززایێ کورێ رەباحێ کورێ عەبدللاهێ کورێ قورطێ کورێ رەزاحێ کورێ عەدییێ کورێ کەعبی بوو.. ژ ئویجاخا قورەیشیانە، ژ بابکێ (عەدی)، ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل کەعبێ کورێ لوئەیی دگەهنە ئێک. دەیکا وی ژی یا قورەیشی بوو، بەلێ ژ بابکێ مەخزوومییان بوو، ناڤێ وێ (حەنتەمە بوو، کچا هاشمێ کورێ موغیرەیی بوو، دۆتماما ئەبووجەهلی بوو عەمرێ کورێ هشامێ کورێ موغیرەیی.

ل رۆژا شەرێ بەدرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناسناڤێ وی کرە: (بابێ حەفصی)، و (حفص) ل نک عەرەبان ناڤەکە ژ ناڤێن شێری. هەر وەسا پێغەمبەری ناسناڤێ (الفاروق) ژی دانابوو سەر، و (فاروق) ئەوە یێ حەقی و نەحەقی ژێکجوداکری.

عومەر -وەکی د وەصفا وی دا دئێتە گۆتن- مرۆڤەکێ بەژن بلند بوو، دێمێ وی یێ سپی بوو، و ڕیهێن وی د بۆش بوون، و سەرێ وی یێ (ئەصلەع) بوو، و هێشتا د جاهلیەتێ دا ئەو مرۆڤەکێ خواندەڤا بوو، دزانی بخوینت و بنڤیست.

سەر و بەرێ ژیانا وی بەری موسلمان ببت ب بەرفرەهی نەهاتییە زانین، بەلێ تشتێ ئاشکەرا ئەو بوو عومەر مرۆڤەکێ گەلەکێ دلرەق بوو، یێ دژوار بوو، خەلک ژێ دترسیان، ل دەسپێکا پەیدابوونا گازییا ئیسلامێ عومەری هەلویستەکێ گەلەکێ خراب و دژوار دژی موسلمانان هەبوو، گاڤا زانییا مرۆڤەکێ موسلمانبووی و مایێ وی تێ چووبا دا ڕابت وی مرۆڤی ژ دەست و پێیان گرێدەت، و ل بەر چاڤێ ڕۆژا ئاریای عەزاب دەت، و دوژمناتییا وی بۆ ئیسلامێ هند یا دژوار بوو کافرێن قورەیشیان ب وی د پشتڕاست بوون، کو ئەو ڕۆژەکێ مفایی دێ گەهینتە وان.

پسيارا ل ڤێرێ خۆ دهلێخت ئەڤەیه:

- ئەرێ ئەڤ عومەرێ دژوارترین دوژمن بۆ ئیسلامێ و موسلمانان چاوا رێکا خۆ گوهارت و هاته د ئیسلامێ دا و بوو مەزنترین لەشکەر د چەپەرێ بەرەڤانییا ژ ئیسلامێ دا؟

حەتا بەرسڤا ڤێ پسیارێ بۆ مە ئاشکەرا ببت دڤێت پسیارەکا دی بکەین: ئەرێ چەند دەرگەهێن دائێخستی د ناڤبەرا ئیسلامێ و عومەری دا هەبوون، و چ ئەگەر د پشت دوژمناتییا وی را بۆ ئیسلامێ هەبوو؟

راسته عومەر مرۆڤەکێ دلرەق بوو، بەلێ مەعنا وێ ئەو نینه دلێ رەق چو جاران نەرم نابت.. رۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایه موسلمانێن هەژار کو مشەخت ببن و بچنه حەبەشێ، بۆ جارا ئێکێ -و عومەر هنگی مرۆڤەکێ جاهلی بوو- هندەک موسلمانێن هەژار و بێرێ ڤیا مشەخت ببن، ژنکەکێ ژ وان دگۆتنێ: دەیکا عەبدللاهی کەفته دەستێ کافران و وان رێ لێ گرت و نەهێلا ئەو بچت بگەهته زەلامێ خۆ، عومەر -خودانێ دلێ رەق- ژ هەمییان دلۆڤانتر بوو د گەل ڤێ ژنکێ، وی رێ دایێ و داخوازا سلامەتییێ ژی بۆ کر، و گۆتێ: هەرە بگەهە هەڤالێن خۆ..

ڤێ هەلویستێ عومەری دلێ ژنکێ برە هندێ کو یا ب هیڤی بت عومەر ژی موسلمان ببت، عامرێ کورێ رەبیعەیی گۆتێ: نە کو تو تەمەعییا موسلمانبوونا عومەری دکەی؟ وێ گۆت: بەلێ.. عامری گۆت: هنگی عومەر دێ موسلمان بت حەتا کەرێ خەططابی موسلمان دبت!

بەلێ ئەو یێ خەلەت بوو، و ژنک یا دورست بوو.

راسته عومەر یێ دژوار بوو، بەلێ مەعنا وێ ئەو نینه مرۆڤێ دژوار چو جاران حسێبێ د گەل خۆ ناکەت، عومەری گاڤا ددیت هندەک مرۆڤێن هەژار و بێ زەرەر یێن دئێنه گرتن و عەزابدان -و هندەک جاران

ب دەستێن وی ب خۆ- و کەس نینە بەرەڤانیێ ژ وان بکەت.. عومەر ب پەشێمانیێ دحەسیا و پسیار ژ خۆ دکر: ئەرێ بۆ؟

مرۆڤێ زیرەک و یێ ب عار کەیف ب زۆرداریێ نائێت ئەگەر خۆ ل دوژمنێ وی ژی بێتەکرن.

رۆژا پێغەمبەرینیا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەست پێ کری ژییێ عومەری بیست و حەفت سال بوون، چونکی عومەر سێزدە سالان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بچویکتر بوو، مەعنا دەمێ گازییا ئیسلامێ دەست پێ کری عومەر زەلامەکێ کامل بوو، ئەو ب خۆ مرۆڤەکێ ب عار و خودان غیرەت بوو، و کانێ چاوا ئیسلامێ خێرەکا مەزن ژ ڤی سالۆخەتێ وی دیت پشتی ئەو موسلمانبووی، هەر ئەڤ سالۆخەتە بوو -ل دەسپێکێ- بوویە دەرگەهێ دائێخستی یێ ئێکانە د ناڤبەرا وی و ئیسلامێ ژی دا.

ئەگەر هوین پسیار کەن: چاوا؟ دێ بێژم: غیرەتا عومەری یا زێدە و عارا وی ئێکا هند ژێ چێکر دەمێ وی گوهـ لێ بووی زەلامەک د ناڤ قورەیشییان دا یێ دەرکەفتی دبێژت: ئەو دینێ باب و باپیرێن هەوە ل سەر، دینەکێ پویچە و چو خێر تێدا نینە، و ئەو صەنەمێن هوین خۆ بۆ دچەمینن هندەک بەرێن رەق و هشکن، چو مفایی ناگەهیننە هەوە، و گاڤا وی دیتی هندەک مرۆڤ یێن بوویننە تاگیرێن ڤێ گازییێ، و دوبەرەکی د ناڤ قورەیشییان دا پەیداکرییە. غیرەتا وی ل سەر رێکا باب و باپیران، و عارا وی ل سەر کولتۆرێ ئویجاخێ وە لێ کر دنیا د چاڤان دا تاری ببت، وی گەلەک هزرێن خۆ د ڤی دینێ نوی دا نەکرن، پسیار نەکر: ئەڤ پێغەمبەرە چ دبێژت و بەرێ خەلکی ددەتە چ؟ ئێکسەر دەست دا چویڤی و گۆت: نابت کەسەک هەبت ژ رێکا باب و باپیران دەرکەڤت، ئەو رێبازا پیرۆز یا ئەڤە هندە سالە د گەل خوینا مە گەرپای هۆسا ب ساناهی چێ نابت بێتە

هێلان.. ئەڤە ئەو دەرگەهێ ئێکانە بوو یێ کەفتییە د ناڤبەرا عومەری و ئیسلامێ دا، و گاڤا خودێ ڤیای ئەڤ دەرگەهە ڤەبت، ب ڕەنگەکێ وەسا ب ساناهی ڤەبوو خەلک ژ بەر حێبەتی بوون.

وەرن دا پێکڤە د گەل عومەری بژین.. و سەرهاتییا گوهۆرینا مەزن د ژیانا وی دا، ئەو سەرهاتییا ئەو ژ نزمترین کەند و کۆرێن جاهلیەتێ گەهاندییە بلندترین کۆپێ ئیسلامێ.

ئیمام ئەحمەد ژ عومەری ب خۆ ڤەدگوهێزت، دبێژت: ئەز مرۆڤەک بووم من خۆ ژ ئیسلامێ دویر دکر، و من هندەک هەڤال هەبوون ئەم پێکڤە ل جهەکی کۆم دبووین مە ڤەدخوار و دەمێ خۆ دبۆراند.. شەڤەکێ ئەز هاتم من چو هەڤالێن خۆ نەدیتن.. ئینا من گۆتە خۆ: دا بچمە کەعبێ طەوافێ بکەم، ئەز هاتم من دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ڕاوەستایە نڤێژێ دکەت، من گۆت: باشە، ئەڤ شەڤە ئەز دێ گوهێ خۆ دەمە موحەممەدی کانێ ئەو چ دبێژت. من خۆ نێزیک کر، و خۆ د ناڤ پاتێ کەعبێ ڕا ڤەشارت دا ئەو من نەبینت، ئینا وی دەست ب خواندنا سوورەتا (الحاقة) کر، من گوهێ خۆ دایێ کەیفا من گەلەک ب ڤەهاندنا قورئانێ هات، من د دلێ خۆ دا گۆت: قورەیشی ڕاست دبێژن: ئەڤە شاعرە، ئینا من هند گوهـ لێ بوو وی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۝ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ۝ ﴾ ئینا من گۆت: پا دیارە ئەو گۆتنا کاهنانە، ئینا وی خواند: ﴿ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ۝ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ۝ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ۝ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ۝ ﴾. گاڤا عومەری گوهـ ل قورئانێ بووی، دلێ وی نەرمبوو، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە عومەر دبێژت: گرییا من هات و ئەز هاتمە د ئیسلامێ دا.

مەعنا: عومەری حسێب دکر ئەڤ رۆژە رۆژا هاتنا وی یا د ئیسلامێ دا بوو.. بەلێ هەر د وان رۆژان دا سەرهاتییەکا دی ژی چێبوو پتر عومەر ب قورئانێ ڤە گرێدا و بوو ئەگەرا هندێ ئەو ئێکسەر قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت و ل سەر دەستێ وی شاهدە بدەت.

ئاشکەرایە کو حەتا وی دەمی موسلمان دڤەشارتی بوون، و ئەو نەدوێریان ئیسلاما خۆ ئاشکەرا بکەن، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل هەڤالێن خۆ ب دزی ڤە ل مالا ئەرقەمی کۆم دبوون، پشتی حەمزە موسلمانبووی ب سێ رۆژان و ب دورستی ل شەڤا چارشەنبێ ل سەر پێنجشەنبێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مالا ئەرقەمی دوعایەک کر و گۆت: یا رەببی تو ئیسلامێ ب عەمرێ کورێ هشامی (ئەبووجەهلی) یان ب عومەرێ کورێ خەططابی عەزیز بکە.

ل پێنج شەنبێ عومەر ب بێن تەنگیا ژ گازییا ئیسلامێ حسیا، رابوو شیرێ خۆ هلگرت و قەستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر و گۆت: ئەز هنگی دزڤرم حەتا وی بکوژم. مرۆڤەک کەتە رێکا وی گۆتێ: دێ چ کەی؟ وی گۆت: دێ چم موحەممەدی کوژم ئەوێ قورەیشی ژێکڤەکرین، و عەیب د دینێ وان دا دەرێخستی و گۆتنێن سەقەت د دەرحەقا خوداوەندێن وان دا گۆتین[1].

ئینا وی مرۆڤی گۆتێ: ئەی عومەر ئەز ب خودێ کەمە تو خۆ گەلەک دبینی، ئەگەر تە موحەممەد کوشت دێ ژ بەر (بەنی هاشم) و (بەنی زوهرە) کیڤە رەڤی؟ ما ئەو دێ هێلن تو ل سەر عەردی ب رێڤە بچی؟ کانێ تو هەرە جارێ مالا خۆ دورست کە.. عومەری گۆت: کی ژ مالا من؟ گۆتێ:

---

(١) بەرێ خۆ بدەنێ چ بوو عومەر کرییە دوژمنێ ئیسلامێ: غیرەت و عارا وی ل سەر دینێ قورەیشییان!

زاڤایێ تە و پسمامێ تە سەعیدێ کورێ زەیدی و خویشکا تە فاطمایا کچا خەططابی.

عومەری رێکا خۆ گوهارت، ڤەستا مالا خویشکا خۆ کر.. ل وی دەمی خەبابێ کورێ ئەرەتتی ل مالا وان بوو قورئان نیشا سەعیدی و فاطمایێ ددا، دەنگێ وی گەهشتە عومەری، و دەنگێ عومەری ژی گەهشتە وان، خەببابی ژ ترسان دا خۆ ڤەشارت، فاطمایێ ئەو پەرێ قورئانێ ژێ وەرگرت، و د ناڤ کراسێ خۆ دا ڤەشارت، عومەر ب ژۆر کەفت و ل وان خورِی: ئەو چ دەنگ بوو دهاتە من؟ وان گۆتێ: تە چ گوهـ لێ بوویە؟ وی گۆت: بەلێ، من یێ زانی هوین یێن ب دویڤ موحەممەدی کەفتین، و کولمەک ل سەعیدی دا، فاطما چوویێ دا وی ژ سەعیدی ڤەکەت، عومەری کولمەک دانا وێ ژی خوین ژ دەڤ و دفنێ هات. گاڤا عومەری دیتی خویشکا وی بریندار بوو ڕاوستیا و هێدی گۆتێ: ئەو چ بوو ڤ تە کا بدە من، عومەری ژێ وەرگرت، و د گەل خۆ خواند: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ طه ① مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ② ﴾ و عومەر پێدا چوو حەتا گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ⑭ ﴾ ل ڤێرێ عومەر ژ خواندنێ ڕاوەستییا، پێ حسیا هەر وەکی سنگێ وی بەرفرەهبوو.. ئەڤە چ گۆتنە ئەو دخوینت؟ پاشی هەر زوی وی بۆ خۆ گۆت، و ئەو کەسێن ل نک گوهـ ل ئاخفتنا وی بوو، عومەری گۆت: خودانێ ڤێ گۆتنێ دڤێت پەرستنا کەسێ د گەل وی نەئێتەکرن، و .. ئەو دەرگەهێ گرتی ڤەبوو، گرفتارییا عومەری ئەو بوو وی دوژمناتییا ئیسلامێ دکر بێی گوهێ خۆ بدەتێ کانێ ئیسلام چ دبێژت و چ دڤێت، گاڤا ئەڤ گرفتارییە ژ رێکێ رابووی و وی ژ نێزیک گوهـ ل گازییا ئیسلامێ بووی ئێکسەر وی ڤەستا ئیسلامێ کر، ئیسلامێ -ب ساناهی- عومەر کەسب

کر، و رۆژا ئیسلامێ عومەر کەسبکری جیهانا مرۆڤینییێ هەمییێ عومەر کەسبکر.. کەسبەکا وەسا حەتا زەمان هەبت و رۆژ و شەڤ بزڤرن دێ هەبت.

د پشت پەردەیێ ترسێ را خەبابی بەرێ خۆ ددا عومەری، گاڤا وی دیتی عومەر نەرمبوو وی ئێکسەر خۆ ئاشکەراکر و گۆت: مزگینی ل تە بت ئەی عومەر، هیڤییا من ئەوە تو ب بەر دوعایا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفتبی، دوهی من گوهـ ل وی دبوو وی دوعایەک ژ خودێ دکر کو خودێ ئیسلامێ ب (ئەبولحەکەمێ کورێ هشامی) یان (عومەرێ کورێ خەططابی) عەزیز بکەت.

عومەر لێ زڤری و گۆتێ: موحەممەدی نیشا من بدە.. خەبابی مالا ئەرقمی نیشا دا، عومەری شیرێ خۆ راکر، و قەستا مالا ئەرقمی کر.. و چەند دەلیڤەیەک بوون عومەر گەهشتە بەر دەرگەهی، دەرگەهـ قوتا، ئێکی د کونا دەری را بەرێ خۆ دایێ و ب ترس ڤە زڤری و گۆت: ئەڤە عومەرە شیرێ وی یێ د دەستان دا، بەری پێغەمبەر بەرسڤێ بدەت، شێرێ خودێ حەمزە رابوو سەر پێیان و گۆت: دەرگەهی بۆ ڤەکەن ئەگەر وی خێر دڤێت ب خێر بێت ئەگەر نە.. ب شیرێ وی دێ وی کوژین.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: دەرگەهی بۆ ڤەکەن. و پێغەمبەر ب بەرڤە چوو و بەر سنگێن وی گرتن و هژاند و گۆتێ: کورێ خەططابی تو هاتییە چ؟ عومەری ب دەنگەکێ نەرم ڤە گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەز یێ هاتیم دا باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینم.

خافلەتی ب مرۆڤێن حازر کەفت، وان هزرەکا دی دکر، و ئەڤە تشتەکێ دی چێبوو.. پێغەمبەری و صەحابییان پێکڤە گۆت: (الله أكبر) حەتا دەنگێ وان ب سەر خانی کەفتی.. (الله أكبر) عومەر موسلمانبوو، عومەر ئەوێ رۆژەکێ موسلمانەکی گۆتی: کەرێ خەططابی دێ موسلمان

بت و عومەر موسلمان نابت.. (الله أكبر) عومەر ئەوێ شیرێ خۆ بۆ کوشتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕویسکری، نوکە یێ دەستێ خۆ دکەتە د ناڤ دەستێ وی دا و دبێژتێ: (.. و أشهد أنک رسول الله).

ئەڤ سەرهاتییە ل هەیڤا (ذو الحجە)یێ بوو ل سالا شەشێ پشتی هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ژییێ عومەری هنگی بیست و حەفت سال بوو.



عومەر موسلمانبوو، و ب موسلمانبوونا وی هژمارا موسلمانا بوو چل زەلام، یەعنی عومەر زەلامێ چلێ بوو موسلمانبووی.. بەلێ موسلمانبوونا وی وەکی یا کەسێ دی نەبوو، گاڤا عومەر هاتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و شاهدە دای، ئێکسەر وی پسیار ژ پێغەمبەری کر: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما ئەم نە دحەقین؟ گۆت: بەلێ، گۆتێ: پا بۆچی ئەم خۆ ڤەشێرین؟ عومەری ئینا بیرا خۆ کانێ وی چەند نەخۆشی گەهاندینە موسلمانێن هەژار، و وی ل چەند جهان شانازی ب کوفرا خۆ یا بری و گۆتنێن سەقەت د دەرحەقا ئیسلامێ و پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- یێن گۆتین، لەو وی پێ خۆش نەبوو ئەڤرۆ -پشتی ئەو موسلمانبووی- ئەو د ژۆر ڤە ڕوینتە خوارێ و چو دەنگی نەکەت.. بەلێ مەسەلا دەرکەفتن و بەلاڤکرنا گازییا ئیسلامێ ب ڕەنگەکێ ئاشکەرا نە ب دەستێ عومەرییە و نە ب دەستێ پێغەمبەری ب خۆیە ژی.. عومەری دەستویری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست کو مەسەلا موسلمانەتییا خۆ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت، پێغەمبەری دەستویری دایێ، عومەری پسیارکر: ئەرێ کی هەیە ل مەکەهێ زوی گۆتنا نەقل دکەت؟ هندەکان گۆتێ: فلان کەس.. عومەر چوو نک، گۆتێ: ئەرێ تو دزانی ئەزێ موسلمانبوویم؟ وی مرۆڤی

هێشتا ل نک عومەری ژ بنێ پێیان کرە هەوار: گەلی قورەیشییان عومەر یێ د سەرداچووی و عومەر ب دویڤ ڕا دچوو و دگۆت: ئەو درەوان دکەت ئەز یێ موسلمانبوویم.

عومەری سۆز دابوو هەر جهەکێ وی کوفرا خۆ لێ ئاشکەرا کری بچت ئیسلاما خۆ ژی لێ ئاشکەرا بکەت.. مەنهەجێ عومەری هەر ژ ڕۆژا ئێکێ ئەڤە بوو، صەراحەت و خۆدویرکرنا ژ (لەف و دەوەرانێ) ئیسلامەکا ڕاست و دورست، یا دویر ژ سیاسەتا (وەربادان) و (پارچەپارچەکرنێ)، ئەڤە ڕێکا عومەری بوو ئەگەر تە بڤێت بزانی.. لەو عومەری گەلەک جاران دگۆت: ئەگەر تە بڤێت باشییا ئێکی بزانی بەرێ خۆ نەدە ڕۆژی و نڤێژێن وی، بەلێ بەرێ خۆ بدە ئاخفتنا وی کانێ یێ ڕاستگۆیە یان نە، و کانێ ئێمانەتێ دپارێزت یان نە، و ئەگەر دلێ وی چوو گونەهەکێ کانێ خۆ ژێ ددەتە پاش یان نە.

عومەری دەست پێ کر جهـ جهـ گەڕییا و ل سەری ژ خالێ خۆ ئەبووجەهلی دەست پێ کر، و هەر جهەکێ چووبایێ دا بێژت: ئەز یێ چوویمە سەر دینێ موحەممەدی و هوین چ دکەن بکەن، پشتی هەمی جهـ خلاسکرین، وی قەستا دیوانخانەیا قورەیشییان ل کەعبێ کر، پشتی وی کەعبە طەوافکری ئەو ل بەرانبەر مەزنێن قورەیشییان ڕاوەستییا و ب دەنگەکێ بلند شاهدە دا، عوتبەیێ کوڕێ ڕەبیعەیی تەحەممل نەکر، چوو عومەری دا لێ بدەت، و خەلکی دا ب دویڤ ڤە، عومەری ئەو ئێخستە بن دەست و پێیێن خۆ و لێ دا، و گاڤا خەلکی ئەڤ چەندە دیتی ژێ ڕەڤین و عوتبە هێلا د دەستان دا.

ئبن مەسعوود دبێژت: ئیسلاما عومەری (فەتح) بوو، و مشەختبوونا وی سەرکەفتن بوو، و حوکمدارییا وی دلۆڤانی بوو. و دبێژت: هنگی ئەم

پشتراستبووین رۆژا عومەر موسلمانبووی، و حەتا ئەو موسلمان نەبووی ئەم نەدوێریاین نڤێژێ ل بەیتێ بکەین.

صوهیبێ رۆمی ژی دبێژت: پشتی عومەر موسلمانبووی ژ نوی ئەم وێریان ل بەیتێ روینین و طەوافێ بکەین.

هەر د وێ رۆژێ دا یا عومەر موسلمانبووی، و پشتی وی داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری کو ئەو دەرکەڤنە کۆلانێن مەکەهێ و ئاشکەرا بەرێ خەلکی بدەنە ئیسلامێ دەستویری بۆ خودان باوەران هاتەدان کو ئەو دەرکەڤن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابی کرنە دو رێز: رێزەکێ حەمزە ل بەراهییێ بوو و رێزا دویێ عومەر.. و ب ڤی رەنگی ئەو دەرکەفتن و چوون حەتا گەهشتینە کەعبێ، و گاڤا کافران حەمزە و عومەر دیتین زێدە زێدە قەهرین و گۆتن: ئێدی خلاس!

پشتی عومەر موسلمانبووی، و هندی ئەو ل مەکەهێ، ئەو یێ نیزیک بوو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هەردەم د خزمەتا وی و موسلمانان دا بوو، و نێزیکییا وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهشتبوو حەددەکی گەلەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا خۆ پێ دکر.

پشتی عومەر موسلمان بووی نێزیکی دەهـ سالان ل مەکەهێ ما.. و ئەو بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا خودان باوەران کو بەر ب (یەثربێ) ڤە مشەخت ببن، و د گەل مشەختبوونێ ژی عومەری چیرۆکا خۆ یا تایبەت هەیە[1]: هەر موسلمانەکێ ژ مەکەهێ مشەختبوویە مەدینێ ب رەنگەکێ ڤەشارتی ژ مالا خۆ دەرکەفت و خۆ ڤەدزی و قەستا مەدینێ

---

(١) هندەک زانایێن حەدیسێ دبێژن: ئەڤ سەرهاتییە ب رێک دورست نەگەهشتییە مە، و عومەر ژی وەکی هەمی صەحابییان ڤەشارتی مشەختبووبوو، و هندەک دبێژن: سەنەدا وێ یا باشە.

کر، عومەر تێ نەبت، ڕۆژا وی ڤیای مشەخت ببت وی کارێ خۆ کر، شیرێ خۆ د ستوییێ خۆ دانا، و کڤانێ خۆ ب ملێ خۆ ڤەکر، و ڕمێ خۆ یێ کورت د دەستێ خۆ گرت، و قەستا کەعبێ کر، حەفت جاران ل دۆر کەعبێ زڤری و هاتە نک مەقامێ ئیبراهیمی نڤێژ کر، پاشی ڕوییێ خۆ ب نک مەزنێن قورەیشیان ڤە لێدا و هنگی ئەو هەمی دروینشتیبوون، و گۆتە وان: ئەڤ ڕوییە درەش بن، خودێ ڤان دفنان ل ئاخێ بکێشت! هەچییێ ژ هەوە بڤێت دەیکا وی بمینتە بێ کوڕ، یان عەیالێ وی بمینتە ئێتیم، یان ژنا وی ببتە بیژن، بلا بێتە بەراهییا من ل پشت ڤێ نهالێ ئەڤە ئەز چووم.

ئەڤە عومەر بوو.. ڕۆژەکی بەرێ وی ب جحێلەکی کەفت، وی سەرێ خۆ چەماندبوو و خۆ مەلویل کربوو دا خەلک بێژن ئەو یێ ب تەقوایە، عومەری لێ حەیتاند و گۆتێ: سەرێ خۆ بلند کە! تەقوایا د دلی دا، هەچییێ ژ دلی پتر تەقوایا خۆ نیشا خەلکی بدەت، ئەو یێ منافقییێ بۆ خەلکی دکەت.

عومەر خۆ ڕەزیلکرنێ قەبویل ناکەت خۆ ئەگەر ب هێجەتا تەقوایێ ژی بت.. دیرۆکێ ڕەنگێ مشەختبوونا عومەری د ناڤ بەرپەڕێن خۆ دا پاراست دا ببتە دەلیلەکێ ئاشکەرا دژی هەر کەسەکێ بێژت: هجرەتا موسلمانان ژ مەککەهێ بۆ مەدینێ ڕەڤین بوو.

ب زیرەکی و عەدالەتا خۆ عومەری (تەحەددییا) هەمی سەر و گرگرێن کوفرێ کر، و سالەک پێڤە نەچوو ئەو نفرینا عومەری ل وان کری ب جهـ هات، ئەو کەسێن عومەری دەستێن خۆ ب نک ڤە کێشاین، هەمی یان بارا پتر ژ وان ل ڕۆژا بەدرێ ڕویرەش بوون و دفنێن وان ل ئاخێ هاتنە کێشان، و بەری هەمییان دفنا خالێ وی فیرعەونێ ئوممەتێ ئەبووجەهلی.



پشتی خودایێ مەزن دەستویری دایە پێغەمبەرێ خۆ کو مشەخت ببت، و وی ژی وەکی مشەختێن دی قەستا مەدینێ کری، و ل وێرێ د ناڤ خودان باوەران دا ئاکنجیبووی، عومەر ئێک ژ صەحابییێن وی یێن نێزیک بوو بۆ وی، و گەلەک جاران وی مشێورەتا خۆ ب عومەری دکر، و ئەڤ چەندە باش ئاشکەرابوو پشتی شەڕێ (بەدرێ) دەمێ خودێ وەسا حەزکری کو موسلمان ب سەرکەڤن و حەفتێ ژ مەزن و گرگرێن قورەیشیان کەفتنە دەستێ موسلمانان و چونکی ئەو بۆ جارا ئێکێ بوو موسلمان کافران ئێخسیر دکەن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەزانی کانێ دێ چ ل وان کەت، ئینا وی پسیارا هندەک صەحابییێن خۆ کر، ئەبووبەکری گۆت: ئەگەر ئەم بەرانبەری هەر ئێکێ هندەک پارەی وەرگرین، و وان بەردەین چێترە. عومەری گۆت: ئەڤە کافرن و ئەو یێن هاتین دا دینێ خودێ نەهێلن، ڤێجا یا باش ئەوە هەر ئێک ژ مە مرۆڤێ خۆ یێ کافر بکوژت؛ دا کافر بزانن کو چو ڤیانا وان د دلێ مە دا نینە.

و دیارە کو رەئیا عومەری ب تنێ ب ڤی رەنگی بوو لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب رەئیا دی کر و (فدیە) ژ ئێخسیران وەرگرت، ئینا ژ بەر ڤێ چەندێ ئایەتەکا قورئانێ هاتە خوارێ، تێدا گەڤ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبووبەکری هاتەکرن: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾ (الأنفال: ٦٧). ڤێجا ئەگەر وێ رۆژێ خودێ عەزابەک ب سەر موسلمانان دا ئینابا ژ عومەری پێڤەتر کەس ژێ خلاس نەدبوو!

د شەرێ ئوحودێ ژی دا عومەر یێ ئامادەبوو، و د گەل موسلمانان دژی کافران شەڕکر حەتا دووماهییێ و دەمێ هندەک صەحابییان بێ ئەمرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری و موسلمان شکەستین، و وان

قەستا چیایێ ئوحودێ کری، ئەبوو سوفیان هاتە ڕاستا موسلمانان و گازی کر: موحەممەد د ناڤ هەوە دا هەیە؟ کەسێ بەرسڤا وی نەدا، پاشی گۆت: (ابن أبي قحافه) د ناڤ هەوە دا هەیە؟ دیسا کەسێ بەرسڤا وی نەدا، ئینا گۆت: (کوڕێ خەططابی) د ناڤ هەوە دا هەیە؟ کەسێ بەرسڤ نەدا، ئینا ئەبوو سوفیانی گۆت: ئەڤە تێرا مە هەنە.. (یا ژ وی ڤە ئەڤ هەر سێیە نەماینە) پاشی وی گۆت: ڕۆژەک ب ئێکێیە، ئەڤرۆ ب ڕۆژا بەدرێیە، (هوبەل) یێ بلند بت.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤبەرا هەمی صەحابییان دا گۆتە عومەری: ڕابە بەرسڤا وی بدە، ئینا عومەری گازی کر: ئەی دوژمنێ خودێ تو درەوان دکەی، خودێ بلندتر و مەزنترە نە کەسێ دی، کوشتیێین مە د بەحەشتێ دانە و کوشتیێین هەوە د ئاگری دانە ، ئەڤە پێغەمبەرە و ئەبووبەکرە و ئەزم، ئەم دساخین.

ئەبوو سوفیانی گۆت: ئبن قەمئە یێ دبێژت: من موحەممەد یێ کوشتی بەلێ ل نک من گۆتنا تە ژ یا وی دورستترە.

و هۆسا عومەر یێ نێزیکی پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و د گەل وی د هەمی شەڕان دا یێ ئامادە بوو و کافران ب خۆ ژی دزانی کو سەنگێ عومەری د ناڤ موسلمانان دا پشتی یێ پێغەمبەری و ئەبووبەکرییە، لەو هەوە دیت ئێکێ وەکی ئەبوو سوفیانی پسیارا وان هەر سێیان کر.. و جارەکا دی ژی دەمێ کافران صولحا حودەیبییێ شکاندی و ئەو ترساین موسلمان تشتەکی بکەن، ڕابوون مەزنێ خۆ ئەبوو سوفیان هنارتە مەدینێ دا صولحێ نوی کەتەڤە، و پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل وی نەئاخفتی هاتە نک ئەبووبەکری دا ئەو مەهدەرێ بۆ وی بکەت، و گاڤا ئەو ژی د گەل نەئاخفتی، ئەو هاتە نک عومەری، ئینا عومەری گۆتێ: (ئەز

مەهدەرێ بۆ هەوە ل نک پێغەمبەری بکەم، ب خودێ ئەگەر ژ مێرێێن هەوير پێڤەتر ئەز چو نەبينم ئەز دێ شەرێ هەوە پێ کەم).

عومەر ل بەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نموونەيێ لەشکەرێ گوهدار بوو، هەر دەم د ئەمر و فەرمانا خودێ و پێغەمبەری دا بوو، و گەلەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بۆ سەرۆکاتييا هندەک (سەرريێن) لەشکەری دەسنيشان دکر.



ژ تايبەتمەنديێن عومەری، ل ڤێرێ ئەم دێ ئيشارەتێ دەينە هندەکان:

١- گەلەک جاران عومەر دا تشتەکی بێژت، پاشی قورئان دهاتە خوارێ تەئييدا گۆتنا عومەری دکر، ژ وان جاران:

- مەسەلا ئێخسيرێن شەرێ بەدرێ، و ئەڤە مە بەری نوکە بەحسێ ژێ کری.

- مەسەلا کرنا نڤێژێ ل نک مەقامێ ئيبراهيمی ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ (البقرة: ١٢٥).

- مەسەلا دانانا حيجابێ ل سەر دەيکێن موسلمانان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُواْ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾ (الأحزاب: ٥٣).

- مسەلا نەکرنا نڤێژێ ل سەر مرییێن منافقان: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ (التوبة: ٨٤).

د ڤان مسەلان دا، و د گەلەکێن دی ژی دا، موافەقا گۆتنا عومەری د گەل ئایەتان پەیدا دبوو هێشتا ئایەت نەهاتینە خوارێ.

٢- شاهدەییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ عومەری کو خودێ حەقی یا دانایە سەر ئەزمانێ وی و دلێ وی، وەکی (أحمد) و (ترمذی) ڤەدگوهێزن: ((**إن الله قد جعل الحق على لسان عمر وقلبه**)).

٣- نەسائی ژ (سعد بن أبی وقاص)ی ڤەدگوهێزت دبێژت: جارەکێ هندەک ژنکێن قورەیشی ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوون، پسیار ژێ دکرن و هندەک ژ وان دەنگێ خۆ بلند دکر، عومەر ب ژۆر کەفت ئینا هەمی بێ دەنگ بوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گاڤا دیتی ژنک ژ عومەری ترسیان و بێ دەنگ بوون کرە کەنی، ئینا عومەری گۆتە وان ژنکان: دوژمنێن خۆ! هوین ژ من دترسن و ژ پێغەمبەری ناترسن؟ ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەی عومەر خۆ ئەو رێکا تو تێرا دچی ژی شەیتان تێرا ناچت.. یەعنی: خۆ شەیتان ژی ژ تە دترست و خۆ ژ رێکا تە ددەتە پاش.

٤- بوخاری و موسلم ژ ئبن عومەری ڤەدگوهێزن، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: من د خەونێ دا ددیت من پەرداغەکێ شیری ڤەدخوار، حەتا ژ نینۆکێن من دەردکەفت، پاشی ئەوا ژ بەر من دما من ددا عومەری، صەحابییان گۆت: تو وێ خەونێ ب چ تەعبیر دکەی؟ گۆت: ب علمی. ئبن مەسعوودی گۆت: ئەگەر علمێ عەرەبان هەمییان د لایەکێ

تەرازییێ دا بت و علمێ عومەری د لایەکی دا بت، علمێ عومەری دێ یێ وان هلکێشت.

٥- د حەدیسێن دورست دا وەکی وێ یا بوخاری و موسلم ژ حوذەیفەی ڤەدگوهێزن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت کو عومەر ئەو دەرگەهە یێ کو ئوممەتێ ژ فتنێ دپارێزت.

٦- ئاشکەرایە کو عومەر ئێک ژ وان مرۆڤانە یێن ب ساخی مزگینی ب بەحشتێ بۆ هاتییەدان.

عومەر ژ وان مرۆڤان بوو یێن ڕاست و حەز ژ ڕاستییێ دکەن، بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن دبێژن: جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێ عومەری گرتبوو، ئینا عومەری گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو ل نک من ژ هەمی تشتان خۆشتڤیتری نەفسا من تێ نەبت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەز ب وێ کەمە یێ نەفسا من د دەستی دا حەتا ئەز ل نک تە ژ نەفسا تە ژی خۆشتڤیتر نەبم (یەعنی: باوەرییا تە تمام نابت) ئینا عومەری گۆتێ: ب خودێ پا نوکە تو ژ نەفسا من ژی خۆشتڤیتری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نوکە ئەی عومەر.

ڤێجا نزا مرۆڤ ژ کیژکێ پتر عەجێبگرتی بمینت: ژ صەراحەتا وی، یان ژی ژ ڤێ شیانا وی یا غەریب کو (سەیطەرێ) ل سەر (عەواطفێن) خۆ بکەت و وەکی وی دڤێت وان بگوهۆرت؟ و ب ڕاستی ئەڤ هەردو تشتە ب هەمی کسان ڤە نائێن.

و کانێ چەند عومەر یێ دژوار بوو دەمێ عێجز دبوو، هند یان پتر ئەو یێ نەرم بوو دەمێ قورئان بۆ دهاتە خواندن، و تشتەکێ بەلاڤبوو د ناڤ صەحابییان دا کو ئەگەر ئێک ژ وان ڤیابا کەرب و عێجزییا عومەری بینتە خواری دا هندەک ئایەتان بۆ خوینت، و ئەڤە یا عەجێب نینە

ما نه قورئان بوو بەرێ عومەری ژ جاهلیەتێ دایە ئیسلامێ؟ و ئەڤ چەندا هە ل هنگی ژی باش ئاشکەرابوو دەمێ بەحسێ مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ صەحابییان دا بەلاڤبووی و بەری ئەڤ خەبەرە بۆ وان بێتە تەئکیدکرن، دەمێ عومەری شیرێ خۆ ڕاکری و ل صەحابییان خوڕی: هەچییێ بێژت پێغەمبەر یێ مری دێ وی ب ڤی شیری کوژم.. وەکی مە بەری نوکە د بەحسێ (ئەبووبەکری) دا ڤەگێڕای.

دو سێ جاران ئەبووبەکری گۆتە عومەری: بێ دەنگ ببە، بەلێ عومەر د حالەتەکێ نەفسی یێ وەسا ڕا دبۆری گوهداربیا وی نەکر و خۆ بێ دەنگ نەکر، گاڤا ئەبووبەکر ب سەر مینبەرێ کەفتی و ئەڤ ئایەتە خواندی: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ (آل عمران: ١٤٤) عومەری حالەتێ خۆ یێ نەفسی ژ بیرکر و دەستێ وی ساربوو و شیر کەفتە عەردی و زانی مەسەلە دورستە.

ب ڤی ڕەنگی عومەر بەرانبەر ئایەتان ڕادوەستا و چەند د حالەتەکێ عێجزییێ دابا گاڤا ئایەت بۆ هاتبانە خواندن ئەو تەسلیم دبوو.

و بەری نوکە ژی مە ئیشارەت دابوو هندێ کو عومەر مرۆڤەکێ خواندەڤان بوو، لەو گەلەک جاران دەمێ قورئان دهاتە خوارێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهنارتە ب دویڤ عومەری ڕا و وی وەحی دنڤیسی.



ل ڕۆژا (موهاجر) و (ئەنصاری) ب هەڤڕکی چووین، کانێ پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کی دێ بتە خەلیفە، ل وێ ڕۆژێ ژی دەورێ عومەری یێ بەرچاف بوو و وی مەسەلە بنبڕکر و دەرگەهێ فتنێ ل سەر ئوممەتێ دائێخست.. و مەسەلە یا ب ڤی ڕەنگی بوو:

ژ تشتێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نیشا مە داین د مەسەلا سەر و بەرێ مرییان دا ئەڤەیە: ئەگەر کەسەک مر یا باش ئەوە مرۆڤێن وی یێن نێزیک ب سەر و بەرێ شویشتن و کفنکرنا وی ڕابن، لەو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەمرێ خودێ کری مامێ وی عەبباس و پسمامێ وی عەلی و کوڕمەتێ وی زوبەیر ب کارێ شویشتن و کفنکرنا وی ڕابوون، هەر چەندە هەر صەحابییەکی دڤیا شەرەفا ڤی کاری بۆ وی بت، بەلێ چونکی ئەڤە مرۆڤێن پێغەمبەری یێن نێزیک بوون ئەو فەرتر بوون ب ڤی کاری ڕابن.

ژ لایەکێ دی ڤە دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەمرێ خودێ کری، سەر و بەرێ موسلمانان گەلەک یێ حەسساس بوو، چونکی دەور و بەرێن وان هەمی دوژمن بوون، و مەسەلا دانانا کەسەکی ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ ب کارئینانا شەریعەتێ و ڕێڤەبرنا دەولەتێ کارەکێ گەلەکێ فەر بوو، و چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ڕەنگەکێ ئاشکەرا نەگۆتبوو: بلا فلان کەس ببتە خەلیفێ من، هەر چەندە وی گەلەک ئیشارەت دابوون کو ب تنێ ئەبووبەکرە یێ ژ هەژی کو ل جهێ وی بت.

ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک ئەنصاری هێشتا بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ببتە ڤەشارتن ل جهەکێ دبێژنێ: (کەپرا بەنووساعدەییان) کۆمبوون دا سەح بکەنێ کانێ کی دێ ببتە خەلیفە ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ل وی دەمی سوحبەت گەهشتە ئەبووبەکر و عومەر و ئەبووعوبەیدەی، و ئەو دحازر نەبوون، ئینا ئەو ڕابوون قەستا وی جهی کر دا بزانن کانێ مەسەلە چییە، وان دیت ئەنصاری هەمی یێن ل دۆر (سەعدێ کوڕێ عوبادەی) کۆمبووین و یێن دبێژنێ: ئەمیرەک دێ ژ مە بت، و ئێک ژ موهاجرییان..

عومەری ڤیا باخڤت ئەبووبەکری گۆتێ: خۆ بێ دەنگ بکە، پاشی ئەبووبەکر ڕابوو ئاخفت، بەحسێ ئەنصارییان کر و کانێ قەنجییا وان چەندە، هەر وەسا وی گۆتنێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دەرحەقا قەدر و بهایێ وان دا ڤەگێڕان پاشی گۆت: دڤێت ئەمیر ژ قورەیشییان بت و وەزیر ژ ئەنصارییان. و ئەبووبەکری بیرا سەعدی ل گۆتنەکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیناڤە دەمێ گۆتی: ((**قريش ولاة هذا الأمر**)) یەعنی: ئەڤ کارە د دەستێ قورەیشییان دایە.. سەعدی گۆتێ: تو ڕاست دبێژی.. و ئەنصاری هەمی ب گۆتنا ئەبووبەکری قانعبوون.

عومەر، دا کو مەسەلێ بنبڕ کەت، ڕابووڤە و چوو دەستێ ئەبووبەکری و گۆتە صەحابییێن حازر: موبایەعا ئەبووبەکری بکەن چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ مە هەمییان پتر حەز ژ وی دکر، و ئەو سەییدێ مەیە و ژ مە هەمییان چێترە، عومەری موبایەعا وی کر و خەلکی ژی د دویڤ دا.. و ب ڤێ چەندێ عومەری دەرگەهێ خیلافێ د ناڤ صەحابییان دا گرت.

بەری ئەم سوحبەتا ڤێ سەرهاتییێ ب دوماهی بینین تەعلیقەکا کورت مە هەیە: هندەک کەسێن دلنساخ یێن نەڤیانا صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ خۆ کرییە دین، و (تەشویهکرنا) دیرۆکا ئیسلامێ بۆ خۆ کرییە مەنهەج و ڕێباز، ژ دلڕەشییا خۆ خەبەر ددەن و دبێژن: دەمێ موبایەعا ئەبووبەکری هاتییەکرن گەلەک صەحابی ئامادە نەبووبوون و هندەک ژ وان هەر ب دلی نەبوو ئەبووبەکر ببتە خەلیفە.. و گەلەک گۆتنێن دی یێن بێخێر دبێژن. و ئەو کەسێن ڤێ گۆتنێ دبێژن ئەگەر بشێن خۆ بخاپینن ژی، ئەو نەشێن خەلکی و دیرۆکێ بخاپینن، و ئەوێ چاڤێن خۆ ژ ڕۆناهییا ڕۆژێ بنقینت و هزر بکەت ب چاڤ نقاندنا وی دنیا

هەمی دێ تاری بت ئەو ژ عەقلی یێ شویشتییە. ب ڕازیبوونا هەمی صەحابییان ئەبووبەکر بوو خەلیفە، و ل دەمێ خیلافەتا خۆ ئەبووبەکری مشێورەتا خۆ ب عومەری دکر و ب گۆتنا وی دکر، وەکی مسەلا کۆمکرنا قورئانێ د ئێک موصحەفێ دا، پشتی ل شەرێ (الیمامە) گەلەک حافظێن قورئانێ هاتینە کوشتن عومەری داخواز ژ خەلیفەی کر کو ئەو قورئانێ د ئێک موصحەفێ دا کۆم بکەت، و خەلیفەی ب گۆتنا وی کر.

دەمێ ئەبووبەکر کەفتییە بەر نساخییا مرنێ، وی هنارتە ب دویڤ هندەک صەحابییێن مەزن ڕا دا دان و ستاندنێ د گەل وان بکەت ل دۆر وی کەسێ دێ ل شوینا وی بتە خەلیفە، وی دیت ئەو د مسەلێ دا ب جەدەل چوون؛ ئینا وی گۆتە عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی و عوثمانێ کوڕێ عەففانی: هوین چ دبێژن ئەگەر عومەرێ کوڕێ خەططابی بت؟ وان گۆتێ: گەلەک باشە، و ئەو ژ مە هەمییان چێترە.

یا بەلاڤ بوو د ناڤ صەحابییان دا کو عومەر مرۆڤەکێ زڤر و دژوارە، لەو هندەکان پێ نەخۆش بوو، و چوونە نک ئەبووبەکری و گۆتنێ: تو دێ چ بێژییە خودێ ئەگەر پسیارا عومەری ژ تە کر؟ ئەبووبەکری گۆت: دێ بێژمێ: یێ ژ وان هەمییان چێتر من کرە مەزنێ وان.

ئەبووبەکری وەصیەتا خۆ نڤیسی و هنارتە ب دویڤ عومەری ڕا و گۆتێ: من پشتی خۆ تو کرییە خەلیفە و ئەز ب تەقوایا خودێ شیرەتێ ل تە دکەم، و بزانە هندی خودێیە کارەک ب شەڤێ یێ هەی ئەو وی ب ڕۆژێ قەبویل ناکەت، و وی کارەک ب ڕۆژێ یێ هەی ئەو وی ب شەڤێ قەبویل ناکەت، و حەتا کارێ فەر نەئێتەکرن یێ سوننەت نائێتە قەبویلکرن..، و وەصیەتەکا درێژ ئەبووبەکری لێ کر.

ل بیست و دووی هەیڤا (جمادی الآخرة) ژ سالا سێزدێ مشەختی ئەبووبەکر چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و ل وێ شەڤا ئەبووبەکر مری ڕۆژا د دویڤ دا سپێدێ صەحابییان موبایەعا عومەری کر و عومەر ب ئتفاقا هەمی صەحابییان بوو خەلیفێ دویێ د دیرۆکا ئیسلامێ دا.

گاڤا عومەر بوویە خەلیفە هندەک کەس د ناڤ خەلکی دا هەبوون ب ڤێ چەندێ نەخۆشبوو، چونکی ئەو ژ هندێ دترسییان عومەر د گەل وان یێ زڤر و دژوار بت، و حالێ وان نەخۆش کەت، دەمێ وان بەرێ خۆ ددا عومەری و هزرا خۆ د ئەبووبەکری دا دکر وان فەرقەکا مەزن ددیت، ئەبووبەکر دەمێ دچوو جهەکی هندی یێ نەرم و حەلیم بوو بچویک هەمی لێ کۆم دبوون، و یاری ل نک دکرن، و ئەبووبەکری دەستێ خۆ ب سەرێ وان دا دئینا، و عومەر گاڤا دچوو عەردەکی هند یێ ب هەیبەت بوو زەلام ژێ دترسییان و خۆ ژێ ددانە پاش.. گاڤا عومەر بوویە خەلیفە وان هزرکر ئەو هەر دێ یێ وەسا بت، ڤێجا ئەو تێکچوون، دەمێ عومەری ب مەسەلا وان زانی بڕیار دا د ناڤ خەلکی دا بێتە گازیکرن دا هەمی ل مزگەفتێ کۆم ببن و ڕابوو خوتبەک بۆ وان خواند، و تێدا گۆت: ((من یێ زانی هندەک مرۆڤ ژ دژوارییا من دترسن، و دبێژن: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ مە دا عومەر د گەل مە یێ زڤر و دژوار بوو، و دەمێ ئەبووبەکر مەزنێ مە ئەو یێ وەسا بوو، پا ئەڤرۆ پشتی ئەو ب خۆ بوویە مەزنێ مە دێ یێ چاوا بت؟ ئەوێ ئەڤ ئاخفتنە گۆتی ڕاست دبێژت، دەمێ ئەز د گەل پێغەمبەری ئەز عەبدێ وی و خولامێ وی بووم، و کەس وەکی وی یێ نەرم و ب ڕەحم نەبوو، ڤێجا ئەز د دەستێ وی دا شیرەک بووم گاڤا وی ڤیابا دا من کەتە د کاڤلانی دا، و گاڤا ڤیابا دا من هێلت شۆلێ خۆ بکەم، پاشی ئەبووبەکر بوو مەزن، و کەس د مەردینی و نەرمییا وی دا نەدکەفتە

گومـانێ، ڤێجـا ئـەز بـۆ وی وەکـی خولامـەکی و هاریکـارەکی بـووم، مـن دژوارییا خۆ تێکەلی نەرمییا وی دکر.. پاشی ئەز بوومە مەزنێ هەوە گەلی مـرۆڤـان، ڤێجا هـویـن بـزانـن هندی ئەو دژوارییە یا نـەرمبووی، بەلێ نـە ل سەر وان یێن زۆرداریێ ل موسلمانان دکەن..)) و عومـەر پێدا چوو و سیاسـەتا خـۆ بـۆ خـەلکی ئاشـکەراکر، ئینـا کـەیفا وان هـات و دلـێ وان رحەتبوو.

عومەر بوو خەلیفە و بۆ جارا ئێکێ ناسناڤێ (أمير المؤمنين) بۆ وی هاتە ب کارئینان، و هەر چەنـدە بناخەیێن دەولـەتا ئیسـلامی ل سـەر دەمـێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و خەلیفەیێ وی یێ ئێکێ ئەبووبەکری هاتبوونە دانان، بەلێ ژ لایێ عەمەلی ڤە عومەر دئێتە هژمارتن ئێکەمین ئاڤاکەرێ دەولـەت و جڤاکا ئیسـلامی یـا مـەدەنی -وەکـی دێ بـۆ مـە ئاشـکەرا بـت- چونکی ئەو کارێ عومەر پێ رابووی ل دەمێ حوکمدارییا خۆ هـەمی وی بـۆ ڤێ چەندێ هل دبژێرن.

عومەر دەمێ بوویە خەلیفە و مـەزنییا خەلکی کەفتییـە د دەسـتان دا بەری هەر تشتەکی وی قانوونەک بۆ خۆ ب خۆ دانا، و خۆ مـەجبوورکر کـو پێگیرییـێ پـێ بکـەت دا بشـێت پشـتی هنگـی قانوونـەکێ بـۆ خـەلکی ژی بدانت، و وان مەجبوور بکەت پێگیرییـێ پـێ بکـەن، و ئـەو قانوونـا وی بـۆ خۆ دانای ژ چەند ماددەیەکێن سەرەکی پێک دهات، ژ وان:

١- عومـەر چـونکی مـەزنێ موسـلمانانە، ئـەو بەرانبـەر خـودێ یـێ بەرپسیارە ژ هەر تشتەکێ د ناڤ توخوبێن دەولەتێ دا چێ دبت، وی هـای ژێ هەبت یان نە، و ل رۆژا قیامەتێ حسێبا وی ژ یا هەر کەسـەکێ دی دێ یا دژوارتر بت، ژ بەر ڤێ چەندێ عومەری چاڤێن خۆ بـاش ڤەدکرن و گاڤـا پێ حسیابا خەلەتییەک یـا هاتییـەکرن هەلویسـتەکێ تونـد و دژوار بەرانبـەر

وی کسی دستاند ئەگەر خۆ کورێ وی ژی با. ژ گۆتنێن وی یێن زێدە بەلاڤ د ڤێ دەلیڤەیێ دا ئەڤەیە: ((ئەگەر حێشترەک ل عیراقێ تەحسی، خودێ رۆژا قیامەتێ حسێبا وێ دێ د گەل من کەت، دێ بێژت: ئەی عومەر بۆچی تە رێکا وێ خۆش نەکربوو)).

عومەری بڕیار دابوو هەر زارۆکەکێ بێتە شیرڤەکرن راتبەکی ژ دەولەتێ بدەنێ، شەڤەکێ عومەر ل بازێری دچوو بۆ سەح و سوییان، دەنگێ گرییا زارۆکەکی هاتێ، عومەری دەرگەهێ خانی قوتا و ل پشت دەرگەهی گۆتە دەیکا زارۆکی: کورێ خۆ تەنا کە.. یەعنی: هەر وەکی ئەو ل وێ باوەرێ بوو کو خودێ حسێبا گرییا ڤی زارۆکی ژی دێ د گەل وی کەت، پشتی دو سێ جاران وی دەیکا زارۆکی ئاگەهدارکری، جارا سییێ گۆتێ: ئەو مەسەلا زارۆکێ تە چییە؟ ژنکێ گۆت: عومەری یێ گۆتی چی زارۆکێ بێتە شیرڤەکرن راتبەکی دێ دەینێ، ڤێجا من دڤێت ژ بەر ڤێ چەندێ زارۆکێ خۆ شیرڤەکەم لەو تو دبینی یێ دکەتە گری.. عومەری گۆتێ: باشە، و عومەری د گەل خۆ گۆت: هیلاک بۆ تە بت ئەی عومەر! نۆکە سەرا بڕیارا تە چەند زارۆکێن موسلمانان هاتینە ئێشاندن، وێ رۆژێ د نڤێژا سپێدێ دا خەلکی ژ بەر گرییا عومەری گوهـ ل دەنگێ خواندنا وی نەبوو، پشتی نڤێژێ عومەری گۆت: مە بڕیار دا هەر زارۆکەکێ ببت هەر ژ رۆژا ئێکێ راتبەک دێ بۆ ئێتە دەسنیشانکرن، چونکی من یێ زانی هندەک بەری دەمێ شیرڤەبوونێ زارۆکێن خۆ شیرڤە دکەن.

٢- بەرانبەر مللەتی ژی عومەر یێ بەرپسیارە ژ هەر تەصەرروفەکا والییەکێ وی دانای، و حوکمێ خەلکی کرییە د دەستی دا.. ڤێجا کارێ ئەو بکەن -یێ باش بت یێ خراب بت- بۆ عومەری دزڤرت و ل سەر وی حسێب دبت، و عومەری مللەت ژی وەسا تێگەهاندبوو لەو گاڤا وان دیتبا

واليیەكی تشتەكێ خراب يێ كری ئێكسەر وان خۆ دگەهاندە عومەری و مەسەلە بۆ دگۆت، و عومەری ب خۆ تەحقیق د مەسەلێ دا دكر. عومەری گاڤا واليیەک تەعیین دكر پشتا خۆ نەددایێ و نەدگۆتێ: تە های ژ وەلاتا خەلكی بت بۆ من و ژ وێرێ وێ ڤە تو یێ ب كەیفا خۆیی.

رۆژەكێ عومەری گۆتە خەلكی: ئەگەر من یێ ژ هەوە هەمییان باشتر كرە مەزنێ هەوە و من ئەمرێ وی كر كو عەدالەتێ بكەت، ئەرێ من حەقێ هەوە ژ سەر خۆ ڕاكر؟ وان گۆتێ: بەلێ. عومەری گۆت: نە.. حەتا ئەز بەرێ خۆ بدەمێ كانێ ئەو دێ وی تشتی كەت یێ من فەرمان پێ لێ كری یان نە.

مەسەلە -ل نك عومەری- نە هەلبژارتنا مرۆڤی باش ب تنێیە، مەسەلە ب جهئینانا باشییێیە و ب كارئینانا عەدالەتێیە.

٣- عومەری ل سەر خۆ عەهد كربوو دادییا جڤاكی د ناڤ خەلكی دا ب كار بینت، و یا ئاشكەرایە كو عومەر و عەدالەت د گوهێ دیرۆكێ دا دو ناڤێن هەڤالجێمكن، یان دو پەیڤێن هەڤرامانن. ب دیتنا عومەری خەلك هەمی وەكی ئێكن ئەو یێ بلندترە یێ تەقوایا وی پتر بت، ژ مەسەلا تەقوایێ دەركەڤت كەس ژ كەسێ چێتر نینە.

جارەكێ عومەر چوو مەكەهێ دیت هندەک زەلامێن قورەیشی یێن روینشتین خوارنێ دخۆن و خولامێن وان ل هنداڤ سەری دڕاوەستاینە، عومەری گۆتێ: بۆچی هوین دڕاوەستاینە دێ روینن هوین ژی د گەل وان خوارنێ بخۆن.

گاڤا كوڕێ واليیێ وی ل مصرێ عەمرێ كوڕێ عاصی شەقەک دانایە كوڕێ فەقیرەكێ مصری یێ فەلە، عومەری گۆتە كوڕێ فەقیرێ مصری: ڕابە تو ژی شەقەكێ بدانە كوڕێ ئەمیری، پشتی وی شەقەک دانایێ گۆتێ: و

ئێکێ بدانە (صەلعا) عەمری ژی، چونکی کوڕێ وی ژ بەر کو کوڕێ ئەمیرییە ئەو شەق یا دانایە تە.. پاشی عومەر ل عەمری زڤڕی و ئەو گۆتن گۆتێ یا حەتا ئەڤرۆ ژی دیرۆکا مرۆڤینییێ شانازییێ پێ دبەت، ئەو گۆتن یا چو حاکمان بەری وی نەگۆتی، گۆت: ((یا عمرو.. متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا؟)) ئەی عەمر.. کەنگی هەوە خەلک کرینە بەنییێن خۆ و ئەو سەربەست ژ دەیکێن خۆ یێن بووین؟

٤- عومەری مللەت وەسا پەروەردەکربوو کو ئەو بزانن حەقێ وان ل سەر عومەری ئەوە عومەر شریعەتێ خودێ ل سەر وان ب کار بینت، و حەقێ عومەری ژی ل سەر وان ئەوە ئەو گوهدارییا عومەری بکەن، و هەر لایەکێ واجبێ خۆ ب جهـ نەئینت لایێ دی حەقێ خۆ نەرازیکرنێ هەیە.

جارەکێ عومەر ل سەر مینبەرێ ستوینێ خۆ ڕاکر و گۆت: ئەگەر من هۆ کرە هە هوین دێ چ کەن؟ مرۆڤەک ڕابووڤە و شیرێ خۆ هژاند و گۆت: ئەم دێ هۆ کەینە هە! یەعنی: دێ سەرێ تە لێ دەین. ئینا عومەری دەستێن خۆ سەرئەڤرازکرن و گۆت: الحمد لله.. مادەم د ناڤ ئوممەتا موحەممەدی دا هندەک هەنە عومەری ب شیری ڕاست بکەن.



کانێ چاوا عومەری قانوونەک بۆ خۆ دانابوو دا ئەو پێگیرییێ پێ بکەت، وەسا وی قانوونەک بۆ والییێن خۆ ژی دانابوو، وی ل سەر وان فەر کربوو ئەو پێگیرییێ پێ بکەن، و سیاسەتا عومەری د گەل والییێن وی یا ب ڤی ڕەنگی بوو:

١- هەر والییەکێ وی هنارتبا جهەکی راتبەکێ هەیڤانە بۆ وی و هاریکارێن وی دەسنیشان دکر، و بۆ زانین هەمی کاڤان راتبێن والییێن وی ژ راتبێ وی پتر بوون، و گوهێ وی لێ بوو چی گاڤا زانیبا مەصرەفێ

والییەکی ژ راتبێ وی پترە دا هنێرتە ب دویڤ ڕا و پسیارێ ژێ کەت کانێ ئەو ڤێ مەصرەفێ ژ کیڤە دئینت؟

٢- یێ وی کریا والی ل سەر دکرە شەرت کو د ناڤ خەلکی دا بژیت، و وەکی وان بت، و ئەو ب خۆ کارێ خۆ ب دەستێ خۆ بکەت.

٣- بەری وی مرۆڤەک کریا والی مالێ وی دهژمارت، و پشتی دبوو والی ژی ب دەمەکی جارەکا دی مالێ وی دهژمارت، ڤێجا ئەگەر زانیبا مالێ وی ب ڕەنگەکێ نە یێ طەبیعی یێ زێدەبووی حسێب د گەل دکر و ژێ دستاند.

٤- دو ئەگەرێن مەزن هەبوون وی والی ژ بەر دئێخستن، ئێک: کو مللەتێ ژێ رازی نەبت و گازندەیان ژێ بکەن ژ بەر (انحراف) و خەلەتییێن وی. دو: کو مللەت ب ڕەنگەکێ زێدەی عەدەتی حەز ژێ بکەن و ل دۆرا وی کۆم ببن، دا غورور بۆ وی چێ نەبت و هزرا هندێ بکەت کو دێ شێت ب وان بەرهنگارییا دەولەتێ کەت.

٥- ل دووماهییا ژییێ خۆ عومەری بڕیار دابوو ئەو بچتە هەر ویلایەتەکێ دو هەیڤان لێ بمینت، و خەلکێ وی جهی ژ نێزیک ببینت، و گوهێ خۆ بدەتە گلە و گازندەیێن وان و وی دگۆت: بەلکی هندەک مرۆڤ هەبن نشێن بێنە مەدینێ، و گازندە و پێتڤییێن خۆ بگەهیننە مە ڤێجا یا دورست ئەوە ئەم ل دویڤ وان بچین. بەلێ مرنێ دەلیڤە نەدایێ ئەو ڤێ بڕیارا خۆ ب جه بینت، هەر چەندە ل دەمێ حەجێ ئەو ب ڤی کاری ڕادبوو و خۆ دگەهاندە خەلکێ هەمی دەڤەران و پسیارا حالێ والییان دکر، و گاڤا وی تشتەکێ نەدورست ژێ گوهـ لێ ببا دا هنێرتە ب دویڤ وان ڕا و حسێبەکا دژوار دا د گەل وان کەت.

ب کورتی دێ بێژین: گاڤا وی کەسەک کربا والی و هنارتبا جهەکی، وی ئەو وەسا تێ دگەهاند کو هزر نەکەت ئەو بوو مەزنێ جهەکی و چو حسێب ل سەر نینە، و هەچییا وی بڤێت ئەو دێ کەت و میزانییەکا ڤەکری دێ ل بن دەستی بت، و دەسهەلاتا مەرکەزی -کو خیلافەتە- های ژ وی نینە.

ژ لایێ دانان و بنەجهکرنا بناخەیێن دەولەتا مەدەنی ژی ڤە عومەری پێگاڤەکا مەزن هاڤێتبوو هێشتا بەری ببتە خەلیفە و پشتی بوویە خەلیفە ژی.. ئەو ژی ب ڤی ڕەنگی:

١- دەولەتا مەدەنی بێ دەستوور و قانوون ب ڕێڤە ناچت، و چونکی دەستوورێ دەولەتا ئیسلامێ قورئانە، ئیمامێ عومەر ما ب ئەبووبەکری ڤە -دەمێ ئەبووبەکر خەلیفە - کو قورئان د ئێک موصحەف دا بێتە کۆمکرن دا بۆ هەر کەسەکی یا بەردەست بت، و ب تایبەتی ئەوێن حوکمی د ناڤبەرا خەلکی دا دکەن، و بەری هەمییان خەلیفەی ب خۆ، لەو ئەڤ موصحەفە ل نک ئەبووبەکری بوو هندی یێ ساخ، پاشی چوو نک عومەری هندی ئەو ژی یێ ساخ.. و ئەڤە ئێک ژ مەزنترین بناخەیێن ئاڤاکرنا دەولەتا مەدەنینە.

٢- پاراستن و پێشخستنا زمانی و ئەدەبییاتان ئەڤە ژی دبتە ناسنامە و بناخەیەکێ سەرەکی بۆ پەیدابوونا جڤاکا مەدەنی، ئەوا ئاڤاکرنا دەولەتا مەدەنی ب هیڤییێ ڤە دمینت، لەو وی خەمەکا مەزن ژ ڤێ چەندێ دخوار، و خەلک ب تایبەتی بچویک و جحێل پال ددان کو خۆ فێری زمان و ئەدەبییاتان بکەن، دا ببنە خودان ناسنامەیا تایبەت و ئاشکەرا.

٣- دامەزراندنا دەولەتا مەدەنی و دورستکرنا حوکمەتەکا ب ڕێک و پێک پێتڤی ب هەبوونا تاریخەکێ هەیە دەم پێ بێتە زانین، و ئاشکەرایە

کو تاریخا هجری، یا کو موسلمان حەتا ئەڤرۆ سالێن خۆ پێ دهژمێرن عومەری دانابوو.

٤- دانانا دەواوینان، یێن کو ڤێ گاڤێ دبێژنێ: دەزگەهێن حوکومی، یان دائیرە، ل سەر دەمێ عومەری بوو، هەر ویلایەتەکێ دیوانەک هەبوو ب ئەزمانێ وی جهی دهاتە نڤیسین، دەزگەها (قضائێ) و ئیدارێ، دورستکرنا دەزگەها بەریدێ و پۆستەگەهاندنێ، دەسنیشانکرنا ئاڤاهییەکی بۆ گرتنا مرۆڤێن تاوانبار، چێکرنا پارەی، پاراستنا توخوبێن دەولەتێ ب رێکا دورستکرنا دیوانا لەشکەری یا نۆکە دبێژنێ: وەزارەتا بەرەڤانییێ.. ئەڤە هەمی عومەری -ل دەمێ خیلافەتا خۆ- دامەزراندبوون، و ب ڤێ چەندێ مرۆڤ دشێت بێژت: عومەر ئاڤاکەرێ ئێکەمین دەولەتا ئیسلامی یا مەدەنی بوو.

٥- تشتێ ژ هەمییێ مەزنتر ئەو بوو عومەری (نظام الشوری) -کو مەزنترین موقەوماتێن نظاما حوکومییە- د دەولەتا خۆ دا کربوو راستییەکا بەرچاڤ، دەمێ عومەر بوویە خەلیفە بریار دا صەحابی -و ب تایبەتی زانا و شارەزایێن وان- ژ مەدینێ دەرنەکەڤن و بمیننە ل نک وی، ژ بەر چەند ئەگەرەکان، ئێک ژ وان ئەو بوو: دا ئەو ل دەمێ هەوجەیێ رەئیا وان وەرگرت و بۆچوونا وان بزانت، و عومەری مەجلسەک هەبوو ژ چەند صەحابییان پێک دهات گاڤا تشتەک چێ ببا دهنارتە ب دویڤ وان را و گوهێ خۆ ددا گۆتنا وان، و تشتێ ئەو ل سەر کۆم ببان عومەری ب جهـ دئینا.

٦- دەستوورەک بۆ کرنا شەری و چاوانییا تەعامولا د ناڤبەرا لەشکەری و سەرلەشکەری دا عومەری دانابوو، و وی ب خۆ چاڤدێری

ل جهێنانا ڤی دەستووری دکر، و ئەڤ چەندە ژی کارەکێ زێدە پێتڤییە بۆ دانان و پێشڤەبرن و پاراستنا دەولەتێ.

دەمێ ئەم دبێژین: عومەری فلان دەستوور، یان فلان نظام دانا، مەعنا وێ ئەو نینە ئەم دبێژین: ئەڤە تشتەک بوو عومەری ژ نک خۆ چێکربوو، و هەمی ژ داهێنانا وی بوو، نەخێر! بەلکی رێبەرێ وی د ڤێ چەندێ دا کیتاب و سوننەت بوو، زێدەباری وان شیرەت و تەوجیهاتێن ئەبووبەکری داینێ، و پشتی ڤان ژ نوی دەورێ ئجتهاداتێن عومەری ب خۆ ژی دئێن.

دو لایێن دی ژی هەبوون عومەری گەلەک خەم ژێ دخوار: لایێ ئابۆری، و لایێ ئاڤەدانکرنێ.

ژ لایێ ئابۆری ڤە: عومەری پەویتە ب چاندن و بازرگانییێ دکر، و دەمێ موسلمانان عەردەکێ نوی دستاند عومەری نەدهێلا عەردێ زراعی ژ خەلکێ وان جهان بێتە ستاندن، بەلکی وی عەرد دهێلا د دەستێ خودانان دا، و تەشجیعا وان ل سەر چاندنێ دکر، و بەری عومەر بمرت ب دەمەکی دگۆت: ئەگەر ئەوا من ل دووماهییێ زانی من ل بەراهییێ زانیبا ئەز دا مالێ زەنگینان یێ زێدە ژێ ستینم و دەمە فەقیران. و عومەری جهەک چێکربوو دگۆتنێ: (بیت الدقیق) ئەرزاق لێ ددانا، هەچییێ برسی با دچوو وێرێ خوارن بۆ خۆ دئینا ب هەروە.

ژ لایێ ئاڤەدانکرنێ ڤە، بەسە بێژین: عومەری ل سەر دەمێ خیلافەتا خۆ بڕیارا دامەزراندنا چەند باژێرەکان دابوو، وەکی: باژێرێ بەصرا و کووفە.

و کورتترین و مەزنترین گۆتن د دەرحەقا عومەری و خیلافەتا وی دا ب بەر گوهێ من کەفتی ئەوە یا ژ ئیمامێ عەلی هاتییە ڤەگوهاستن، ڕۆژەکی عەلی عومەر ل چۆلێ دیت یێ دکەتە غار، گۆتێ: نە خێرە ئەی

(أمير المؤمنين)؟ عومەری گۆتی: حێشترەک ژ حێشترێن زەکاتێ یا ڤەرەستی ئەزێ لێ دگەڕییم.. ئینا عەلی سەرێ خۆ هژاند و گۆتی: **((لقد أتعبت من بعدک))** یەعنی: ب ڕاستی تە ئەو وەستاند یێ پشتی تە بێت!! گۆتنەکە کانێ چەند مەزنییا عومەری ژێ دئێتە زانین هند شارەزاییا عەلی ژی ژێ دئێتە زانین.

ئەی عومەر تە ب ڤی سەر و بەرێ خۆ، ب ڤێ دادی و عەدالەتا خۆ هەمی مەزن و خەلیفەیێن پشتی خۆ وەستاندن، کەس پشتی تە نەشێت وەکی تە بکەت، و هەچییێ بێت خەلک دێ بێژنێ: وەکی عومەری بە، و گەلەک یا ب زەحمەتە عومەر دوبارە ببت.. **((لقد أتعبت من بعدک))** گۆتنەکە چیایێ زانینێ عەلی د دەرحەقا چیایێ عەدالەتێ دا عومەری دبێژت، ڤێجا نزا مرۆڤ پتر ژ کێ عەجێبگرتی ببت؟

سەرهاتییا عەدالەتا عومەری گەلەک ژ وێ ڕۆژێ ئاشکەراترە ئەوا ل ڕۆژەکا ساهی ل نیڤا عەسمانی، و ئەگەر ئەم وێ هەمییێ ڤەگێرین دەم تێرا مە ناکەت، ل ڤێرێ ب تنێ دێ گۆتنا نەیارەکی ژ نەیارێن عومەری ڤەگێرم دا بزانین کانێ عومەر چ بوو.. قەیصەرێ ڕۆمێ مرۆڤەک هنارتە مەدینێ دا بۆ وی بەرێ خۆ بدەتە حالێ عومەری، دا بەلکی ئەو بزانت کانێ عومەر چییە و بۆچی هۆسا زوی دەولەتا وی هندە بەرفرەهبوویە؟

ئەو مرۆڤ هاتە مەدینێ چاڤێ خۆ ل بازێری گێڕا کانێ قەسرا عومەری ل کیڤەیە، و چەند لەشکەر زێرەڤانییێ لێ دکەن، چو قەسر و قوسیر ب بەرچاڤێن وی نەکەفتن، پسیارا مرۆڤەکی کر: مەلکێ هەوە ل کیڤەیە؟ وی گۆتێ: مە چو مەلک نینن، ئەمیرەک مە یێ هەی یێ ب وی لایێ هە ڤە چووی.. ئەو مرۆڤ ب وی لایی ڤە چوو کەس نەدیت، ب تنێ زەلامەک تێ نەبت یێ خۆ درێژکرییە سەر ئاخێ، و تژی سەر جلکێن وی ئاخە، و یێ

نڤستییه، هەمی تشت هاتنه سەر هزرا وی مرۆڤی ب تنێ ئەو تێ نەبت کو ئەڤ زەلامێ درێژکری عومەر بت، ل خۆ زڤڕی پسیار ژ مرۆڤەکی کر: کانێ عومەر؟ وی گۆتێ: ئەوێ هە عومەرە.. ئەو زەلام د جهـ دا هشکبوو، ئەڤە عومەرە؟ ئەو عومەرێ مەلک ل سەر کورسیکێن خۆ ژ ترسێن وی دا ڤەدلەرزن یێ ب ڤی حالییە، ئەی عومەر تە عەدالەت کر ڤێجا تو پشتڕاستبووی، لەو تو یێ نڤستی!

هەر جارەکا ئەڤ گۆتنه یا ڤی نەیارێ عومەری د دەرحەقا وی دا گۆتی دئێته بیرا من، کانێ چەند مەزنییا عومەری ل بەر چاڤێن من دوبارە دبتە ڤە هند ئەحمەقییا وان نەزانان بۆ من دیار دبت ئەوێن دبێژن: مادەم وەسایە پا بۆچی عومە هاتە کوشتن؟ هەر وەکی ل نک ڤان (عەبقەرییان) کوشتن ئەنجامێ ئێکانەیە یێ (موعادەلا) زولم و زۆردارییێ.. بەلێ بەری ئەو ڤێ پسیارا وەکی وان یا بێ بها بکەن، دڤیا وان ل بیرا خۆ ئینابا کو عەدالەت و بەلاڤکرن و گۆتنا حەقییێ کانێ چەند هەڤالان بۆ مرۆڤی پەیدا دکەت، هند دوژمنان ژی پەیدا دکەت، و تێرا عومەری هەیە ئەم بێژین: کوشتنا وی ب دەستێ مرۆڤەکێ بوو د هەمی ژییێ خۆ دا جارەکا ب تنێ ژی خۆ بۆ خودێ نەچەماند بوو و نەگۆتبوو: (اللـه اکبر)، و ئەڤە دەلیلەکێ دییە دیرۆکێ د صالحێ عومەری دا تۆمارکری، دیسا دێ بێژین: تێرا عومەری هەیە مەزنیێ، کو پشتی وی و حەتا ئەڤرۆ ژی کەسێ کەرب ژ عومەری ڤەنەبوویە سەرا زولمەکا وی کربت.

هەر چاوا بت ڕۆژا عومەری گەلەک ژ هندێ گەشتر و مەزنترە کو ب چەنگێ هندەک قەل و چەکچەکیلان ڕەش ببت، یان ب سەرادا هندەک بێ عەقلان بێتە ڤەشارتن.

دەهـ سـال و شـەش هـەیڤ و چـار ڕۆژان عومـەری خیلافـەت ب خـۆ خەملاند، و ڕۆژا بارکرنێ هات.. ل وێ هەیڤا عومەر تێدا شەهیدبووی، کو هەیڤا (ذو الحجه) بوو، عومەر ژ حەجێ ڤەگەڕیا، و بەری ئەو ژ مەکەهێ دەرکەڤت، وی دەستێن خۆ سەرئەڤراز کرن و گۆت: ((یا ڕەببی ژییێ من درێژبوو، و هێزا من لاوازبوو، و ڕەعییەتا من بەرفرەهبوو، ڤێجا تو ڕحا من بستینە، یا ڕەببی تو شەهادەتێ ب ڕزقێ من بکە، و مرنا من بێخە باژێرێ پێغەمبەرێ خۆ)).

کچا وی حەفصا دبێژت: ئینا مـن گۆتـێ: چاوا دێ شـەهید بی و تـو ل مەدینێ؟ گۆت: وی گۆتە من: ئەگەر خودێ بڤێت دشێت.

بیست ڕۆژ ب سەر دوعایا وی ڤە نەچوون خودێ داخوازا وی ب جهـ ئینا:

ل سالا (٢٣) مشەختی عومەری قەستا مەکەهێ کر بۆ کرنا حەجێ، و ئەو بوو پشتی ئەو ژ کرنا حەجێ خلاسبووی و بەری بزڤڕتە مـەدینێ وی دوعایـەک ژ خـودێ کـر کـو شـەهیدبوونێ ب ڕزقـێ وی بکـەت، ل دوڕێـن بیسـتی هـەیڤا (ذو الحجـە) عومـەر گەهشـتە مـەدینێ، و ئێـک ژ وان سیاسەتان یێن عومەری ب کار دئینا د دەرحەقا عەبدێن نە موسلمان دا ئەو بوو وی نەدهێلا عەبدەک پشتی بالغ دبت بمینتـە د مـەدینێ دا، ئەگەر یێ موسـلمان نـەبت، (المغیـره بـن شـعبه) دەمـێ والـی ل کووفـە عەبـدەکێ مەجووسـی ب دەسـت کـەفت نـاڤێ وی (فـەیرووز) بـوو و دگـۆتنێ: (أبـو لؤلـؤە)، ئەو مرۆڤـەکێ صنعەتکار بـوو، و گەلـەک کارێن دەستی دزانـین، مـوغیرەی کاغـەزەک بـۆ عومـەری هنـارت تێـدا داخـواز ژێ کـر کـو ئـەو دەستویریێ بدەت دا موغیرە عەبدێ خۆ د گەل خۆ بینتـە مـەدینێ بـەلکی موسلمان فایدەی ژ کارێ دەستێ وی بکەن، عومەری دەستویری دایێ.

(أبو لؤلؤە)ی ل مەدینێ کارێ دەستی دکر بۆ سەییدێ خۆ موغیرەی، و موغیرەی ل سەر وی کربوو شەرت کو هەر ڕۆژ ئەو چار دەرهەمان بدەتە سەییدێ خۆ، (أبو لؤلؤە)ی ب ڤێ چەندێ نەخۆشبوو، و هزرکر چار دەرهەم گەلەکن.. ڕۆژەکێ وی عومەر دیت ئینا گازندەیێن خۆ بۆ کرن کو سەییدێ وی بارەکێ گران یێ دانایە سەر ملان. عومەری کرە دلێ خۆ کو بێژتە موغیرەی بارێ وی سڤک بکەت، و گۆتە (أبو لؤلؤە)ی: تەقوایا خودێ بکە و قەنجییێ د گەل سەییدێ خۆ بکە. (أبو لؤلؤە)ی هزرکر عومەر یێ پشتا موغیرەی دگرت، لەو گۆت: عەدالەتا وی خەلک هەمی ڤەگرت ئەز تێ نەبم. پاشی عومەری پسیار ژێ کر: کانێ ئەو چ کاران دزانت، وی گۆت: ئەز دشێم دستارەکێ چێ کەم ب بایی شۆل بکەت. عومەری گۆتێ: پا دێ ئێکێ وەسا بۆ مە چێ بکە.. وی گۆت: ئەز دێ بۆ تە دستارەکی چێ کەم خەلکێ ڕۆژهەلاتێ و ڕۆژئاڤایێ پێ باخڤن. عومەری تێ ئینا دەر کو ئاخفتنا وی یا ب تێڤلە لەو گۆتە مرۆڤەکێ د گەل خۆ دا: ئەڤە یێ گەفان ل من دکەت.

(أبو لؤلؤە)ی کرە دلێ خۆ عومەری بکوژت، ژ بەر ڤێ سەرهاتییێ، یان ژی چونکی ئیمپراتۆریەتا شرکێ یا مەجووسیان ب دەستێن عومەری هاتبوو پەلخاندن و ئالایێ تەوحیدێ ل وەلاتێ فورسێ هاتبوو بلندکرن؟

ئەڤ هەردو گۆتن یێن هاتینەکرن.

ل دۆر مسەلا: کانێ هندەک کەسێن دی ژی د گەل (أبو لؤلؤە)ی دا هەبوون دەمێ وی پیلان بۆ کوشتنا عومەری گێڕای یان نە؟ د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو مسەلە پیلانەکا مەزن بوو هورمزانێ مەجووسی، و جوفینەیێ فەلە، د گەل (أبو لؤلؤە)ی تێدا پشکداربوون، و وان (أبو لؤلؤە)

هلبـژارت دا ب کـاریٚ کوشـتنیٚ رابیـت.. بـەلیٚ ئـەڤ چەنـدە د ریوایـەتا (بوخاری) دا نەهاتییە.

هەر چاوا بت (أبو لؤلؤه)ی کێرەک تایبەت بوٚ ڤی کاریٚ خوٚ چیٚ کر، دو سەر ئێخستنیٚ دا ژ هەردو لایان ڤە کار بدەت، پاشی هەردو دەڤێن کێریٚ تیژکرن و ژەهر پیٚ وەرکر، و وەسا بوٚ خوٚ دانا کو ل نڤێژا سپێدیٚ بچتە مزگەفتیٚ و عومەری د نڤێژیٚ دا بکوژت.

ل سـپێدەیا رۆژا دوشـەنبیٚ، (٢٣) ی هـەیڤا (ذو الحجـه) ژ سـالا (٢٣) مشـەختی، (أبو لؤلـؤه)یێ مەجووسی ب کێرا خوٚ یا ژەهرکری ڤە قەستا مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- ل مەدینیٚ کر ب ئنیەتا کوشتنا عومـەریٚ کوریٚ خەطـطابی، پشـتی عومـەری ریٚزێن نڤێژکـەران راسـتکرین پێشڤەچوو و بەریٚ خوٚ دا قیبلیٚ، (أبو لؤلؤه)ی ریٚز برین، و کێرا وی د بـن جلکان ڤـە یـا ڤەشارتی بـوو، و دیـارە مزگـەفت ل وی دەمـی هند یـا روهـن نەبوو ژی خەلک وی بنیاسن، خوٚ ب عومـەری را گەهاند، پشـتی عومـەری گۆتی: (الله أکبر).. صەییٚ مەجووسی سـیٚ درب ب کێـرا خوٚ یـا ژەهرکـری ل عومـەری دان، ئێـک ژ وان ل جهیٚ نـافکیٚ بـوو و عومـەر ب ویٚ چـوو.. حەتا عومەر لیٚ زڤری وی خوٚ هاڤێت و د ناف ریٚزا را قەسـتا ژ دەرڤـە کـر، عومەری گازی کر: وی صەی ئەز کوشتم. خەلک شاشبوون، (أبـو لؤلـؤه)ی هەچییٚ کەفتیە بەر سنگی دریـەک وەشاندیٚ، حـەتا دبێـژن: وی سێزدە زەلام بریندارکرن، حەفت ژیٚ مرن ژ بلی عومەری.

(أبو لؤلؤه) نەشیا خلاس ببت، هندەکان ریٚ لـیٚ گـرت گاڤـا وی زانـی خلاس نابت کێرەک ل ستوییٚ خوٚ دا و خوٚ کوشت.

عومـەر پاشپاشـکی زڤـری د نـاف ریٚـزیٚ دا و دەسـتیٚ عەبـدررحمانیٚ کوریٚ عەوفی گرت و کێشا جهیٚ خوٚ، عەبدررەحمانی نڤێژ ل شوینا عومـەری

کر، و عومەری -ب برینا خۆ ڤە- نڤێژ ل پشت وی کر. پشتی نڤێژ ب دووماهی هاتی عومەری گۆتە (ابن عباس)ی: کانێ بەرێ خۆ بدێ ئەو کییە ئەز کوشتیم؟ (ابن عباس)ی سەحکرێ پاشی زڤڕی و گۆت: عەبدێ موغیرەیە. عومەری گۆت: ئەوێ صنعەتکار؟ گۆتێ: بەلێ. عومەری گۆت: خودێ وی بکوژت من قەنجی د گەل وی کربوو، (الحمد لله) مرنا من ب دەستێ مرۆڤەکێ موسلمان نەبوو کو ڕۆژا قیامەتێ ل نک خودێ سوجدەکا خۆ بۆ خۆ بکەتە هێجەت. پاشی عومەری گۆت: جارێ وی نەکوژن. هندەکان گۆت: وی ب خۆ خۆ یێ کوشتی. ئینا عومەری گۆت: (انا لله وانا الیه راجعون).

پاشی هندی خوین ژ برینا عومەری هات دلێ وی هاتەگرتن، ئینا زەلامان ئەو ڕاکر و برە مال.. سێ ڕۆژان عومەر ما بریندار، و د گەل برینا وی یا مەزن ئەو ل سەر هشێن خۆ ما و یا وی د برینداریيا خۆ دا کری چو مرۆڤێن ساخ و هشیار ژی نەشێن بکەن.. وەرن دا قەستا مالا عومەری بکەین و وان هەر سێ ڕۆژێن دووماهییێ ژ ژییێ وی د گەل دا بژین، دا پتر مەزنییا وی بۆ مە ئاشکەرت ببت.



مەخسەدا مە ب وی تشتی یێ عومەری کری مەسەلا هلبژارتنا خەلیفەیێ پشتی وی بوو..

دەمێ نڤێژ خلاسبووی و هندەک زەلامان عومەر هلگرتی و برییە مالا وی، خەمەکا مەزن ب سەر خەلکێ مەدینێ دا هات تو دا بێژی چو خەم ژ وێ مەزنتر نینن، هندەک صەحابی لێ کۆمبوون دا حالێ وی ل سەر سڤک بکەن، جحێلەک هاتە نک و ئەو یێ د وی حالی دا بوو، گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین) مزگینییا خودێ ل تە بت، تە هەڤالینییا پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- یا کری، و تو زوی هاتبوویە د ئیسلامێ دا، و دەمێ تو بوویە خەلیفە تە عەدالەت کر و ئەڤە شەهیدبوون ژی گەهشتە تە.. عومەری گۆت: خۆزی ئەز سەر ب سەر ژێ دەرکفتبامە، نە ل سەر من و نە بۆ من، پاشی ئەو جحێل دەرکەفت، عومەری بەرێ خۆ دایێ کراسێ وی یێ شۆرە و یێ عەردی دمالت، ئینا عومەری گۆت: کانێ بێژنێ بلا بزڤرت، گاڤا زڤری عومەری گۆتێ: برازا کراسێ خۆ کورت کە، بۆ جلکێ تە پاقژترە، و دا خودێ ژی ژ تە رازی ببت.

بەرێ خۆ بدەنە مەزنییا عومەری و کانێ ئەو چەند یێ حەریص بوو ل سەر سوننەتێ، د گەل وێ برینا مەزن یا کەفتییە لەشی کو رویڤیکێن وی قەتکرین، دەمێ وی دیتی کراسێ مرۆڤەکی یێ شۆرە و یێ د بن گۆزەکێ دا -و ئەڤە خیلافی سوننەتا پێغەمبەرییە سلاڤ لێ بن- وی برینا خۆ ژ بیرکر و ئەمرێ ب سوننەتێ ل وی جحێلی کر.

عومەری -وەکی هندەک ئیسلامخوازێن مە یێن عەصری و حەرەکی- نەگۆت: کورتکرنا دەلنگان مەسەلەکا (هامشی)یە و ژ (قوشوورانە)، ب بەر ناکەڤت مرۆڤێ داعیە خۆ پێڤە مژویل بکەت، یان (واقع) و حالێ سیاسی ژ هندێ مەزنترە خەلیفە خۆ ب مەسەلەکا هندە (تافە) ڤە مژویل بکەت.. رۆژا مە ئیسلام کرییە تشتێن (موهیم) و نە (موهیم)، و مە خەم ژ یێ (موهیم) ب تنێ خواری، و سێ چارێکێن سوننەتێ ژ بەر مەصلەحەتەکا (شەخصی) یان (حزبی) مە ژ تشتێن (تافە) و نە (موهیم) هژمارتی، (موهیم) و نە (موهیم) پێکڤە چوون:

دین چوو و نەکەت ب دەست مە دینار

تالی ژ نەچاری بوویندە صەففار

وەکی سەیدایێ خانی گۆتی.

ئبن عەبباس ل نك عومەری یێ روینشتیبوو، گاڤا وی گوهـ ل عومەری بووی گۆتی: خۆزی ئەز سەر ب سەر ژێ دەركەفتبام.. گۆتێ: نە ب خودێ تو سەر ب سەر ژێ دەرناكەڤی، تە هەڤالینییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كربوو و ئەو یێ ژ تە رازی بوو، و تە هۆ كربوو و هۆ كربوو.. و حەتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری ژی یێ ژ تە رازی بوو، پاشی تە هەڤالینییا خەلیفێ پێغەمبەری ژی كر و تو د فەرمانا وی دا بووی و تە بۆ وی هۆ كر و هۆ كر.. پاشی تو بوویە ئەمیر و تە ئەمیراتی ب تازەیی كر و تە هۆ كر و هۆ كر، ئینا عومەری گۆتێ: كورێ عەبباسی ئەگەر تژی عەردی من زێڕ هەبا ژ ترسێن ڕۆژا قیامەتێ دا ئەز دا دەم.

پاشی وان هنارتە ب دویڤ حەكیمەكی ڕا دا بەرێ خۆ بدەتە برینێن عومەری، وی هندەك قەسپ كرنە ئاڤێ و ئەو ئاڤ دا عومەری، پشتی بێنەكی ئەو ژ برینا وی دەركەفت، پاشی هندەك ئاڤەماست ژی دایێ، ئەو ژی ژ برینێ دەركەفت، ئینا ئەو ژ عومەری بێ هیڤی بوو و گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین) كەسەكی بدانە شوینا خۆ، ئەز دبێژم ژ ئەڤرۆ حەتا سوباهی زێدەتر تو نامینی، عومەری گۆت: تە ڕاستی گۆتە من، و ئەگەر تە تشتەكێ دی گۆتبا من، من باوەر نەدكر، ڤێ گاڤێ ئەگەر دنیا هەمی یا من با ژ ترسێن هاتنا قیامەتێ دا ئەز دا وێ دەم.

ل ڤان هەر سێ ڕۆژان عومەر ژ بەر برینا خۆ نەشیا بچتە نڤێژا ب جماعەت ل مزگەفتێ، لەو وی ئەمركر صوهەیبێ رۆمی ل شوینا وی نڤێژێ ل بەرا موسلمانان بكەت.. و دەمێ خەلكی داخواز ژێ كری ئەو ئێكی ل شوینا خۆ بكەتە خەلیفە، عومەر پیچەكێ ما هزرێن خۆ كرن، و گۆت: ئەگەر ئەز كەسێ نەدانمە شوینا خۆ ئێكێ ژ من چێتر وە كرییە، و مەخسەدا وی پێ پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن-، و ئەگەر ئەز ئێكی بدانمە

شوینا خۆ ژی ئێکی ژ من باشتر وە کرییە، و مەخسەدا وی پێ ئەبووبەکر بوو.

مرۆڤەکێ گۆتێ: ئەز دێ ئێکی باش نیشا تە دەم، کورێ تە عەبدللاهـ. عومەری گۆتێ: خودێ تە بکوژت، ئەز ب خودێ کەمە مەخسەدا تە ب ڤێ گۆتنێ خودێ نینە، من بۆ خۆ پێ نەخۆش نەبوو ڤێجا چاوا دێ دەمە ئێکێ دی ژ مرۆڤێن خۆ؟! ئەگەر خێر تێدا بت مە تێرا خۆ ژێ ڕاکر، و ئەگەر خرابی تێدا بت بەسی بنەمالا عومەرییە حسێبا ئوممەتا موحەممەدی ژ زەلامەکێ وان ب تنێ بێتەکرن، من چو ل سەر خۆ نەهێلا یا ژ من هاتی من کر و من مرۆڤێن خۆ بێ بارکرن، ڤێجا ئەگەر سەر ب سەر ئەز رزگار بووم ئەو ئەز مرۆڤەکێ بەختەوەرم.

پاشی گۆت: ئەگەر (أبو عبیدە) یێ ساخ با ئەز دا وی ل شوینا خۆ دانم.

ئاشکەرایە کو دەهـ مرۆڤ هەبوون پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ساخی مزگینی ب بەحەشتێ دابوویێ: ئەبووبەکر و ئەبوو عوبەیدە، و ئەڤ هەردویە بەری عومەری مربوون، و عومەر.. ئەڤە سێ، و پشتی عومەری حەفت مابوون: عوثمان و عەلی و زوبەیر و طەلحە و عەبدرەحمان و سەعد و سەعیدێ کورێ زەیدی.

عومەری شەشێن ئێکێ ژ ڤان هلبژارتن، و یێ حەفتێ (سەعیدێ کورێ زەیدی) ژ ناڤ دەرێخست، چونکی پسمامێ وی بوو و زەلامێ خویشکا وی فاطمایێ بوو، گۆتێ: ئەز شاهدەیێ بۆ تە ددەم کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ژ تە رازی بوو حەتا مری، بەلێ چونکی تو مرۆڤێ منی، چێ نابت تو د گەل ڤان بی، پاشی گۆتە صەحابییان: ئێکی ژ ڤان هەر شەشان بۆ خۆ هلبژێرن، و کورێ من عەبدللاهـ بلا د گەل هەوە بت رەئیا

وی وەرگرن، بەلێ وە نەبت تشتەکی بێخنە د دەستان دا. و گۆت: ئەز شیرەتێ ل وی دکەم یێ پشتی من دبتە خەلیفە کو قەدرێ موهاجران بگرت و حورمەتا وان بپارێزت، و قەدرێ ئەنصارییان ژی بگرت، باشییێ د گەل باشێ وان بکەت و ل خرابێ وان ببۆرت، و قەدرێ خەلکێ دی ژی بگرت ئەوێ ل وەلاتێن موسلمانان، چونکی ئەون ئیسلامێ دپارێزن، چویێ ژێ نەستینت ئەو مال نەبت یێ ژ وان زێدە بکەت و ئەو پێ درازی، و ئەز شیرەتێ ب عەرەبێن دەشتێ ژی ل وی دکەم.. و ب (أهل الذمه) ژی باری زێدەی طاقەتا وان ل وان نەکەن.

ئەڤە ب کورتی ئەو شیرەت بوو یا عومەری ل وی کەسی کری ئەوێ دێ پشتی وی بتە خەلیفە. و عومەری گۆتە کورێ خۆ: سەح کێ کانێ چ دەین ل سەر من هەنە ژ مالێ من بدە، ئەگەر مالێ من تێرا نەکر، بێژە بنەمالا عەدی بلا هاری تە بکەن، ئەگەر هەر تێرا نەکر بلا قورەیشی ژی هاری تە بکەن.

پاشی گۆتێ: عەبدللاهـ، هەرە نک دەیکا موسلمانان عائیشایێ و بێژێ: عومەری سلاڤێ ل تە کرین، و نەبێژێ (أمیر المؤمنین)ی، چونکی ئەز نوکە ئەمیرێ کەسێ نینم، و بێژێ: ئەگەر تو دەستوریێ بدەی، عومەری دڤێت ل نک هەردو هەڤالێن خۆ بێتە ڤەشارتن، یەعنی: د مەزەلکا عائیشایێ ڤە ل نک قەبرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و یێ ئەبووبەکری.

عەبدللاهـ هات، دیت عائیشا یا بۆ عومەری دکەتە گری، عەبدللاهی داخوازا عومەری گەهاندێ، عائیشایێ گۆت: ب خودێ ئەو جهـ من بۆ خۆ هێلابوو بەلێ ئەز دێ وی ئەڤرۆ ب پێش خۆ ئێخم. گاڤا عەبدللاهـ زڤڕیە نک بابێ خۆ و گۆتییێ: عائیشا یا رازییە، وی گۆت: (الحمد لله) ئەڤە

ل نک من ژ هەمییێ گرنگتر بوو، ئەگەر ئەز مرم جارەکا دی دەستویرییێ ژێ بخوازە ڤە ئەگەر رازی نەبوو من ببەنە ناڤ زیارەتێ موسلمانان.

کچا وی حەفصا دەیکا موسلمانان هاتە نک، گاڤا وێ ئەو د ڤی حالی دا دیتی کرە گری و گۆت: وەی بۆ هەڤالێ پێغەمبەری.. عومەری گۆتە کورێ خۆ: کانێ من ڕاکەڤە ئەز نەشێم گوهێ خۆ بدەمە ڤان گۆتنان، وی عومەر دا بەر سنگێ خۆ، عومەری گۆتە کچا خۆ: ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ ژ ڤێ جارێ پێڤەتر تشتەکی ب من نەبێژی، چاڤێن تە ئەز نەشێمێ، بەلێ هەر مرییەکێ ئەو تشت پێ بێتە گۆتن یێ نە ل نک وی، مەلائیکەتان کەرب ژێ ڤەدبن.

سێ ڕۆژان عومەر پشتی بریندارکرنێ ما، دوشەنبێ و سێشەنبێ و چارشەنبێ، و ل ڕۆژا چارشەنبێ (٢٦)ی هەیڤا (ذو الحجه) ژ سالا (٢٣) مشەختی عومەرێ شەهید چوو بەر دلۆڤانیا خودێ، و ژییێ وی هنگی ل دۆرێن (٦٣) سالییێ بوو.

گاڤا عومەر هاتییە ب سەر و بەرکرن ئیمامێ عەلی هاتە هنداڤ و گۆت: ب خودێ پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مرۆڤەک ل سەر عەردی نینە من حەز کریت ئەز ب عەمەلەکێ وەکی یێ وی بچمە نک خودێ ژ عەمەلێ ڤی یێ هاتیە کفنکرن پێڤەتر.. پاشی عەلی هند کرە گری حەتا ریهێن وی ژ ڕوندکان تەڕبووین و گۆت: مرنا عومەری دەرزەک د ئیسلامێ دا چێکر حەتا ڕۆژا قیامەتێ ئەو دەرز خۆ لێک نادەتەڤە.

گاڤا خەلک کۆمبووین دا نڤێژێ ل سەر عومەری بکەن، هندەکان عوثمان و هندەکان عەلی پێش ئێخست دا نڤێژێ ل سەر بکەن -و هنگی هێشتا خەلیفە نەهاتبوو هلبژارتن- صوهەیبی گۆت: هوین هەردو خۆ بدەنە پاش، عومەری ئەز ل شوینا خۆ یێ کریمە ئیمام.

وان گۆت: تو ڕاست دبێژی.. و هەمی پاشداچوون، و صوهەیبی نڤێژ ل بەرا موسلمانان ل سەر عومەری کر، و پاشی عومەر ل وی جهی هاتە ڤەشارتن یێ وی ڤیای، ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەر یێ ل لایێ قیبلێ، و ب ڕەخ ڤە ئەبووبەکرە و ب ڕەخ ئەبووبەکری ڤە عومەرە[1].

عومەری سێزدە عەیال هەبوون: نەهـ کوڕ و چار کچ، کوڕێ وی یێ ژ هەمییان ناڤدارتر عەبدللاهە و ئەو ژی صەحابییەکێ ب ناڤ و دەنگە، و وی گەلەک حەدیس یێن ریوایەتکرین، و عاصم و ئەڤە باپیرێ عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی یێ دەیکێیە، و ژ کچێن وی: (حفصە) ژ هەمییان ناڤدارترە، و ئەڤێ شوی ب پێغەمبەری کربوو -سلاڤ لێ بن- لەو ئەبووبەکر و عومەر هەردو خەزوریێن پێغەمبەری بوون، و پێغەمبەر خەزوریێ عوثمانی و عەلی هەر دویان بوو.

وەکی بۆ مە ئاشکەرابووی عومەر دەهـ سال و شەش هەیڤ و پێنج ڕۆژان ما خەلیفە، و وی ل ڤی دەمی گەلەک کارێن مەزن کرن، ل ڤێرێ ئەم دێ وان کاران ب کورتی بێژین:

١- دەمێ عومەر بوویە خەلیفە گەرم گەرما شەڕێ موسلمان و کافران بوو ل پتر ژ چەپەرەکی، ل عیراقێ و شامێ، گاڤا عومەری خیلافەت وەرگرتی وی بەردەوامی ب سیاسەتا ئەبووبەکری دا و خەمەکا مەزن ژ ئامادەکرنا لەشکەری خوار.

ل شامێ سەرکەفتنێن موسلمانان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زێدەتر لێ هاتن و موسلمان شیان دیمەشق و حمص و قنسرین و ئەجنادینێ بستینن، و یا

---

(١) سەرهاتییا هلبژارتنا خەلیفەیێ پشتی عومەری، هنگی دێ بەحس ژێ کەین دەمێ ئەم بەحسێ ئیمامێ عوثمان دکەین، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

ژ هەمییێ مەزنتر ئەو بوو موسلمان شیان قودسێ ڤەکەن و عومەری ب خۆ ب دەستێ خۆ کلیلێن قودسێ وەرگرتن.

ل چەپەرێ عیراقێ ژی لەشکەرێ ئیسلامێ بۆ پێشڤەچوو و شیا د گەلەک شەرێن مەزن دا سەرکەڤت حەتا پایتەختا دەولەتا فورسێ ب خۆ ژی ستاند، و دەولەتا وان بێ سەر و شوین کر، و ب لایێ خوراسانێ ژی ڤە چوو.

کوردستان ژی، و هەر وەسا مصر، ژ وان وەلاتان بوون یێن ل سەر دەمێ عومەری هاتینە ڤەکرن و ئیسلام گەهشتییێ.

ل دەمەکی عومەری بڕیار دا ئەو ب خۆ سەرکێشییا لەشکەرێ ئیسلامێ ل عیراقێ بکەت، بەلێ صەحابی مانە پێڤە و گۆتنێ: یا باش ئەوە تو بمینییە ل مەدینێ، ئینا وی (سعد بن أبي وقاص) ل شوینا خۆ هنارت.

٢- کارێ دی یێ مەزن یێ عومەری کری دەرێخستنا جوهی و فەلان بوو ژ وەلاتێ حیجازێ، و ئەو فرێکرنە شامێ، ژ بەر کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دابوو کو دو دین ل ویرێ کۆم نابن.

٣- ب سەر و بەرکرن و رێکخستنا کار و بارێ دەولەتێ ب وی رەنگێ مە بەری نوکە ئیشارەت پێ دای.

٤- دانانا دیرۆکا هجری ئەوا بوویە دیرۆکا دەولەتا ئیسلامێ یا رەسمی.

پشتی ڤێ هەمییێ، و بەری ئەم بەرپەرێ عومەری ژی قەلدەین و قەستا دیوانا عوثمانی بکەین، هوین هزر نەکەن ئەم یێن شیاین دیرۆکا عومەری بۆ هەوە ڤەگێرین، یان هندەکێ ژ مەزنییا وی بەرچاڤ کەین.

عومەر ئەوێ قەدەرا مە وەسا كو ئەم گوهـ لێ ببین بێی وی ب خۆ ببینـین، حـەز ژێ بكـەین بێـی مـەزنییا وی -وەكـی ئـەو ژ هـەژی- بـزانین، گەلەک ژ هندێ مەزنترە مـرۆڤ د سـەعەتەكێ یان د دو سـەعەتان دا بشـێت بدەتە نیاسین.

بەلێ هەر چاوا بت هیڤییا مـە ئـەوە ئـەو دەمـێ مـە د گـەل عومـەری بۆراندی ڤیانا وی پتر د دلێ مە دا مەزن كربت؛ دا بـەلـكـی ئـەڤ ڤیانـە ل ئـاخرەتێ مـە بدەتـە د گـەل وی، هـەر وەكـی پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- گۆتی: ((**المرء مع من أحب**)) مرۆڤ د گەل وییە یێ ئەو حەز ژێ دكەت.

# خەلیفێ سێیێ
# عوثمانێ کوڕێ عەففانی

پشتی عومەری دۆرا عوثمانی دئێت، زەلامێ ئێکانە د دیرۆکێ دا دو جاران بوویە زاڤایێ پێغەمبەرەکی، عوثمان ئەوێ مەلائیکەتان شەرم ژێ دکر.. ئیمامێ شەهید ئەوێ پتر ژ جارەکێ مزگینی ب بەحەشتێ بۆ هاتییەدان.

ڤێجا کەرە کەن ئەم و هوین و عوثمان.. و چیرۆکا مەردینی و خۆفرۆتنا بۆ خودێ.

عوثمان ناڤێ وی یێ دورست بوو، بابێ وی عەففانێ کوڕێ ئەبوولعاصێ کوڕێ ئومەییەیێ کوڕێ عەبدشەمسێ کوڕێ عەبدمەنافێ قورەیشییە.. ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل عەبدمەنافی دگەهنە ئێک، یەعنی: ل بابێ پێنجێ؛ چونکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کوڕێ عەبدللاهێ کوڕێ عەبدلموطەلبێ کوڕێ هاشمێ کوڕێ عەبدمەنافی بوو.

عەففانێ بابێ عوثمانی د جاهلیەتێ دا مربوو. ناڤێ دەیکا وی ئەروا بوو، ئەو ژی هەر ژ بابکێ عەبدشەمسێ قورەیشی بوو، یەعنی: ئەو و زەلامێ خۆ ژ ئێک بنەمالێ بوون، و دەیکا دەیکا عوثمانی ئەلبەیضاء کچا عەبدلموطەلبی بوو، یەعنی: عوثمان نەڤییێ مەتا پێغەمبەری بوو و پێغەمبەر برازایێ پیرا عوثمانی بوو. دەیکا عوثمانی گەهشتبوو دەمێ ئیسلامێ و موسلمان بووبوو، و دبێژن: ئەو ل سەر دەمێ خیلافەتا عوثمانی مربوو.

عوثمان شەش سالان پشتی بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل باژێرێ طائفێ ب سەر دنیایێ کەفتبوو. و سەر و بەرێ ژینا عوثمانی د جاهلیەتێ دا ب بەرفرەهی مە نەزانییە، بەلێ ژ تشتێن ئاشکەرایە کو عوثمان مرۆڤەکێ گەلەک خۆشتڤی بوو د ناڤ قورەیشییان دا، حەتا دبێژن: دەمێ ژنکەکێ کورەکێ خۆ دهژاند ئەڤ مالکا شعرێ پێ دگۆت:

أحبک و الرحمن        حب قريش عثمان

یەعنی: ئەز ب خودێ کەمی کانێ قورەیشی چەند حەز ژ عوثمانی دکەن، ئەز هند حەز ژ تە دکەم.

عوثمان مرۆڤەکێ رویگەش بوو، یێ رەنگ ئەسمەر بوو، ریهێن وی د درێژ بوون، و بەژنا وی یا ناڤنجی بوو، هەر ژ جحێلینییا خۆ ئەو زەلامەکێ ب مرۆڤاینی و شەرمین بوو، د ناڤ قورەیشییان دا کەسک نەبوو قورەیشی هەمی حەز ژێ بکەن هندی وی، و هەر ژ بەر هندێ بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دەمێ صولحا حودەیبییێ ئەو هنارتە مەکەهێ د ناڤ قورەیشییان دا.

بابێ عوثمانی ئێک ژ مەزن و ماقویلێن بابکێ ئومەوییێن قورەیشی بوو، و ئەو مرۆڤەکێ دەولەمەند بوو و کارێ بازرگانییێ دکر، لەو عوثمان هەر ژ زارۆکینییا خۆ ژینەکا خۆش بربوو سەری، و دبێژن: عوثمانی چو رۆژان فەقیری نەدیتبوو.

هێشتا عوثمان یێ جحێل بابێ وی مر، و مالێ وی هەمی بۆ عوثمانی ما، و عوثمانی ژی وەکی پترییا زەلامێن مەکەهێ بازرگانی ب مالێ خۆ دکر.

هەڤالینی د ناڤبەرا عوثمان و ئەبووبەکری دا هەبوو، لەو دەمێ ئیسلام هاتی و ئەبووبەکری بەری هەمییان باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

ئینای، ئەبووبەکر هات و داخواز ژ هەڤالێن خۆ یێن نێزیک کر کو ئەو بێنە د ئیسلامێ دا، و عوثمان ئێک ژ وان بوو.. عوثمانی د گاڤێ دا گوهداریا ئەبووبەکری کر، و د گەل وی چوو نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ل سەر دەستێ وی موسلمانبوو، و عوثمان ئێک ژ وان پێنج زەلامان بوو یێن بەری هەمییان هاتینە د ئیسلامێ دا: ئەبووبەکر، عوثمان، طەلحە، زوبەیر و سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی.

عوثمان ئێکەمین زەلامێ ئومەوی بوو باوەری ب پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای، لەو ئەڤ چەندە بۆ ئومەوییان نەخۆش بوو، ب تایبەتی ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو پەیوەندی د ناڤبەرا ئومەوییان و بابکێ هاشمییان دا دخۆش نەبوون.

گاڤا خەلکی زانی عوثمان یێ موسلمانبووی ژ ڤێ چەندێ مەندەهۆش بوون، ئێک ژ وان چوو -ب گازندە ڤە- گۆتە دەیکا وی: کورێ تە یێ چوویە سەر دینێ موحەممەدی. دەیکا وی ئەوا کچ مەتا پێغەمبەری، گۆت: ما کی ژ مە فەرترە هاری موحەممەدی بکەت؟ مالێ مە و رحێن مە گۆری موحەممەدی بن!

بەلێ ئەڤە رەئیا زەلامێن ئومەوییان نەبوو، مامێ وی حەکەمێ کورێ ئەبوولعاصی گاڤا زانی عوثمان یێ موسلمانبووی، چوو عوثمان گرت و حشکێ گرێدا و عەزاب دا و سویند خوار ئەو عوثمانی بەرنەدەت حەتا عوثمان نەزڤرتە سەر دینێ وان.. عوثمانی ژی سویند خوار ژ دینێ خۆ لێڤە نەبت ئەگەر خۆ ئەو د بن عەزابێ دا بمرت ژی. پشتی دەمەکی مامێ وی ژێ بێ هیڤی بوو، ئینا ئەو بەردا و ئێدی مایێ خۆ تێ نەکر.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کچا خۆ روقەییە دابوو کورێ مامێ خۆ ئەبوولەهەبی، بەلێ بەری ئەبوولەهەب بویکا خۆ ڤەگوهێزت وەحی بۆ

پێغەمبەری هات، و ئیسلامێ دەست پێ کر، ئەبوولەهەبی گۆتە کورێ خۆ: تو کچا مەحەممەدی بینی ئەز و تو ژێک خلاس. وی گوهێ خۆ دا بابێ خۆ و کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێشتا نەڤەگوهاستی بەردا.

پشتی هنگی عوثمانی ئەو بۆ خۆ خواست، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخوازا وی ب جهئینا و کچا خۆ روقەییە دایێ.

ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هژمارا موسلمانان زێدە دبوو، و د گەل زێدەبوونا هژمارا وان دژوارییا کافرێن قورەیشییان ژی ل سەر وان زێدە دبوو، و ژ بەر کو موسلمان د بێ هێز بوون و کەس نەبوو بەرەڤانییێ ژ وان بکەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دا وان ئەو مشەخت ببن و بچنە وەلاتێ حەبەشێ؛ چونکی مەلکەک ل وێرێ هەبوو ل سەر دینێ عیسایی بوو، قەبویل نەدکر د مەملەکەتا وی دا تەعدایی ل کەسێ بێتەکرن.. و ئێکەمین کەسێ ڕێکا مشەختبوونێ گرتی و د فەرمانا پێغەمبەری دەرکەفتی: عوثمانێ کوڕێ عەففانی و ژنکا وی کچا پێغەمبەری بوون. لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا بۆ وی کر و گۆت: عوثمان ئێکەمین کەسە پشتی لووطی مشەخت دبت.

پشتی عوثمان و هندەک صەحابییێن دی گەهشتینە حەبەشە، دەمەکی مان، ئەو بوو قورەیشییان کرە دیعایەت کو خەلکێ مەکەهێ هەمی یێن موسلمانبووین ئینا ئەو زڤڕینە مەکەهێ.. بەلێ پشتی ئەو زڤڕین بۆ وان دیاربوو کو ئەڤ گۆتنا گەهشتییە وان درەو بوو، لەو هندەک ژ وان جارەکا دی زڤڕینە حەبەشە و عوثمان و کابانییا وی ژ وان بوون، ئەو ب دەستویرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چوون.

ئەم نزانین کانێ ڤێ جارێ عوثمان چەند مابوو ل حەبەشە، و کانێ بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ مەکەهێ مشەخت ببتە مەدینێ عوثمان

ژ حەبەشێ زڤڕی بوو مەکەهێ، یان پشتی مشەختبوونێ ئەو ئێکسەر ژ حەبەشێ هاتبوو مەدینێ؟ بەلێ تشتێ مسۆگەر ئەوە ل سالا دویێ ژ مشەختێ دەمێ شەڕێ بەدرێ چێبووی، عوثمان ل مەدینێ بوو.. و هزر پتر بۆ هندێ دچت کو ئەو زڤڕی بوو مەکەهێ پاشی ژ مەکەهێ مشەخت بووبوو مەدینێ، و ب ڤێ چەندێ عوثمان دبتە ژ وان کەسان یێن سێ جاران -د ڕێکا خودێ دا- مشەختبووی.

ل مەدینێ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هندەک صەحابییێن خۆ دەرکەفتینە بەراهییا کاروانێ ئەبوو سوفیانی، عوثمان ژ وان کەسان بوو یێن دەرنەکەفتین، و ئەگەرا دەرنەکەفتنا وی نساخییا ژنکا وی بوو.. بەری پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەڤتە بەدرێ کچا وی روقەییە نساخبوو، هەر چەندە عوثمانی دل تێ هەبوو د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەڤت ژی، بەلێ پێغەمبەری گۆتێ: تو نەئێ بمینە ل مال ژ بەر ژنکا خۆ.. و بەری لەشکەرێ موسلمانان یێ سەرکەفتی ژ بەدرێ بزڤڕتە مەدینێ خودێ وەسا حەز کر کابانییا عوثمانی بچتە بەر دلۆڤانییا خودێ، پشتی نێزیکی پازدە سالان ئەو هەردو مابنە د گەل ئێک، و ژییێ روقەییەیێ دەمێ مری نەبووبوو سیه سال، و عوثمانی کوڕەک ژێ هەبوو ناڤێ وی (عەبدللاهـ) بوو، دبێژن: ئەو ل شەش سالییێ مربوو.

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستکەفتییێن بەدرێ لێکڤەکرین پشکەک دا عوثمانی ژی، وەکو کو عوثمان د شەڕی دا یێ ئامادە، لەو تەعامولا خەلکێ بەدرێ د گەل عوثمانی دهاتەکرن.

ل مەدینێ عوثمان ژی وەکی ئەبووبەکر و عومەر و عەلی، هەردەم د گەل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و هەر وەکی قەدەرێ ئەڤ هەر چارە ئامادەدکرن دا پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خلافەتا راشدی بکەن.

عوثمان -وەکی مە بەری نوکە ژی گـۆتـی- مرۆڤەکێ زەنگین بـوو، و ل مـەدینێ وی مـالێ خـۆ د خزمـەتا پێغەمبـەری و ئیسـلامێ دا دانـابوو، دەمـەکی ئـاڤ ل مـەدینێ کێمبـوو، و ئاڤـا کـانی و بیـران ژی ل بـەر دەڤێ خەلکی تام نەخۆش بوو، بیرەک تێ نـەبت ئـەو بیـرا دگـۆتنێ: (بئر رومـە)، ئەڤ بیرە یا زەلامەکێ جوهی بوو، گاڤا وی دیتی بەرێ خەلکی کەفتە ئاڤا بیـرا وی ڕابـوو ئـاڤ فـرۆت و ب ڤـێ چەنـدێ ل سـەر موسـلمانان بـوو تـەنگاڤی.. پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گـۆت: کـی دێ ڤـێ بیـرێ بـۆ موسـلمانان کـڕت و پـێش وێ ڤـە کانییـەک د بەحەشـتێ دا دێ بـۆ هـەبت؟ عوثمانی گۆت: ئەز.

عوثمان چوو نـک زەلامـێ جوهی، گۆتێ: بیـرا خۆ بفرۆشە مـن، یێ جوهی گۆتێ: نیڤەکێ دێ فرۆشمە تە، ڕۆژەکێ ئاڤ بۆ من و ڕۆژەکێ بۆ تە، و بهایـەکێ ب دلـێ خـۆ گـۆت. هزرا وی ئـەو بـوو دێ پـارەی ژ عوثمـانی وەرگرت، و ڕۆژەکێ دێ ئاڤێ فرۆشت. عوثمانی گۆتێ: بلا.

پشـتی عوثمـانی پـارێ وی داینـێ و دبێـژن: ئـەو دوازدە هزار دەرهـەم بوون، عوثمانی گۆتە خەلکی: هەچییێ ئاڤ بڤێت بلا ب هەروە ل ڕۆژا مـن بۆ خۆ ببەت، ڕۆژا دۆرا عوثمانی بـا خـەلـک دچـوون تێـرا دو ڕۆژان ئـاڤ بـۆ خـۆ دئینـا، و ڕۆژا دۆرا زەلامـێ جـوهی بـا کەسـێ ئـاڤ ژێ نـەدکڕی، ئینـا زەلامێ جوهی بارا خۆ ژی فرۆتە عوثمانی بەلێ ڤێ جارێ ب هەشت هزار دەرهەمان. و عوثمانی بیر بۆ موسلمانان کرە وەقف.

سـەرهاتییێن مـەردینییا عوثمـانی ژ هندێ پـترن کـو مـرۆڤ بشـێت بهژمێرت.

دەمەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیت هەر وەکی مزگـەفتا وی یا تـەنگ دبـت پشـتی هژمـارا موسـلمانان زێـدەبووی، لـەو ڕۆژەکـێ د نـاڤ

صەحابییێن خۆ دا گۆت: کی دێ فلان جهی کڕت دا ئەم ب سەر مزگەفتێ ڤە بەردەین و ژ وێ چێتر بۆ وی د بەحەشتێ دا هەیە؟ ل ڤێرێ عوثمانی بەری هەڤالێن خۆ ڕا کر و گۆت: ئەز.. و وی ئەو عەرد ب بیست و پێنج هزار دەرهەمان کڕی.

هەر ژ چیرۆکێن مەردینی و خێرخوازییا وی ل سەر دەمێ خلافەتا ئەبوبەکری جارەکێ ل مەدینێ بوو گرانی، و ئەرزاق ل بازاری نەما، ل وان ڕۆژان کاروانەکێ عوثمانی هاتە مەدینێ، هەمی قویت و ئەرزاق بوو، بازرگانێن مەدینێ چوونە نک عوثمانی دا معاملێ د گەل وی بکەن، عوثمانی گۆتێ: هەوە خێرە، وان گۆت: مە یێ زانی کاروانەکێ تە یێ هاتی و ئەم یێن هاتین ئەرزاقی ژ تە بکڕین دا ببەینە بازارێ؛ چونکی تو دزانی خەلک یێ تەنگاڤە.. عوثمانی گۆتێ: وەرن.. هەر دەرهەمی هوین چەند فایدەی دێ دەنە من؟

وان گۆت: ئەوێ تە ب دەهان کڕی ئەم دێ ب دوازدان ژ تە کڕین، وی گۆت: ئێکی پتر یێ دایە من. وان گۆت: دێ چاردەیان دەینە تە. گۆت: پتر. گۆتن: پازدەیان، عوثمانی گۆت: ئێکی پتر یێ دایە من. ئینا بازرگانان گۆت: ئەو کییە پتر دای؟ ئاخری تاجرێن مەدینێ ئەمین! عوثمانی گۆت: ئێکی هەر دەرهەمی دەهـ دەرهەم فایدە یێن داینە من، هوین دێ پترێ دەن؟ وان نەگۆت: نەخێر. عوثمانی گۆت: گەلی تاجران. هوین شاهد بن ئەڤ هزار حێشترێن من ب بار ڤە خێرن بۆ فەقیر و ژارێن مەدینێ.

ئەو فایدێ خودێ ددەتە عوثمانی دەرهەمەک ب دەهان بۆ وی چێترە ژ هەمی فایدێن دی.. ڤێ سەرهاتییێ ئەڤرۆ ئەم دکەینە دیاری بۆ وان تاجرێن دەلیڤەیان بۆ خۆ (ئستغلال) دکەن، و کەیفا وان دئێت دەمێ کورێن مللەتی دکەڤنە د تەنگاڤییێ دا، نە دا وەکی عوثمانی بکەن و سەرمالێ خۆ

ل نک خودێ زێده کەن، بەلکی دا پتر خوینا هەژاران بمێژن و ب برسا وان خۆ حەمەر کەن!

(ئەز) ئەو شعار و دوریشمە بوو یێ عوثمانی ل دەمێ سباقا خێرێ دا بلند دکر.

رۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرییە دلێ خۆ بۆ شەرێ تەبووکێ دەرکەڤتنە جیهادێ وی بەرێ خۆ دایێ گرفتارییا مەزن ئەو بوو موسلمانان پێرەهـ نەبوون پێ بدەرکەڤنە جیهادێ، لەو ئەو ب سەر مینبەرێ کەفت و داخواز ژ موسلمانان کر کو هاریکارییا لەشکەری بکەن؛ دا بشێت دەرکەفتە جیهادێ.

عوثمان ڕابووڤە و گۆت: کارکرنا لەشکەری هەمی خەما من.. هزار و تشتەک خێشتر و هەسپ عوثمانی ئامادەکرن، ب زینی و ئالف ڤە.. نە بەس هندە، هزار دینار ژی ئینان کرنە کۆشا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ئەو وان ل سەر جیهادکەران خەرج بکەت.. ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((**ما ضر عثمان ما عمل بعد اليوم**)) یەعنی: ژ ئەڤرۆ وێڤە عوثمان چ بکەت زیان ناگەهتێ.

ئەڤە پیچەک بوو ژ گەلەکییا مەردینییا عوثمانی، ڤێجا چاوا ئەو ژ زەلامێن دەرەجا ئێکێ نەبت؟

وەکی مە گۆتی: عوثمان ژ وان صەحابییان بوو یێن هەردەم د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دژیا، و دەمێ کچا پێغەمبەری (روقەییە) مری ل سالا دویێ مشەختی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خویشکا وێ (ئوم کولثووم) دا عوثمانی، و ب ڤێ چەندێ عوثمان دو جاران بوو زاڤایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-. نێزیکی شەش سالان عوثمان و (ئوم کولثووم) د گەل ئێک مان، و ل سالا نەهێ مشەختی ئەو مر بێی کو چو عەیال

ژ عوثمانی هەبن.. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەگەر کچەکا دی مە هەبا دا دەینە عوثمانی.

عوثمان مرۆڤەکێ خواندەڤان بوو، و ئێک ژ نڤیسەرێن وەحیێ بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهنارتە ب دویڤ ڕا دا قورئانێ بنڤیست دەمێ هندەک ئایەتێن نوی دهاتنە خوارێ.

ل ڕۆژا حودەیبییێ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابی هاتین دا بچنە مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ، و کافران هندەک هنارتینە بەراهییا وان دا نەهێلن ئەو بێنە د مەکەهێ دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیا مرۆڤەکی فرێکەتە مەکەهێ دا بێژتە کافران: ئەم نەهاتینە شەڕێ هەوە بکەین، ئەم یێن هاتین عومرێ بکەین.. پشتی وی دان و ستاندن د گەل صەحابییێن خۆ کری ڕەئیا هەمییان ئەو بوو ئەو عوثمانی بهنێرتە مەکەهێ؛ چونکی کەس وەکی وی ل نک قورەیشییان یێ ب قەدر نەبوو.

گاڤا عوثمان چوویە مەکەهێ، کافران عوثمان گرت و سێ ڕۆژان دان و ستاندن کرن کانێ ئەو چ بکەن.. هنگی سوحبەت وەسا گەهشتە پێغەمبەری کو قورەیشییان عوثمان یێ کوشتی، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیارا شەڕی دا، و صەحابییان بەیعە دا پێغەمبەری کو د هەر حالەکێ هەبت دا ئەو د گەل وی بن، پشتی ئەو چوونە دەستێ پێغەمبەری، پێغەمبەری دەستێ خۆ یێ چەپێ کرە د دەستێ خۆ یێ ڕاستێ دا و گۆت: ئەڤە پێش عوثمانی ڤە، و ئەڤە بوو (بیعة الرضوان).

د هندەک ریوایەتێن دورست دا هاتییە ڤەگوهاستن کو عوثمان ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک نهێنی بۆ گۆتین، و ئاگەهدارییا وی کری کو هندەک موصیبەت دێ ب سەر وی دا ئێن، ڤێجا دڤێت ئەو صەبری بکێشت حەتا خودێ حوکمی د ناڤبەرا وی و دوژمنێن وی

دا بکەت، (ئبن ماجە) د حەدیسەکا دورست دا ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت، دبێژت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە عوثمانی: ((**یا عثمان، إن ولاک الله هذا الأمر یوما، فأرادک المنافقون أن تخلع قمیصک الذي قمصک الله فلا تخلعە**)) ئەی عوثمان ئەگەر خودێ ئەڤ کارە ڕۆژەکێ ئێخستە دەستێن تە، و منافقان ڤیا وی کراسێ خودێ کرییە بەر تە ژ بەر تە بکەن، تو وی ژ بەر خۆ نەکە.

ئەڤ شیرەتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل عوثمانی کربوو، و عوثمان شیرەتا وی ب جهئینا، و ژ لایەکێ دی ڤە ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو ئەوێن ڤیاین عوثمانی بێخن (منافق) بوون؛ چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ ناڤە پێ دانایە سەر وان.

ئیمامێ ترمذی د حەدیسەکا دورست دا ژ مورەیێ کوڕێ کەعبی ڤەدگوهێزت، دبێژت: ڕۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ فتنا کر و وەسا بۆ مە دیارکر کو فتنە گەلەک یا نێزیکبووی، هنگی زەلامەکێ سەر و چاڤ پێچای د بەر مە ڕا چوو، ئینا پێغەمبەری ئیشارەت داێ و گۆت: ((**هذا یومئذ علی الهدی**)) یەعنی: وێ ڕۆژێ ئەڤە دێ ل سەر هیدایەتێ بت. گۆت: ئەز ب دویڤ وی زەلامی دا چووم دا بزانم کانێ ئەو کییە، من دیت ئەو عوثمانە.

د حەدیسەکێ دا ئیمام ئەحمەد ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- کەفتییە بەر نساخییا مرنێ، ئەز و حەفصایا کچا عومەری ل نک وی بووین، گۆت: جارەکێ دلێ پێغەمبەری هاتە گرتن، مە گۆت: دیارە ئەو تمامبوو، پاشی هشیاربوو، و گۆت: دەرگەهی بۆ ڤەکەن. من گۆتە حەفصایێ: دێ بابێ من بت یان بابێ تە، مە دەرگەهـ ڤەکر دەرکەفت عوثمان، گاڤا پێغەمبەری ئەو دیتی گۆتێ: خۆ

نێزیک بکه. عوثمان ب نک ڤه چوو، ئینا پێغەمبەری تشتەک د گوهی دا گۆت، من و حەفصایێ نەزانی کانێ چ گۆتێ، پاشی ب دەنگەکێ بلند گۆتێ: تە زانی من چ گۆتە تە؟ گۆت: بەلێ، پاشی جارەکا دی ژی تشتەک د گوهی دا گۆتێ، و دیسا ب دەنگەکێ بلند گۆتێ: تە زانی من چ گۆتە تە؟ گۆت: بەلێ من زانی و ئەز تێ گەهشتم.

د ریوایەتەکا دی دا عائیشا دبێژت: گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێدی تشتەک گۆتییێ ڕەنگێ عوثمانی هاتە گوهارتن.. و ڕۆژا دوژمنان حصار دانایە سەر عوثمانی -وەکی دێ بەحس ژێ کەین- هندەک مرۆڤان گۆتێ: بۆچی تو ئەمر ناکەی شەڕێ وان بێتەکرن؟ وی گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تشتەکێ گۆتییە من ئەز دێ صەبرێ ل سەر کێشم. لەو هندەک زانایان دگۆت: دیارە ئەو تشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییێ بەحسێ کوشتنا وی بوو.

ئیمامێ عوثمان ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب بەحەشتێ دایێ، و مری و ئەو یێ ژێ رازی.



ل سەر دەمێ خلافەتا ئەبووبەکری عومەر تێ نەبت کەس هندی عوثمانی یێ نێزیکی ئەبووبەکری نەبوو، د گەلەک مسەلان دا خەلیفەی رەئیا وی وەردگرت و ب گۆتنا وی دکر، و ڕۆژا ئەبووبەکر کەفتییە بەر مرنێ و ڤیای کیتابەکێ بنڤیست دا کەسەکی بدانتە جهێ خۆ، وی هنارتە ب دویڤ عوثمانی ڕا دا بنڤیست، دەمێ عوثمانی دەست ب نڤیسینێ کری و بەری ئەبووبەکر ناڤێ وی کەسی بنڤیست یێ وی دڤێت ل شوینا خۆ بدانت دلێ وی هاتە گرتن، یا ژ عوثمانی ڤە ئەو تمامبوو ئینا عوثمانی ناڤێ عومەری نڤیسی گۆت: دا چو خیلاف چێ نەبت.. پشتی ئەبووبەکر

هشیاربووی گۆتێ: تە چ نڤیسی؟ عوثمانی بۆ خواند و ناڤێ عومەری گۆت، ئینا ئەبووبەکری گۆتێ: (بارک الله فیک! ئەگەر تە ناڤێ خۆ نڤیسیبا ژی تو یێ ژ هەژی بووی).

عومەر بوو خەلیفە.. و دەمێ مە بەحسێ عومەری کری، مە ئاشکەرا کر کو عومەری تشتەک نەدکر حەتا رەئیا صەحابییان وەرنەگرتبا، و عوثمان ئێک ژ وان بوو یێن عومەری دڤیا د هەمی مەسەلان دا رەئیا وی بزانت، و گەلەک کارێن عومەری کرین رەئیا عوثمانی بوو وی وەرگرتی.

بەری عومەر ژی ژ ڤێ دنیایێ بار کەت -وەکی مە گۆتی- وی شەش کەس هلبژارتن و گۆتە موسلمانان: ئەڤە ئەون یێن پێغەمبەر ژێ رازی، ڤێجا هوین ئێکی بۆ خۆ ژێ هلبژێرن، و عومەر چوو بێی بزانت کانێ ئەوێ دێ بتە خەلیفە پشتی وی کییە، بەلێ دلێ عومەری دگۆتێ موسلمان دێ ئێکی ژ دویان هلبژێرن: عوثمانی یان ژی عەلی، لەو وی شیرەت ل ڤان هەردویان کر کو ئەگەر تشتەک کەفتە دەستێ وان ئەو عەدالەتێ د ناڤبەرا خەلکی دا بکەن، و عومەر چوو.. و موسلمانان عوثمان هلبژارت، بەلێ ب چ رەنگ؟

چیرۆکا (شوورایێ) دێ ڤێ چەندێ بۆ مە دیار کەت.



دەمێ عومەر هاتییە برینداركرن و دختوران ئەو بێ هیڤیکری، خەلکی گۆتێ: ئێکی بدانە جهێ خۆ.. ئەو بوو عومەری شەش کەس هلبژارتن و گۆت: ئەڤە ئەون یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژێ رازی، و ئەو هەر شەش ژی ئەڤە بوون: عوثمان، عەلی، طەلحە، زوبەیر، سەعد و عەبدررەحمان. بەری عومەر تمام ببت گۆت: هێشتا سێ رۆژ د سەر هەوە را نەبۆرن هوین ئێکی ژ ڤان بۆ خۆ هلبژێرن.

پشتی صەحابی ژ ڤەشارتنا عومەری خلاسبووین، ئەڤ هەر شەشە-ب ئامادەبوونا صەحابییێن مەزن- کۆمبوون، عەبدررەحمانێ کورێ عەوفی رابووڤە و گۆت: سێ ژ هەوە (تەنازولێ) بۆ سێیان بکەن.

زوبەیری گۆت: من تەنازول بۆ عەلی کر.

طەلحەی گۆت: من تەنازول بۆ عوثمانی کر.

سەعدی گۆت: من تەنازول بۆ عەبدررەحمانی کر.

ژ شەشان سێ دەرکەفتن، و سێ مان، عەبدررەحمانی گۆتە هەردو هەڤالێن خۆ: ئێک ژ هەوە دێ تەنازولێ بۆ یێ دی کەت دا ئەم وی بکەینە خەلیفە؟

یەعنی: عەبدررەحمانی ب خۆ ژی تەنازول کر.. عوثمان و عەلی خۆ بێ دەنگ کر، کەسێ نەگۆت: من تەنازول بۆ یێ دی کر، عەبدررەحمانی گۆت: باشە هوین هەردو دێ ب گۆتنا من کەن ئەگەر ئەز ئێک ژ هەوە هلبژێرم و ئەز سۆزێ ددەم کو یێ باشتر ژ هەوە هلبژێرم؟

هەردویان گۆت: بەلێ.

عەبدررەحمانی هەردو برنە وێڤە و ئێک ئێکە گۆتێ: تو مرۆڤێ پێغەمبەریی و تو ژ وانی یێن بەری خەلکی هاتینە د ئیسلامێ دا، ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ ئەگەر من یێ دی هلبژارت تو گوهدارییا وی بکە و پێ رازی ببە.

هەردویان گۆت: بلا.

صەحابی ژی هەمی ب ڤێ گۆتنێ رازی بوون، سێ رۆژان عەبدررەحمان ما، ئێک ئێکە پسیارا موهاجری و ئەنصارییان کر، هەمییان عوثمان هلبژارت، لەو عەبدررەحمان هات و گۆتە عوثمانی: دەستێ خۆ بینە.. و موبایەعا وی کر.

د دویڤ وی دا صەحابییان هەمییان -بێی ئێک خۆ ڤەکێشت یان خۆ نەڕازی بکەت- موبایەعا عوثمانی کر.

ژ ڤێ سەرهاتییێ یا (بوخاری) د صەحیحا خۆ دا ڤەدگوهێزت بۆ مە ئاشکەرا دبت کو صەحابی هەمی ل وێ باوەرێ بوون کو پشتی ئەبووبەکری و عومەری عوثمان ژ هەمی صەحابییان چێترە، و ئەگەر ل نک وان عەلی چێتر با وان ئەو نەدهێلا و عوثمانی هلبژێرن. و د ریوایەتەکا دی دا بوخاری ژ ئبن عومەری ڤەدگوهێزت، دبێژت: پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مە کەس وەکی ئەبووبەکری نەدیت، و پشتی ئەبووبەکری عومەر، و پشتی عومەری عوثمان، و پشتی عوثمانی مە کەس ژ کەسێ باشتر نەددیت.



ب ڤی ڕەنگی عوثمان بۆ خیلافەتێ هاتە هلبژارتن، و وی ل ڕۆژا شەنبییێ دەهی هەیڤا موحەررەما سالا (٢٤)ێ مشەختی دەست ب کارێ خۆ وەک خەلیفە کر.. و ئێکەمین تشت عوثمانی کری پشتی موبایەعا وی هاتییەکرن، وی خەتبەک ل مزگەفتێ خواند تێدا بیرا خەلکی ل ڕاستییا ڤێ ژینێ ئینا و کو دنیا مالا کەسێ نینە، و کەس لێ نامینت ڤێجا بلا کەس کەیفا خۆ پێ نەئینت و خۆ پێ پشتڕاست نەکەت، هەر وەسا وی سۆز دا وان کو ئەو دێ ل سەر ڕێکا یێن بەری خۆ چت، و ژ وان خواست ئەو گوهدارییا وی بکەن د خێرێ دا و هاریکارییا وی بکەن ل سەر ب جهئینانا کیتابا خودێ و سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

پشتی سوحبەتا کوشتنا عومەری بەلاڤبووی و گەهشتییە کافران، پشتا وان ڕاست بوو و دلێ وان رحەت بوو؛ چونکی ترسا عومەری خەو ژ چاڤێن وان رەڤاندبوو، حەتا دەرەجەکێ ئێکێ وەکی رۆستەمێ فورسی دگۆت:

عومەری مێلاکا من سوٚت، ئەو د گەل صەیان دئاخڤت صە د ئاخفتنا وی دگەهن!

ئەو کافرێن ل دەور و بەرێـن دەولـەتا ئیسلامی دژیان گەلەک کەیف ب نەمانا عومەری هات و وان دلێ خوٚ برێ دەست درێژییان ل سەر دەولـەتا ئیسلامێ بکەن.

دەولـەتا روٚمـێ پـێ ل وێ صـولحێ دانـا یـا وان د گـەل موسـلمانان گـرێـدای، و ژ لایـێ مـصرێ و شامێ ڤە هێرش دانە سەر موسلمانان، و ل لایێ ڕوٚژهەلاتێ ژی هندەک مللەتان وەکی ئەرمەن و فورسێ و هندەک مللەتێن دی دەست ب دوژمنییا دەولەتا ئیسلامێ کر، و هزرا وان ئەو بوو ئەڤ خەلیفێ نوی هاتی وەکی یێ بەری خوٚ نابت، بەلێ هزرا وان خاڤ دەرکەفت؛ چونکی ئیمامێ عوثمان هەر ژ دەسپێکێ ب هێز بەرسڤا وان دا.

عوثمانی دەستویرییا موعاویەی دا کو ئەو ژ لایێ دەریایێ ڤە هێرشێ بکەتە سەر هێزێن دەولەتا روٚمێ.. ئینا موعاویەی -ئەوێ عومەری ل سەر دەمێ خوٚ کرییە والییێ شامێ- دەست ب ئاڤاکرنا ئسطوولەکێ ئیسلامی یێ ب هێز کر، ب وی ئسطوولی موعاویەی گەلەک دەڤەر ستاندن و گەف ل پایتەختا روٚمییان ب خوٚ کر، کو هنگی بـاژێرێ (قسطەنطینییێ) بوو، ئەوێ نوکە دبێژنێ: ستەنبوٚل. و ب ڤی مەوقفێ خوٚ یێ ب هێز نە ب تنێ عوثمان شیا هیڤییێن دەولەتا روٚمێ پویچ بکەت، بەلکی ئەو شیا سەهما دەولەتا ئیسلامێ هندی دی بکـەتـە د دلێ وان دا، کو پشتی هنگی خوٚ ل دەمێ موسلمان بێ هێز ژی بووین دەمێ شەڕێ ناڤخوٚیی د ناڤ وان دا پەیدابووی، روٚمانییـان د خـوٚ ڕا نـەدیت هێرشەکێ بکەنـە سـەر دەولـەتا ئیسلامێ.

ل لایێ ڕۆژهەلاتێ ژی ئیمامێ عوثمان دەستویری دا لەشکەرێ ئیسلامێ کو پێشڤە بچت، و وان کەسان ئەدەب دەت یێن دلێ خۆ برییە خیانەتا دەولەتا ئیسلامێ.

د چەند سالەکێن کێم دا عوثمان ب سیاسەتا خۆ و ب هێز و دژوارییا خۆ شیا توخیبێن دەولەتا ئیسلامی ژ چینێ حەتا ئەندەلوسێ و ژ لێڤێن قسطەنطینییێ حەتا توخیبێن حەبەشە بەرفرەه بکەت، و ترسا ئیسلامێ د دلێن کافران دا مەزنتر لێ بکەت.

ل ڤێری یا د جهێ خۆ دایە ئیشارەتێ بدەینە مەسەلەکێ ئەو ژی ئەڤەیە: هندەک دیرۆکڤان و نڤیسەران وەسا عوثمان یێ دایە نیاسین کو مرۆڤەکێ لاواز و بێ هێز بوو، و وی ب سستییا خۆ دەولەت هەرفاند. و ئەڤ مەوقفێ عوثمانی یێ مە نوکە بەحس ژێ کری بەسە کو درەوا ڤێ گۆتنێ بۆ مە ئاشکەرا بکەت.. عوثمان مرۆڤەکێ سست و خاڤ نەبوو، و ب لاوازی قەت تەعامول د گەل نەیارێن دەولەتا ئیسلامێ نەدکر، و دیرۆک شاهدەییێ بۆ عوثمانی ددەت کو ئەو مەوقفێ ب هێز یێ وی بەرانبەر دوژمنێن دەولەتێ ستاندی قەت یێ کێمتر نەبوویە ژ مەوقفێ عومەری، ژ بەر ڤێ چەندێ گەلەک کەسان ل هەر شەش سالێن ئێکێ یێن خیلافەتا عوثمانی عەصرێ وی ژ عەصرێ عومەری چێتر ددیت، بەلێ تشتێ تەرازی گوهارتی، ئەو بوو د لایێ سیاسەتا ناڤخۆیی دا عوثمانی سیاسەتەکا جودا ژ یا ئەبووبەکری و عومەری ب کارئینا، و ئەڤێ سیاسەتا هە مەسەلە گوهارت، و ل دەمەکێ دی ب بەرفرەهی دێ بەحسێ ڤێ سیاسەتێ کەین.

تشتێ دی یێ مەزن -ژ بلی بەرفرەهکرنا توخوبێن دەولەتێ- یێ کو عوثمانی ل دەمێ خیلافەتا خۆ کری (ئستنساخا) قورئانێ بوو: ئاشکەرایە کو هندی قورئانە ل درێژییا بیست و سێ سالان پارچە پارچە هاتبوو

خواریٚ، و هەر جارەکا پارچـەیـەکا نوی ژ قورئانیٚ دهاتە خواریٚ پێغەمبـەری -سلاڤ لیٚ بن- دهـنـارتە ب دویڤ هندەک صەحابییان ڕا؛ دا ویٚ پارچەییٚ ژ قورئانیٚ بنڤیسن.. و بەری پێغەمبەر -سلاڤ لیٚ بن- ژ دنیـاییٚ بـار کـەت قـورئـان هـەمـی یا نڤیسـیـبوو ل سەر گەلەک جهان، بـەلیٚ ئـەڤ نڤیسـینە د ئێک کتێبیٚ دا یا کۆمکری نەبوو.

ژ بلی نڤیسینیٚ گەلەک صەحابی ژی هەبوون قورئان هەمی ژ بەر بوو.

ل سەر دەمیٚ ئەبووبەکری دەمیٚ گەلەک صـەحابـی ژ وان یێن قورئـان ژ بەر د شەڕێن مورتەددان دا هاتینە کوشتن، عومەری داخواز ژ ئەبووبـەکری کـر ب کۆمکرنـا قورئـانیٚ ڕابیـت؛ دا ئـەو ژ بـەرزەبوونیٚ بێتـە پاراسـتن، ئەبووبەکر -پشتی ب گۆتنا عومـەری ڤانعبووی- بەریٚ خۆ دایـیٚ کـانیٚ کیژ صەحابی ژ هەمییان پتر ب نـڤـیـسـیـنـا قـورئـانیٚ رادبوو دەمـیٚ پێغەمبـەر -سلاڤ لیٚ بن- یـیٚ سـاخ، وی دیت (زەیـدیٚ کوڕیٚ ثابتی) ژ هـەمییان پتـر ب ڤـی کـاری رادبـوو، ئینـا وی هنارتـە ب دویـڤ ڕا، و هنـدەک صەحابییێن دی ژی دانە د گەل وی و ژ وان خواست ئـەو قورئـانیٚ هـەمییێ -ژ جهێن نڤیسی- د ئێک کتێبیٚ دا کۆم بکەن، ب وی ڕەنـگـی یـیٚ وان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لیٚ بن- گوه لیٚ بووی.

پشتی ئەو ب ڤی کاری ڕابووین و وان دانەیـەک ژ قورئانیٚ نڤیسی، ئـەو قورئـان مـا ل نـک ئەبووبـەکری.. و وەکـی دی صـەحابییان ل دویـڤ ژبـەرکرنا خـۆ، و هنـدەکان ژی ل دویـڤ دانـەییێن خـۆ یـێن نڤیسـی قورئـان دخواند و نیشا خەلکی ددا.

دەمیٚ ئەبووبـەکر مـری، ئـەو دانـەیا قورئـانیٚ ئـەوا ل نـک وی بـۆ مـالا عومەری هاتە ڤەگوهاستن و هندی عومـەر یـیٚ ساخ ئـەو ل نـک وی مـا. و گاڤا عومەر مری، ئەو ما ل نک کچا وی دایکا موسلمانان حەفصاییٚ.

ل دەمێ عوثمانی -وەکی مە گۆتی- تـوخیبێن دەولەتا ئیسلامێ هێشتا بەرفرەهتر لێ هاتن، و صەحابی پتر بەلاڤبوون، و ل هەر وەلاتەکێ ئەو دچوونێ و لێ ئاکنجی دبوون، وان قورئان نیشا خەلکی ددا و خەلکی بۆ خۆ هندەک دانە دنڤیسین، هەر ئێکی ل دویڤ زانینا خۆ، و ژ بەر کو چو دانەیێن رەسمی ل بەر دەستێ وان نەبوون، هندەک جاران گوهۆڕین د ناڤبەرا خەلکی دا پەیدا دبوون.

صەحابییێ پێغەمبەری (حوذەیفەیێ کوڕێ یەمانی) جارەکێ ل سەر دەمێ خیلافەتا عوثمانی بۆ جیهادێ دەرکەفتە وەلاتێ شامێ و عیراقێ، وی دیت بەربەرە خەلک د خواندنا قورئانێ دا یێ ب خیلاف دچن، و هەڤڕکی د ناڤبەرا وان دا یا پەیدا دبت، حوذەیفەی ب ڤێ چەندێ گەلەک نەخۆش بوو، و ترسیا ئوممەت د کیتابا خودێ دا ب جەدەل بچت.. لەو گاڤا ئەو زڤڕییە مەدینێ بەری بچتە مالا خۆ، وی قەستا خەلیفەی کر و گۆتێ: د هەوارا ئوممەتێ هەڕە بەری ئەو د کیتابا خودێ دا ب خیلاف بچن وەکی جوهی و فەلە د کیتابێن خۆ دا ب خیلاف چووین.

ئیمامێ عوثمان صەحابی هەمی کۆمکرن و دان و ستاندن د ڤێ مەسەلێ دا د گەل وان کر، و پاشی ئەو ل سەر هندێ پێکهاتن کو وێ دانەیا ل نک حەفصایێ بینن، ئەوا ل سەر دەمێ ئەبووبەکری هاتییە نڤیسین، و جارەکا دی تەکلیفا (زەیدی) بێتەکرن کو ئەو و هندەک صەحابییێن دی ڤێ دانەیێ د گەل وان دانەیێن صەحابییان هەین و ژ بەر، هەڤبەر بکەن، پاشی هندەک دانە ل بەر بێنە نڤیسین، و هەر دانەیەک ل وەلاتەکی ژ جیهانا ئیسلامی بێتە بەلاڤکرن؛ دا خەلکێ وی وەلاتی لێ بخوینن و بۆ خۆ ل بەر بنڤیسن و ب ڤێ چەندێ چو خیلاف نەمینت.

ئیمامێ عوثمان ب ڤی کارێ مەزن رابوو و ب ڤێ چەندێ (موصحەفێن عوثمانی) ل جیهانا ئیسلامی بەلاڤبوون و ب هزاران دانە ل بەر هاتنە نڤیسین.. و ئەگەر عوثمانی د ژینا خۆ هەمییێ دا چو کارێن دی ژ بلی ڤی کاری نەکربان ژی، ئەڤ کارە بەسی وی بوو کو ناڤێ وی ب زێری د دیرۆکا ئیسلامێ دا بێتە نڤیسین.

ب ڤی رەنگی دەم بۆری.. خۆشی و بەرفرەهی و عەدالەت د ناڤ ئوممەتێ دا بەلاڤبوو، و کانێ چاوا هەژاری و بەردەست تەنگی خرابییێ د ناڤ ئوممەتێ دا بەلاڤ دکەت گەلەک جاران بەرفرەهی و زەنگینی ژی سستی و خاڤییێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ دکەت و ئەنجامێ خاڤییێ خرابی پێڤە دئێت.

ل زەمانێ عوثمانی ئوممەت گەلەک بەرفرەهبوو، خێر و خێرات بەلاڤ و زێدەبوون، گەلەک کس و مللەت کۆمکۆمە هاتنە د ئیسلامێ دا و هاتنا وان یا ب لەز ئێکا هند پەیداکر کو ئەو ب دورستی نەئێنە گوهارتن.

ژ بەر ڤێ هەمییێ هزەبایێن گوهۆرینێ رابوون، و کوشتنا عومەری -یا کو گەلەک دەست د پشت را هەین- ڤەکرنەک بوو بۆ دەرگەهێ فتنێ د ناڤ ئوممەتێ دا، ئیمامێ عوثمان شیا نێزیکی شەش سالان ڤێ فتنێ پاش بێخت و ئوممەتێ ژێ بپارێزت، بەلێ پشتی هنگی سالێن تەنگاڤی و زەحمەتێ دەست پێ کرن، و گەلەک ئەگەر د پشت دەسپێکرنا وان را هەبوون، پترییا وان عوثمانی چو پەیوەندی پێڤە نەبوو، بەلێ یا عوثمانی پەیوەندی پێڤە هەی ب تنێ ئێک ئەگەر بوو.



هەر مرۆڤەکی هزر و بیرەکا تایبەت هەیە، و هەر مەزنەکی ژی سیاسەتەکا تایبەت هەیە، دەمێ (فتوحاتێن) ئیسلامی ل سەر دەمێ

ئەبووبەکری دەست پێ کرین، پاشی ل سەر دەمێ عومەری بەرفرەهبووین، بارا پتر ژ سەرکێشێن لەشکەرێ ئیسلامێ صەحابی بوون، و دەمێ خودێ کەرەم د گەل موسلمانان کری و گەلەک جهـ و وەلات ل بەر وان ڤەکرین و دەولەتا ئیسلامێ بەرفرەهبووی، موسلمان -ب تایبەتی صەحابی- ل گەلەک جهان بەلاڤبوون بۆ جیهادێ، و ئەو ل هندەک وەلاتان ئاکنجیبوون؛ دا ئیسلامێ نیشا خەلکێ وان وەلاتان بدەن.

ئەبووبەکری و پشتی وی عومەری ژی، گاڤا دیتی صەحابی بەلاڤبوون رابوون سیاسەتەکا دەسنیشانکری دانا و ئەڤ سیاسەتە ئەڤە بوو، گۆتن: چوونا صەحابییان بۆ ژ دەرڤەی مەدینێ -ب تایبەتی زانایێن وان یێن مەزن- دڤێت بۆ دەمەکێ دەسنیشانکری بت و ب دەستوریریا خەلیفەی بت، و هەر جارەکا خەلیفەی گۆتێ: بزڤرە، دڤێت ئەو بزڤرت.

هەر چەندە ئەبووبەکری ژی ئەڤ سیاسەتە ب کار ئینابوو بەلێ ئەو پتر ب ناڤێ عومەری هاتە نیاسین؛ چونکی دەمێ خیلافەتا وی درێژتر بوو.. ڤێ سیاسەتێ گەلەک بەرهەمێن باش بۆ دەولەتێ پێڤە هاتن، وەکی:

١- مەدینە (پایتەختا دەولەتێ) کرە سەنتەری گرانییێ یێ دەولەتێ؛ ژ بەر کو پتریا صەحابییێن مەزن ل وێرێ دئامادەبوون.

٢- ئامادەبوونا ڤان صەحابییان ل نک خەلیفەی بارێ وی سڤککر؛ چونکی هەر جارەکا ئەو هەوجەی فەتوایەکێ ببا دا صەحابییان کۆم کەت و رەئیا وان وەرگرت، و ب ڤێ چەندێ تشتێ خەلیفەی دکر بۆ صەحابییان هەمییان حسێب دبوو.

٣- کۆمبوونا صەحابییان ل مەدینێ دەولەت ژ پەیدابوونا گرۆپان پاراست؛ چونکی مانا صەحابییان ل هندەک باژێران دا بتە ئەگەرا کۆمبوونا خەلکی ل دۆر وان و پەیدابوونا هندەک عەصەبییاتێن جودا جودا.

دەمێ عوثمان بوویە خەلیفە کار ب ڤێ سیاسەتێ نەکر، رەئیا وی ئەو بوو هەر صەحابییەک یێ ب کەیفا خۆ بت، و وی ئەو حەق نەدا خۆ کو صەحابییان ل مەدینێ کۆم بکەت وەکی عومەری کری.

ئەڤ گوهۆڕینا د مەنهەجی دا، یا عوثمانی پەیدا کری سەقایەک دورستکر بۆ وان سەرهاتی و رویدانێن پشتی هنگی قەومین.. بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن ئەڤە ئەگەرا ئێکانە بوو، نە! بەرفرەهبوونا دەولەتێ، و هاتنا گەلەک مللەتێن جودا جودا د ئیسلامێ دا بێی ئیسلام وەسا ژێنا وان ب رێڤە ببەت وەکی ژێنا صەحابییان ب رێڤە دبر، پەیدابوونا هندەک عەصەبییاتێن هەرێمی، و کێمبوونا زوهدێ.. و گەلەک ئەگەرێن دی ژی د پشت دورستبوونا ڤی مەناخی ڕا هەبوون، ئەڤ مەناخێ هندەک سالێن ب زەحمەت ب سەر ئوممەتێ دا ئینایین ل وی دەمێ قەدەرا خودێ عوثمان بۆ مەزنیییێ هلبژارتی.

ژ بلی ڤێ ئەگەرەکا دی ژی یا مەزن د پشت وێ فتنێ ڕا هەبوو یا ل سەر دەمێ عوثمانی ڕابووی، یا پێتڤییە ئەم ل ڤێرێ ب کورتی ئیشارەتێ بدەینێ: جوهییەکێ یەمەنی هەبوو دگۆتنێ: عەبدللاهێ کوڕێ سەبەئی دوژمناتییا ئیسلامێ د گەل خوینا وی دگەڕیا، هاتە مەدینێ و ژ درەو خۆ ب ئیسلامێ ئینادەر؛ دا بشێت کارێ خۆ یێ پیس د ناڤ ڕێزێن موسلمانان دا بکەت، کا چاوا برایێ وی شاوولی بەری وی ب شەشسەد سالان خۆ ژ درەو کریوو فەلە و ناڤێ خۆ کریوو پۆلس و فەلاتی ژ ناڤ دا خرابکر. عەبدللاهی ڤیا ڤی دەوری دوبارە بکەت، لەو وی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤکر کو پێغەمبەر دێ زڤڕتەڤە و عەلی وەصییێ وییە، و عوثمانی یێ پێ ل حەقێ وی داناى.. و هندەک تشتێن دی ژی بەلاڤکرن، گاڤا صەحابی پێ حسیاین ب توندی بەرسنگێ ڤان گۆتنێن وی گرت، ئینا ئەو ژ مەدینێ

ڕەڤی و خۆ ژ جهەکی ڤەگوهاستە جهەکێ دی، چوو بەصرا، پاشی کووفە، پاشی شامی، پاشی مصری و ل وێرێ ما.. و هەر جهەکێ ئەو چووبایێ وی خۆ دگەهاندە ئەعرابییێن نەزان، و ب ئەزمانێ خۆ یێ حلی خەلک دگەهاندە خۆ، و دلێ وان ژ عوثمانی ڕەش دکر و بێبەختی ب دویڤ وی ڤەدنان؛ دا فتنە د ناڤ ئوممەتێ دا سەری هلدەت، و هەر کەسەکێ ب درەوێن وی قانع ببا و گەهشتبایێ ئەو دا بەرێ وی دەتە سێ ڕێکان، وی دگۆتە هەڤالێن خۆ:

- هوین خۆ ب هندێ بیننە دەر کو هوین یێن (الامر بالمعروف والنهی عن المنکر) دکەن؛ دا خەلک حەز ژ هەوە بکەن و بگەهنە هەوە.

- بەری هەر تشتەکی بەحسێ خرابی و خەلەتییێن مەزنێن خۆ بکەن؛ دا وان ل بەر خەلکی ڕەش بکەن.

- بێژنە خەلکی عەلی پتر یێ ژ هەژی خیلافەتێ بوو؛ چونکی ئەو وەصییێ پێغەمبەرییە و پسمامێ وییە.

ب ڤێ چەندێ تۆڤێ ئێکێ یێ (شیعاتییێ) ب دەستێ کەسەکێ هێڤێن جوهی د ناڤ ئوممەتێ دا هاتە چاندن بۆ هندێ دا دلێ خەلکی ژ صەحابییان ڕەش ببت.



پشتی مە ئیشارت دایە وان ئەگەران یێن فتنە هلکری، یا د جهێ خۆ دایە ئیشارەتێ بدەینە وان هێجەتان ژی یێن فتنەچییان بۆ خۆ گرتین دا عوثمانی پێ بێخن، چ هەڤالێن عەبدللاهێ کوڕێ سەبەئێ جوهی بن، یان یێن دی بن.. و دەمێ مرۆڤ وان هێجەتان دخوینت یێن ڤان فتنەچییان بۆ خۆ گرتین وەکی د کتێبێن دیرۆکێ دا هاتین، مرۆڤ دشێت وان هەمییان د چار خالان دا کۆم بکەت:

١- ل دۆر وان والییان یێن کو عوثمانی دانایبن.. گۆتن: وی هندەک صەحابی ئێخستن و هندەکێن دی یێن نە ژ هەژی ل جهێ وان دانان.

٢- ل دۆر مالێ دەولەتێ یێ گشتی.. گۆتن: وی هند رێ یا دایە مرۆڤێن خۆ ژ ئومەوییان کو تشتێ حەقێ وان نەبت ئەو بۆ خۆ ببەن.

٣- ل دۆر هەلویستێ وی ژ هندەک صەحابییان.. گۆتن: وی هندەک کارێن زۆردار و دژوار د گەل هندەک صەحابییێن خودان قەدر وەرگرتن.

٤- ل دۆر هندەک مەسەلێن دینی یێن کو وی ئجتهاد تێدا کر.. گۆتن: وی موخالەفا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبووبەکری و عومەری کرییە.

ئەڤە ئەو هێجەت بوون یێن فتنەچییان بۆ خۆ گرتین؛ دا دوژمناتییا خۆ بۆ عوثمانی پێ دورست بکەن، و هەر چەندە ئەڤ هێجەتە چو د جهێ خۆ دا نینن، و زانایێن موسلمان د کەڤن دا ئێک ئێکە یێن موناقەشە کرین، و ب دەلیل ئاشکەراکرییە کو ئیمامێ عوثمان یێ دورستبوویە، بەلێ حەتا ڤێ گاڤێ ژی هندەک نەزان وان هێجەتان ڤەدگێڕن و دوبارە دکەن؛ دا دیرۆکا ئیسلامێ پێ شێلی بکەن و بەریەرێ سپییێ هندەک صەحابییان بەقەم بکەن.

مە نە ل بەرە ل ڤێرێ ئێک ئێکە بەحسێ وان هێجەتێن بێخێر بکەین و بێخێرییا وان ئاشکەرا بکەین؛ چونکی ب وی رەنگی گۆتنا مە دێ گەلەک درێژ بت، بەلێ پێخەمەت دیارکرنا مەسەلێ ب کورتی دێ نە دورستییا ڤان هێجەتان بەرچاڤ کەین:

* **مسەلا ئێخستنا وی بۆ هندەک صەحابییان ژ والییاتییا هندەک جهان، و دانانا هندەکێن دی یێن نە ژ هەژی، و ب تایبەت ژ بنەمالا ئومەوییان، دێ بێژین:**

١- عوثمان خەلیفه بوو، و حەقێ خەلیفەیە وان والییان بدانت یێن وی باوەری پێ هەی کو دێ شێن ب ڤی کاری ڕابن و ب کێر دئێن.

٢- ئەو صەحابییێن وی ئێخستین ب جهێنانا داخوازا خەلکێ وان جهان بوو.. و دڤێت ژ بیر نەکەین کو عومەری ژی بەری وی هندەک صەحابی ژ والییاتییێ ئێخستبوون.

٣- ل سەر دەمێ عوثمانی هەژدە والی هەبوون، پێنج ژ وان ئومەوی بوون چار ژ وان ل ئێک دەمی والییاتی دکر: (سعید بن العاص) و (معاویه بن أبی سفیان) و (عبدالله بن سعد بن أبی السرح) و (عبدالله بن عامر)، و بەری مرنا عوثمانی وی (سعید بن العاص) ئێخستبوو، مەعنا سێ والی هەبوون و ئێک ژ وان کو (معاویه) بوو عومەری کربوو والی، مەعنا: ژ هەژدە والییان عوثمانی دو ئومەوی کربوونە والی و ئێک ژ وان هەردویان صەحابی بوو.

٤- بۆ زانین ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێغەمبەری ویلایەت دابوو پێنج ئومەوییان، مەعنا د ناڤ ئومەوییان دا گەلەک مرۆڤ هەبوون ب کێرا والییاتییێ دهاتن.. پشتی هنگی: دەمێ ئیمام عەلی بوویە خەلیفە وی پێنج کەس ژ بنەمالا خۆ، ژ هاشمییان کرنە والی، و کەسێ ئەڤ چەندە بۆ وی کێماسی نەدیتییە، ڤێجا بۆچی بۆ عوثمانی کێماسییە؟

*** ل دۆر مەسەلا کو وی مالێ دەولەتێ یێ ئێخستییە دەستێ ئومەوییان.. دێ بێژین:**

ئاشکەرایە کو کەسێ -خۆ دوژمنێن عوثمانی ژی- نەشیاینە بێژن: ئیمامێ عوثمان تشتەک ژ مالێ دەولەتێ بۆ خۆ یێ بری، و د ڤێ مەسەلێ دا بەرپەرێ عوثمانی ل نک هەڤال و دوژمنێن وی ژ بەفرێ سپیترە.

یا دی: تشتەکێ گەلەکێ بەرچاڤە کو عوثمان ب خۆ، هێشتا د جاهلیەتێ دا، مرۆڤەکێ زێدە زەنگین بوو، و چیرۆکێن مەردینییا وی د ئیسلامێ دا دناشکەرانە و هندەک ژ وان مە بەحس ژێ کر.. و عوثمان مرۆڤەکێ دلنەرم و ب رەحم بوو د گەل خەلکی هەمییێ و د گەل مرۆڤێن خۆ ب تایبەتی، و هێشتا بەری ئەو ببتە خەلیفە ژی وی گەلەک هاریکارییا مرۆڤێن خۆ دکر، و پشتی بوویە خەلیفە ژی، ڤێجا دەمێ فتنەچییان ڤیای بهایێ وی د چاڤێن نەزانان د کێم بکەن وان ژ درەو بەلاڤکر کو عوثمان ژ مالێ موسمانان ددەتە مرۆڤێن خۆ.. ئەرێ ئەگەر عوثمان پشتی بوویە خەلیفە ژ مالێ موسلمانان دابتە مرۆڤێن خۆ، پا بەری ئەو ببتە خەلیفە وی ژ مالێ کێ ددان وان؟ یان هوین بێژن وی ژ (بیت المال)ێ ددزی و عومەر پێ نەدحسیا؟!

*** ل دۆر هەلویستێ وی ژ هندەک صەحابییان وەکی (أبو ذر)ی و (عمار بن یاسر) و (عبدالله بن مسعود)ی.. دێ بێژین:**

تشتەکێ غەریب نینە خیلافەک د ناڤبەرا خەلیفەی و هندەک صەحابییان دا چێ ببت، و خەلیفەی هەلویستەکێ دژوار هەبت، و ئەبووبەکری و عومەری ب خۆ ژی ئەڤ چەندە ل نک هەبوو، ڤێجا بۆچی ئەڤ تشتە بۆ خەلکی چێ ببت و بۆ عوثمانی چێ نەبت؟

د گۆتنەکێ دا ژ عوثمانی دئێتە ڤەگوهاستن ئەو دبێژتە وی خەلکێ دژی وی ڕابووین: ((ئەز ب خودێ کەمە ئەو تشتێن هوین پێ ژ عومەری رازیبووین هەوە بۆ من کرنە عەیب؛ چونکی ئەوی پێ ل هەوە ددانا و ب دەستێ خۆ هوین دقوتان، و ب ئەزمانێ خۆ هوین پاشدا دبرن.. بەلێ من خۆ بۆ هەوە نەرمکر، و من چەنگێ خۆ بۆ هەوە چەماند، و دەستێ خۆ و ئەزمانێ خۆ ژ هەوە گرت، ڤێجا هوین وێریانە من)). یەعنی: مەسەلە

ئەو بوو یا ئیمامێ عەلی گۆتییە عومەری: ((لقد أتعبت من بعدك)) تە ئەوێ ل دویڤ خۆ وەستاند.

*** مەسەلا چارێ کو وی هندەک تشت کرن خەلیفەیێن بەری وی ئەو نەکربوون..**

ئەڤێ ئەم گەلەک ل دویڤ ناچین؛ چونکی ئەوێن ئەڤ هێجەتە بۆ خۆ گرتی دا فتنێ پێ د ناڤ خەلکی دا ڕاکەن هەمی ژ هندێ د کێمتربوون کو د مەسەلێن شریعەتی دا باخڤن، یان بگەهنە گۆزەکا عوثمانی بۆ علمی و زوهدێ و تەقوایێ.. پشتی هنگی ئەگەر خۆ ئەو ددورست ژی بن د ڤان گۆتنێن خۆ دا -و سەداسەد ئەو ددورست نەبوون- ئەرێ کیژک خرابترە: خەلیفە د هندەک (ئجتهاداتێن) خۆ دا خەلەت بت، یان مرۆڤ فتنێ د ناڤ خەلکی دا هلکەت و ژ بن ئەمرێ خەلیفەی دەرکەڤت و بەیعا خۆ بۆ وی بشکێنت و دووماهییێ وی بکوژت؟

* * *

پشتی بۆ مە دیاربووی کانێ ئەگەرێن ڕابوونا فتنەچییان دژی ئیمامێ عوثمان چ بوون، و ئەو هێجەتێن وان بۆ خۆ گرتین دا دوژمناتییا خۆ بۆ عوثمانی پێ دورست بکەن چ بوون، ئەم دێ نۆکە ژ لایێ دیرۆکی ڤە بەرێ خۆ دەینە سەرهاتییا دەرکەفتنا وان و کۆمبوونا وان ل مەدینێ:

پشتی بۆرینا شەش سالان د سەر خیلافەتا عوثمانی ڕا، یەعنی: ل سالا سیهێ مشەختی، نەرازیبوون ل سەر هندەک کارێن عوثمانی ژ هندەک لایان ڤە پەیدابوو، ژ بەر وان ئەگەرێن مە بەحس ژێ کری، و ڤان کەسێن هە، ئەوێن حەزکری فتنێ د ناڤ ئوممەتێ دا هلکەن بزاڤەکا مەزن کر؛ دا خەلکی دژی عوثمانی و والییێن وی ڕاکەن، و ژ بەر کو سەر و گرگرێن فتنێ کەس ژ وان ئەو نەبوو یێ ناڤێ خۆ هەی، و د ئیسلامێ دا

دەورەک دیتی، نە ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و نە ل سەر دەمێ ئەبووبەکری و عومەری، بەلکی هەمی ئەو بوون یێن باوەرییەکا تەقەلەق هەی، و زانینەکا مەزن ب شەریعەتی نەهەی، و دا خەلکێ نەزان و سادە گۆتنێن وان باوەر بکەن، ئەو ڕابوون هندەک کاغەز ل سەر ئەزمانێ هندەک صەحابییان (تەزویرکرن) و د ناڤ نەزان و خەلکێ دەشتێ دا ل کووفە و بەصرە و مصرێ بەلاڤکرن، ئەو جهێن عەبدللاهێ کوڕێ سەبەئی تۆڤێ فتنێ لێ چاندی، و وان د ڤان کاغەزان دا ل سەر ئەزمانێ هندەک صەحابییان داخواز ژ خەلکی کر کو دژی عوثمانی ڕابن و کاری بۆ ئێخستنا خەلیفەی بکەن.. و مخابن هندەک نەزان هەبوون باوەر ژ ڤێ چەندێ کر، و ژ بیرا وان چوو کو ئەگەر صەحابییان ڤیابا عوثمانی بێخن ئەو هند ل مەدینێ هەبوون کو وی بێخن و هەوجەیی نەزانێن مصرێ و عیراقێ نەبن.

ڕۆژ بۆ ڕۆژێ نیشانێن فتنێ ئاشکەرابوون، و هندەک فتنیەچییان خۆ گەهاندە عوثمانی ل مەدینێ و دان و ستاندن د گەل کرن، عوثمانی ب تازەیی بەرسڤا وان دا و هندەک داخوازێن وان -یێن دورست- بۆ ب جهـ ئینان، و هندەک والییێن وان، ل دویڤ داخوازا وان گوهاڕتن، بۆ هندێ دا فتنە بێتە ڤەمراندن و ئوممەت تووشی چو گرفتارییان نەبت. بەلێ ئەو دەستێن پیس یێن کو د پشت فتنێ ڕا ب ڤی ئەنجامی نەخۆش بوو، و لێ گەڕیان دوبارە خەلکی دژی عوثمانی ڕاکەن، و د بن لێڤلێڤکان ڕا گەف کرن کو هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ دا عوثمانی بێخن، یان ژی بکوژن ئەگەر وی گوهدارییا وان نەکر.

ئەڤ سوحبەتە گەهشتنە مەدینێ، عوثمان ڕابوو هنارتە ب دویڤ والییێن خۆ ڕا و هەمی ل مەدینێ کۆمکرن و ئەو پێکڤە -د گەل هندەک

صەحابییان ژی- ڕوینشتن؛ دا ل دۆر ڤێ مەسەلێ باخڤن.. پاشی هەمی ل سەر هندێ کۆمبوون کو والی ب حکمەت و عەقلداری سەرەدەرییێ د گەل سەر و گرگرێن فتنێ بکەن، و وان بژاڵە کەن، و بهنێرنە توخوبیێن دەولەتێ ب هێجەتا جهادێ؛ دا مژویل ببن و فتنەگێڕییێ ژبیر بکەن.. و هەر والییەک زڤڕی وەلاتێ خۆ.

والییێ شامێ موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانێ ئومەوی، ب شارەزاییا خۆ هەستکر کو دبت مەسەلە هۆسا ب ساناهی ب دووماهی نەئێت، لەو بەری بزڤڕت وی گۆتە عوثمانی: د گەل من وەرە شامێ ئەز دێ بەرەڤانییێ ژ تە کەم ئەگەر هندەک کەس دژی تە ڕابوون. عوثمانی گۆت: جیرانییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و وارێ مشەختییێ ئەز ب چو جهان ناگوهۆڕم.

موعاویەی گۆتێ: پا لەشکەرەکی ژ شامێ دێ بۆ تە هنێرم؛ دا زێرەڤانییێ ل تە بکەت. عوثمانی گۆت: ئەز قەبویل ناکەم لەشکەرێ تە بەر پێیێن خەلکێ مەدینێ تەنگ بکەت و ئەرزاقێ وان کێم بکەت.

موعاویەی گۆتێ: پا دێ ئێیە کوشتن! عوثمانی گۆت: (حسبي الله و نعم الوكيل).

ئەو چێبوو یا موعاویەی هزرکری.. ل هەیڤا شەووالا سالا (٣٥) مشەختی، هژمارەکا فتنەچییان ژ بەصرە و کووفە و مصرێ، کو هژمارا وان هزار و دوسەد مرۆڤ بوون ل دویڤ گۆتنەکێ، و ل دویڤ گۆتنەکا دی دو هزار بوون، و هندەک دبێژن: شەش هزار بوون. ب هێجەتا کرنا حەجێ دەرکەفتن و بەر ب حیجازێ ڤە چوون، و چوونا وان ل ئێک دەم و بۆ ئێک جهی نیشانا هندێیە کو تفاقەک د ناڤبەرا وان دا هەبوو. و بۆ زانینی سەرێ فتنێ یێ مەزن عەبدللاهێ کوڕێ سەبەئی د گەل فتنەچییێن مصرێ بوو.

گاڤا فتنەچی هەمی گەهشتینە ئێک، وان قەستا مەدینێ کر و ب رەخ باژێری ڤە دانا، و جاب هنارت کو ئەو یێن هاتین دا ئێک ژ دویان بکەن:

- یان عوثمانی بێخن و ل شوینا وی ئێکێ دی بدانن.

- یان ژی ئەو داخوازێن وان هەمییان ب جهـ بینت.

هندی فتنەچییێن مصرێ بوون هندەک هنارتنە نک ئیمام عەلی و گۆتنێ: مە دڤێت تو ل شوینا عوثمانی ببییە خەلیفە، ئیمام عەلی ل وان خورِی و گۆتە وان: هەچییێ باش بت دزانت ل سەر ئەزمانێ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- لەعنەت ل هەوە یێن هاتینەکرن، دەرکەڤن خودێ خێرێ نەدەتە هەوە.

فتنەچییێن کووفە چوونە نک زوبەیری و ئەو گۆتێ یا مصرییان گۆتییە عەلی، و وی ژی ئەو بەرسڤ دا وان یا عەلی دایە مصرییان، و فتنەچییێن بەصرا چوونە نک طەلحەی، و ئەوا ب سەرێ مصری و کووفییان هاتی ب سەرێ وان ژی هات، و هەر وەکی ئەڤە پیلانەک بوو فتنەچییان گێرِای دا ریزێن صەحابییان ژێکڤەکەن، بەلێ یا وان ڤیای چێ نەبوو، ئەو صەحابییێن ل مەدینێ هەمی بوونە ئێک ریز و ل دۆر ئیمامێ عوثمان کۆمبوون.

پشتی فتنەچییان زانی چو صەحابی خۆ نادەنە د گەل وان، رِابوون هندەک مرۆڤ ژ خۆ هلبژارتن و هنارتنە نک عوثمانی دا دان و ستاندنێ د گەل وی بکەن.. و ب ئامادەبوونا چەند صەحابییەکێن وەکی عەلی ئەو ل سەر پێنج شەرتان پێکهاتن.. پێنج داخواز وان هەبوون عوثمانی سۆز دا بۆ وان ئەو وان ب جهـ بینت، ب وی شەرتی ئەو بزڤرِنە وان جهێن ئەو ژێ هاتین.

فتنەچی ژ دو ڕەنگە مرۆڤان پێکهاتبوون: سەرێن فتنێ، و ئەڤان دزانی ئەو یێ چ دکەن، و ب فەند و فێل وان کارێ خۆ دکر، و عامی، و ئەڤە هاتبوونە خاپاندن ژ لایێ دەستەکا ئێکێ ڤە.

عامییێن فتنەچییان کەیف ب ڤێ ئێتفاقێ هات، و گۆتن: هەما مە ژی ئەڤە دڤیا، بەلێ سەرێن فتنێ ب ڤێ چەندێ نەخۆشبوو؛ چونکی ئەو نە بۆ ڤی تشتی هاتبوون، لەو وان پیلانەکا دی گێڕا:

ئەشتەرێ نەخعی و حەکیمێ کوڕێ جیبلەیی کو دو ژ سەرێن فتنێ بوون، خۆ ژ هەڤالێن خۆ ڤەقەتاندن و مانە ل مەدینێ.. کۆما فتنەچییان ژ دەرڤەی مەدینێ ڤەڕەڤین و بوونە دو پارچە: مصری ب لایێ ڕۆژئاڤایێ ڤە چوون، و عراقی ب لایێ ڕۆژهەلاتێ ڤە؛ دا بزڤڕنە جهێن ئەو ژێ هاتین، پشتی وێ ئێتفاقا د ناڤبەرا وان و عوثمانی دا هاتییەکرن.. پشتی وان شەش قوناغان دایە ڕێ، مصرییان دیت سویارەک هات د بەر وان ڕا بۆری، خۆ نێزیکی وان کر خەبەر گۆتنە وان و چوو، پشتی بێنەکا دی دیسا خۆ نێزیکی وان کر و خەبەر گۆتنێ، یەعنی: هەر وەکی وی دڤیا بێژتە وان: وەرن من بگرن تشتەکێ د گەل من!

گاڤا وان ئەڤ هەلویستە ژ وی دیتی ئەو چوونێ گرت و ئینا، و گۆتێ: تە چییە؟ و تو کییی؟ وی گۆت: ئەز قاصدێ (أمیر المؤمنین)یمە بۆ والییێ مصرێ. ئینا مصرییان ئەو گرت و سەحکرێ کاغەزەک ڤێ دیت تێدا هاتبوو کو عوثمان یێ دبێژتە والییێ مصرێ ئەگەر ئەڤ مرۆڤە زڤڕینە مصرێ هەمییان بگرە و بکوژە.

فتنەچی تێک هاتن و تێک چوون و گۆتن: ئەڤە عوثمانی خیانەت ل مە کر و ئێتفاقا مە د گەل وی نەما، دڤێت ئەم جارەکا دی بزڤڕینە مەدینێ و مەسەلێ صافی بکەین.. حەتا مصری گەهشتینە مەدینێ،

فتنەچییێن عراقی ژی گەهشتن و هەمی ل جهێ بەرێ کۆم بوونەڤە. گاڤا صەحابییان دیتی فتنەچی زڤڕینەڤە، هندەکان خۆ گەهاندە وان دا پسیارێ ژێ بکەن کانێ بۆچی ئەو زڤڕینە ڤە، مصرییان گۆتە عەلی: تە کاغەزا بۆ مە فرێکری دا بزڤڕین، عەلی بۆ وان سویند خوار کو وی های ژ چو کاغەزان نینە.. بەری مەسەلە د دەستێ سەرێن فتنێ دا روهن ببت و پیلانا وان بۆ هەڤالێن وان ئاشکەرا ببت، گۆتن: ئەڤە کاغەزا دوژمنێ خودێ عوثمانییە بۆ والییێ مصرێ دا ئەو مە بکوژت.

ئیمام عەلی گۆتە عراقییان: مصری ژ بەر ڤێ چەندێ زڤڕین و هەوە چییە بۆچی هوین زڤڕین؟ وان گۆت: ئەم ژی یێ د هەوارا وان هاتین. عەلی گۆتێ: و چاوا هوین ب وان حسیان و شەش قوناغ د ناڤبەرا هەوە دا هەبوون، هوین ل ڕۆژهەلاتێ بوون و ئەو ل ڕۆژئاڤایێ؟ ئەڤە پیلانەکە ل مەدینێ یا هاتییە گێڕان. یەعنی: بەری هوین ژ مەدینێ بچن هەوە ئەڤ شۆلە یێ دورستکری.

عوثمانی ژی وەکی عەلی سویند خوار کو وی چو کاغەز بۆ کەسێ نەنڤیسینە و ئەو ژ گۆتنا خۆ لێڤە نەبوویە، و دا ئالۆزییەکا دی بێتە د ناڤ مەسەلێ دا حەتا ئتتفاق نوی نەبتەڤە سەرێن فتنێ گۆتە عوثمانی: پا کاتبێ خۆ مەروانی بدەف مە دا ئەم وی بکوژین دیارە وی ئەڤ کاغەزە یا ب ناڤێ تە نڤیسی.. و وان ژ ئەحمەقییا خۆ نەگۆت: ئەگەر مەروانی پێش عوثمانی ڤە نڤیسی بت پا کێ پێش عەلی ڤە نڤیسییە؟

عوثمان ل بەر نەهات مەروانی تسلیمی وان بکەت.. ئینا فتنەچییان چو پێ نەما گۆت: پا ئەم نازڤڕین حەتا عوثمان ئعتزالێ نەکەت.

بەری ئەم بەردەوامییێ ب سەرهاتییا فتنەچییان د گەل عوثمانی بدەین، پسیارەکێ دێ کەین: ئەرێ ئەگەر عوثمانی، یان حەتا مەروانی

کاغەز بۆ والییێ مصرێ هنارتبا ما دا بێژتە قاصدی خۆ: د بەر فتنەچییێن مصرێ ڕا هەرە و خەبەران بێژە وان؛ دا ئەو ل تە بکەڤنە شکێ و کاغەزێ ژ تە بستینن؟ یان دا بێژنێ: د جهەکێ دی ڕا هەرە و خۆ نیشا وان نەدە و لەزێ بکە دا بەری وان بگەهییە مصرێ؟

مەسەلە یا ئاشکەرایە وەکی ئیمام عەلی گۆتی، بەلێ نە بۆ وان یێن عەقلێ خۆ داننە بن پێیێن خۆ!

فتنەچییان بڕیار دا حصارێ بداننە سەر عوثمانی و مالا وی، و وان نەهێلا عوثمان دەرکەفتە مزگەفتێ بۆ کرنا نڤێژێ ل بەرا خەلکی، و نەهێلا کەس ئاڤێ یان خوارنێ بۆ وی ببەت.

ل وی دەمی بارا پتر ژ صەحابییان ل مەدینێ نەبوون؛ چونکی عوثمانی -وەکی مە گۆتی- ڕێ ل بەر صەحابییان نەدگرت کو بۆ خۆ دەرکەڤن، ئەڤە ئێک.. یا دویێ: دەمێ ئەڤ فتنە چێبووی دەمێ حەجێ بوو و گەلەک صەحابی چووبوونە مەکەهێ، و گەلەک ژی ل سەر توخویبێن دەولەتێ بوون، بۆ کرنا جیهادێ.

نێزیکی حەفتسەد صەحابییان ژ وان یێن کو هنگی ل مەدینێ بوون خۆ دانە ئێک وەکی: عەلی و هەردو کوڕێن وی حەسەن و حوسەینی، و زوبەیری و زەیدێ کوڕێ ثابتی و ئەبوو هورەیرەی و عەبدللاهێ کوڕێ عومەری.. و گەلەکێن دی، هەمییان شیرێن خۆ هلگرتن و چوونە نک عوثمانی و گۆتنێ: ئەڤە ئەم د ئامادەینە کانێ تو چ بڕیارێ ددەی، عوثمانی گۆت: مەسەلا شەڕی و کوشتنێ قەت نابت؛ چونکی من نەڤێت ئەز ئێکەمین کەس بم پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئوممەتا وی لێک بێخم.. شیرێن خۆ بدانن و هەچییێ ب من بکەت و گوهدارییا ئەمرێ من بکەت بلا شەڕی نەکەت.

ئینا ئەڤ صەحابییە ڤەرەڤین، هندەکان گۆتە عوثمانی: ئەگەر تو دەرکەڤییە مەکەهێ باشترە، ئەو ل وێرێ حورمەتا مەکەهێ تێک نادەن.
عوثمانی گۆت: نە.. نەکو بێنە مەکەهێ و ئەز ببمە ئەگەرا شکاندنا حورمەتا باژێڕی.

د گەل کو ئەڤ صەحابییە ب ئەمرێ عوثمانی ڤەرەڤین ژی، بەلێ هندەک جحێلێن وان هەر مانە ل دۆر مالا عوثمانی بۆ بەرەڤانیکرنا ژ وی، وەکی: حسەن و حوسەینی و عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری و عەبدللاهێ کوڕێ عومەری.. حەتا دبێژن: جارەکێ عوثمان دەرکەفتە بەر دەری دیت حسەن و حوسەین یێن ل بەر دەری ڕاوەستاینە و شیرێن وان یێن د دەستان دا، عوثمانی گۆتە وان: هوین ل ڤێرێ چ دکەن؟

وان گۆت: بابێ مە ئەم یێن هنارتین دا زێرەڤانییێ ل تە بکەین..
ئینا عوثمانی گۆتێ: بزڤڕنە مالێن خۆ، سوباهی ئەز دێ چ بێژمە پێغەمبەری ئەگەر گۆتە من: تە کوڕێن من بۆ خۆ کربوونە حەرەس؟!

هەردو زڤڕینە مال، بەلێ بابێ وان جارەکا دی ئەو زڤڕاندن و گۆتێ: ل جهەکێ وەسا ڕاوەستن عوثمان هەوە نەبینت.

حصارێ دەست پێ کر، ئەو حصارا نێزیکی چل ڕۆژان ڤەکێشای..
ل دەمێ حصارێ فتنەچییان شعارێ خۆ یێ پیس هلدا: یان عەزلکرنا عوثمانی، یان ژی کوشتنا وی.

عوثمانی -د دل دا- ئێک ژ دویان بۆ خۆ هلبژارت، بەلێ د گەل هندێ ژی پسیارا خۆ ب صەحابییێن ئامادە ژی کر، هندەکان گۆتێ: یا باشتر ئەوە تو نەفسا خۆ ژ کوشتنێ بپارێزی.. بەلێ ئەڤ ڕێکە نە ئەو بوو یا عوثمانی هلبژارتی، ڕۆژەکێ عەبدللاهێ کوڕێ عومەری چوو نک ل مال -وەکی ئیمام ئەحمەد ژێ ڤەدگوهێزت- عوثمانی گۆتێ: تو چ دبێژی بۆ ڤێ گۆتنا وان،

دبێژن: خیلافەتێ بهێله و خۆ نەدە کوشتن. و گوهێ خۆ بدەنە بەرسڤا کورێ عومەری، ئەوێ ل سەر دەستێ بابێ خۆ عومەرێ کورێ خەططابی، و بەری وی ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فێری مەزنییا خۆ گۆریکرنێ بووی.. وی گۆتێ: ئەگەر تو خۆ عەزل بکەی، و گوهێ خۆ بدەیە وان، ما تو دێ د دنیایێ دا هەر و هەر مینی؟

وی گۆت: نە.

کورێ عومەری گۆتێ: و ئەگەر تە گوهێ خۆ نەدا وان ما ژ کوشتنا تە پێڤەتر ئەو دێ تشتەکێ دی کەن؟

وی گۆت: نە.

کورێ عومەری گۆتێ: و ما بەحەشت و جەهنەم ب دەستێ وانە؟

وی گۆت: نە.

کورێ عومەری گۆت: پا ئەز دبێژم ئەو کراسێ خودێ کرییە بەر تە، ژ بەر خۆ نەکە، دا بۆ خەلکێ نەبتە سوننەت چی گاڤا هندەکان خەلیفێ خۆ نەڤیا رابن بێژنێ: خۆ بێخە.

هەر ئەو گۆتن بوو یا بەری هنگی ب پتر ژ بیست سالان پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییە عوثمانی: ئەگەر رۆژەکێ خودێ جلکەک کرە بەر تە و منافق هاتنێ دا تو ژ بەر خۆ بکەی، تو وی ژ بەر خۆ نەکە..

و عوثمان ل بەر نەهات خۆ عەزل بکەت.

وە نەبت بێتە هزرکرن هندی عوثمان حەز ژ خەلیفاتی و مەزنییێ دکر لەو وی خۆ عەزل نەکر، نە.. هنگی ژیێ عوثمانی ژ حەشتێییێ بۆری بوو، و ئەڤە ژ دەمێ ئادەمی وەرە هاتییە زانین کو هەر مرۆڤەکێ گەهشتییە پیراتییێ هیڤی و طموحەکا وەسا ل نک نامینت کو مرنێ و کوشتنێ ل سەر تشتەکێ دی هلبژێرت، و هەمی نیشان و سەرهاتییێن دیرۆکا

عوثمانی هندێ دگەهینن کو ڕۆژەکا ب تنێ ژی ئەو یێ مەنصبپەرێس نەبوو، ئەگەر نە.. بۆچی وی ب لەشکەرێ موعاویەی مەنصبێ خۆ نەدپاراست؟ بۆچی حەفتسەد موهاجری و ئەنصاری -یێن کو پێغەمبەری ب وان بەرهنگارییا عەرەب و عەجەمێ کری- وی ڤەرەڤاندن و گۆت: من نەڤێت ئەز ئەو کەس بم یێ بۆ جارا ئێکێ خوینا ئوممەتێ درێژت.

ل نک عوثمانی خوینا وی بێتە ڕێتن چێترە ژ هندێ کو ئوممەت خوینا ئێک و دو برێژن، ئەگەر وی بڕیارا شەڕی دا، یان دەرگەهێ سوننەتەکا خراب د ناڤ ئوممەتێ دا ڤەکر، کو تەنازولێ بۆ فتنەچییان بکەت.

زەرەرا ژ هەمییان کێمتر -ب دیتنا عوثمانی- ئەوە: ئەو بێتە کوشتن دا ئوممەت پاراستی بمینت، ئەڤە ئنیەتا وی بوو.. ڤێجا بێژنە من: خۆ گۆریکرنەکا ژ ڤێ مەزنتر هەیە؟

بەلێ دڤێت عەجێبگرتی نەبین مادەم ئەڤ خۆگۆریکرنە ژ عوثمانی دەرکەفتییە، ئەو عوثمانێ هەر ژ ڕۆژا ئێکێ ژ موسلمانبوونا خۆ سەر و مالێ خۆ گۆری ئیسلامێ کری.

وەکی مە گۆرتی پتر ژ چل ڕۆژان فتنەچییان حصار دانا سەر عوثمانی.. و ل ڤی دەمی وان نەدهێلا عوثمان ژ مال دەرکەڤت و بچت نڤێژێ ل بەری خەلکی بکەت، و هەر ژ بەر ڤێ فتنێ ئەو وێ سالێ نەشیا بچتە حەجێ، و ئەو دەهـ سال بوو، هەر سال عوثمان دچوو حەجێ، وێ سالێ وی عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی پێش خۆڤە کرە ئەمیرێ حەجێ، و ل دەمێ حصارێ وی ئەبوو هورەیرە و ئیمام عەلی تەکلیفکربوون کو نڤێژێ ل بەرا خەلکی بکەن، و عەلی خوتبە دخواند. و دەمێ فتنەچییان زانی کو مسۆگەر عوثمان ل بەر یا وان نائێت، و عوثمانی نەڤێت کەس شەڕی بکەت و بەرەڤانییێ ژێ بکەت، و دەمێ حصارێ ژی درێژبوو، ئەو ژ ئێک

ژ دو تشتان ترسیان: کو خەلکێ مەدینێ بێنتەنگ ببن و دژی وان ڕابن. یان ژی لەشکەرەک ژ دەرڤەی مەدینێ بێت، و ب تایبەت ژ شامێ؛ دا بەرەڤانییێ ژ عوثمانی بکەت.

ئەڤا دویێ چێبوو، سوحبەت گەهشتە خەلکێ مەدینێ کو مەعاویەی لەشکەرەک یێ هنارتی دا بێتە مەدینێ بۆ بەرەڤانیکرنا ژ عوثمانی، لەو فتنەچی تەنگاڤبوون و ب تایبەتی سەرێن فتنێ و کار کر دا مەسەلێ ب دووماهی بینن.

ل سەری هژمارەکا فتنەچییان چەکێ خۆ هلگرت و قەستا مالا عوثمانی کر دا وی بکوژن بەلێ ئەو صەحابییێن حەرەسی ل خەلیفەی دگرت هاتنە بەراهییا وان و شەرەکێ سڤک د ناڤبەرا وان دا چێبوو، حەتا دبێژن: حەسەنێ کوڕێ عەلی د ڤی شەری دا بریندار بوو.

فتنەچییان زانی ئەو ب ڤێ ڕێکێ نەشێن بگەهنە عوثمانی، ڕابوون ڕێکا خۆ گوهارت، و ژ پشتا خانی ڤە هاتن، چەند مرۆڤەک ژ وان ب لەز هاتن و موحەممەدێ کوڕێ ئەبووبەکری ژی د گەل وان بوو. وان خۆ د سەر سیاجێ خانی ڕا هاڤێت، کوڕێ ئەبووبەکری گەهشتە عوثمانی ڕیهێن عوثمانی گرتن و گەف لێ کرن، عوثمانی ب رحەتی ڤە گۆتێ:

- برازا، ڕیهێن من بەردە، ئەز ب خودێ کەمە بابێ تە قەدرێ ڤان ڕیهان دگرت، و ئەگەر وی ئەڤرۆ تو دیتبای دا ئەو شەرمێ ژ ڤی کارێ تە کەت.

دبێژن: موحەممەدی شەرم ژ خۆ کر و پەشێمانبوو، دەرکەفتە حەوشێ، و ئەو کەسێن د گەل وی ب زۆر کەفتین هاژۆتنە ژ دەرڤە، و شیرێ خۆ هلگرت و گۆت: ئەز ناهێلم هوین بچنێ.

ل ڤێرێ هەڤالێن وی دینبوون، و وەکی گورگێن برسی هێرش دا مالێ و ب نک ئیمامێ عوثمان ڤە چوون. و بەری ئەو تاوانا خۆ یا مەزن و ڕویرەش بکەن، وەرن دا سەحکەینێ کانێ ئەو دو ڕۆژ بوو حالێ عوثمانی چ بوو؟

مە گۆت: پشتی فتنەچی ب ڕێڤە زڤڕین و هاتینە مەدینێ، و دوریشمێ خۆ ئاشکەراکری: عەزلا عوثمانی یان کوشتنا وی، و دەمێ وان دیتی عوثمان ب یا وان ناکەت، ڕابوون حصار دانا سەر و ڤێ حصارێ چل و ئێک ڕۆژا ڤەکێشا، سیهـ ڕۆژان وان ڕێ ددا عوثمانی کو بچتە نڤێژێ ل مزگەفتێ.

ل ڕۆژا سێ شەنبی حەفتی هەیڤا (ذو الحجه) وان بڕیار دا نەهێلن عوثمان دەرکەفتە مزگەفتێ، و نەهێلا کەس خوارنێ و ڤەخوارنێ بۆ وی ببەتە مال، حەتا دبێژن: دەیکا موسلمانان (أم حبيبة رملة بنت أبي سفيان)ی هندەک خوارن بۆ عوثمانی بر ئەو هاتنە بەراهییێ و ب ڕەنگەکێ کرێت ڕێ لێ گرت و زڤڕاندەڤە.

ڕۆژەکێ عوثمان دەرکەفتە بەر دەری و گۆتە فتنەچییان: (السلام عليكم)، کەسێ بەرسڤا وی نەدا، ئینا وی گۆتە وان: ئەز هەوە ب خودێ ددەمە سویندێ هەوە زانییە کو من (بيرا رومە) ب مالێ خۆ کڕیبوو و کربوو وەقف بۆ موسلمانان؟

وان گۆت: بەلێ.

عوثمانی گۆت: پا بۆچی هوین ئەڤرۆ ناهێلن ئەز ئاڤێ ژێ ڤەخۆم.

وان سەرێن خۆ شۆڕکرن!

عوثمانی گۆت: ئەز هەوە ب خودێ ددەمە سویندێ هەوە زانییە کو من فلان عەرد ب مالێ خۆ کڕی بوو و ل سەر مزگەفتێ زێدە کربوو؟

وان گۆت: بەلێ.

عوثمانی گۆت: پا بۆچی هوین ئەڤرۆ ناهێلن ئەز نڤێژێ لێ بکەم؟

دیسا وان سەرێن خۆ شۆڕکرن!

عوثمانی گۆت: ئەز هەوە ب خودێ ددەمە سویندێ هەوە زانییە رۆژەکێ ئەز د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبوبەکری و عومەری، ئەم ل سەر کەڤرەکی بووین ئەو کەڤر هژیا ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە کەڤری: راوەستە پێغەمبەرەک و صددیقەک و دو شەهید ل سەر تە هەنە؟

وان گۆت: بەلێ.

عوثمانی گۆت: (الله أكبر) وان ب خۆ شاهدەیی دا کو ئەز شەهیدم.

پاشی زڤڕی د ژۆرڤە.

گاڤا صەحابییان دەستویری ژ عوثمانی خواستی کو شەڕی بکەن و وی رێ نەدایە وان، هندەک عەبدێن عوثمانی هەبوون شیرێن خۆ ئینانەدەر دا شەڕی بکەن ئەگەر هات و هندەک فتنەچییان هێرش دا سەر خانی، ئینا عوثمانی گۆتە وان: هەچییێ شیرێ خۆ بزڤڕینتە د کاڤلانی دا، ئەو -بۆ کنارێ خودێ- یێ ئازایە.

ب ڤی رەنگی عوثمانی نەهێلا چپکەکا خوینێ ژ مرۆڤەکی برێژت پێخەمەت بەرەڤانییا ژ وی، و گاڤا هندەکان سەرا ڤێ چەندێ گازندە ژ وی کری، وی گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تشتەک یێ گۆتییە من و ئەز دێ صەبرێ ل سەر کێشم.

گاڤا فتنەچییان حصار ل سەر عوثمانی دژوارکری، و هندەک صەحابییێن کێم ل بەر دەرگەهێ مالا وی مایین؛ دا نەهێلن کەس ب زۆر بکەڤت، ئەو بوو فتنەچییان هێرشەک دا سەر خانی یێ عوثمانی ب وی

ڕەنگێ مە بەری نوکە بەحس ژێ کری، و گاڤا وان صەحابییان بەرگری کری و دەنگێ قەرەبالغا وان گەهشتییە ژۆر، عوثمان ل دەنگێ وان دەرکەفت و گۆت: گەلی مرۆڤان من نەکوژن، ئەز ب`خودێ کەمە ئەگەر هەوە ئەز کوشتم، پشتی من چو جاران هوین حەز ژ ئێک و دو ناکەن و چو جاران هوین هەمی پێکڤە نڤێژێ ناکەن.. شیرەتا عوثمانی یا دووماهییێ ل وان کری ئەڤە بوو، بەلێ ئەو ژ هندێ بۆری بوون کو گوهدارییا گۆتنەکا ڕاست بکەن.

ڕۆژا ئەڤ سەرهاتییە چێبووی ئەینی بوو، هەژدەی هەیڤا (ذو الحجە) ژ سالا (٣٥) مشەختی، وێ ڕۆژێ عوثمان یێ ب ڕۆژی بوو، و ئەگەرا ڕۆژیگرتنا عوثمانی -وەکی ئیمام ئەحمەد ڤەدگوهێزت- ئەو بوو: شەڤا بەری هنگی عوثمانی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د خەوا خۆ دا دیتبوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتێ: ئەی عوثمان فتارا تە سوباهی دێ ل نک مە بت.

هەر ژ بەر هندێ عوثمانی وێ ڕۆژێ بیست عەبدێن خۆ ئازاکرن و هندەک جلکێن زێدە کرنە بەر خۆ و یێ ب ڕۆژی بوو.

گاڤا عوثمانی بۆ جارا دووماهییێ شیرەت ل وان کری زڤری د مال ڤە، و داخواز ژ ژنکا خۆ نائیلایێ کر کو قورئانا وی بینت بدانتە بەر سنگی، و عوثمانی دەست ب خواندنا قورئانێ کر هەر وەکی مرۆڤەک ژ عالەما ئاخرەتێ هاتییە دنیایێ.

گاڤا فتنەچی بێ هیڤی بووین کو ئەو نشێن ژ دەرگەهیڤە بێنە ژۆر هندی حسەن و حوسەین و عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری و هەڤالێن وان ل بەر دەری بن، ئەو ڕابوون ڕێکا خۆ گوهارت، و ژ پشتا خانی ڤە هاتنێ.. ب وی ڕەنگێ مە ڤەگێڕای.

گاڤا عوثمانی زانی فتنەچی ب زۆر کەفتن وەکی خۆ ما، ئەو و قورئانا خۆ د گەل ئێک بوون، و ب پیراتییا خۆ یا خودان هەیبەت ڤە ئەو چاڤەرێیی دەعوەتا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-.

رۆژ ژ ئێڤاری وەرگەڕیابوو و دەمێ فتارێ نێزیک بووبوو، و فتارا وی ل نک پێغەمبەری بوو.

دوژمنەکێ خودێ ب زۆر کەفت و شیرێ وی د دەستان دا بوو، ئێکەمین درب وەشاندییە خەلیفێ (مەظلووم) ب دەستێ وی کەفت، بریندار کر، گۆتنا عوثمانی ئەڤە بوو: ب خودێ ئەو ئێکەمین دەست بوو وەحی پێ هاتییە نڤیسین.

دربێ دویێ ب جێنیکا عوثمانی یا چەپێ کەفت، و ب وێ ئیمامێ شەهید کەفتە د بەحەشتێ دا، د گەل هەڤالێن خۆ: پێغەمبەری و ئەبووبەکری و عومەری.

لەعنەتییێ خودانێ ڤێ دربێ مرۆڤەکێ مصری بوو دگۆتنێ (جبللەیێ کوڕێ ئەیهەمی.

چپکەک ژ خوینا عوثمانی کەفتە سەر بەرپەرێ قورئانێ، ل سەر ئایەتا (١٣٧)ێ ژ سوورەتا (البقرة): ﴿ فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ ﴾ هەر وەکی خودێ ب ڤێ چەندێ دڤیا مزگینییێ بدەتە وی کو ئەو دێ تۆلا وی ستینت و ئەو تێرا وی هەیە.

و وەسا چێبوو، دیرۆک دبێژت: هەر کەسەکێ پشکداری د کوشتنا عوثمانی دا کری ئەو ب مرنەکا عەدەتی نەمربوو، هەمی هاتنە کوشتن هەر ئێک ل جهەکی و ب کرێتترین ڕەنگ.

دبێژن: بەری عوثمان تمام ببت دوعایەک کر و گۆت: (اللهم اجمع أمة محمد) یا رەببی تو ئوممەتا موحەممەدی کۆم کەی و بکەیە ئێک.

و دا پتر بۆ هەوە ئاشکەرا ببت کانێ کەرب و کینا ڤان فتنەچییان ل سەر عوثمانی چەند بوو، دو نموونەیان دێ بۆ هەوە ڤەگێرم:

١- گاڤا عوثمان تمامبووی ژنکا وی سەرێ وی دانا سەر پییێ خۆ، وێ گاڤێ فتنەچییەکێ دی ب ژۆر کەفت و شیرێ وی د دەستان دا بوو، گۆت: ب خودێ ئەز هنگی رادوەستم حەتا دفنا وی دبرم، ژنکا عوثمانی دەستێ خۆ دا بەر شیرێ وی تبلەکا وێ قەت بوو، هنگی عەبدەکێ عوثمانی ب ژۆر کەفت و شیرەک ل وی مرۆڤی دا و کوشت.

٢- (محمد بن سیرین) دبێژت: جارەکێ مە طەواف دکر، من گوه ل زەلامەکی بوو دگۆت: یا رەببی تو گونەها من بۆ من بغەفرینە، و ئەز باوەر ناکەم تو بۆ من بغەفرینی. گۆت: ئەز ژێ عەجێبگرتی مام و من گۆتێ: ئەڤە چ گۆتنا غەریبە تو دبێژی؟ گۆت: وی گۆتە من: ئەز مرۆڤەک بووم من سویند خواربوو چی گاڤا عوثمان ب دەست من کەفت، ئەز شەقەکێ بدانمێ، رۆژا ئەو هاتییە کوشتن و تەرمێ وی هێشتا ل ژۆر خەلک دچوون نڤێژ ل سەر دکر، ئەز ژی چوومە ژۆر، گاڤا من دیتی کەس نەما د ژۆرڤە من شەقەک دانا عوثمانی و ئەو یێ مری، ئینا د گاڤێ دا دەستێ من هشک بوو. (ابن سیرین) دبێژت: من بەرێ خۆ دا دەستێ وی هێشتا یێ هشک بوو نەدلڤلڤی.

مەعنا: خۆ پشتی عوثمان مری ژی دلێ وی هوین نەبووبوو!



ل دەهێ هەیڤا موحەررەما سالا (٢٤)ێ عوثمان بووبوو خەلیفە، و ل هەژدەی هەیڤا (ذو الحجە) ژ سالا (٣٥) هاتە شەهیکرن، یەعنی:

دوازده سال کێم بیست و چوار ڕۆژان وی خەلیفاتی کربوو. و ڕۆژا ئەو شەهیدبووی ژیییێ وی حەشتێ و دو سال بوون.

وەکی مە گۆتی: بەری مەغرەبا ڕۆژا ئەینیییێ هەژدەی هەیڤا (ذو الحجە) ئەو هاتە شەهیدکرن و هەر وێ شەڤێ ئەو هاتە ڤەشارتن ژی، و ژ (الحسن البصری) یا هاتییە ڤەگوهاستن کو عوثمان ب جلکێن وی ڤە هاتبوو ڤەشارتن بێ شویشتن.. و (جبیر بن مطعم)ی د گەل سێ مرۆڤێن دی نڤێژ ل سەر کربوو، و ل بەقیعێ ل جهەکێ ڤەشارتی هاتە ڤەشارتن دا فتنەچی ڤێ نەکەڤن.

ئیمامێ عوثمان پتر ژ ژنەکێ ئینابوون، و وی شازدە عەیال هەبوون: نەهـ کوڕ و حەفت کچ.. ئێک ژ وان عەبدللاهـ بوو کوڕێ روقەییەیا کچا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-.

ئەڤە ئیمامێ شەهید عوثمانێ کوڕێ عەففانی بوو.. و سەرهاتییا وی د گەل مەردینییێ و خۆگۆریکرنێ.

سلاڤ ل عوثمانی بن هندی خودان باوەرەک هەبت موصحەفا عوثمانی بخوینت.

## خەلیفێ چارێ
## عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی

ڤێ جارێ قستا دیوانا شەهیدەکێ دی دێ کەین.. شەهیدێ بابێ شەهیدان: عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبێ هاشمی یێ قورەیشی.. شێرێ خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بابێ حسەنی، عەلی کوڕێ ئەبوو طالبێ مامێ پێغەمبەرییە، و ئەبوو طالب ناڤێ وی یێ دورست (عەبدمەناف) بوو، و ئەو کوڕێ عەبدلموطەلبێ کوڕێ هاشمییە.. و دەمێ مە بەحسێ حەمزەی کری ئەم چەندەکێ ل دۆر عەیالێ عەبدلموطەلبی ئاخفتبووین.

دەیکا وی فاطمایا کچا ئەسەدێ کوڕێ هاشمییە، یەعنی: دەیکا وی دۆتماما بابێ وی بوو، چونک ئەسەد و عەبدلموطەلب برایێن ئێک بوون.

بابێ وی ئەبوو طالب و عەبدللاهێ بابێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- برایێن ئێک یێن دەیبابی بوون، لەو دەمێ عەبدلموطەلب کەفتییە بەر مرنێ وی نەڤییێ خۆ یێ ئێتیم موحەممەدێ کوڕێ عەبدللاهی -سلاڤ لێ بن- ئەوێ ژییێ وی هنگی هەشت سال، ئێمانەتی کوڕێ خۆ ئەبوو طالبی کر، و ئەبوو طالبی حەتا ڕۆژا دووماهییێ ژ ژییێ خۆ ئێمانەتێ خۆ ب دورستی پاراست.

ل هەشت سالییێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مالا ئەبوو طالبی هاتە ڤەگوهاستن، و ل وێرێ هاتە ب خودانکرن.. ئەبوو طالبی و ژنکا وی فاطمایێ نەهێلا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب نەخۆشییا ئێتیمییێ بحەسییێت و هەمی جاران وان ژ عەیالێ خۆ پتر چاڤێ خۆ ددا وی. ژ بەر

ڤێ قەنجییا وان دەمێ پێغەمبەر مەزنبووی و بوویە خودان ژن و مال وی ڤیا قەنجییا مامێ خۆ ژ سەر خۆ ڕاکەت، لەو وی گۆتە هەردو مامێن خۆ حەمزە و عەبباسی: حالێ ئەبوو طالبی یێ نەخۆشە و عەیالەکێ بۆش وی یێ هەی ئەگەر هەر ئێک ژ مە کورەکێ وی ببەتە نک خۆ و هاری وی ب خودان بکەت. وان گۆت: تو ڕاست دبێژی[1].

ئەبوو طالبی چار کوڕ و دو کچ هەبوون: طالب و عەقیل و جەعفەر و عەلی، و فاختا ئەوا دگۆتنێ: (أم هانیء)، و جومانە.

گاڤا پێغەمبەرینی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی ژییێ عەلی ل دۆرێن دەهـ سالییێ بوو، و هەر ژ دەستپێکێ عەلی باوەری پێ ئینا، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێکەمین کەس موسلمانبووی ژ زارۆک و جحێلان.

بابێ عەلی (ئەبوو طالب) ل سەر کوفرێ مربوو، بەلێ دەیکا وی فاطما موسلمان بووبوو، و د گەل کوڕێ خۆ یێ بچویکتر عەلی مشەخت بووبوو مەدینێ و ل مالا وی بوو حەتا مری، و مرنا وێ بەری مرنا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-. و دبێژن: دەمێ ئەو مری پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کراسەکێ خۆ ل شوینا کفنی کرە بەر و نڤێژ ل سەر کر و د گەل چوو د قەبرێ وێ دا، و دوعا بۆ کرن و چاڤێن وی ڕۆندک دباراندن.. هندەکان گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مە نەدیتییە ئەوا تە بۆ ڤێ کری تە بۆ ئێکێ دی کریت؟

---

(١) ڤێ چەندێ ئبن ئسحاق ریوایەت دکەت، بەلێ زانایێن حەدیسێ دبێژن: چو ڕاستی بۆ وێ نینە، د گەل بەلاڤبوونا وێ د ناڤ نڤیسەرێن دیرۆکێ دا؛ چونکی ریوایەتا ئبن ئسحاقی یا (مورسەل و مودەللەسە)، یەعنی: ئەو ریوایەتەکا ضەعیفە! و ئەبوو طالبی شەش زارۆک ب تنێ هەبوون، و ئەو -وەکی ئاشکەرا- هند نەبوون کو بابێ وان نەشێت وان ب خودان بکەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەبوو طالب تێ نەبت کەس وەکی ڤێ بۆ من یێ باش نەبوو، من کراسێ خۆ کرە بەر وێ دا جلکێن بەحەشتێ ل بەر بێنەکرن، و ئەز چوومە د قەبرێ وێ دا؛ دا عەزابا قەبری ل سەر وێ بێتە سڤککرن.

عەلی ژ هەمی صەحابییان پتر یێ نێزیکی پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، بەلکی ئەو وەکی کورەکێ وی دئێتە هژمارتن، و حەتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری ژی ئەو د گەل وی دا بوو و چو جاران ژێ دویر نەکەفتبوو، و ڤێ چەندێ مفایەکێ مەزن گەهاندە عەلی و ئێکا هند ژێ چێ کر کو ئەو زانینێ و کاربنەجهییێ ژ سەرەکانییا وێ یا پاقژ و صافی وەرگرت، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بوو عەلی بۆ هەر سێ خەلیفێن بەری خۆ بووبوو وەزیر و موشیرەکێ ئەمین، و د پتر مەسەلان دا ئێک ژ وان رەئیەک وەرنەدگرت حەتا بۆچوونا عەلی زانیبا.

ل مەکەهێ عەلی یێ نێزیک بوو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و هەر چەندە ئەو ل دەستپێکا گازییا ئیسلامێ یێ بچویک بوو ژی -ل دۆرێن دەه سالییێ بوو- بەلێ وی قەت خۆ ژ پشتەڤانییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەددا پاش، و و تشتێ پێڤە هاتبا تێدا دودل نەدبوو.

ئەو نەخۆشییێن ل دەستپێکێ هاتینە سەرێ صەحابییان عەلی یێ ژێ پاراستی بوو؛ چونکی ئەو هنگی یێ بچویک بوو، و ل هەر سێزدە سالێن بەری مشەختێ ب تنێ ل جهەکی ناڤێ عەلی بلند دبت و بۆ مرۆڤی ئاشکەرا دبت کو عەلی ژ وی رەنگێ صەحابییان بوو یێن هەردەم د ئامادە کو خۆ گۆری ئیسلامێ و پێغەمبەرێ ئیسلامێ بکەن، و مەخسەدا مە پێ ل دەمێ مشەختێیە.

رۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای ژ مەکەهێ مشەخت ببت و بەر ب مەدینێ ڤە بچت و وی و ئەبووبەکری ئێتیفاقکری ب شەڤ ژ باژێرێ دەرکەڤن.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زانی کو کافرێن مەکەهێ دۆرێن خانییێ وی یێن گرتین و شیرێن خۆ یێن ڕاکرین دا وی پێ بکوژن.. ل وێ شەڤێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ پسمامێ خۆ عەلی خواست کو ئەو ل سەر جهێ وی بنڤت؛ دا وان کافرێن ل بەر دەرگەهی وە تێ بگەهینت کو ئەو هێشتا یێ ل سەر جهێ خۆ ڕازایە.. و ژ لایەکێ دی ڤە وی گۆتە عەلی: هندەک ئێمانەتێن خەلکێ مەکەهێ ل نک من هەنە، تو بمینە پشتی ئەز دەردکەڤم ئێمانەتێن وان بۆ وان ڤەگەڕینە، پاشی تو ژی وەرە مەدینێ بگەهە مە.

عەلیێ ب گۆتنا وی کر.. و ژ ڤێ چەندێ بۆ مە ئاشکەرا دبت، کو عەلی مرۆڤەکێ زێدە ب جەرگ و زیرەک بوو، و ترسێ ڕێکا خۆ بۆ دلێ وی نەددیت؛ چونکی ئەگەر عەلی پیچەکێ ب تنێ ژی ترسیابا ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەدنڤست دا بێژت: نەکو کافر ب خەلەتی ڤە من بکوژن.

پشتی عەلی داخوازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینای، و ئێمانەتێن خەلکی بۆ زڤڕاندین، وی ژی وەکی موسلمانێن دی قەستا مەدینێ کر و مشەختبوو، و هنگی ژییێ عەلی بیست و سێ سال بوون.

یا هاتییە ڤەگوهاستن کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشتی مشەختبوونێ (مؤاخاە) دانای و هەر دو صەحابی کرینە برایێن ئێک، وی خۆ و عەلی کرنە برایێن ئێک.

ل مەدینێ ژی عەلی گەلەک یێ نێزیکی پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و پشکداری د وان شەڕان دا دکر یێن پێغەمبەری د گەل کافران دکرن،

و گەلەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئالایێ لەشکەرێ موسلمانان دکرە د دەستێ عەلی دا.

دەمێ مە بەحسێ سەرهاتییێن ژینا پیغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری، مە ب بەرفرەهی بەحسێ سەرهاتییا شەرێ بەدرێ کر و مە دەورێ ئیمام عەلی ژی د ڤی شەری دا دیار کر لەو هەوجە ناکەت ل ڤێرێ دوبارە بکەین[1].

هەر وەسا دەمێ مە بەحسێ ژینا فاطمایێ ژی کری مە ئاشکەرا کربوو کو پشتی شەرێ بەدرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بریار دا کچا خۆ فاطمایێ بدەتە پسمامێ خۆ عەلییێ کورێ ئەبوو طالبی، و سەرهاتییا شویکرنا فاتمایێ و داوەنا وێ و عەلی ژی بەری نوکە مە ب درێژی ڤەگوهاستییە، لەو ئەم ل ڤێرێ دوبارە ناکەینەڤە.

د وان هەمی شەران دا یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ژینا خۆ دا کرین ئیمام عەلی پشکداری تێدا کربوو وەکی: بەدرێ و ئوحودێ و خەندەقێ و خەیبەرێ و فەتحا مەکەهێ و حودەیبییێ و هتد.. تەبووک تێ نەبت، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتییە غەزایێ گۆتە عەلی: تو ل شوینا من بمینە ل مەدینێ. و گاڤا عەلی گۆتییێ: دێ من هێلییە د گەل ژنک و بچویکان، وی گۆتێ: ما تە نەڤێت تو بۆ من وەکی هاروونی بی بۆ مووسای، بەلێ پشتی من چو پێغەمبەر نینن؟

ژ بەر ڤێ چەندێ عەلی ما ل مەدینێ و پشکداری د ڤێ غەزایێ دا نەکر. و ل رۆژا خەیبەرێ بهایێ عەلی و زیرەکییا وی بۆ هەمی صەحابییان ئاشکەرا بوو: گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی دۆر ل جوهییێن خەیبەرێ گرتی و دەمەکێ درێژ حصار مای، پێغەمبەری -سلاڤ

---

(١) بزڤنە کتێبا مە: ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ سلاڤ لێ بن.

لێ بن- چەند جارەکان لەشکەر هنارت دا خەیبەرێ ڤەکەن بەلێ هەر جار لەشکەر دەستڤالا دزڤری ژ بەر کو خەیبەر یا ئاسێ بوو.. شەڤەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: سوباهی ئەز دێ ئالای دەمە ف زەلامەکی، وی خودێ و پێغەمبەر دڤێن و خودێ و پێغەمبەری ئەو دڤێت، خودێ خەیبەرێ ل سەر دەستێ وی دێ ڤەکەت..

رۆژا د دویڤ دا پێغەمبەری هنارتە ب دویڤ عەلی ڕا و ئالا کرە د دەستان دا و خودێ خەیبەر ب دەستێ وی ڤەکر. هەڤالەکێ وی دبێژت: عەلی دەرگەهەکێ خەیبەرێ ژ جهـ ئینادەرێ و بلندکر و ئەم ب زۆرکەفتین، پشتی هنگی چار پێنج زەلامەک ژ مە هاتنێ دا وی دەرگەهی ڕاکەن نەشیانێ هندی یێ گران بوو.

ل شەڕێ حونەینێ ژی دەمێ بارا پتر ژ صەحابییان ژ مەیدانا شەڕی ڕەڤین و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هێلایە ل سنگێ شەڕی، ئیمام عەلی ئێک ژ وان صەحابییێن کێم بوو یێن ماینە ل مەیدانا شەڕی و نەڕەڤین.

ل سالا نەهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمان هنارتنە حەجێ و ئەبووبەکر کرە ئەمیرێ حەجێ، و هنگی کافر ژی دچوونە مەکەهێ بۆ کرنا حەجێ، ئینا ئایەتێن دەستپێکا سوورەتا (التوبە) هاتنە خوارێ و خودایێ مەزن تێدا ئاشکەرا کر کو ژ ئەڤ سالە پێڤەتر چێ نابت کافر بێنە کەعبێ و حەجێ بکەن.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عەلی هنارتە مەکەهێ دا ئەو ڤان ئایەتان پێش پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- بۆ خەلکی بخوینت.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری، عەلی ژ وان بوو یێن ب کارێ وی ڕابووین و شویشتین و کفنکری.

د دەر حەقا عەلی و قەدرێ وی دا گەلەک حەدیس ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن هاتینە ڤەگوهاستن، ئیمام ئەحمەد دبێژت: د دەر حەقا

قەدر و بهایێ چو صەحابییان دا هند حەدیس ب سەنەدێن دورست نەهاتینە ڤەگوهاستن هندی د دەر حەقا عەلی دا هاتینە ڤەگوهاستن.

گاڤا عومەر هاتییە برینداركرن، وی شەش صەحابی هلبژارتن و شاهدەیی بۆ وان دا كو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمێ مری ژ وان یێ رازی بوو، و عەلی ئێک ژ وان شەشان بوو، و ئاشكەرایە كو عەلی ئێک ژ وان دەهـ زەلامانە یێن مزگینییا ب بەحەشتێ بۆ هاتییەدان.

د عەقیدا مە سونتییان دا ئیمامێ عەلی پشتی ئەبووبەكر و عومەر و عوثمانی چێترینێ ئوممەتێیە، و ئەم ژ وان كەسان دبەرینە یێن كو ئەزمان درێژییان د دەرحەقا عەلی دا دكەن، هەر وەسا ژ وان كەسان ژی یێن كو زێدەگاڤییێ د دەرحەقا وی دا دكەن و وی ژ مەرتەبا وی بلندتر لێ دكەن.

ل سەر دەمێ هەر سێ خەلیفەیان: ئەبووبەكر و عومەر و عوثمانی، عەلی گەلەک یێ نێزیكی وان بوو، و پتر جاران وان رەئی و بۆچوونا عەلی وەردگرت و كار پێ دكر.. بەلێ ئەڤ چەندا هە پتر ل سەر دەمێ عوثمانی هاتە پێش، و مرۆڤ دشێت بێژت: پشكدارییا عەلی یا (مباشر) د سیاسەتێ دا ل سەر دەمێ خیلافەتا عوثمانی دەست پێ دكەت؛ چونكی ل دەمێ عوثمانی، عەلی زەلامێ دویێ بوو -پشتی عوثمانی- د دەولەتێ دا.

دەمێ مە بەحسێ سیرەتا عوثمانی كری چەندەكێ مە دەورێ عەلی ژی د وان سەرهاتی و رویدانان دا ئاشكراكر یێن بەری شەهیدبوونا عوثمانی قەومین. و ژ بەر كو ئەو سەرهاتییێن مەزن یێن ل سەر دەمێ خیلافەتا عەلی چێبووین هەمی ئەنجامێ سەرهاتییا رابوونا فتنەچییان بوو دژی عوثمانی.. و دا مەسەلە پتر ل بەر مە یا ئاشكەرا بت، ل ڤێرێ ئەم دێ پێڤەگرێدانەكێ د ناڤبەرا سەرهاتییێن دەمێ عوثمانی و عەلی دا دكەین:

سەرهاتییا ڕابوونا فتنەچییان دژی ئیمام عوثمانی هەر ژ دەستپێکێ و حەتا وان تاوانا خۆ یا مەزن ب کوشتنا ئیمامی ب دووماهی ئینا مە بەری نۆکە ب بەرفرەهی ڤەگێڕابوو.. ل ڤێرێ پتر دو مەسەلان دێ بەرچاف کەین:

یا ئێکێ: هەلویستێ وان صەحابییان ئەوێن ل مەدینێ ژ ڤێ مەسەلێ چ بوو؟ هەر چەندە مە گەلەک ئیشارەت پێ داینە ڤێ چەندێ ژی، بەلێ بۆ بیرئینان و پێکڤەگرێدانا بابەتی دێ دوبارە کەین.

یا دوێ: پشتی فتنەچی ب کوشتنا عوثمانی ڕابووین ئەو کیڤە چوون و وان چ کر؟

**مەسەلا ئێکێ:**

دەمێ فتنەچی ل مەدینێ داجڕیاین دا تاوانا خۆ ب جه بینن، هەلویستێ صەحابییان د دەر حەقا وان مەسەلان دا یێن فتنەچییان دژی عوثمانی هلێخستین ل سەر دو بۆچوونان یێ لێکڤەکری بوو، هندەکان دگۆت: بلا عوثمان پیچەکێ تەنازولێ بۆ وان بکەت دا فتنە مەزنتر لێ نەئێت، و ئیمام عەلی د گەل ڤێ بۆچوونێ بوو.

هندەکان دگۆت: دڤێت عوثمان چو تەنازولێ بۆ وان نەکەت؛ دا ڕێ بۆ وان و یێن وەکی وان خۆش نەبت کو چی گاڤا وان تشتەک ڤیا ڤان ڕەنگە فتنەیان بگێڕن، و عەبدللاهێ کوڕێ عومەری د گەل ڤێ بۆچوونێ بوو.

وەکی مە ڤەگێڕای ئیمام عوثمان ب خۆ د گەل بۆچوونا دوێ بوو، لەو وی چو تەنازول نەکر حەتا شەهیدبووی.

بەلێ دڤێت بێژین: ئەڤ جوداهییا د ڤی هەلویستی دا د ناڤبەرا صەحابییان دا کارەکێ وەسا د وان دا نەکربوو کو ئەو دژی عوثمانی ڕاوەستن، یان کەربێن خۆ ژێ ڤەکەن، یان پشتا فتنەچییان بگرن، و مە ڤەگێڕابوو کو دەمێ فتنە دژواربووی حەفتسەد صەحابییان ژ (موهاجر و

ئەنصارییان) شیرێن خۆ هلگرتن -و خودانێن هەر دو بۆچوونێن بۆری د گەل دا بوون- و چوونە نک عوثمانی، و دەستویری ژێ خواست کو ئەو بەرگرییێ بکەن و شەرێ فتنەچییان بکەن، بەلێ عوثمانی قەت رێ نەدا وان و گۆت: ئەز ئێکەمین کەس نابم پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەری د ناڤ ئوممەتا وی دا هل دئێخت، و گۆتە وان: ئەگەر هەوە باوەری ب ئیمامەتییا من هەیە شیرێن خۆ بدانن و هەر ئێک بلا بچتە مالا خۆ. ئینا ئەو ڤەرەڤین، بەلێ د گەل هندێ هندەک صەحابی بۆ زێرەڤانی مانە ل بەر دەرگەهێ مالا عوثمانی، و ژ وانان -وەکی مە بەری نوکە ڤەگێرای-: حەسەن و حوسەین بوون، و عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، و موحەممەدێ کورێ طەلحەی، بابێن وان ئەو هنارتبوون، و عەبدللاهێ کورێ عومەری، و ئەبوو هورەیرە، و هژمارەکا دی.. ئەڤان حەتا عوثمان هاتییە کوشتن ژی شیرێن وان د دەستی دا بوون و ل بەر دەرێ مالا وی بوون، و هندەک ژ وان بریندار ژی بووبوون.

گاڤا هندەک فتنەچی هاتینە نک عەلی و زوبەیر و طەلحەی و ژێ خواستی موبایەعا ئێک ژ وان بکەن دا ل شوینا عوثمانی ببتە خەلیفە، هەر ئێک ژ وان ژ لایێ خۆ ڤە ب کرێتترین رەنگ ئەو زڤراندن و تەئکید ل سەر ئیمامەتییا عوثمانی کر.

رۆژا عوثمان تێدا شەهیدبووی و سوحبەت گەهشتییە عەلی، ئەو وەکی مرۆڤەکێ دین ب نک مالا عوثمانی ڤە هات، و ب ناڤ وان صەحابییان کەفت یێن حەرەسی ل مالا عوثمانی دکر، و ب کولم و مستان چوو وان و گۆتێ: پا بۆچی مە هوین دانا بوونە ڤێرێ؟

وێ رۆژێ دەنگێ گرییێ -گرییا ل سەر عوثمانی- ژ مالا عەلی هاتە گوهـ لێ بوون.. و ئێک صەحابی ب تنێ ژی نە ل مەدینێ و نە ژ دەرڤەی

مەدینێ نەبوو کەیف ب کوشتنا عوثمانی هاتی، یان گۆتی: باش بوو ئەو نەمای!! خۆ ئەو صەحابییێن هندەک خیلاف د گەل عوثمانی هەی ژی تێکچوون، و کرنە گری، و گۆتن: خۆزی بەری بیست سالان ئەم مربایین و مە کوشتنا عوثمانی نەدیتبا.

**مەسەلا دویێ:**

فتنەچی -وەکی مە گۆتی- ژ دو ڕەنگە مرۆڤان پێک هاتبوون: سەر و گرگرە: و ئەڤە ددلڕەش و حاقد بوون ل سەر ئیسلامێ و صەحابییان، و وان ب نەخشە کارێ خۆ دکر. و مرۆڤێن عامی: و ئەڤە ئەو کەسێن خاپاندی بوون و هندەک ژ وان -ل نک خۆ- ددل صافی بوون، و وان هزر دکر نەمانا عوثمانی بۆ ئوممەتێ چێترە، دا (سلبیاتێن) وی -یێن وان هزر دکر سلبیاتن- نەمینن، ڤێجا گاڤا عوثمان نەمای ئەڤ ڕەنگێ دویێ ژ فتنەچییان زڤڕینە جهێن خۆ و بێ دەنگ بوون، و ڕەنگێ ئێکێ ژ فتنەچییان -کو ب تبلێن دەستان دهاتنە هژمارتن- مانە د مەیدانێ دا، و ناڤێن وان ل سەر هەمی ئەزمانان گەریان و (مەصیرێ) وان بوو ئەگەرا پەیدابوونا هندەک فتنە و شەڕ و لێککەفتنێن مەزن د ناڤ ئوممەتێ دا، وەکی دێ بەحس ژێ کەین.



پشتی ئیمام عوثمان ب دەستێن فتنەچییان هاتییە شەهیدکرن، ئەو صەحابی یێن ل مەدینێ هەمی ل دۆر ئیمام عەلی کۆمبوون و موبایەعا وی کر، و ئاشکەرایە کو عوثمانی بەری مرنا خۆ وەصیەت بۆ کەسێ نەکربوو کو پشتی وی ببتە خەلیفە، لەو صەحابی ب ئجتهادا خۆ ل سەر وێ بۆچوونێ کۆمبوون کو عەلی ببتە خەلیفە؛ چونکی کەسەکێ ژ وی باشتر د ناڤ وان دا نەبوو.

ئیمام ئەحمەد ڤەدگوهێزت، دبێژت: ڕۆژا عوثمان تێدا هاتییە کوشتن، عەلی زڤڕی مالا خۆ و دەرگەهێ خۆ گرت، خەلک هاتە نک ل مالا وی و گۆتنێ: ئەڤ مرۆڤە هاتە کوشتن و دڤێت خەلکی خەلیفەیەک هەبت و ئەم نابینین کەس ژ تە چێتر بت بۆ ڤی کاری. ئینا عەلی گۆتە وان: وە نەبێژن، ئەز وەزیر بم بۆ هەوە چێترە ژ هندێ کو ئەز ئەمیر بم. وان گۆت: نە ب خودێ، کەسەکێ ژ تە باشتر نابت بۆ ڤی کاری. عەلی گۆت: ئەگەر وە بت ئەز قەبویل ناکەم موبایەعا من ڤەشارتی بێتەکرن، ئەز دێ دەرکەڤمە مزگەفتێ و هەچییێ ڤیا بلا موبایەعا من بکەت.

عەلی دەرکەفتە مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ل ڕۆژا ئەینییێ (٢٥) هەیڤا (ذو الحجە) ژ سالا (٣٥)مشەختی -پشتی شەهیدبوونا عوثمانی ب حەفتییەکێ- موهاجر و ئەنصاریان موبایەعا ئیمام عەلی کر، و ب ڤێ چەندێ عەلی دئێتە هژمارتن خەلیفەیێ راشدی یێ چارێ و ئێکەمین زەلامێ هاشمی یێ بوویە خەلیفە.

کتەکا کێم ژ صەحابییان -ل دەسپێکێ- خۆ ژ موبایەعا وی دا پاش وەکی: سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی و عەبدللاهێ کوڕێ عومەری، بەلێ وان ب خۆ ژی پشتی هنگی ئعتراف ب خلافەتا وی کر. و طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدللاهی و زوبەیرێ کوڕێ عەووامی ژ وان صەحابییان بوون یێن موبایەعا عەلی کری.

گاڤا عەلی بوویە خەلیفە سەرێن فتنێ، کو پتر ژ وان خەلکێ کووفە و بەصرا بوون، چوونە د ناڤ لەشکەرێ موسلمانان دا یێ کو ئیمام عەلی سەرکێشییا وی دکر، و بارا پتر ژ صەحابییان وەسا هزرکر کو ئێکەمین کار یێ عەلی پێ رابیت دێ کوشتنا وان سەرێن فتنێ بت یێن کو ب کوشتنا عوثمانی ڕابووین، وەک (قصاص) و تۆلستاندن، بەلێ گاڤا وان دیتی

عەلی ئەڤ چەندە نەکر، ئەو تێکچوون و نەرازیبوونا خۆ ل سەر ڤی کارێ عەلی دیارکر، و هندەک ژ وان ڕابوون و گۆتن: ئەگەر عەلی تۆلێ نەستینت ئەم دێ ستینین.

مسۆگەر پسیارا ل ڤێرێ دئێتەکرن دێ ئەڤە بت: ئەرێ بۆچی عەلی ئەو نەکوشتن؟

د بەسڤێ دا دێ بێژین: عەلی -خودێ ژێ رازی بت- خەلیفە بوو، ئیمامێ موجتەهد بوو، ڕەئیا وی ئەو بوو تەئجیلکرنا ب کارئینانا حەددی پتر مەصلەحەت یا تێدا؛ چونکی فتنەچییان هێزەکا مەزن د پشت ڕا هەبوو، و مەسەلە نە چەند مرۆڤەک بوون کو عەلی وان بکوژت یان نەکوژت، و عەلی دەلیلێ خۆ ل سەر ڤێ چەندێ هەبوو، گاڤا (حادثە الافک) چێبووی -ل سەر دەمێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- و بۆ خەلکێ ئاشکەرابووی کو (عبد الله بن أبی بن سلول) سەرەکانییا ڤێ بێ بەختییێیە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- (عبد الله) جەلدە نەدا، یەعنی (حەددێ قەذفێ) ل سەر ب کارنەئینا دەمێ دیتی فتنە دێ مەزن بت و (ئەوس و خەزرەجی) سەرا ڤێ چەندێ دێ بەربنە سەر و چاڤێن ئێک.

هەر ژ بەر ڤێ مەصلەحەتا مەزن عەلی (حەددێ قەتلێ) ل سەر وان فتنەچییان ب کار نەئینا، گۆت: دا مەسەلە پتر ژ دەستێن مە دەرنەکەڤت. بەلێ (ئجتهادا) هندەک صەحابییێن دی یا ب ڤی ڕەنگی نەبوو، وان گۆت: مرۆڤێن عوثمانی خودانێن خوینێنە و وان حەق هەیە داخوازا حەقێ خۆ بکەن.. و وەکی ئاشکەرا خیلاف د ناڤبەرا عەلی و وان صەحابییێن دی دا خیلافەکا فقهی بوو نە کو یا سیاسی یان عەقائدی بوو، یەعنی: وان نەدگۆت: عەلی ب کێر خیلافەتێ نائێت، یان بلا ئەو خۆ عەزل بکەت، یان ئەو شریکێ فتنەچییانە. حاشای صەحابییان کو ڤێ ڕەئییێ د دەرحەقا

عەلی دا بێژن. ئەڤە ب نسبەت عەلی و خیلافا وی د گەل (طەلحە) و (زوبەیری) و هەڤالێن وان.

ب نسبەت خیلافا وی د گەل موعاویەی و وان صەحابییێن ل شامێ، هەر چەندە ئەو ژی خیلافەکا فقهی بوو بەلێ ئەو چەندەکێ یا جودابوو.

ئێک ژ وان هێجەتێن فتنەچییان ل سەر عوثمانی گرتین -وەکی مە گۆتی- ئەو بوو وان دگۆت: عوثمانی مرۆڤێن خۆ یێن کرینە والی، لەو عەلی ڤیا مەسەلا والییان حسم بکەت دا ئەڤ گازندە ئێدی نەئێتەکرن.

گاڤا صەحابییان ل مەدینێ موبایەعا عەلی کری، خەلکێ دی ژی ل وەلاتێن دی یێن موسلمانان موبایەعا وی کر، خەلکێ شامێ تێ نەبت، گاڤا عەلی داخواز ژ موعاویەی کری ئەو د گەل خەلکێ ویلایەتا خۆ موبایەعا وی بکەن، موعاویەی صەحابی و ماقویلێن شامێ کۆمکرن و رەئیا وان وەرگرت، وان گۆت: بلا عەلی کوژەکێن عوثمانی بکوژت ئەم دێ موبایەعا وی کەین.

عەلی ئەو نەکوشتن، خەلکێ شامێ موبایەعا وی نەکر!

عەلی هزرکر ئەگەر ئەو موعاویەی بێخت مەسەلە دێ چارەسەر بت، ئینا وی سەهلێ کوڕێ حەنیفی کرە والییێ شامێ ل شوینا موعاویەی، بەلێ خەلکێ شامێ هاتنە بەراهییێ و گۆتنێ: بزڤرە نک وی یێ تو هنارتی. عەلی دیت مەسەلە ئالۆزبوو، ئینا بڕیار دا بچتە باژێڕێ کووفە دا نێزیکی شامی ببت، و مەسەلێ د گەل وان ب دوومــاهی بینت، ئەڤ دەرکەفتنە ب دلێ گەلەک صەحابییان نەبوو، و حەسەنێ کوڕێ عەلی ب خۆ ژی ئێک ژ وان بوو، بەلێ عەلی ب یا وان نەکر و ل دەسپێکا مەها (ربیع الاول)ێ ژ سالا (٣٦) مشەختی وی خۆ ژ مەدینێ ڤەگوهاستە کووفە.



ب دەرکەفتنا عەلی بۆ عیراقێ کەیفا فتنەچییان ئەوێن عوثمان کوشتی گەلەک هات؛ چونکی ئەو ل وێرێ چوونە د ناڤ مرۆڤێن خۆ دا و پتر ب هێزکەفتن. و بەری عەلی بگەهتە کووفە جاب گەهشتێ کو (طەلحە) و (زوبەیر) ب لەشکەرەکی ڤە یێن هاتینە بەصرا ب ئنیەتا وەرگرتنا تۆلا عوثمانی، ئینا عەلی رێکا خۆ ڤەگوهاست و قەستا بەصرا کر دا بزانت کانێ مەسەلا ڤی لەشکەری چییە؟

بەری ئەم بەردەوامییێ بدەینە ڤەگێرینا ڤێ سەرهاتییێ چەند خالەک هەنە دڤێت بەرچاڤ بکەین:

١- طەلحە و زوبەیر و لەشکەرێ وان بەیعە دابوو عەلی، و وان ئعتراف ب خیلافەتا وی ژی دکر، و بەیعا خۆ ژی وان د گەل وی نەشکاندبوو.

٢- ئەو بۆ شەرێ عەلی دەرنەکەفتبوون، و هەما هەر نەهاتبوو سەر هزرا وان ژی کو ئەو و عەلی دێ کەڤنە بەرانبەر ئێک.

٣- عەلی و طەلحە و زوبەیر هەر سێ ژ وان دەهـ صەحابییانە یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینییا بەحشتێ دایێ.

٤- ئەو هەر سێ موجتەهد بوون و زانایێ موجتەهد -ب شاهدەییا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- ئەگەر خۆ یێ خەلەت ژی بت دێ یێ خودان خێر بت.

هەر چاوا بت ل مەکەهێ هژمارەکا صەحابییان گەهشتنە ئێک و گۆتن: ئەم دێ دەرکەڤینە بەصرا؛ دا خەلکێ وێ ل خرابییا قاتلێن عوثمانی هشیار بکەین و دا ئەو هەمی بینە ئێک رەئی دژی وان، و داخوازا تۆلستاندنا کوشتنا عوثمانی بکەن، و خودانێن ڤێ هزرێ یێن مەزن طەلحە و زوبەیر بوون، و وان گۆتە دەیکا موسلمانان عائیشایێ: ئەگەر تو د گەل

مـه دەرکـەڤی دێ خـودان خێـر بـی؛ چـونکی دەمـێ موسـلمان دزانـن تـو ژی خودانا ڤێ گۆتنێ یی ئەو دێ گوهدارییا تە کەن.. عائیشایێ گوهدارییا وان کر و ئەو ژی دەرکەفت.

گاڤا لەشکەر نێزیکی بەصرا بووی، والییـێ بەصرا یێ عـەلی دانـای عوثمانێ کوڕێ حەنیفی لەشکەرەکێ حەفتسـەد نەفـەری ب سەرکێشییا ئبن جبللەی -کو ئێک ژ سەرێن فتنێ بـوو دژی عوثمـانی- هنارتـە بـەراهییا وان دا بزانت کانێ ئەو هاتینە چ؟

ئـبن جبللـەی بـۆ شـاراندنا ئـاگرێ فتنـێ دەسـت دا شـەرێ طـەلحـە و زوبەیری بێی دان و ستاندنێ د گەل وان بکەت، و پسیارێ ژێ بکەت کانێ ئەو هاتینە چ؟ لەشکەرێ ئبن جبللەی شکەست و هندەک دبێژن: ئەو ب خۆ ژی هاتە کوشتن.

والییـێ بەصـرا هزرکـر طـەلحـە و زوبـەیر یـێن هاتینـە شـەڕی، ئینـا کاغەزەک بـۆ ئیمـام عـەلی هنـارت و سوحبەت بـۆ ڤـەگێڕا، عـەلی ڕێکـا خـۆ گوهاڕت و شوینا بچتە کووفە هاتە بەصرا.. دەهـ هزار مـرۆڤ د گـەل عـەلی بوون، لەشکەرێ طـەلحە و زوبیری ژی نێزیکی پێنج هزار کەسان بوو، گاڤـا ئیمام عەلی نێزیکی وان بووی (المقداد بن الأسود) و (القعقاع بن عمرو) -و ئەو هەردو صـەحابینە- هنارتـە نـک طـەلحـە و زوبـەیری دا پسـیارێ ژێ بکەن کانێ وان چ ل بەرە؟

پشتی هەردو لایان ڕەئییا ئێک و دو زانـی ل سـەر هندێ پێـک هـاتن کو شەڕ نەئێتـەکرن و هـەمی پێکڤـە هـاری ئێـک بکـەن بـۆ ئارمانجـا خـۆ یـا هەڤپشـک کـو کۆمکرنـا موسـلمانانە و تۆلسـتاندنا ژ فتنەچییانـە. گاڤـا فتنەچییان ب ڤێ صولحێ زانی ئـەو تێکچـوون و ل نـک وان مسـۆگەر بـوو کو هەر صولحەکا د ناڤ موسلمانان دا چێ ببت بـۆ وان خرابـە، لـەو گۆتنـە

ئێک و دو: هەر چاوا بت دڤێت ئەڤ صولحە چێ نەبت. و بۆ ب جهێنانا ڤێ ئارمانجا خۆ یا پیس ئەو ڕابوون ڕۆژا د دویڤ دا، و بەری هەردو کۆم ڤەرەڤن ب خافلەتی ڤە سپێدێ زوی چوون هندەک زەلام ژ لەشکەرێ طەلحە و زوبەیری کوشتن دەمێ ئەو دنڤستی و زڤڕینە ناڤ لەشکەرێ عەلی.. ئەڤان هزرکر ئەو صولحا دوهی عەلی د گەل وان کری بۆ خاپاندن بوو، ئینا وان ژی هندەک تیر د لەشکەرێ عەلی وەرکرن، عەلی ژی ژ لایێ خۆ ڤە هزرکر ئەڤە ئەو ژ گۆتنا خۆ لێڤەبوون، پێچەک ژ ڤی لایی پێچەک ژ لایێ دی، شەڕی دەست پێ کر و حەتا دانێ ئێڤاری ڤەکێشا، و هژمارەکا نە یا کێم ژ مرۆڤان د ڤی شەڕی دا هاتنە کوشتن، و سەرکەفتن یا لەشکەرێ ئیمام عەلی بوو.

هەژی گۆتنێیە کو هەردو لا پشتی هنگی گەلەک پەشێمانبوون کو ئەڤ سەرهاتییا نەخۆش د ناڤ وان دا ڕویدای، و خودێ گونەهێن هەمییان بغەفرینت.

د ڤی شەڕی دا ئالایێ ئیمام عەلی د دەستێ کوڕێ وی موحەممەدی دا بوو، و ئالایێ زوبەیری د دەستێ کوڕێ وی عەبدللاهی دا بوو.

پشتی ئەڤ شەڕە ب دوماهی هاتی، یێ کو ژ بەر حێشترا عائیشایێ ب ناڤێ شەڕێ حێشترێ (معركة الجمل) هاتییە نیاسین ، ئیمام عەلی ب لەشکەرێ خۆ ڤە قەستا باژێرێ کووفە کر، و ل (١٢)ی ڕەجەبا سالا (٣٦)ێ ئەو گەهشتە باژێری، ل کووفە عەلی ئاکنجیبوو و وی ئەو بۆ خۆ کرە پایتەخت، و نێزیکی حەفت هەیڤان تەناهییێ ڤەکێشا.. د ڤی دەمی دا ئیمامی کاغەزەک بۆ موعاویەی د گەل صەحابییێ ناڤدار (جرير بن عبدالله البجلي) هنارت، تێدا ژێ خواست کو ئەو ژی وەکی هەمی موسلمانان موبایەعا وی بکەت، و دوبەرەکییێ نەئێختە ناڤ ڕێزا ئوممەتێ، ئەگەر نە

ئـەو دێ ژ وان ئێتـە هژمـارتن یـێن ژ بـن حـوکمێ ئیمـامی دەرکـەفتین، و هنگی بۆ ئیمامی دروستە شەڕێ وان بکەت حەتا ئەو ل حەقییێ بزڤڕن.

موعاویـەی هـەڤالێن خۆ ژ صـەحابییان و خـەلکێ شـامێ کـۆمکرن و داخوازا عەلی بۆ وان ڤەگێڕا، ئینا گۆتنا هەمییان ئەو بـوو کـو ئەگـەر عـەلی وان بکوژت یێن عوثمان کوشتی ئەم دێ موبایەعا وی کەین، ئەگەر ئەو وێ نەکەت ئەم موبایەعا وی ناکەین.

و دا هـوین بـزانن کـانێ مـەوقفێ عـەلی چەنـد یـێ بەرتـەنگ بـوو گوهداربیا ڤێ سەرهاتییێ بکەن: جارەکێ عەلی د ناڤ لەشکەری دا ڕابوو، و گۆت: کێ ژ هەوە عوثمان کوشتییە؟ دەهـ هزار مرۆڤـان ب ئێـک دەنـگ گۆت: مە هەمییان ئەو یێ کوشتی!

مەزنترین موصیبەت خودێ دایە عـەلی ئەو لەشکەر بـوو یـێ ل دۆرا وی کۆمبووی، هەر ئێک ژ وان خۆ ب عـەلی ب خۆ نەددا، و لـەشـکـەرێ ب ڤی ڕەنگی بت ئەگەر خۆ ل سەر حەقییێ ژی بت دێ شکێت.. گاڤا ئەڤ سوحبەتە دگەهشتنە شامێ خەلکێ نەزان وە هزر دکر کـو عـەلی ب کوشتنا عوثمانی یێ رازییە ئەگەر نە پا بۆچی ئەو قاتلێن وی ڤەدحەوینت؟

عـەلی د واقعـەکی دا دژیـا خـەلکێ شـامێ ب دورسـتی تەقـدیرا وی نەدکر، وان ژ لایەکێ نەظـەری ڤە بەرێ خۆ ددا ڤـێ مەسـەلێ، یا ژ وان ڤـە مـەسـەلـە گەلەک یا ب ساناهییە، و باشترین دەلیـل کـو مەسـەلە هند یا ب ساناهی نەبوو وەکی خەلکێ شامێ هزر دکر ئەو بـوو: دەمـێ موعاویـە بوویـە خەلیفـە و ئوممـەت هـەمی ل سـەر خیلافـەتا وی کۆمبـووی ژی، ئـەو نەشیا قاتلێن عوثمانی بکوژت.. هنگی ژ نوی وی ب دورستی تەقدیرا وی واقعی کر یێ ئیمام عەلی تێدا دژیا.

عەلی د گەل خۆ برپار دا کو شەڕێ خەلکێ شامێ بکەت، لەو وی کارێ خۆ بۆ ڤێ چەندێ کر، و گۆتە لەشکەرێ خۆ: ئەڤە خەلکێ شامێ یێ شەڕی دخوازن، هوین چ دبێژن؟ بوو پرم پرما وان و وان چو گۆتنێن ئاشکەرا نەدانە ئیمامی، ئیمام عەلی ژ سەر مینبەرێ هاتە خوارێ و د گەل خۆ گۆت: (انا لله وانا اليه راجعون).

وەسا دیاربوو کو هەردو دەستەک بەر ب شەڕی ڤە چوون.. بەری مەسەلا شەڕێ وان ڤەگێرین چەند خالەکێن هەوجەی روهنکرنێ هەنە:

١- عەلی و موعاویە هەردو صەحابی بوون، و د ناڤ لەشکەرێ هەر دویان دا هژمارەکا دی یا صەحابییان هەبوون[1]، و د عەقیدا مە سوننییان دا هەر چەندە چو صەحابی دموعصووم نینن ژی، بەلێ ئەو هەمی دعادلن، و ئەم هزرا باشییێ ژێ دکەین و مە باوەرە کو ئنیەتا وان یا باش بوو.

٢- خیلافا وان خیلافەکا فقهی بوو نە یا عەقائیدی و سیاسی بوو، لەو خۆ د دەمێ هەڤڕکییێ ژی دا کەسێ کەس فاسق نەدکر و ژ مونحەرف و بیدعەچییان حسێب نەدکر.

---

(١) ژ موحەممەدێ کوڕێ سیرینی دئێتە ڤەگوهاستن دبێژت: دەمێ فتنە پەیدابووین صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەهـ هزار کەس بوون، ئەوێن ب نک ڤە چووین ژ وان نەدگەهشتنە سەدان، بەلکی سیهـ ژی تێ نەبوون. مەعنا: دەمێ شەڕێ ناڤخۆیی ل زەمانێ ئیمامێ عەلی د ناڤبەرا موسلمانان دا پەیدابووی، ئەو صەحابییێن ب دەستێ خۆ پشکداری تێدا کری نەدگەهشتە سیهـ کەسان، هەر چەندە ئەو ب هزاران بوون، و ئەوێن دی هەمییان ئعتزال کربوو. ڤێجا کانێ ئەڤ ڕاستییە ژ وێ مەزنکرن و تەشویها هندەک کەسێن ل سەر دیرۆکێ دئێنە هژمارتن دکەن، دەمێ دڤێن وەسا دیار بکەن کو صەحابی فتنەچی بوون!!

٣- هەر چەندە موعاویەی موبایەعا عەلی نەکربوو، بەلێ مەعنا وێ ئەو نەبوو وی عەلی ژ هەژی خیلافەتێ نەددیت، نەخێر.. یا هاتییە ڤەگوهاستن ژ موعاویەی کو وی کاغەز بۆ عەلی دهنارتنە کووفە -ل دەمێ هەڤڕکی د ناڤبەرا وان دا یا گەرم- و پسیارا هندەک مەسەلێن دینی ژێ دکر و عەلی بەرسڤا وی ددا.. و ڕۆژا صولح د ناڤبەرا هەردویان دا هاتییە مۆرکرن نڤیسەرێ صولحێ ناڤێ موعاویەی بەری یێ عەلی نڤیسی، موعاویەی گۆتێ: ناڤێ عەلی ببە بەراهییێ؛ چونکی ئەو بەرێ هاتبوو د ئیسلامێ دا و ئەو ژ من چێترە!

٤- نەهاتبوو ڤەگوهاستن ژ موعاویەی هندی عەلی یێ ساخ کو وی خۆ ب خەلیفە دابتە ناسین، یان ژێ داخواز ژ خەلکی کربت کو موبایەعا وی بکەن.

٥- د عەقیدا مە دا، عەلی ئیمامێ شەرعی بوو، و ئەو ل سەر حەقییێ بوو، و دڤیا موعاویەی گوهدارییا وی کربا و بەیعە دابایێ، و پشتی ئەبووبەکر و عومەر و عوثمانی چو صەحابی ژ عەلی د باشتر نەبوون.

٦- موعاویە صەحابی بوو و ئێک ژ نڤیسەرێن وەحییێ بوو، مەعنا یێ ئەمین بوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- باوەری پێ هەبوو لەو وەحی پێ ددا نڤیسین، و ژ بلی هەر چار خەلیفەیێن راشد چو خەلیفە ژ موعاویەی باشتر و ب عەدالەتتر نەهاتینە، و هەچییێ بڤێت پاراستی بمینت دڤێت دلێ خۆ د دەر حەقا موعاویەی دا ساخلەم بکەت، و ئەزمانێ خۆ ژێ د دەر حەقێ وی دا پاقژ بکەت، ئەگەر نە دێ ژ فاسقان ئێتە هژمارتن.

٧- (أبو مسلم الخولانی) ڕۆژەکێ چوو نک موعاویەی و گۆتێ: تو هەڤڕکییا عەلی دکەی ما خونە تو وەکی وییی؟ موعاویەی گۆت: نە

ب خودێ ئەز دزانم عەلی ژ من چێترە، بەلێ ما هوین ژی نابێژن: عوثمان ب زۆرداری هاتە کوشتن؟ و ئەز پسمامێ ویمە و ئەزێ داخوازا خوینا وی دکەم، بێژنە عەلی بلا کوژەکێن عوثمانی بدەتە ف من ئەز دێ هەمی تشتان تەسلیمی وی کەم.

ئەو چوونە نک عەلی، بەلێ عەلی قەبویل نەکر وان تەسلیم بکەت، ژ بەر وێ ئەگەرا مە بەحس ژێ کری.. ئینا شەڕ د ناڤبەرا وان دا چێبوو.

ل هەیڤا صەفەرێ ژ سالا سیهـ و حەفتێ مشەختی ل (صوففینێ) ل سەر لێڤا (فوراتی) هەردو لەشکەر گەهشتنە ئێک، لەشکەرێ ئیمام عەلی ژ سەد هزار کەسان پێک دهات، و یێ موعاویەی ژ حەفتێ هزار کەسان. سێ ڕۆژا شەڕی ڤەکێشا، و ب نیشانان یا دیاربوو کو لەشکەرێ ئیمامی یێ سەرکەفتییە، ل ئێڤارا ڕۆژا سێیێ لەشکەرێ شامێ قورئان بلندکرن و داخوازا صولحێ کر، ڕەئییا عەلی ئەو بوو صولحێ قەبویل نەکەت، بەلێ پشکەکا مەزن ژ لەشکەرێ وی ل بەر سنگی ڕاوەستیا و گۆتێ: چاوا تو حوکمێ قورئانێ قەبویل ناکەی؟ ئینا عەلی نەچاربوو صولح قەبویلکر، گاڤا وی صولح قەبویلکری ڕەئی بوو ئەو عەلی مرۆڤەکی بهنێرت و موعاویە ئێکی دا ئەو ئتفاقێ بکەن، موعاویەی عەمرێ کوڕێ عاصی هنارت ئەوێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د دەر حەقێ دا دبێژت: ((**عمرو بن العاص في الجنة**))[1]. و عەلی ڤیا پسمامێ خۆ عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی بهنێرت، بەلێ هەڤالێن وی گۆتێ: چونکی ئەو پسمامێ تەیە لەو تو دێ وی هنێری ئەم قەبویل ناکەین، ئەبوو مووسایێ ئەشعەری بهنێرە! و ئەبوو مووسا ژی صەحابییەکێ خودان قەدر بوو، ئینا عەلی ب یا وان کر.

---

(١) وەکی ئیمام ئەحمەد و طەبەرانی ژێ ڤەدگوهێزن.

هەردو لەشکەر ژێک ڤەرەڤین ب ئنیەتا هندێ کو هەردو حەکەم (عەمر و ئـەبوو مووسـا) ل هـەیڤا رەمـەزانێ کـۆم ببن، و د ڤـی شـەڕی ژی دا هژمارەکا نە یا کێم ژ موسلمانان هاتنە کوشتن، ئێک ژ وان عەمماری کوڕێ یاسری بوو، ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییێ: ((ویح عمار تقتله الفئة الباغية، يدعوهم إلى الجنة ويدعونه إلى النار))[1] و چونکی عەممار د گەل لەشکەرێ عەلی بوو، و ئەو ب دەستێ لەشکەرێ موعاویەی هاتبوو کوشتن، جمهوورێ زانایێن سوننی ل وێ باوەرێنە کو عەلی یێ حەق بوو، بەلێ مەعنا ڤێ ئەو نینە موعاویە یێ نەحەق بوو؛ چونکی ئەو یێ موجتەهد بوو، و موجتەهد ئەگەر خۆ یێ خەلەت ژی بت دێ یێ خودان خێر بت.

پشتی شەڕ راوەستیای عەلی ب لەشکەرێ خۆ ڤە زڤڕی کووفە، و موعاویە زڤڕی شامێ، و پشتی حەفت هەیڤان هەر دو حەکەم ل (دومە الجندل) کۆمبوون و پشتی دان و ستاندنێ ئەو نەگەهشتنە چو ئەنجامان، و هەر ئێک زڤڕی نک هەڤالێ خۆ.

گاڤا عەلی ب مەسەلا حەکەمان رازیبووی، ئەوا هەڤالێن وی ل سەر وی فەرضکری، دەستەکەک هەر ژ ناڤ هەڤالێن وی ڕابوون و گۆتن: خودێ دبێژت: ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾ (الأنعام: ٥٧) چاوا تو حوکمێ مرۆڤان قەبویل دکەی، تو کافربووی سەرا ڤێ چەندێ!

ئەڤە ئێکەمین (فرقە) بوو ژ ناڤ موسلمانان دەرکەفتی و (ئنحراف) د عەقیدێ دا کری، و چونکی ئەو ژ ناڤ لەشکەرێ ئیمام عەلی دەرکەفتن

---

(١) وەکی بوخاری ژێ ڤەدگوهێزت. و هندەک ریوایەتێن ڤێ حەدیسێ ژ عەمرێ کوڕێ عاصی ب خۆ دئێنە ڤەگوهاستن، ئەوێ شەڕ ل لایێ موعاویەی دکر.. و ژ ڤێ چەندێ ئینصافا صەحابییان د ریوایەتا حەدیسان دا ئاشکەرا دبت.

موسلمانان ناڤێ وان کره: (خەوارج)، و ئەڤ خەوارجە خودانێن عەقیدەیەکا فاسد بوون، و تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر د مەزهەبێ وان دا ئەو بوو وان موسلمان هەمی کافر دکرن ئەو تێ نەبن یێن دگەهنە وان. و وان گەلەک ئەزمان درێژی د دەر حەقا ئیمام عەلی دا کرن و دووماهییێ چوونە د رێکا موسلمانان دا و خەلک کوشتن، ئینا ئیمامی بڕیار دا شەڕێ وان بکەت پشتی ئبن عەبباس هنارتییە د ناڤ وان دا و وی حەقی بۆ وان ئاشکەراکری.

مەزنترین شەڕ د ناڤبەرا عەلی و خەوارجان دا چێبووی شەڕێ (نەهروانێ) بوو، و د ڤی شەڕی دا ئیمامێ عەلی هژمارەکا مەزن ژ ڤان مونحەرفان کوشتن، و ئەڤ سەرهاتییە ژی بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو ئیمامێ عەلی ل سەر حەقییێ بوو؛ چونکی د حەدیسێن دورست دا هاتییە کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا بەحسێ سالۆخەتێن ڤان خەوارجان دکەت و دبێژت: ((يقتلهم أدنى الطائفتين إلى الحق))[1] یەعنی: ئەوێن نێزیکتر بۆ حەقییێ دێ شەڕێ وان کەن. و یێن شەڕێ وان کری عەلی و لەشکەرێ وی بوو.

پشتی خەوارج دەرکەفتین و عەلی شەڕێ وان کری خۆ ئەو صەحابییێن د گەل عەلی شەڕێ هەڤرکێن وی نەکری ژی وەکی عەبدللاهێ کوڕێ عومەری و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی خۆزی ڕاهێلان کو وان د گەل عەلی شەڕێ خەوارجان کربا، ژ بەر وێ حەدیسا مە ڤەگێڕای.. مەعنا صەحابییان هەمییان (ئقرارا) عەلی ل سەر ڤێ چەندێ کر.

هەژی گۆتنێیە کو ئیمام عەلی فەتوا ب کوفرا خەوارجان نەدا، و شەڕێ خۆ د گەل وان ب ناڤێ جیهادا د گەل کافران نەدا نیاسینێ، و

---

(١) موسلم ڤێ حەدیسێ ریوایەت دکەت.

جوداهییا مەزن د ناڤبەرا شەڕێ عەلی د گەل خەوارجان، و شەڕێ وی د گەل طەلحە و زوبیر و موعاویەی ئەو بوو شەڕێ وی د گەل ڤان هەر سێیان ئەنجامێ خیلافەکا فقهی بوو، ژ بەر هندێ د ناڤ صەحابییان دا هەبوون یێن خۆ نەدایە د گەل چو ژ هەردو لایان، بەلێ شەڕێ وی د گەل خەوارجان شەڕەکێ عەقائیدی بوو و ئەنجامێ خیلافەکا عەقیدێ بوو، لەو هەمی صەحابییان خۆ ئەوێن شەڕێ عەلی ژی دکر پشتەڤانییا ئیمامی د ڤێ چەندێ دا کر.

وەکی مە گۆتی: د شەڕێ نەهرەوانێ دا موسلمانان هژمارەکا مەزن ژ خەوارجان کوشتن، و ئەوێن مایی ژ وان ل سەر باطلێ خۆ پتر مجدبوون و گۆتن: ئێکجار عەلی کافربوو؛ چونکی ئەو ب حوکمێ مرۆڤان رازیبوو و ب کوشتنا مە ڕابوو.. و د عەقیدا وان دا ئەو بوو: گاڤا مرۆڤێ موسلمان گونەهەکا مەزن کر -وەکی قەتلێ- دێ کافر بت.

ژ بلی ڤێ چەندێ وان موعاویە و عەمرێ کوڕێ عاصی ژی کافرکرن، لەو وان بڕیار دا ڤان هەر سێیان بکوژن، گۆتن: دا موسلمان ژ خرابییا وان رحەت ببن!

سێ کسان پەیمان دا ب ڤێ تاوانا مەزن ڕابن: (عبد الرحمن بن ملجم المرادی) گۆت: عەلی بۆ من، و (البرک بن عبد الله التمیمی) گۆت: موعاویە خەما من، و (عمرو بن بکر التمیمی) گۆت: و عەمر بۆ من.. یێ ئێکێ مرادا خۆ ب جهـ ئینا و هەردوییێن دی فاشلبوون.

ل سالا (٤٠)ێ مشەختی (عبد الرحمن)ێ خارجی قەستا کووفە کر، و ل وێرێ وی خۆ ب هەڤالێن خۆ ڕا گەهاند و کارێ خۆ کر.

دبێژن: وی ل کووفە کچکەک دیت ناڤێ وێ (قطام) بوو، ئەو ژی ل سەر مەزهەبێ خەوارجان بوو و گەلەک مرۆڤێن وێ ل شەڕێ نەهرەوانێ

هاتبوونه کوشتن ب دەستێ لەشکەرێ ئیمام عەلی، ئەڤ کچە زێدە زێدە یا جوان بوو، گاڤا (عبد الرحمن)ی ئەو دیتی حەز ژێ کر و داخواز ژێ کر کو ئەو شوی پێ بکەت، کچکێ گۆتێ: بلا ئەگەر تو مەهرێ من بدەیە من. وی گۆتێ: مەهرێ تە چییە؟ وێ گۆت: سێ هزار دینار و کوشتنا عەلی. مەزنترین مەهر بوو دیرۆکێ ڤەگێڕای، کوشتنا شێرێ ئیسلامێ بابێ حسەنی، عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی!

جوانییا کچکێ، و عەقیدا خراب، و دلێ ژ کەربێ داگرتی.. عەبدررەحمانێ موجرم پالدا کو مەزنترین تاوانێ ل سەر ناڤێ خۆ تۆمار بکەت.. ل ڕۆژا چارشەنبێ پازدەی رەمەزانا سالا چلێ، ل دەمێ نڤێژا سپێدێ، هندەک دبێژن: ئیمام عەلی د نڤێژێ دا بوو، و هندەک دبێژن: هێشتا وی دەست ب نڤێژێ نەکربوو، عەبدررەحمانی شیرێ خۆ یێ ژەهرکری د ئیمامی وەراند و دربێ وی ب سەرێ ئیمامی کەفت.. و وی کارێ ڕەڤێ کر، بەلێ موسلمان پێ وەرهاتن و ئەو گرت.

عەلی جەعدەیێ کوڕێ هوبیرەی ل شوینا خۆ کرە ئیمام دا نڤێژا سپێدێ ل بەراهییا خەلکی بکەت، و پشتی هندەکان عەلی برییە مالا وی، وی گۆت: ئەگەر ئەز مام ئەز خودانێ ویمە، یەعنی: ئەز دێ حوکمی ل سەر وی دەم، و ئەگەر ئەز مرم وی ب تنێ پێش من ڤە بکوژن، و نەڕابن خوینا خەلکی بڕێژن بێژن: ئەڤە پێش عەلی ڤە.

چارشەنبێ و پێنجشەنبێ عەلی ما بریندار و ل سپێدەییا ڕۆژا ئەینییێ ئیمام شەهیدبوو، و هنگی ژییێ وی شێست و سێ سال بوو، و هندەک دبێژن: پێنجی و حەفت سال بوو.

حسەن و حوسەین و عەبدللاهێ کوڕێ جەعفەری ب شویشتنا وی ڕابوون، و حسەنی نڤێژ ل سەر کر، و ل جهەکێ بەرزە وان ئەو ڤەشارت،

ژ ترسێن هندێ دا کو خەوارج بچن تەرمێ وی بیننەدەر، و هندەک دبێژن: ئەو د قەصرا میراتییێ ڤە ل کووفە هاتە ڤەشارتن. هەر چاوا بت ئەو قەبرێ نوکە ل نەجەفێ ب ناڤێ قەبرێ عەلی دئێتە نیاسن، و رافزی دپەرێسن! قەبرێ ئیمام عەلی نینە؛ چونکی ژ تشێتن مەعلوومە د دیرۆکێ دا کو ئەو ل کووفە -نە ل نەجەفێ- هاتبوو ڤەشارتن، و ل جهەکێ ڤەشارتی؛ دا خەوارج ڤێ نەکەڤن.

و گاڤا ئیمام شەهیدبووی وی کەس پشتی خۆ نەکربوو خەلیفە، و ئەگەر وی حەسەن دانابا جهێ خۆ، وەکی هندەک نەزان دبێژن، دەمێ موعاویەی کورێ خۆ یەزید دانایە جهێ خۆ، و هندەک صەحابییان خۆ ل سەر کارێ وی نەرازی کری، ئەو دا بێژت: عەلی ژی ئەڤ چەندە بەری من کربوو، کانێ چاوا گۆت: ئەڤە سوننەتا ئەبووبەکر و عومەرییە.. بەلێ کو موعاویەی ئەڤ هێجەتە بۆ خۆ نەگرتی، هندێ دگەهینت کو عەلی کەس ل جهێ خۆ نەدانابوو، بەلێ پشتی شەهیدبوونا وی خەلکێ کووفە ژ هەڤالێن وی پشتی مرنا وی موبایەعا حەسەنێ کورێ وی کر، وەکی مە بەحس ژێ کری دەمێ مە بەحسێ حەسەنی کری. و چونکی دەمێ حەسەنی دکەفتە د بن وان سیه سالان ڤە یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحس ژێ کری دەمێ گۆتی: ((الخلافة بعدي ثلاثون سنة))[1] یەعنی: خیلافەت پشتی من سیه سالن. زانایێن ئیسلامێ ل وێ باوەرێنە کو حەسەنێ کورێ عەلی خەلیفەیێ راشدی یێ پێنجێیە.

ئیمام عەلی پتر ژ ژنەکێ ئینابوون، و وی عەیالەکێ بۆش هەبوو، یێن ژ هەمییان ناڤدارتر: حەسەن و حوسەین بوون، و بەری نوکە مە ب بەرفرەهی بەحسێ وان کریە. و موحسن، و ئەڤە هێشتا یێ ساڤا مربوو.

---

(١) ئبن حببان ڤێ حەدیسێ ریوایەت دکەت.

و زەینەب، و ڤێ شوی ب پسمامێ خۆ عەبدللاهێ کورێ جەعفەری کربوو، و (أم کلثوم) و ڤێ شوی ب عومەرێ کورێ خەططابی کربوو.. و ئەڤ هەر پێنجە عەیالێن فاطمایا کچا پێغەمبەری بوون -سلاڤ لێ بن-.

و ژ کورێن وی یێن دی: موحەممەد، و ئەبووبەکر، و عوثمان، و عەبباس و عەبدللاهـ و هندەکێن دی.. و وەکی هوین دبینن وی ناڤێن هەر سێ خەلیفێن بەری خۆ ڕاکربوون و هەما ئەڤە ب تنێ بەسە ببتە ڕەد ل سەر وان ئەزمان درێژان ئەوێن دبێژن: عەلی دژی وان بوو.

ئەگەر عەلی دژی ئەبووبەکری با دا بۆچی ناڤێ وی دانتە سەر کورێ خۆ، و ئەگەر د ناڤبەرا عەلی و عومەری دا دوژمناتی هەبا چاوا ئەو دا کچا خۆ دەتێ، و ناڤێ وی دانتە سەر کورەکێ خۆ، و هەر وەسا عوثمان ژی؟

﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾ (الحج: ٤٦).

## پشکا سێیێ

# بەرماییێن وان دەهێن
# مزگینی ب بەحەشتێ بۆ هاتییەدان

- سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی
- زوبەیرێ کوڕێ عەووامی
- طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدوللاهی
- عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی
- ئەبوو عوبەیدە عامرێ کوڕێ جەرراحی
- سەعیدێ کوڕێ زەیدی

# سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی

ژییێ وی نێزیکی شازدە هەڤدە سالییێ بوو دەمێ وی مەزنترین بڕیار د ژیانا خۆ دا دای، ئەو بڕیارا هەر تشتەک د ژیانا وی دا سەروبن کری.. وی دزانی ئەو بڕیار گەلەک یا ب زەحمەتە؛ چونکی ئەو دێ وی تووشی بەرهنگارییا جڤاکێ هەمییێ کەت، ب تایبەتی نێزیکترین کەس ژ وی، کو دەیکا وییە، ئەوا هێشتا وەسا بەرێ خۆ ددەتێ هەر وەکی ئەو هێشتا زارۆکەکێ ساڤا.

وێ ڕۆژێ ئەو وەکی هەر جار ژ مال دەرکەفتە کۆلانێن بازێڕێ ب وێ ئنیەتێ کو ئەو چەندەکێ خۆ ل نک هەڤالان موژیل بکەت، و ڕۆژا خۆ دەرباس بکەت، یان ژی دا بچتە کەعبێ و بەرانبەر (هوبەلێ مەزن!) ڕاوەستت و چەند دەلیڤەیەکان سەرێ خۆ بۆ بچەمینت، ئەگەر هات و وی چو هەڤال نەدیتن.. ژ نشکەکێ ڤە بەرێ وی ب هەڤالەکێ وی کەفت، ڕاستە ئەڤ هەڤالە نە ل عەمرێ وییە، و نێزیکی بیست سالان ژ وی مەزنترە ژی، بەلێ ئەو ئێک ژ هەڤالێن وی یێن گەلەک نێزیک و دلسۆز بوو، هەڤالێ وی دەڤێ خۆ برە بەر گوهێ وی و تشتەک ب دزی ڤە بۆ وی گۆت دا کەسێ گوهـ لێ نەبت، ڤێ ئاخفتنا هەڤالێ وی ڕەنگ لێ گوهاڕت، و گوهوشینەک ب سەر دێمێ وی دا بەردا، پشتی هەڤالێ وی ئەو گۆتن د گوهێ وی دا گۆتی، ئەو هێدی ل سەر پێیێ خۆ زڤڕی مال، و خۆ ژ خەلکێ مالێ ڤەدەرکر، هەر وەکی وی دڤیا ب تنێ و باش هزرا خۆ د گۆتنا هەڤالێ خۆ دا بکەت، و ئەو د گەل خۆ کەفتە دان و ستاندنەکا گەرم:

- ئەز چ بکەم چ نەکەم؟ ب گۆتنا هەڤالێ خۆ بکەم، یان نە؟ تو بێژی ئەو گۆتنا وی گۆتییە من تشتەکێ دورست بت؟ پشتی هنگی ئەگەر من وەکی وی کر ئەز دێ چ بێژمە دەیکا خۆ؟ چاوا دێ بەرانبەر مرۆڤێن خۆ ڕاوەستم؟ مسەلە وەسا یا ب ساناهی نینە وەکی هەڤالێ من هزر دکەت..

پشتی هزرا وی زێدە وەستیای، و ئەو د گەل نەفسا خۆ کەفتییە هەڤڕکییەکا درێژ، و بەری ڕۆژا وێ ڕۆژێ ئاڤا ببت، وی بڕیارا خۆ دا، وی گۆتە خۆ: ئەز دێ ب یا هەڤالێ خۆ کەم؛ چونکی ئەو مرۆڤەکێ خێرخواز و جامێرە، و وی چو جاران خرابییا من نەڤیایە.. بەلێ، ئەز دێ ب گۆتنا وی کەم، و چ چێ دبت بلا چێ ببت!

پاشی هێدی ئەو دەرکەفت و قەستا مالا هەڤالێ خۆ کر؛ دا بێژتێ: من بڕیارا خۆ دا بێمە سەر دینێ هەڤالێ تە (موحەممەدی).. کەیفا ئەبووبەکری زێدە ب ڤی خەبەری هات، و هەر د گاڤێ دا دەستێ هەڤالێ خۆ یێ هەڤدە سالی گرت و برە نک پێغەمبەرێ خودێ دا مزگینییێ بدەتێ کو ئەڤە کەسەکێ دی ل وان زێدەبوو، ئەو ژی سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصێ زوهرییە.

د هندەک ریوایەتان دا ژ سەعدی دئێتە ڤەگوهاستن کو ئەو سێیەمین کەس بوو موسلمانبووی، یەعنی: پشتی خەدیجایێ و ئەبووبەکری، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئەو مرۆڤێ حەفتێ بوو موسلمانبووی.. هەر چاوا بت سەعدی ژ دەهـ کەسێن ئێکێیە کو هاتییە د ئیسلامێ دا، و موسلمانبوونا وی ب ڕێکا ئەبووبەکری بوو، و ل سەر دەستێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و سەعد دەمێ موسلمانبووی گەنجەکێ شازدە هەڤدە سالی بوو، وەکی مە گۆتی..

بابێ وی ئەوێ ب ناسناڤێ (ئەبوو وەققاص) دهاتە نیاسین ناڤێ وی یێ دورست مالک بوو، مالک کورێ ووهەیبێ کورێ عەبدمەنافێ کورێ زوهەرەیێ کورێ کیلابێ کورێ موورەیێ کورێ کەعبێ کورێ لوئەیێ قورەیشی بوو. ئەو و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل کیلابێ کورێ موررەیی دگەهنە ئێک، پێغەمبەر ژ بابکێ هاشمی بوو، و ئەو ژ بابکێ زوهەریی بوو، و ئەو دو بابکێن ناڤدارێن قورەیشییان بوون.

دەیکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئامینایا کچا وەهەبێ کورێ عەبدمەنافی ژ بابکێ زوهرەییان بوو، و ئەو دۆتماما بابێ سەعدی بوو، مالکێ کورێ ووهەیبی، (وەهەب) و (وهەیب) هەردو برایێن ئێک بوون، لەو سەعد وەک خالێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهاتە هژمارتن، جابرێ کورێ عەبدللاهێ ئەنصاری دبێژت: جارەکێ ئەم ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- درووینشتی بووین مە دیت سەعد ژ وێڤە هات، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دایێ و گۆت: ((ئەڤە خالێ منە، کانێ ئێک ژ هەوە خالێ خۆ نیشا من بدەن))[1]، مەعنا: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شانازی پێ دبر کو ئەو خالێ وییە.



ئێک ژ وان گرفتارییێن مەزن یێن سەعدی هزرا خۆ تێدا کری بەری بڕیارا موسلمانبوونا خۆ بدەت، دەیکا وی بوو، سەعدی باش دزانی کو دەیکا وی ئەوا زێدە گرێدای ب دینێ باب و باپیران ڤە دێ بتە ئاستەنگ د ڕێکا وی و ڤی دینێ نوی دا، بەلێ پشتی وی باش هزرا خۆ د مەسەلێ دا کری، وی بڕیار دا موسلمان ببت و بەرانبەر دەیکا خۆ ژی ڕاوەستت ئەگەر هات و وێ خۆ کرە ئاستەنگ د ناڤبەرا سەعدی و ئیسلامێ دا.

---

(١) ترمذی ڤەدگوهێزت.

دەیکا سەعدی ژ بابکێ ئومەوییان بوو، ناڤێ وێ حەمنەیا کچا سوفیانێ کورێ ئومەییەیێ کورێ عەبدشەمسی بوو، و ئەو زێدە ب کورێ خۆ ڤە یا گرێدای بوو، پشتی سەعدی بریار دای موسلمان ببت ئێکەمین رەنگێن جەرباندن و (ئبتلائێ) کەفتییە رێکا وی دەیکا وی بوو.. و پێ نەڤێت بێژین: ئێک ژ وان رەنگێن جەرباندنێ یێن خودێ هندەک خودان باوەران پێ دجەربینت جەرباندنا ب مرۆڤ و کەس و کارێن نێزیکە، ب تایبەتی دەیک و بابان کو نێزیکترین کەسن بۆ مرۆڤی، دبت حالەتەک ب سەر مرۆڤێ خودان باوەر دا بێت دەیک و بابێن وی ببنە ئاستەنگ د ناڤبەرا وی و رازیبوونا خودێ دا، کو ئەو بەرێ وی ژ حەقییێ بدەنە پاش، یان فەرمانێ ب بێ ئەمرییا خودێ ل وی بکەن، و هنگی ئەو دێ کەفتە د ناڤبەرا دو هلبژارتێن ب زەحمەت دا ل سەر نەفسا وی: یان دڤێت ئەو ل رێکا حەقییێ بچت، و هنگی دڤێت ئەو دلێ دەیبابێن خۆ بێشینت، و داخوازا وان ل عەردی بدەت، یان ژی دڤێت ئەو دلێ دەیبابێن خۆ نەهێلت و یێ دلۆڤان بت د گەل وان، و هنگی دڤێت ئەو حەقییێ ژ دەست بدەت، و خودایێ خۆ ژ خۆ نەرازی بکەت.. و ئەڤ هەردو هلبژارتنە ل سەر نەفسا وی ب ساناهی نینن، ڤێجا ئەو چ بکەت؟

ئەڤە ئەو بەلا بوو یا هاتییە سەرێ سەعدی، سەعدی دزانی ئەڤ مەسەلە ب ساناهی دەرباس نابت، ئەو چ بکەت؟ مەسەلێ ل بەر دەیکا خۆ ڤەشێرت، یان وێ ئاگەهدار بکەت؟ بریارەکا هندە مەزن نائێتە ڤەشارتن، دەیکا وی ب ڤی خەبەری حسیا، (صەدمەیەکا) مەزن بۆ وێ چێبوو، ل سەری وێ داخواز ژ کورێ خۆ کر ئەو ل بریارا خۆ لێڤە ببت، گاڤا وێ دیتی ئەو لێڤە نابت، وێ هەڤرکی و دان و ستاندنەکا دویر و درێژ د گەل کر، پاشی وێ چەکێ خۆ یێ دووماهییێ ب کارئینای، چەکێ (عاطیفەیا

دەیکینییێ)، وێ گۆتە کوڕێ خۆ: ئەز ب خودێ کەمە هەما تو ل دینێ مە نەزڤڕی ئەز نە زادی دخۆم نە ئاڤێ ڤەدخۆم حەتا کو دمرم؛ دا سەرێ تە د ناڤ خەلکی دا شۆڕ ببت، و هەچییێ تە ببینت بێژت: ئەڤە ئەوە یێ دەیکا خۆ کوشتی!!

سەعدی ب نەرمی و دلپێڤەبوون گۆتە دەیکا خۆ: دادێ! وە نەکە، ئەز دینێ خۆ ناهێلم.. و گاڤا وی دیتی دەیکا وی گەفا خۆ ب جهئینا و دەست ژ خوارن و ڤەخوارنێ کێشا، وی ب مجدی ڤە گۆتێ: دادێ، ئەز ب خودێ کەمە تو باش دزانی کو ئەگەر تە سەد رح هەبن، و ئەو ئێک ئێکە ژ کەلەخێ تە دەرکەڤن، ئەز دینێ خۆ ناهێلم، ڤێجا تە دڤێت خوارنا خۆ بخۆ، تە دڤێت نەخۆ!

د ڤی هەلویستێ سەعدی دا ئەڤ ئایەتا سوورەتا (العنکبوت) هاتە خوارێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَـٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٨﴾ خودێ گۆت: مە شیرەت ل مرۆڤی کرییە کو ئەو د گەل دەیبابێن خۆ یێ باش بت، و ژ باشییێیە تو دلێ وان نەهێلی و گۆتن یان کریارەکا وەسا نەکەی دلێ وان بێشت.. بەلێ ئەگەر هات ئێک ژ وان داخواز ژ تە کر کو تو شریکەکی بۆ من د پەرستنێ دا بدانی تو گوهدارییا وان نەکە.. بۆچی؟ چونکی د دینێ خودێ دا پەیوەندییا ل سەر بناخەیێ باوەرییێ دئێتە ئاڤاکرن، بەری هەر پەیوەندییەکا دی دئێت، و د بێ ئەمرییا خودێ دا گوهدارییا چو مەخلووقان نائێتەکرن، وەکی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((لاَ طَاعَـةَ لِمَخْلُـوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ))[1].

---

(١) نبن نەبی شیبە ڤەدگوهێزت.

سەعدی فەرمانا خودێ ب جهئینا، و ئەو سەرکەفتی ژ ڤێ جەرباندنێ دەرباسبوو؛ دا جهێ خۆ د ناڤ کۆما پێشییێ یا خودان باوەران دا بکەت، و ببتە ژ دەستەکا ئێکێ یا بارێ گرانێ هلگرتن و گەهاندنا گازییا خودێ کەفتییە سەر ملان.



هەر چەندە دەنگ و باسێن سەعدی وەکی یێن پترییا صەحابییان ل قووناغا ئێکێ ژ ژییێ گازییا ئیسلامێ ئەوا نێزیکی شەش سالان ڤەدکێشت، زێدە ب فرەهی نەگەهشتینە مە، بەلێ ژ هندەک ریوایەتان دئێتە زانین کو هەر ژ دەسپێکێ سەعد ژ وان صەحابییان بوو یێن ملێ وی ب ملێ پێغەمبەری ڤە، بەری قووناغا مالا ئەرقەمی دەست پێ بکەت، و ل دەمێ ئەو ل مالا ئەرقەمی و پشتی هنگی ژی دەمێ فەرمان ل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هاتییەکرن کو ئەو ئاشکەرا بەرێ خەلکی بدەتە ئیسلامێ.. کتێبێن سیرەتێ ڤەدگێڕن کو ل هەیڤێن ئێکێ پشتی هاتنا گازییا ئیسلامێ دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ڤیابا عیبادەتێ خودێ بکەن ئەو ژ بازێری دەردکەفتن، و دچوونە وان دۆل و نهالێن ل دۆرێن مەکەهێ هەین، و وان ل وێرێ نڤێژ دکرن؛ بۆ هندێ دا کافر وان نەبینن و پێ نەحسییێن. جارەکێ ژ وان جاران چەند صەحابییەکان ل نهالەکێ نڤێژ دکر، هندەک کافر ب سەر هلبوون، پشتی ب نک ڤە هاتین، گۆتنێ: ئەڤە چ تشتێ غەریبە هوین دکەن؟

وان گۆت: ئەڤە نڤێژە ئەم بۆ خودایێ خۆ دکەین..

گاڤا وان کافران زانی کو ئەو یێ عیبادەتێ خودایەکێ دی ژ بلی صەنەمێن وان دکەن، وان پێ نەخۆشبوو، و شەڕەدەڤەک د ناڤبەرا وان دا چێبوو، و دووماهییێ مەسەلە گەهشتە هندێ ئەو لێککەفتن.. سەعدێ

کوڕێ ئەبوو وەققاصی هەستییەکێ حێشترێ ڕاکر.و ل سەرێ کافرەکی دا و سەرێ وی شکاند. و دبێژن: ئەڤە ئێکەمین خوین بوو د ئیسلامێ دا هاتییە ڕێتن!

پشتی ڤێ سەرهاتییێ سوحبەتا موسلمانان ل مەکەهێ بەلاڤبوو، و موسلمان ئێدی ژ خۆ ترسییان دەرکەڤنە چۆلی، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هزر د هندێ دا کر ڕێکەکا دی بۆ موسلمانان ببینت، و ئەو بوو وی داخواز ژ وان کر ئەو ل مالا ئەرقەمی بگەهنە ئێک.

تشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د سەعدی دئینادەر زیرەکییا وی بوو د کرنا شەڕی دا، ب تایبەتی سەگڤانییا وی بۆ هاڤێتنا تیران، لەو وی ئەڤ بەهرەیا وی بۆ پاشەڕۆژێ هلدگرت، حەتا دەمێ وێ بێت.. بەلێ هندی موسلمان ل مەکەهێ بەردەوام فەرمانا خودێ بۆ وان دهات کو ئەو دەستی ژ شەڕی بکێشن، و پشتی موسلمان بەر ب مەدینێ ڤە مشەختبووین، و بنگەهێ دەولەتا خۆ ل وێرێ دانای، و پشتی نێزیکی سالەکێ ئەو ل وێرێ ماین دەستویری بۆ وان هاتەدان کو ئەو بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، و هنگی دەورێ سەعدی هاتە پێش.. د سالا دویێ مشەختی دا، و بەری شەڕێ بەدرێ ل هەیڤا رەمەزانێ چێ ببت، موسلمان ب چار غەزایان ڕابوون و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چار سەرییێن لەشکەری هنارتنە ژ دەرڤەی مەدینێ، و ئێکەمین سەرییە سەرییا عوبەیدەیێ کوڕێ حارثی بوو، ئەوا ژ شێست زەلامان پێک دهات، و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی ئێک ژ وان بوو. هندەک زانایێن سیرەتێ دبێژن: ئەڤە ل هەیڤا دەهێ ژ سالا ئێکێ مشەختی بوو، د ڤێ سەرییێ دا شەڕەکێ سڤک د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن مەکەهێ دا چێبوو، و سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی هندەک تیر هاڤێتنە کافران، و ئەو ئێکەمین تیر بوون د ئیسلامێ دا هاتینە هاڤێتن.

ژ ڤێ چەندێ دئێتە زانین کو د دیرۆکا ئیسلامێ دا سەعد ئێکەمین کەس بوو خوین د کافرەکی ئیناى، و ئێکەمین کەس بوو هندەک تیر د رێکا خودێ دا هاڤێتین.. تشتەکێ دی ژی ل نک سەعدی هەبوو کەسێ پشکداریا وی تێدا نەکربوو، ئەو ژی ئەڤە بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتبوویێ: (دەیک و بابێن من گۆری تەبن) و ئەڤ گۆتنە ژ بلی وی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەگۆتییە کەسێ دی! ڤێجا سەرهاتییا ڤێ گۆتنێ چ بوو؟



((ارْمِ سَعْدُ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي)) تیران د وان وەرکە ئەی سەعد، بابێ من و دەیکا من گۆری تەبن[1].. ئەڤە ئەو گۆتن بوو یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بلی سەعدی نەگۆتییە چو کەسان.. و ئەڤ نیشانە ئەو بوو یا ل رۆژا ئوحودێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب سنگێ سەعدی ڤە کری ژ بەر قەهرەمانییا وی یا مەزن.

ل رۆژا ئوحودێ، پشتی رمبازان جهێ خۆ ل سەر گری بەردای، و لەشکەرێ کافران ل دۆر موسلمانان زڤری، و سەرکەفتا صەحابییان بوویە شکەستنەکا لەشکەری یا مەزن، حال زێدە بەرتەنگ بوو، و خەمەکا مەزن گەهشتە خودان باوەران، نێزیکی حەفتێ کەسان ژ وان هاتنە شەهیدکرن، و حەمزە ئێک ژ وان بوو، پاشی د ناڤ خەلکی دا بوو دەنگ کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە کوشتن، پترییا صەحابییان بێ هیڤی بوون، هندەکان خۆ ژ مەیدانا شەڕی ڤەکێشا و ب لەز ب نک مەدینێ ڤە رەڤین، و هندەک ژ کرنا شەڕی ساربوون و خۆ دانە لایەکی، و هژمارەکا گەلەکا کێم ل ڤێرێ

(١) ترمذی و ئبن ماجە ڤەدگوهێزن.

و ویرا هه مان و شەرکرن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سنگێ چەپەری بوو شەڕ دکر، هەر چەندە یێ بریندار ژی بوو، هنگی کافران ژ هەمی لایان ڤە هێرش ددا وی جهی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- لێ.. کتێبێن سیرەتێ ڤەدگوهێزن کو ل وی دەمی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و نەهـ صەحابی ب تنێ ل وی چەپەری بەرانبەر کافران مابوون، حەفت کەس ژ وان کەسێن ماین ئەنصاری بوون، و دو ب تنێ ژ موهاجران بوو، ئێک ژ وان سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی بوو، و یێ دویێ طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدوللاهی بوو، وان د گەل هەر حەفت هەڤالێن خۆ یێن ئەنصاری ب هەمی هێزا خۆ بەرەڤانی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، و هەر ئێکی ژ لایەکی ڤە و ب ڕەنگەکی شەڕ دکر دا نەهێلن کافر بگەهنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، کارێ سەعدی ژ بەر سەکڤانی و هێزا زەند و باسکێن وی ئەو بوو وی ل بەر سنگێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تیر ل دویڤ تیری د کافران وەردکرن، و ئەو وەردگێڕانە ئاخێ، هنگی دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو د ڤی حالی دا دیتی، ئەڤ نیشانا قەهرەمانییێ ب سنگێ وی ڤە کر، گۆتێ: بدانێ بابێ من و دەیکا من گۆری تە بن!

ئەڤە ئەو گۆتن بوو یا سەعدی پتر ژ پێنجی سالان پشتی گۆتنا وێ شانازی بۆ خۆ پێ دبر د ناڤ صەحابییان دا، و دگۆت: ژ بلی من پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەیک و بابێن خۆ گۆری کەسێ نەکرینە!! و نە بەس هندە، بەلکی پشتی مرنا وی عەیالێ وی ژی شانازی بۆ خۆ ب ڤی تشتی دبر یێ کەسێ دی پشکدارییا وان تێدا نەکری.

ژ بلی ڤێ (شانازییێ) سەعدی گەلەک تشتێن دی ژی هەبوون خۆ پێ د ناڤ خەلکی دا سەربلند بکەت، ئێک ژ وان ئەو بوو سەعد ژ وان کەسان بوو یێن پتر ژ جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب وەحیا خودێ

مزگینییا چوونا بەحەشتێ دایێ، لەو دەمێ ئەو کەفتییە بەر مرنێ سەرێ وی د کۆشا کورێ وی موصعەبی دا بوو، دەمەکی وی چاڤێن خۆ ڤەکرن دیت کورێ وی یێ دکەتە گری، وی گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ کورێ وی گۆت: ژ بەر حالێ تە.. سەعدی گۆتێ: نەکە گری، خودێ قەت من عەزاب نادەت، و ئەز ژ خەلکێ بەحەشتێمە.

وەک (تەعلیق) ل سەر ڤێ گۆتنا وی ئیمامێ ذەهەبی دبێژت: ئەو ڕاست دبێژت، و خوزییێن وی!!

خەلاتێ دی یێ پێغەمبەری -سلاڤ ل بن- دایە سەعدی ئەو بوو وی دوعا بۆ وی کربوو کو خودێ دوعایێن وی قەبویل بکەت، ئیمامێ ترمذی ژ سەعدی ب خۆ ڤەدگوهێزت کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((اللَّهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ)) یا ڕەبی تو دوعایا سەعدی قەبویل بکە دەمێ ئەو دوعایەکێ ژ تە دکەت.. ژ بەر ڤێ چەندێ هەر دوعایەکا سەعدی کربا ئەو د گاڤێ دا ب جهـ دهات.

جارەکێ سەعد د بەر مرۆڤەکی ڕا بۆری دیت ئەو یێ ئاخفتنێن کرێت دبێژتە عەلی و طەلحە و زوبەیری.. ئەڤە پشتی کو د ناڤبەرا وان دا نەخۆشی پەیدابووی، سەعدی ب ڕەنگەکێ تازە گۆتێ: ئاخفتنێن کرێت نەبێژە وان، ژ کەربێن سەعدی دا وی بەردەوامی دا گۆتنێن خۆ، سەعدی گۆتێ: ئەگەر تو بێ دەنگ نەبی دێ نفرینان ل تە کەم.. وی ب ترانە ڤە گۆت: پاشی ڕاستی تو پێغەمبەری دا ئەز ژ نفرینێن تە بترسم! سەعدی پشتا خۆ دایێ چوو دەستنڤێژا خۆ گرت، و دو رکاعەتێن سوننەت کرن، پاشی هەردو دەستێن خۆ بلندکرن و گۆت: یارەبی! ئەگەر تو بزانی کو ڤی زەلامی هندەک گۆتنێن کرێت یێن گۆتینە هندەک مرۆڤێن تو ژێ رازی و تە قەنجی لێ کری، و وی ب ڤان گۆتنێن خۆ کەربا تە ڤەکربت، وی وی بکە

نیشان و عیبرەت د ناڤ خەلکی دا.. دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو حێشترەکا شەنبۆز ڤەرەست و قیتکرە کۆمەکا مرۆڤان خەلک ژێ رەڤبن زەلامەک ما حێشتر ب پێیان ڤە چوو سەر کەلەخێ وی حەتا د بن پێیێن خۆ ڤە کوشتی، خەلکی سەحکرێ دیت ئەو ئەو زەلامە یێ سەعدی نفرین لێ کری!



هندی پێغەمبەرێ زێندی، ملێ سەعدی ب ملێ وی ڤە بوو، ل دەمێ شەڕی و ل دەمێ تەناهییێ ژی، و ل وێ سالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بازێڕێ مەکەهێ ژ دەستێ کافران ئینایەدەر، سەعد ژی د گەل وی بوو، سەعد ل مەکەهێ نساخبوو، وی هزرکر ئەڤە نساخییا مرنێیە، پێغەمبەر هات سەرا وی دا، وی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: من مالەکێ زێدە یێ هەی، و ژ کچەکێ پێڤەتر من چو میراتگر نینن، ئەرێ ئەز وەصیەت نەکەم مالێ من هەمی بۆ خێرێ بت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە.. وی گۆت: پا نیڤا مالێ من؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: نە.. وی گۆت: پا سێئێکا مالێ من؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: سێئێک بلا، و سێئێک گەلەکە، ئەگەر تو میراتگرێن خۆ بهێلی دەولەمەند چێترە ژ هندێ کو تو وان بهێلی هەژار دەستێ خۆ ل بەر خەلکی ڤەگرن.. پاشی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گۆتە وی: بەلکی تو هند بمینییە ساخ حەتا کو پشتی هەڤالێن خۆ بمینی.. سەعدی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز دترسم ل وی عەردی بمرم یێ من هجرەت ژێ کری. مەخسەدا وی پێ مەکەه بوو، و ترسا وی ئەو بوو ئەو ل مەکەهێ بمرت ڤێجا هجەتا وی ژێ نەئێتە قەبویلکرن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ((لَعَلَّكَ أَنْ تَبْقَى حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُوْنَ)) بەلکی تو هند بمینییە زێندی حەتا هندەک مفایی ژ تە ببینن و هندەک زیانێ.

و ئەڤ گۆتنا پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- پشتی هنگی ب شەش حەفت سالەکا ب جهێت..

ئەڤ گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سالا هەشتێ مشەختی بوو، ل سالا سێزدێ ل سەر دەمێ خیلافەتا عومەری موسلمان د شەڕەکێ مەزن دا بەرانبەر فورسێ شکەستن، ئەو شەڕێ دبێژنێ: شەڕێ پرێ (معركة الجسر)، د ڤی شەڕی دا و د ڕۆژەکا ب تنێ دا نێزیکی چار هزار موسلمانان هاتنە کوشتن، و گەلەک ژێ صەحابی بوون، گاڤا خەبەرێ ڤێ شکەستنا مەزن گەهشتییە مەدینێ، ئیمامێ عومەر بڕیار دا ئەو ب خۆ سەرکێشییا لەشکەرێ موسلمانان بکەت و بچتە شەڕێ فورسێ، ل دەسپێکا سالا چاردێ وی لەشکەرەکێ مەزن ئامادەکر، و د گەل وان دەرکەفت دا قەستا عیراقێ بکەت، وی ئیمام عەلی ل جهێ خۆ دانا، و هژمارەکا مەزن یا صەحابییان د گەل خۆ بر.. ب ڕێڤە هندەک صەحابییان ئەو ژ دەرکەفتنێ سستکر و گۆتێ: یا باش ئەوە تو بمینییە ل مەدینێ، ئینا وی بڕیار دا صەحابییێن مەزن کۆم بکەت و بۆچوونا وان وەرگرت، حەتا وی هنارتە ب دویڤ عەلی ژی ڕا دا بێت و ئەو ژی ڕەئیا خۆ بێژت، هژمارەکا مەزن ژ صەحابییان ڕەئیا وان ئەو بوو ئیمامێ عومەر بچتە شەڕی دا حەماس بۆ موسلمانان چێ بت و پتر شەڕی بکەن، بەلێ عەبدرڕەحمانێ کوڕێ عەوفی گۆتێ: د شەڕان دا سەرکەفتن یا هەی و شکەستن ژی یا هەی، و ئەز دترسم ئەگەر تو شکەستی موسلمان ل هەمی جهان لاواز ببن، لەو یا باشتر ئەوە تو بزڤرییە مەدینێ، و مرۆڤەکی بکەیە ئەمیرێ موسلمانان ل عیراقێ و بلا ئەو پێش تە ڤە بچت شەڕی بکەت.

عومەری گۆتێ: تو کێ دبینی ب کێر ڤی کاری بێت؟ وی گۆتێ: شێرێ بیشان، عومەری گۆتێ: ئەو کییە؟ وی گۆت: سەعدێ کوڕێ مالکێ

زوهری.. ئاخفتنا وی کەفتە عەقلێ عومەری لەو عومەری هنارتە ب دویڤ سەعدی ڕا و ئەو کرە ئەمیرێ عیراقێ، و ئەڤ شیرەتە لێ کر و گۆتێ: ئەی سەعدێ کوڕێ ووهەیبی! دلێ خۆ ب هندێ خۆش نەکە کو خەلک دبێژن: ئەو خالێ پێغەمبەرییە و صەحابییێ وییە، خودێ خرابی ب خرابی ناگوهۆڕت، بەلکی ئەو خرابی ب باشی دگوهۆڕت، د ناڤبەرا خودێ و کەسەکێ دا چو نەسەب و مرۆڤاینی نینە طاعەتێ وی تێ نەبت، مرۆڤ مەزنێن وان و بچویکێن وان ل نک خودێ وەکی ئێکن، خودێ خودایێ وانە و ئەو عەبدێن وینە، هندەک ژ وان ب عافیەتێ ب سەر هندەکان دکەڤن، و ئەو ب طاعەتی دگەهنە وی تشتێ ل نک خودێ هەی، ڤێجا تو بەرێ خۆ بدە وی تشتی یێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل سەر حەتا کو ئەم هێلاین کاری پێ بکە ئەوە دین، ئەڤە شیرەتا منە ل تە ئەگەر تو کاری پێ نەکەی و تە پشتا خۆ دایێ کارێ تە هەمی دێ پویچ بت و تو دێ ژ زیانکاران بی.

ب ڤێ چەندێ سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی بۆ ئەمیرێ عیراقێ و سەرلەشکەرێ جیهادا دژی مەجووسییان ل چەپەرێ ڕۆژهەلاتا دەولەتا ئیسلامێ.. و هەر ژ سالا چاردێ حەتا سالا بیستێ، یەعنی: ل درێژییا شەش حەفت سالان سەعد ب ئانەهییا خودێ و هێزا لەشکەرێ ئیسلامێ شیا دووماهییێ بۆ ئمبراتوورییەتا فورسێ بدانت، و بۆ حەتاحەتایێ ناڤێ کیسرایی ژ سەر عەردی ڕاکەت، و ئاشکەرایە کو سەعد سەرلەشکەرێ موسلمانان بوو ل شەڕێ قادسییێ ئەوێ موسلمان تێدا ب سەرکەفتین، و پشتی هنگی ب دەمەکێ کێم بەر ب پایتەختا فورسێ (تیسەفوونێ) ڤە چووین، و دەستێ خۆ دانایە سەر کۆچکا کیسرایی.. و سەعد ئەو سەرۆک لەشکەر بوو یێ چوویە د قەسرا کیسرایی ڤە و هەشت رکاعەت وەک سوننەتا شوکرێ بۆ خودێ ل وێرێ کرین، و ئەڤ ئایەتە خواندی دەمێ دیتی

ئەو ژ خودانا ڤالابووی: ﴿ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الدخان: ٢٥-٢٩). و پشتی سەرکەفتن ب دووماهی هاتی و سەعدی دەسکەفتی ل دویڤ شریعەتی لێکڤەکرین، وی پێنجئێکا دەسکەفتییان هنارتە مەدینێ ل نک خەلیفەی، گاڤا عومەری ئەو هەمی مال دیتی ب عەجێبی ڤە گۆت: ئەو مللەتێ ئەڤ هەمی مالە هنارتی مللەتەکێ ئەمینە.. ئیمام عەلی گۆتێ: تە دەستپاکی و (عففەت) ب کارئینا لەو رەعییەتا تە ژی دەستپاک بوون، و ئەگەر تو یێ خائین بای ئەو ژی دا خیانەتێ کەن!

د ڤان شەرێن مەزن دا دژی مەجووسییان سەعدی دەورێ خۆ وەک ئەمیر ب تمامی و دورستی ب جهئینا، و ئەگەر ئەم بەحسێ سەرهاتییا وی د گەل جیهادێ و شەرێن وی کرین ب بەرفرەهی بێژین دەم تێرا مە ناکەت.



پشتی پاقژکرنا عیراقێ ژ ئاگرێ مەجووسییەتێ و بلندکرنا ئالایێ تەوحیدێ، سەعد بوو مەزنێ عیراقێ و ئەو وەک ئەمیر ل باژێرێ کووفە ئاکنجیبوو، و چیرۆکا عیراقییان د گەل مەزنێن وان د دیرۆکێ هەمییێ دا چیرۆکەکا عنتیکەیە.. وەختەکی هندەک ژ خەلکێ کووفە چوونە مەدینێ ل نک خەلیفەی دا گازندەیەکێ ل ئەمیرێ خۆ بکەن.. و هوین دزانن گازندەیا وان ل سەر چ بوو؟

وان گۆتە عومەری: ئەو ئەمیرێ تە بۆ مە هنارتی نزانت نڤێژێ بکەت؟ بەلێ.. گۆتن: ئەو نزانت نڤێژێ دورست بکەت!! ما نە (نوکتەیەکا ب کەنییە) سەعدێ سێیەمین کەسێ هاتییە د ئیسلامێ دا و دەرچوویێ مالا ئەرقەمی ب دیتنا عیراقییان نزانت نڤێژێ بکەت!

ئەڤ گازندە ل سالا بیست و ئێکێ بوو.. عومەری باش دزانی کو ئەڤ گۆتنا وان درەوە، ئەگەر سەعد نەزانت نڤێژێ بکەت پا کی دزانت نڤێژێ بکەت؟ بەلێ ئیمامێ عومەر تێ ئینادەر کو دبت ڤێ هێجەتێ تشتەکێ دی د پشت ڕا هەبت، و عومەری باش دزانی ئەو جهێ باوەری لێ د ناڤبەرا مللەتی و مەزنان دا نەبت ئەو جهـ یێ رحەت نابت، لەو وی بڕیار دا سەعدی بێخت، و بزڤڕینتە مەدینێ، پشتی ئەو ب تمامی ب دەورێ خۆ ڕابووی.. هەر چەندە وی دزانی کو سەعد نە ب تنێ ب کێر دئێت ببتە ئەمیر، بەلکی ئەو ب کێر دئێت ببتە خەلیفە ب خۆ ژی، لەو دەمێ عومەر هاتییە بریندارکرن و وی ڤیای ئێکی بدانتە جهێ خۆ وی شەش کەس هلبژارتن و ژ موسلمانان خواست ئەو ئێک ژ وان بۆ خۆ بکەنە خەلیفە و سەعد ئێک ژ وان بوو.

بەلێ سەعدی بڕیارا خۆ دا بوو ئەو ژی خۆڤەکێشانە ژ مەیدانا سیاسەت و هەڤڕکییێ، لەو هەر ژ سەری وی (تەنازول)کر وەکی مە بەحس ژێ کری دەمێ مە سەرهاتییا هلبژارتنا ئیمامێ عوثمان بۆ خیلافەتێ ڤەگێڕای.



ل سەر دەمێ ئەبووبەکر و عومەر و عوثمانی ژی سەعد ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن خەلیفەی بۆچوونا وی وەردگرت و گەلەک جاران ب گۆتنا وی دکر، و ل سەر زەمانێ ئیمام عەلی و پشتی دوبەرەکی کەفتییە ناڤ ڕێزا موسلمانان، ئەو دوبەرەکییا سەر کێشایە هەڤڕکی و لێککەفتنێ سەعدی -وەکی پترییا صەحابییێن وی دەمی دزێندی- بڕیار دا بمینتە ل مەدینێ، و شیرێ خۆ بشکێنت، و خۆ نەدەتە د گەل چو لایان.. و هندەک کەسان حەتا نێزیکێن وی نەرازیبوونا خۆ ل سەر ڤێ چەندێ دیارکر،

جارەکێ کوڕێ وی عامری دان و ستاندن سەرا ڤێ چەندێ د گەل وی کر، ئینا وی گۆتێ: کوڕێ من! تو داخوازێ ژ من دکەی ئەز ل دەمێ فتنێ ببمە سەر! نە ب خودێ هنگی ئەز دێ وە کەم حەتا شیرەکی بدەنە من گاڤا من ئەو دانا موسلمانەکی ڤێ نەکەڤت، و گاڤا من دانا کافرەکی وی بکوژت، من یێ گوهـ ل پێغەمبەری بووی -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((خودێ حەز ژ وی کەسی دکەت یێ بێ منەت و ڤەشارتی و ب تەقوا بت)).

و د گەل هندێ کو وی خۆ نەدابوو د گەل چو لایێن هەڤڕکییێ ژی ئەو یێ دل صافی بوو د گەل هەردو لایان و دوعایا خێرێ بۆ هەمییان دکر، و هیڤییا وی ئەو بوو ڕۆژەک بێت ڕێزێن موسلمانان ببنە ئێک و ئەڤ دوبەرەکییە نەمینت.

ل تەنشت بازێڕێ مەدینێ، وی جهێ دبێژنێ: عەقیق، سەعدی خانییەک هەبوو، ئەو دووماهییا عەمرێ خۆ چووبوو لێ ئاکنجی بووبوو، و خۆ ژ خەلکی ڤەدەر کربوو حەتا کو ل سالا ٥٥ مشەختی ئەو چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ پشتی کو پتر ژ حەشتێ سالان دەرباسکرین، و ئەو ل ناڤ زیارەتێن بەقیعێ ل مەدینێ هاتییە ڤەشارتن.

هندەک زانایێن دیرۆکێ دبێژن: سەعدی دووماهی صەحابییێ موهاجر بوو مری. دبێژن: ئەو کراسێ وی شەڕێ بەدرێ پێ کری وی هلگرتبوو و دەمێ کەفتییە بەر مرنێ وی وەصیەتکر کو ب وی کراسی وی کفن بکەن و ڤەشێرن، گۆت: من ئەو بۆ ڤێ ڕۆژێ یێ هێلای.

# زوبەیرێ کوڕێ عەووامی

ئەو صەحابییێ ڤێ جارێ ئەم بەحس ژێ دکەین ژ وان مرۆڤان بوو یێن کریارێن وی پتر ژ گۆتنان، ئەو ژی ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب ساخی مزگینیا بەحەشتێ دایێ، ژییێ وی -وەکی یێ سەعدی- ل دۆرێن شازدە هەڤدە سالییێ بوو دەمێ هاتییە د ئیسلامێ دا، و ئەو ژی وەکی سەعدی ل سەر دەستێ ئەبووبەکری هاتبوو د ئیسلامێ دا و هەر ل وێ ڕۆژێ یا سەعد تێدا موسلمانبووی، لەو هژمارا وی ژی د ناڤ هەر حەفت کەسێن ئێکێ دا بوو یێن هاتینە د ئیسلامێ دا..

ڤیانا جیهادێ و شەهیدبوونا د ڕێکا خودێ دا وەکی خوینێ د لەشێ وی دا دگەڕیا، حەفت کوڕێن وی هەبوون وی هەر ئێک ژ وان ب ناڤێ شەهیدەکێ ئیسلامێ ب ناڤ کربوو دگۆت: بەلکی ئەو ژی وەکی وان شەهید ببن.. صەحابییەکێ هەڤالێ وی دبێژت: ڕۆژەکێ ئەز د گەل وی چوومە سەفەرەکێ، جارەکێ وی کراسێ خۆ ژ بەر خۆ کر من دیت لەشێ وی هەمی جهێ برینانە، من گۆتێ: ئەڤە تە خێرە دێ بێژی لەشێ تە هەمی ب کێرێ یێ هاتییە قەدقەدکرن؟ وی گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەڤ تشتێ تو ل سەر لەشێ من دبینی هەمی شوینێن وان برینانە یێن د گەل پێغەمبەری و د ڕێکا خودێ دا کەفتینە لەشێ من!

ئەگەر سەعد -وەکی مە گۆتی- کوڕخالێ پێغەمبەری بت -سلاڤ لێ بن- صەحابییێ مە یێ ڤێ جارێ کوڕمەتێ پێغەمبەری بوو، ژ بلی

مزگینیدانا ب بەحەشتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خەلاتەکێ دی ژی دابۆیێ، یان بلا بێژین: نیشانەکا دی یا قەهرەمانییێ ب سنگێ وی ڤە کربوو، دەمێ گۆتی: ((لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ))[1] یەعنی: هەر پێغەمبەرەکی هەڤالەکێ نێزیک و پشتەڤانەکێ هەی، و هەڤال و پشتەڤانێ من زوبەیرە.

زوبەیرێ کورێ عەووامێ کورێ خوەیلدێ کورێ ئەسەدێ کورێ عەبدلعوززایێ کورێ قوصەیێ کورێ کیلابێ قورەیشی، ژ بابکێ ئەسەدەییان بوو، و ئەو ل قوصەیێ کورێ کیلابی دگەهتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، دەیکا وی صەفییایا کچا عەبدلموطەلبی بوو، مەتا پێغەمبەری، و بابێ وی مربوو هێشتا ئەو یێ بچویک لەوا ئەو ب ئێتیمی هاتبوو مەزنکرن.

دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی ژییێ زوبەیری شازدە سال بوو، و چونکی ئەو ژی ئێک ژ هەڤالێن نێزیک بوو بۆ ئەبووبەکری د گەل وێ فەرقا بەرچاڤ یا د ناڤبەرا ژییێ وان دا هەی، ئەبووبەکری پشتی باوەری ب پێغەمبەری ئینای ئێکسەر هزر ل هندێ کر ئەو هەڤالێن خۆ یێن نێزیک ژی بۆ ڤێ خێرێ گازی بکەت، و زوبەیر ئێک ژ وان هەڤالان بوو، و ژ بەر کو پێغەمبەر سلاڤ لێ بن- کورخالێ زوبەیری بوو، و زوبەیری ئەو باش و ژ نێزیک دنیاسی، زوبەیر د ڕاستگۆییا وی دا نەکەفتە گومانێ و ئێکسەر باوەری پێ ئینا و خۆ دا د گەل کاروانێ خودان باوەران.

موسلمانبوونا زوبەیری ژی، وەکی یا پترییا صەحابییان ب بێدەنگی نەچوو سەری، مامێ زوبەیری ڤاڤا زانی ئەو یێ موسلمانبووی و دینێ باب

---

(١) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن.

و باپیرێن خۆ یێ هێلای، وی هەلویستەکێ توند و دژوار وەرگرت، و ئەو گرت و هلاویست و ئاگر ل بەر دفنا وی بەردا حێسیلکان دا بخندقینت یان ژی دا ل دینێ باب و باپیران بزڤڕتەڤە، بەلێ د گەل ڤێ هەمییێ زوبەیر لێڤە نەبوو و وی گۆتە مامێ خۆ: تو چ دکەی بکە ئەز قەت ل کوفرێ نازڤرم. گاڤا مامێ وی دیتی ڤێ عەزابدانێ چو پێڤە نائێت وی زوبەیر بەردا..

ل وان ڕۆژان دەمێ ژ نوی دەنگ و باسێن ئیسلامێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ دبوون، ل نیڤرۆییەکێ زوبەیرێ گەنج د نهالەکا ژ دەرڤەی مەکەهێ دا بوو بێنا خۆ ڤەددا، کەسەک د بەر ڕا بۆری و گۆتێ: قورەیشییان موحەممەد کوشت! وەکی مرۆڤەکێ دیناتی ب سەری کەفتی زوبەیری شیرێ خۆ ڕویسکر و ب نک مەکەهێ ڤە هات، و ژ بیر نەکەن هنگی عەمرێ وی ل دۆرێن شازدە سالییێ بوو، دەمێ ئەو گەهشتییە مەکەهێ ئێکەمین کەسێ کەفتییە د ڕێکا وی دا پێغەمبەر بوو، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب ڤی ڕەنگی دیتی، گۆتێ: تە خێرە زوبەیر؟ وی گۆت: من گوهـ لێ بوو کو قورەیشییان تو یێ کوشتی.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ڤێجا تو دا چ کەی؟ وی گۆت: ئەز دا تۆلا تە ژ خەلکێ مەکەهێ ڤەکەم! ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڕوییێ وی دا گرنژی و دوعایا خێرێ بۆ وی کر.. و دبێژن: ئەڤە جارا ئێکێ بوو ئێکەمین جار شیر د ئیسلامێ دا بێتە ڕویسکرن.

و ئەڤە هندێ دگەهینت کو زوبەیر هەر ژ دەسپێکێ ژ وان کەسان بوو یێن ئامادە بەرانبەر خەلکی هەمییێ ڕاوەستن بۆ ب سەرێخستنا حەقییێ، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو زوبەیر ژ وان موسلمانێن کێم بوو یێن ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مالا ئەرقەمی هاتینە پەروەردەکرن، و

ئەو ژ وان خودان باوەران بوو یێن نەخۆشییەکا زێدە ژ دەستێ کافران دیتین، لەو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایە هەڤالێن خۆ کو ئەو مشەخت ببنە وەلاتێ حەبەشە، زوبەیر ئێک ژ وان بوو یێن مشەختبووین، و چەند سالەکان ماینە ل وێرێ.

پشتی چەند سالەکان ژ مانا وی ل حەبەشە، ئەو زڤری مەکەهێ، سالەکێ بەری کو موسلمان ژ مەکەهێ بچنە مەدینێ، و د ڤێ سالێ دا ئەو بوو زاڤایێ ئەبووبەکری، کچا وی یا مەزن (ئەسماء) ڤەگوهاست، و ل وی دەمێ ژنکا وی (ئەسماء) ب کورێ وی یێ نەخری (عەبدللاهی) یا گران

دەستویری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتەدان کو ئەو مشەخت ببت، و چونکی ئەبووبەکر بۆ هەڤالینییا پێغەمبەری هاتە هلبژارتن، بارێ گرانێ ڤێ سەفەرا ب ترس و ڤەشارتی کەفتە سەر ملێن مالا ئەبووبەکری، و کچا وی ئەسماء ژنکا زوبەیری دەورەکێ بەرچاڤ د چەندێ دا هەبوو، ل وان ڕۆژێن بابێ وێ ئەبووبەکر د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د شکەفتێ ڤە دڤەشارتی هەر ڕۆژ ئەسمائێ مێدەکەکا خوارنێ بۆ وان دبر بێی کەس پێ بحەسییێت.. و پشتی هەمی پێکڤە ل مەدینێ گەهشتینە ئێک و ل وێرێ کۆمبووین، کورێ زوبەیری (عەبدللاهـ) ئێکەمین زارۆک بوو د ناڤ موسلمانان دا هاتییە سەر دنیایێ، لەو دەنگێ (الله أكبر) ژ مالێن موسلمانان هاتە بهیستن؛ چونکی منافق و جوهییان وە کربوو دەنگ کو چو زارۆک د ناڤ موسلمانان دا نابن پشتی ئەو هاتینە مەدینێ!



ل مەدینێ زوبەیر ژ وان صەحابییان بوو یێن هەردەم نێزیکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و د شەڕەک ژ وان شەڕان دا یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرین ئەو پاشدا نەمابوو، و د هەمییان دا یێ پشکدار

بوو، د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ل ڕۆژا بەدرێ دەمێ ملیاکەت بۆ پشتەڤانییا صەحابییان هاتینە خوارێ وان خۆ وەکی زوبەیری لێ کربوو، و زوبەیر ل وێ ڕۆژێ مەزنێ لایێ ڕاستێ یێ لەشکەری بوو، و مقداد مەزنێ لایێ چەپێ بوو، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل نیڤێ بوو.

ل ڕۆژا ئوحودێ ژی زوبەیر ژ وان کەسان بوو یێن دەورەکێ بەرچاڤ گێڕای، دەمێ شکەستن کەفتییە ناڤ ڕیزێن موسلمانان، و وان خۆ ڤەکێشایە سەر چیایێ ئوحودێ، ترسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمانان ئەو بوو کافر هێرشێ بدەنە سەر مەدینێ، و ل وێرێ منافق و جوهی هاری وان بکەن و بازێڕی بندەست بکەن، هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەڤالێن خۆ خواست هندەک ژ وان ب دویڤ لەشکەرێ کافران دا بچن؛ دا کافر هزر نەکەن موسلمانان چو هێز نەمایە، ل وی دەمێ تەنگاڤی ل سەر موسلمانان یا دژوار، و ترس یا زێدە، و لەشێن وان تژی برین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ هەڤالێن خۆ دا گۆت: کی دێ ب دویڤ وان چت دا ئەو بزانن کو هێشتا مە هێزا مای؟ هنگی زوبەیر و خەزویرێ وی ئەبووبەکر د گەل حەفتێ زەلامان ب دویڤ لەشکەرێ کافران دا چوون، و ئەڤەیە دەمێ ئایەتا قورئانێ دبێژت: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُواْ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ ﴾ (آل عمران: ١٧٣-١٧٤) یەعنی: ئەوێن موشرکان گۆتییێ: هندی مرۆڤن کۆمبووینەڤە و ڤێ جارێ ئەو دێ ئێن هەوە برینن، ڤێجا هوین ژ وان بترسن، چونکی هوین نەشێنە وان، بەلێ ڤێ ترساندنێ باوەرییا وان ب سۆزا خودێ پتر لێ کر، و ڤێ چەندێ ئەو سست نەکرن، و ئەو چوونە وی جهێ خودێ حەزکری، و گۆتن: خودێ تێرا مە هەیە و ئەو چێترین

وەكیلە. ئینا ئەو ب قەنجی و خێرەكا مەزن زڤڕینەڤە، و خودێ مەرتەبەیەكا بلند دا وان، و باوەرییا وان زێدەتر و پتر لێ هات، و وان دوژمنێن خودێ ڕەزیلكرن، و ئەو ژ كوشتن و شەڕی هاتنە پاراستن، و وان ب گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی دویكەفتنا ڕازیبوونا خودێ كر. و خودێ خودانێ قەنجی و دانەكا مەزن و بەرفرەهە ل سەر وان و ل سەر خەلكێ دی.

ل شەڕێ خەندەكێ ژی دەمێ ترس زێدەبووی و كار ب زەحمەت كەفتی، و خەبەرەک گەهشتییە موسلمانان كو جوهییێن (بەنووقورەیظە) خیانەتا كری و یا خۆ دایە د گەل كافران ئەوێن ئەڤە نێزیكی بیست ڕۆژانە باژێرێ مەدینێ دۆرپێچكری، و ئنیەتا وان ئەوە ژ پشتێ ڤە هێرشێ بدەنە سەر موسلمانان.. ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ۝ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ۝ ﴾ (الأحزاب: ١٠-١١) یەعنی: گەلی خودانا باوەران، هوین ل بیرا خۆ بینن دەمێ كافر ژ لایێ د سەر هەموە دا هاتینە هەموە، و ژ لایێ دبن هەموە ژی دا، دەمێ ژ مەندەهۆشییان دا چاڤ زلبووین، و دل ژ ترسان دا گەهشتینە گەروییێ، و هەموە هزرێن خەلەت ژ خودێ دكرن یا ژ هەوەڤە ئەو دینێ خۆ ب سەر نائێخت، و پەیڤا خۆ بلند ناكەت. ل وی دەمێ بەرتەنگ و نەخۆش باوەرییا خودان باوەران هاتە جەڕباندن و ئەو هاتنە ڤاڤارتن، و یێ خودان باوەر ژ یێ دوڕی هاتە جوداكرن، و ئەو ب ترس و دودلییێ ب ڕەنگەكێ دژوار هاتنە هژاندن.

ل وی دەمێ ترس گەهشتییە ڤی حەددی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ناڤ هەڤالێن خۆ دا كی دێ ب لایێ جوهییان ڤە چت دا بەرێ خۆ بدەتێ كانێ ئەو خەبەرێ گەهشتییە مە ژ وان یێ ڕاستە یان نە؟ سێ جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە گۆت، هەر سێ جاران زوبەیری

گـوّت: ئـەز.. و ئەڤـە نیشـانا زیرەکییـا وی بـوو.. بـەری زوبـەیر بچـت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب تنێ گۆتێ: ئەگەر ئەو خەبەرێ گەهشتییە مە ژ جوهییان یێ دورست بوو، دەمێ تو دزڤری د ناڤ خەلکی دا نەبێژە ئەو یێ دورستە؛ دا (مەعنەوییاتێن) وان نەشکێن، هەما بێژە: (عەضەل و قارره) و ئەو ناڤێ دو ئویجاخێن عەرەبان بوون بەری هنگی خیانەت ل موسلمانان کریوو. زوبەیری داخواز و فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا، و هنگی بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی: هەر پێغەمبەرەکی هەڤالەکێ نێزیک و پشتەڤانەکێ هەی، و هەڤال و پشتەڤانێ من زوبەیرە.



کانێ چاوا زوبەیر هەردەم د گەل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- و د هەمی شەڕێن وی دا ل پێشییێ یێ ئامادەبوو، وەسا ئەو ل سەر دەمێ خەلیفەیێن راشدی ژی ئێک ژ شێوەرمەندێن وان یێن نێزیک بوو، و شیرێ وی بۆ بەرەڤانییا ژ ئیسلامێ هەردەم یێ ڕویس بوو.. ل سەر زەمانێ خیلافەتا عومەری دەمێ وی عەمرێ کوڕێ عاصی هنارتی دا مصرێ ڤەکەت، ئەو لەشکەرێ د گەل عەمری تێرا نەدکر، ئینا وی داخواز ژ ئیمامێ عومەر کر کو ئەو هێشتا لەشکەری بۆ وی بهنێرت، عومەری چار هزار کەس هنارتن هەر هزاران مەزنەک هەبوو، ئەو ژی ئەڤە بوون: زوبەیر و مقداد و عوبادەیێ کوڕێ صامتی و مەسلەمەیێ کوڕێ موخەللەدی، و عومەری کاغەزەک بۆ عەمری هنارت تێدا نڤیسی: ئەڤە من چار هزار کەس بۆ تە هنارتن، هەر هزاران مرۆڤەک مەنێ وانە پێش هزارن ڤەیە.. یەعنی: ئیمامێ عومەر ل وێ باوەرێ بوو کو زوبەیر د شەڕی دا پێش هزار مرۆڤان ڤەیە، و هزرا عومەری ڕاست دەرکەفت، دەمێ زوبەیر گەهشتییە عەمری

ل مصرێ، دیت وی (حصنێ بابلیوونێ) یێ دوورپێچکری، و ژ بەر ئاستێبوونا حصنی ئەو نەشێن وی بستینن، دەمێ حیصارێ درێژبوو، و نێزیکبوو موسلمان بێ هیڤی ببن و بزڤرن، رۆژەکێ زوبەیری گۆتە عەمری: ئەز دێ خۆ گۆری خودێ کەم، و هیڤییا من ئەوە خودێ سەرکەفتنێ ب وێ چەندێ بدەتە موسلمانان، زوبەیری پێسترکەکا درێژ ئینا و ژ لایەکێ حصنی ڤە ب سەرکەفت، و بەری هنگی وی گۆتبوو موسلمانان: هوین د دویڤ من دا وەرن، گاڤا ئەز ب سلامەتی ب سەرکەفتم، ئەز ب دەنگەکێ بلند دێ (تەکبیرەکێ) دەم، هوین د دویڤ من دا ب سەرکەڤن.. دەمەکێ کێم پێڤە نەچوو وان هند دیت زوبەیر یێ ل سەر حصنی و یێ دبێژت: (اللـه أکبر) و شیرێ وی یێ د دەستان دا، وان ب لەز دا ب دویڤ وی ڤە حەتا کۆمەکا مەزن ژ وان ل نک وی گۆمبووین، گاڤا رۆمێ دیتی موسلمان ب سەر حصنی کەفتن، وان خۆ ڤەکێشا و رەڤین، و ب ڤێ چەندێ موسلمان ئەو جهـ ستاند، و ب ڤێ ستاندنێ دەرگەهێ ڤەکرنا مصرێ ل بەر لەشکەرێ ئیسلامێ ل تاق بوو، و زوبەیری بۆ عومەری بنەجهکر کو هزرا وی یا د جهێ خۆ دا بوو دەمێ وی گۆتی: زوبەیر ب هزار زەلامانە.

بەری نوکە، دەمێ مە سەرهاتییا عومەری ڤەگوهاستی، مە گۆتبوو: دەمێ ئیمامێ عومەر هاتییە بریندارکرن، و بەری ئەو تمام ببت، وی ئاگەهدارییا صەحابییان کر کو ئەگەر ئەو کەسێ نەدانتە جهێ خۆ ئێکێ ژ وی باشتر ئەڤ چەندە یا کری، کو پێغەمبەرە -سلاڤ لێ بن- و ئەگەر ئەو ئێکێ دەسنیشانکری بدانتە جهێ خۆ ئێکێ ژ وی چێتر ئەڤ چەندە یا کری، کو ئەبووبەکرە، بەلێ ئەو نە ڤێ چەندێ دکەت نە ڤێ، بەلکی ئەو دێ تشتەکێ دی یێ جودا کەت، و ئەو بوو وی هنارتە ب دویڤ وان بەرمایا وان هەر دەهـ کەسان را یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب چوونا

بەحەشتێ دایێ، و ئەو شەش بوون، پشتی کو عومەری پسمامێ خۆ سەعیدێ کورێ زەیدە دایە لایەکی.. ئێک ژ وان هەر شەشان زوبەیر بوو، بەلێ چونکی زوبەیری دل د خەلیفاتییێ نەبوو، وی (تەنازول) بۆ عەلی کر، و هەڤالێ وی طەلحەی (تەنازول) بۆ عوثمانی کر، و سەعدی (تەنازول) بۆ عەبددرەحمانی کر.. و ئەو بوو پشتی هنگی خیلافەت گەهشتە ئیمامێ عوثمان، وەکی مە بەری نوکە بەحس ژێ کری.

دەمێ ئیمامێ عوثمان ژ لایێ فتنەچییان ڤە هاتییە کوشتن، ئەو صەحابییێن ل مەدینێ دئامادە هەمی ل سەر هندێ پێکهاتن کو عەلی بدانە جهێ عوثمانی، و (بەیعەتا) وی بکەن، و زوبەیر ئێک ژ وان کەسان بوو یێن (بەیعە) دایە عەلی و رازیبووی ئەو ببتە خەلیفە، و ئەڤە تشتەکێ غەریب نینە ژ وی، ما نە هەر ئەو بوو یێ بەری هنگی (تەنازول) بۆ عەلی کری دەمێ عومەری ئەو هەر شەش هلبژارتین؟

د هندەک ریوایەتێن بێ بناخە و درەو دا هاتییە کو زوبەیر و طەلحەی نە ژ دل (بەیعە) دا عەلی، و ئەڤە گۆتنەکا نە هێژایی ڤان مرۆڤانە، نە زوبەیر و طەلحە ژ وان کەسان بوون یێن ژ ترسان دا بەیعێ بدەنە عەلی، و نە عەلی هنگی ئەو هێز هەبوو ئەو ژێ بترسن، پشتی هنگی عەلی ب خۆ ژی نە ئەو کەس بوو یێ (بەیعەیەکا) نە ژ دل قەبویل بکەت.. بەلێ تشتێ بەرێ ڤان کەسان دایە ڤێ هزرێ ئەو خیلاف بوو یا پشتی هنگی د ناڤبەرا عەلی و زوبەیر و طەلحەی دا چێبووی..

بناخەیێ وێ خیلافا د ناڤبەرا صەحابییان دا چێبووی -وەکی زانایێن (موعتەبەر) ژ ئەهلێ سوننەت و جەماعەتێ دبێژن- خیلافەکا فقهی بوو، و ئەو قەت یا سیاسی نەبوو، هەر چەندە هندەک کەسان -ب تایبەتی ژ یێن هەڤچاخ- وەسا دڤێت مە تێ بگەهینن کو ئەو خیلافەکا سیاسی بوو، و

ئارمانج ژێ گەهشتنا کورسیکێ بوو، و ئاشکەرایە کو هەر ئێک یا دلێ خۆ دبێژتە یێ بەرانبەر! ئیمامێ نەوەوی دبێژت: ((تو بزانە کو ئەگەرا وان شەڕان ئەو بوو مەسەلە گەلەک وەکی ئێک بوون، و هندی هند ئەو وەکی ئێک بوون ئجتهیادا وان ژێکجودابوو، و ئەو بوونە سێ دەستەک:

- هندەکان ئجتیهادا وان بەرێ وان دا هندێ کو حەقی یا د گەل ڤی لایی، لەو یا فەر ل سەر وان ئەوە ئەو پشتەڤانییا ڤی لایی بکەن، و لایێ دی حسێب بکەن تەعداکەر، و دڤێت شەڕێ تەعداکەری بێتەکرن، و نابت بۆ مرۆڤی ئەو خۆ ژ پشتەڤانییا ئیمامێ عادل بدەتە پاش دەمێ ئەو ب کرنا شەڕێ تەعداکەران رادبت.

- بەرەڤاژی وان هندەک هەبوون ئجتیهادا وان بەرێ وان دا هندێ کو حەقی یا ل لایێ دی، لەو دڤێت ئەو پشتەڤانییا لایێ دی بکەن، و د گەل وی شەڕێ تەعداکەران بکەن.

- هندەکێن دی مەسەلە ل بەر وان یا زەلال نەبوو، و ئەو حێبەتی مان کانێ پشتەڤانییا کێ بکەن، و نەشیان (تەرجیحا) لایەکی ل سەر لایەکێ دی بکەن، لەو وان دیت یا واجب د دەرحەقا وان دا ئەوە ئەو پشت بدەنە هەردو لایان، بێی کو لایەکی ب سەر لایەکێ دی بێخن)).

ئەصلێ خیلافێ ل سەر مەسەلا کوشتنا ئیمامێ عوثمان هاتبوو ئاڤاکرن، بەری نوکە مە سەرهاتییا کوشتنا ئیمامێ عوثمان ڤەگێڕابوو، و مە گۆت: پشتی ئیمام عوثمان هاتییە شەهیدکرن، و ئەو صەحابییێن ل مەدینێ هەمییان پێکڤە بەیعە دایە ئیمام عەلی، مەسەلەک (کو د بنیات دا یا فقهییە) د ناڤبەرا صەحابییان دا هاتە ئازراندن: ئەرێ دڤێت تۆلا عوثمانی هەر نوکە بێتە ستاندن، یان یا باشترە ئەوە نوکە ئەڤ سوحبەتە بێتە پاشئێخستن حەتا دەلیڤە بۆ وێ هل دکەڤت؟

جارێ صەحابی هەمی ل وێ باوەرێ بوون کو عوثمان یێ مەظلوومە، و ئەوێن ئەو کوشتی تاوانبارن و دڤێت جزایێ خۆ وەرگرن، و ئیمام عەلی ب خۆ ل سەر ڤێ بۆچوونێ بوو، بەلێ تشتێ ئیمام عەلی دگۆت ئەڤە بوو: ئەڤ حەقێ هە یێ کو دڤێت بێتە ستاندن، نوکە ژ بەر گەلەک ئەگەران نە مومکنە بێتە ستاندن، دڤێت ئەم خۆ بگرین حەتا کاودان رحەت دبن؛ دا ئەم بشێین ڤی حوکمی ب جهـ بینین بێی کو هندەک کارڤەدانێن خراب ژێ پەیدا ببن.

ل مەدینێ وی دەمی پێلەکا (عاطفی) یا دژوار د ناڤ ڕێزێن خەلکی دا (خاص و عامان) هەبوو داخوازا تۆلستاندنێ دکر، ژ بەر حەجمێ مەزنێ وێ جەریمێ یا کو ل بەر چاڤێن وان چێببووی، و ئەو جارا ئێکێ بوو تشتەکێ هۆسا د ناڤ موسلمانان دا چێ دبت و ل مەدینێ! داخوازا تۆلستاندنێ ب دژواری دهاتەکرن، و ژ بەر کو عەلی بۆ خیلافەتێ هاتبوو هلبژارتن، و خەلکی وەک (بەرپرس) بەرێ خۆ ددا وی، ئەڤ داخوازە ژ وی دهاتەکرن.. ژ لایەکێ دی ڤە، ئەو فتنەچییێن دژی عوثمانی ڕابوون و ب کارێ کوشتنا وی ڕابووین هژمارا وان ب سەدان و هزاران بوو، و ئەو دچەکدار بوون، و ل مەدینێ و ژ دەرڤەی مەدینێ ژی دبەلاڤبوون، و وان گەف ل خەلکی دکر، و بۆ فێلبازی وان خۆ دا د گەل لەشکەرێ ئیمام عەلی، ب وێ هێجەتێ کو ئەو خەلیفەیە..

ل ڤێرێ بۆچوونا عەلی و یا هندەک صەحابییێن دی ژ هەڤالێن وی ژێکجودابوو، وی گۆت: نوکە مە هێزا بەرگرییا ڤان فتنەچییان نینە، و چو گرفتاری د هندێ نینە ئەم نوکە (حوکمەکێ شەرعی) پاشدا ببەین، و ئەڤە تشتەکە پێغەمبەری ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- د ژیانا خۆ دا کربوو، دەمێ وی حوکمێ (قەذفێ) ل سەر عەبدللاهێ کوڕێ سەلوولی ب کار نەئینای؛

دا فتنە مەزنتر لێ نەئێت. ئەڤە بۆچوونا عەلی بوو. هندەک صەحابییێن دی و ل پێشـییا وان (طەلحە و زوبەیر) بـوون گـۆتن: نـەخێر! ئـەم دشـێین بەرانبەر فتنەچییان ڕاوەستین، و دڤێت ئەم ڤێ چەندێ بکـەین، و طـەلحەی گۆتە عـەلی: بهێلـە دا ئـەز بچمـە بەصرا دەرسـەکێ بدەمـە وان.. و زوبـەیری گۆت: ئەز ژی دێ چمە کووفە بەرانبەر وان ڕاوەستم؛ دا ئـەو سوپاهی نـەئێن ل مەدینێ گەفێ ل تە بکەن. بەلێ عەلی گۆتە وان: نەخێر! یا دورست ئـەوە ئەم نوکە چو تشتێن وەسا نەکەین.

ب ڤی ڕەنگی صەحابی ل سەر دو بۆچوونـان ژێکجودابـوون، و هنـدەک صـەحابییێن دی هـەبوون گـۆتن: ئەڤـە فتنەیـە و ئـەم نـزانین بۆچوونـا کـێ یـا دورستە لەو ئەم خۆ نادەینە د گەل چو ژ هەردو لایان. و بـارا پتـر ژ مـەزنێن صەحابییان ل سەر ڤێ بۆچوونێ بوون..

گاڤـا طـەلحـە و زوبـەیری دیتـی ئیمـام عـەلی داخـوازا وان ب جهـ نائینت، و ێ سستییێ د مەسەلا وەرگرتنا تۆلا عوثمانی دا دکەت، وەکـی وان هزرکری، وان گـۆت: دڤێـت ئـەم ب دەسـتێ خۆ ب ڤـی کـاری ڕابـین، و ئەگەر مە سستی د پاراستنا عوثمانی دا کربت، دڤێت ئەم سـستییێ د تـۆلا وی دا نەکەین؛ دا حوکمێ خودێ د ناڤ مەدا بێ بها نەبت..

بـۆ ب جهئینانـا ڤـێ ئارمـانجێ طـەلحـە و زوبـەیر و گەلـەک ژ وان کەسێن وەکی وان هزر دکر ژ مەدینێ دەرکەفتن و چوونـە مەکەهێ، و هنگـی دەیکـا موسـلمانان عائیشـا ژی ل مەکـەهێ بـوو، و ئـەو ژی ئێـک ژ وان صەحابییان بوو یێن دگۆتن: دڤێت تۆلا عوثمانی بێتـە ستاندن.. و هنگـی گەلەک کەس ژ مالباتا عوثمانی، ژ بەنوو ئومەییە، ل مەکەهێ بوون، ئەڤـە ل سالا ٣٦ مشـەختی بـوو، پشـتی دان و سـتاندنێ پلانـا وان ئـەو بـوو ئـەو لەشـکەرەکی ئامادەکـەن و بـەر ب بەصـرا ڤـە بچـن، پاشـی بچنـە کووفـە، و

خەلکی دژی کوژەکێن عوثمانی بەرهەڤ بکەن، و وان بدەنە د گەل خۆ؛ دا پشتی هنگی بچن وان ژ ناڤ لەشکەرێ عەلی دەربێخن و بکوژن.

لەشکەرێ طەلحە و زوبەیری -و عائیشا ژی د گەل وان دا بوو- ژ مەکەهێ دەرکەفت و بەر ب بەصرا ڤە چوو، و وان پەیوەندی ب خەلکێ بەصرا و مەزنێن وان ڤە کر بۆ هندێ کو ئەو هاریکارییا وان بکەن د وێ ئارمانجێ دا یا ئەو ژ بەر دەرکەفتین.. گەلەک کەس د داخوازا وان هاتن، و هندەکان گۆت: ئەڤە کارەکە دڤێت (ئەمیرولمومنین) بکەت، لەو وان خۆ دا پاش.

ل وی دەمی گەهشتە ئیمام عەلی کو والییێ شامێ موعاویە یێ داخوازا تۆلا عوثمانی دکەت، و دبێژت: ئەم بەیعێ نادەینە عەلی حەتا ئەو تۆلا عوثمانی نستینت، و ئەز پسمامێ عوثمانیمە و من حەقێ هەی داخوازا خوینا وی بکەم.. هنگی عەلی بڕیار دا ژ مەدینێ دەرکەفتە کووفە دا نێزیکی شامێ بت، و ب مەسەلا موعاویەی و خەلکێ شامێ باخڤت، هەر چەندە بۆچوونا گەلەک صەحابییان ئەو بوو عەلی بمینتە ل مەدینێ و دەرنەکەفتە کووفە بەلێ وی ب یا وان نەکر، و دەمێ ئیمام عەلی ب لەشکەرێ خۆ ڤە دچوو کووفە خەبەرێ دەرکەفتنا طەلحە و زوبەیری بۆ بەصرا گەهشتە وی، لەو وی ڕێکا خۆ گوهاڕت دا بزانت کانێ مەسەلا وان چییە؟



هۆسا دەمێ فتنێ دەست پێ کر.. و سەر و بەر تێکچوو، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((سَأَلْتُ رَبِّي ثَلاَثًا فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لاَ يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لاَ

يُهْلِكَ أُمَّتِي بِـالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَـا، وَسَـأَلْتُهُ أَنْ لاَ يَجْعَـلَ بَأْسَـهُمْ بَيْـنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَـا))

يەعنى: من سێ داخواز ژ خودايێ خۆ كرن وى دو دانە من و ئێك نەدا من، من داخواز ژێ كر ئەو ئوممەتا من ب هشكاتييێ نەبەتە هيكلاكێ وى ئەو دا من، و من داخواز ژێ كر ئەو ئوممەتا من خندقاندنێ نەبەتە هيلاكێ وى ئەو دا من، و من داخواز ژێ كر ئەو وان بەرنەدەتە ئێك و دو وى ئەو نەدا من..[1]، و گرفتارييا ڤێ ئوممەتێ هەر ژ دەسپێكێ ئەوە ئەو د ناڤبەرا خۆ دا ژێكجودا دبن.

پشتى لەشكەرێ طەلحە و زوبەيرى گەهشتييە بەصرا، و لەشكەرێ عەلى رێكا خۆ ژ كووفە وەرگێراى و بەر ب بەصرا ڤە چووى، گەلەك كەس ژ صەحابى و تابعييان ژى، ئەوێن ل وێ دەڤەرێ و خۆ نەدايە د گەل چو ژ هەردو لايان كار بۆ هندێ كر هەردو لايان بگەهيننە ئێك و صولحێ د ناڤبەرا وان دا پەيدا كەن دا چو شەڕ چێ نەبن، و عەلى ب خۆ ژى بەرى بگەهتە بەصرا هەڤالێ خۆ يێ صەحابى قەعقاعێ تەميمى هنارتە نك طەلحە و زوبەيرى دا بەرێ وان بدەتە صولحێ، و قەعقاع ب ئەزمانێ خۆ يێ رەهوان شيا طەلحە و زوبەيرى ل ديوانا عائيشايێ قانع بكەت كو مەسەلە وەسا يا ب ساناهى نينە وەكى ئەو هزر دكەن، و دڤێت ئەو دەليڤەيێ بدەنە ئيمام عەلى حەتا ئوممەتێ هەمييێ دكەتە ئێك پشتى ڤێ دوبەرەكييا پەيدابووى؛ دا پشتى هنگى ئەو ب مەسەلا تۆلا ئيمام عوثمانى باخڤت.. نەخاسم ئەو ژ وان كەسانە يێن بەيعە دايە عەلى.

پشتى قەعقاع زڤڕييە نك عەلى و ئاگەهدارييا وى كرى كو لايێ دى ب گۆتنا وى دقانعن، عەلى دو كەس هنارتنە نك وان دا مەسەلا صولحێ موكوم بكەن، و هەردو لا ل سەر هندێ پێكهاتن كو سوباهى ژ بەصرايێ

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

دەركەڤن، عەلی بچتە كووفە و طەلحە و زوبەیر بچنە مەدینێ.. وێ شەڤێ ئەو فتنەچییێن دژی عوثمانی ڕابووین و ئەو كوشتی زێدە تەنگاڤبوون، و گۆتنە ئێک و دو: هەر گاڤەكا ئەڤە پێكهاتن یا مە ژ بنی دێ تێكچت؛ چونكی ئەو هەردو دێ كاری دژی مە كەن، لەو پیلانا وان بوو ئەو خۆ بكەنە دو پشک هەر پشكەک ب دزی ڤە بچتە د ناڤ دەستەكەكێ دا، و هێشتا دنیا زەلال نەبووی ئەو تیران د ئێک و دو وەربكەن، و هێرشێ بدەنە سەر لایێ دی؛ دا هەر ئێک هزر بكەت لایێ دی ژ صولحێ لێڤەبوو، و هۆسا شەڕ پەیدا ببت!

و یا وان ڤیای چێبوو.. و شەڕەكێ دژوار د ناڤبەرا هەردو لایان دا پەیدابوو، ئەڤ شەڕە ل ڕۆژا ئەینییێ بوو شازدەی هەیڤا جومادایا پاشییێ ژ سالا ٣٦ مشەختی، و ئەڤ شەڕە ئەوە یێ ب ناڤێ شەڕێ حێشترێ (حرب الجمل) هاتییە ب ناڤكرن.

د هندەک ریوایەتێن دورست دا هاتییە كو بەری شەڕ دەست پێ بكەت تیرەک ب طەلحەیی كەفت بێی بێتە زانین كانێ ئەو ژ كیڤە هات، و ئەو بریندار بوو، لەو هندەک هەڤالێن وی ئەو برە بەصرا و دانا مالەكێ، بەلێ ژ بەر كو خوینا وی زێدە چوو ئەو ب وێ برینێ مر. و زوبەیر بەری دەسپێكرنا شەڕی ڕەئیا وی هاتە گوهارتن، و دیرۆكڤان چەند ئەگەرەكان بۆ گوهۆڕینا وی دبێژن، وەكی -بۆ نموونە- هندەک دبێژن: عەبدللاهێ كوڕێ عەبباسی بیرا وی ل مرۆڤاینییێ ئیناڤە؛ چونكی دەیكا وی مەتا ئیمام عەلی بوو، و هندەک دبێژن: پشتی وی زانی كو عەممارێ كوڕێ یاسری یێ د گەل عەلی ئەو لێڤەبوو، و چەند گۆتنەكێن دی ژی دئێنە گۆتن، هەر چاوا بت، زوبەیری خۆ ژ شەڕی ڤەكێشا بەری كو ب دورستی دەست پێ بكەت، و دەمێ ئەو چووی وی ئەڤ شعرە ب خۆ گۆت:

ترک الأمـور الـتـي أخشى عواقبها

في الله أحسن في الدنيا وفي الدين

يەعنی: هێلانا وان کـارێـن ئەز ژ دووماهییا وان دتـرسـم بۆ خودێ، ل دنیایێ و ئاخرەتێ چێترە.. و ئەڤ شعرە هندێ دگەهینت کو ئـەو د بیـر و بۆچوونا خۆ دا کەفتبوو شکێ، ب تایبەتی پشـتی وی گوهدارییا قـەعقاقی کری ڕۆژا بەری هنگی..

هەر چاوا بت دیارە پشتی وی خۆ ژ مەیدانا شـەڕی ڤەکێشـای هندەک کەسـان ئـەو دیـت، و ب دویـڤ دا چـوون، و دەمـێ وان دیـتـی ئـەو چـوو وێ نهالا دبێژنـێ: (وادی السـباع) وان خـۆ ل بـەر ڤەنویسـاند، وپشـتـی وی خـۆ درێژکری و نڤستی وان هێرش دایێ و ئەو کوشت، و ئەوێ ئەو کوشتی ناڤێ وی عەمرێ کوڕێ جەرموزی بوو، یا ژ وی ڤـە ئــەو ب ڤـی کـارێ خـۆ دێ ل بـەر ئیمـام عـەلی شـرین بـت، لـەو وی هـەر زوی ئـەڤ خەبـەرە گەهانـدە عەلی، عەلی گۆتە وی کەسێ ئەڤ خەبـەرە بۆ ئینـای: مزگینییـێ ب ئـاگری بدە کوژەکێ کوڕێ صەفییایێ!

# طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدللاهی

ئەو ژی ئێک ژ وان پێنج کەسان بوو یێن ل ڕۆژێن ئێکێ ژ گازییا ئیسلامێ ل سەر دەستێ ئەبووبەکری هاتییە د ئیسلامێ دا، و ژ حەفت هەشتەکێن ئێکێ بوو یێن موسلمانبووین، ئێک ژ وان شەشان بوو یێن ئیمامێ عومەر بۆ خەلیفاتییێ پشتی خۆ هلبژارتین، و گۆتی: ئەز شاهدم کو پێغەمبەرم -سلاڤ لێ بن- دەمێ مری یێ رازیبوو ژ ڤان، و ئەو ئێک ژ وان دەهـ کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ئێک حەدیسێ دا مزگینییا چوونا بەحەشتێ دایێ، ئەوێن ب عەرەبی دبێژنێ: (العشرة المبشرة)، ژ بەر مەردینی و دەستێ وی یێ ڤەکری ب دانا خێران، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناسناڤێ (الفیاض) دانابوو سەر، و د دەر حەقا وی دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى شَهِيدٍ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ الله)) هەچییێ بۆ وی خۆش بت بەرێ خۆ بدەتە شەهیدەکێ ل سەر ڕوییێ عەردی ب ڕێڤە دچت، بلا بەرێ خۆ بدەتە طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدوللاهی..[1]

ڤێ جارێ گەشتا مە دێ د گەل طەلحەیی بت..

طەلحە ژی ئێک ژ زەلامێن قورەیشییان بوو، ژ بابکێ تەیمییان ئەو بابکێ ئەبووبەکر ژی دگەهتێ، مەعنا ئەو و ئەبووبەکر پسمامێن ئێک بوون، بابێ وی عوبەیدوللاهـ کوڕێ عوثمانێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ کەعبێ کوڕێ سەعدێ کوڕێ تیمی بوو، و دەیکا وی ژنکەکا خەلکێ یەمەنێ بوو دگۆتنێ:

---

(١) ترمذی ڤەدگوهێزت.

(الصعبة بنت الحضرمي)، بەری هاتنا ئیسلامێ ب نێزیکی سێزدە چاردە سالان هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر زوی وی وەکی زەلامێن دی یێن قوریشییان دەست دا بازرگانییێ، و دەمێ ژییێ وی دوازدە سێزدە سال ئەو د گەل کاروانێ قورەیشییان دەردکەفتە شامێ و یەمەنێ بوو بازرگانییێ، طەلحە ب خۆ بەحسێ خۆ دکەت و دبێژت: ئەز د گەل کاروانییان چوومە بازارا بوصرایێ (بازێرەکێ شامێ بوو) -یەعنی بۆ بازرگانییێ- د رێکا خۆ دا مە راهبەک دیت د دیرەکێ ڤە عیبادەت دکر، گاڤا وی زانی ئەم یێ ژ حیجازێ دئێین، وی پسیارا کاروانییان کر: ئەرێ ئێکێ خەلکێ حەرەمێ د گەل هەوە هەیە؟ من گۆتێ: بەلێ ئەز خەلکێ حەرەمێمە، وی گۆت: ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ د ناڤ وە دا دەرکەفتییە؟ من گۆتێ: پێغەمبەر کییە؟ وی گۆت: نوکە دەمێ دەرکەفتنا وییە، ئەگەر ئەو پەیدابوو هشیار بی کەس بەری تە رانەکەت، باوەرییێ پێ بینە.. طەلحە دبێژت: گاڤا ئەم زڤرینە مەکەهێ، من پسیار کر: ئەرێ تشتەکێ نوی ل بازێری چێبوویە؟ گۆتنە من: بەلێ، موحەممەدێ کورێ عەبدللاهی دبێژت: ئەز یێ بوویمە پێغەمبەر، و ئەبووبەکری باوەری پێ ئینایە.. ئینا ئەز ب لەز چوومە نک ئەبووبەکری و من گۆتێ: تە باوەری ب موحەممەدی ئینایە؟ وی گۆت: بەلێ، من گۆتێ: من ژی ببە نک وی، ئەبووبەکری ئەز برمە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و من ژی باوەری پێ ئینا.

ئەڤە رۆژێن ئێکێ بوون یێن هاتنا ئیسلامێ، و هنگی حەفت هەشت مرۆڤەکان ب تنێ باوەری ب پێغەمبەری ئینابوو، ل سەر ڤی بناخەیی طەلحە ژی دئێتە هژمارتن ژ موسلمانێن دەستپێکێ، یێن بەری قووناغا مالا ئەرقەمی هاتینە د ئیسلامێ دا، و قەنجییا موسلمانبوونا وی پشتی خودێ بۆ راهبێ شامی و ئەبووبەکری دزڤرت.

طەلحە بازرگانەکێ دەولەمەند بوو پتریا ژیێ خۆ وی ب بازرگانییێ ڤە دبۆراند، و گەلەک جاران ئەو د گەل کاروانێ قورەیشییان دەردکەفتە شام و یەمەنێ.. و ئەو ژی وەکی ئەبووبەکری ب مەردینی و جامێرییێ هاتبوو نیاسین، و وی ب مالێ زێدە هاریکاریا مرۆڤێن هەوجە و پێتڤی دکر.

دەمێ ئەو موسلمانبووی نەوفەلێ کوڕێ خوەیلدێ ئەسەدی ئەوێ دگۆتنێ: شێرێ قورەیشییان، ئەو و ئەبووبەکر گرتن و پێکڤە ب وەریسەکی ڤە گرێدان، و نەخۆشی گەهاندێ دا ئەو ژ دینێ خۆ لێڤە ببن، بەلێ وان گوهداریا وی نەکر و خۆڕاگرتی مان.

ل مەکەهێ وی ب دەستێ خۆ و مالێ خۆ ژی هاریکاریا موسلمانان دکر، و پتریا دەمێ خۆ ب کاروانێن بازرگانییێ ڤە دبۆراند، و نەهاتییە زانین کو ئەو ژ وان صەحابییان بت یێن مشەختبووینە حەبەشە. و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبووبەکر مشەختبووینە مەدینێ، طەلحە بۆ بازرگانییێ چووبوو شامێ، و ل دەمێ زڤڕینێ وی ئەو ب ڕێڤە دیتن، و وی هندەک جلکێن شامێ دانە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەبووبەکری، و ئەو هاتە مەکەهێ دا هندەک کار و بارێن خۆ بقەتینت، پشتی وی کارێن خۆ صافیکرین، وی ئەوێن مایی ژ مالباتا ئەبووبەکری ل مەکەهێ د گەل خۆ برن و چوو قەستا مەدینێ کر، و ل وێرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- براینی د ناڤبەرا وی و ئەبوو ئەییوبێ ئەنصاری دا پەیداکر.



ل مەدینێ طەلحە ئێک ژ صەحابییێن بەرچاڤ و مەزن بوو، یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک جاران کارێن گرنگ پێ ددانەکرن، و ئێک ژ وان کاران ئەو بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دای

بچته د رێکا کاروانێ قورەیشییان دا، وی طـەلحه و سەعیدێ کورێ زەیـدی هەردو هنارتنه د رێکێ دا؛ دا ئەو دەنگ و باسێن کـاروانێ قورەیشـییان بـۆ وی بیـنن، وان ل جهـەکی دانـا، و مانـه ل هیڤییـا کـاروانی، گاڤـا خەبـەر گەهشتییه وان کو کاروانی رێکا خۆ یا گوهارتی، ئەو ب لەز هاتنه مـەدینێ دا ڤی خەبەری بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- ڤـەگوهێزن، بەلێ حەتا ئـەو گـەهـشـتـینـه مـەدینێ وان دیت پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- و هەڤالێن خۆ ژ مـەدیـنـێ یـێن دەرکەفتین، وان هـەردویان لـەزکر دا بگەهنـه پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن-، بەلێ حەتا ئەو گەهشتینه وان شەرێ بەدرێ ب دوومـاهی هـاتبوو، ئینـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئـەو هـەردو وەکـی دو پشکداربوویێن شەرێ هژمارتن و پشکەک ژ دەستکەفتییان دا وان.

ل رۆژا ئوحودێ دەمـێ تـەنگاڤی ل سـەر پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- زێده شدیای طـەلحه ئێـک ژ وان صەحابییان بـوو یـێن ماینـه ل بـەر سنگێ وی و بەرەڤانی ژێ دکر حەتا پتر ژ سیهـ و پێنج برینان کەفتینه لەشێ وی، و برینا ژ هەمییێ مەزنتر ئەو بوو دو تبلێن دەستێ وی هاتنەبرین، و تیرەک ب دەستێ وی یێ چەپێ کەفت دەستێ وی شەلەلی کر لـەو حەتا ئـەو مـری ژێ ئەو نەدشیا کارەکی ب وی دەستی بکەت.

و گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب برینداری کەفتییه د وێ چالێ یا کـافران کـۆلای، طـەلحـه ئێـک ژ وان صـەحابییان بـوو یـێن هاریکارییـا وی کری دا ئەو ژێ دەرکەڤت، وی خۆ هاڤێتـه د چالێ دا و پێغەمبـەر بلـندکر و عەلی ئـەو هلکێشا، و دەمـێ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- بڕیـار دای ئـەو صەحابی خۆ ڤەکێشنه سـەر چیـایێ ئوحودێ، و وی ڤیـای ب سـەر کـەڤرەکی بکەفت، ژ بەر وەستیان و برینێن خۆ ئەو نەشیا ب سـەر کـەڤری بکەڤت، هنگی طـەلحەی خۆ چەماند و گۆته پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- پێیـێ خۆ

بـدانـه سەر پشتا من و ب سـەرکەڤە، د ڤی هەولیستێ وی دا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((أَوْجَبَ طَلْحَـةُ)) یـەعنی: بەحەشت بۆ طـەلحـەیی واجببوو[1].

ژ بـەر ڤـێ چەنـدێ ئەبووبـەکری دگۆتـه ڕۆژا ئوحـودێ: ڕۆژا طـەلحـەی! بۆچی؟ چونکی ئەو ڕۆژ ئەو بوو یا طـەلحـەی بەحەشت تێدا ب دەست خۆ ئێخستی.

د وان هەمی شەڕان دا یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ژیانا خۆ دا کرین، ملێ طـەلحەی ب ملێ وی ڤـه بوو، ب تنێ ڕۆژا بـەردێ تێ نـەبت، ژ بەر وێ ئەگەرا مە گۆتی.

سەرهاتییا طـەلحەی د گەل مەردینی و کەرەمێ و هاریکارییـا وی یـا بەردەوام بۆ هەڤالێن وی بێی ئەو داخـوازێ ژێ بکـەن، تشـتێ نـاڤداریـوو د ناڤ صەحابییان دا.. جارەکێ وی عەردەکێ خۆ ب حەفتسەد هزاران فـرۆت، ئێڤارەکا درەنگ پارە گەهشتنە دەسـتان، وێ شـەڤێ هـەمییێ حالێ وی یـێ نـەخۆش بـوو، ژنکـا وی -کـو کچـا ئەبووبـەکری بـوو- دیـت حـالێ وی یـێ نەخۆشە گۆتێ: تـه خێـرە؟ وی گـۆت: ئـەو مرۆڤـێ ئـەڤ هـەمی مالـه ل نـک هەی دێ چ بێژتە خودایێ خۆ؟ ژنکێ گۆتێ: گـاڤـا ل تــه بـوو سپێدە وی ل سـەر هـەڤالێن خـۆ لێکڤەکـە.. ئـەو ل ژنکـا خـۆ زڤـڕی و گـۆتێ: خـودێ ڕەحمێ ب تە ببەت، موففـەقا کچـا موەففـەقی! سپێدێ وی ب گۆتنـا ژنکـا خـۆ کـر، دوومـاهییێ ژنکـا وی گـۆتێ: مـا تـو هندەک مـالی بـۆ مـە ژێ نـاهێلی؟ وی گـۆتێ: پـا بـۆچی تـه زوی نـەدگۆت؟ پاشی وی بـەرێ خۆ دا ئامانەکی دیت هزار دەرهەم یێن تێدا ماین، گۆتێ: بلا ئەڤە ژی بۆ تە بن.

---

(١) ترمذی ڤەدگوهێزت.

و عـەدەتێ وی ئـەو بـوو وی ئێتیمـەک د نـاڤ مالباتـا تـەیمییان دا نـەدهێلا ئەگـەر کەفالـەتا وی نـەکربا، و گوهـ ل دەینـدارەکی نـەدبوو ئەگـەر نەچووبا دەینێ وی پێش ڤە بدەت، بێی ئەو داخوازا ڤێ چەندێ ژێ بکەت، و هەر سال وی دەهـ هزار بۆ عائیشـایێ دهنـارتن. ژ بـەر هندێ دگۆتنـە وی: (طلحة الجود) یان: (طلحة الفیاض).

سائبێ کوڕێ زەیدی دبێژت: ل مـال و ل سـەفەرێ ژی مـن هـەڤالینییا طـەلحـەی کـر، مـن نـەدیت کسـەک ژ وی مـەردتر بـۆ دەرهـەمی و کراسـی و خوارنێ.



ل سەر دەمێ خیلافەتا ئەبووبەکر و عومەری طەلحە ژ وان کەسان بوو یێن نێزیک ژ وان، و گەلەک جاران وان داخوازا بۆچوون و ڕەئیا وی دکر، و ئاشکەرایە کو ئەو ئێک ژ وان شەش کەسان بوو یێن عومـەری هلبژارتین دا ئێک ژ وان پشـتی وی ببتـە خەلیفـە، بـەلێ چونکی طـەلحە ژ وان کەسـان نـەبوو یـێن دل د خیلافـەتێ هـەی وی (تـەنازول) بـۆ عوثمـانی کـر، و هـەر چەندە وی تەنازول بۆ عوثمانی کربوو، بـەلێ پشـتی عوثمـان بـوویـە خەلیفـە ب دەمــەکی ڕەنگـەکێ سـارییێ د ناڤبـەرا وان دا پەیـدابوو، و طـەلحـەی چەندەکێ خۆ دا پاش.. و پشتی فتنەچی دژی عوثمـانی ڕابووین و مەسـەلە گەهشـتییە وی حـەددی کـو عوثمـان ب دەسـتێن وان هاتییـە کوشـتن، دیـارە طـەلحەی هەست ب ڕەنگەکێ پەشێمانییێ کر کـو وی بـەرەڤانی ژ عوثمـانی نەکر لەو -وەک کفارەت بۆ ڤێ خەلەتییێ- وی بڕیار دا ئەو خۆ بدەتە د گەل وی لایێ یێ داخوازا ستاندنا تۆلا عوثمانی کری، وەکی د ژیانا زوبـەیری دا مە ڤەگێڕای.

طەلحە -وەکی زوبەیری و عائیشایێ- ژ وان صەحابییان بوو یێن داخواز ژ عەلی کری کو ئەو لەزێ د ستاندنا تۆلا عوثمانی دا بکەت، و هەر ژ بۆ ڤێ ئارمانجێ ئەو ژی د گەل وان دەرکەفتە بەصرا، و سەرهاتییا دەرکەفتنا وان و کانێ چاوا ب دووماهی هات بەری نوکە مە ڤەگێڕایە لەو پێتڤی ناکەت دوبارە بکەین.

بەری شەڕێ جەمەلێ ل سالا سیهـ و شەشێ مشەختی دەست پێ بکەت، طەلحە و زوبەیر هەردو قانعبووبوون کو شەڕ دڤێت نەئێتەکرن، بەلێ بێی وان و ژ ئەنجامێ پیلانەکا فتنەچییان گێڕای شەڕ چێبوو، و بەری دەسپێکرنا شەڕی، یان ل دەمێ دەسپێکرنا شەڕی ل دویڤ گۆتنەکێ، تیرەک -بێی کەس بزانت کێ ئەو هاڤێتییە- هات و بچووکێ طەلحەی کەت، و ئەو بریندارکر، هەڤالەکێ وی ئەو بر حەتا گەهاندییە باژێرێ بەصرە و دانا مالەکێ ل وێرێ، بەلێ هندی خوینا وی چووبوو ئەو ب وێ برینێ مر. و مرنا وی ل سالا ٣٦ مشەختی بوو، و هنگی ژییێ وی نێزیکی ٦٢ سالان بوو.

گۆتنەکا دی هەیە دبێژت: ئەو د شەڕی دا هاتە کوشتن، و دەمێ شەڕ ب دووماهی هاتی و ئیمامێ عەلی د ناڤ کوشتییان دا گەڕیای ئەو دیت، چوو هنداڤ سەری و تۆز ژ دێمێ وی ڤەمالی و ب خەم ڤە گۆت: بابێ موحەمەدی! یا مەزنە ل سەر من ئەز تە هۆسا ببینم، خودێ رەحمێ ب تە ببەت، خوزی بەری بیست سالان ئەز مربام!

# عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی

هەڤالینییەکا موکم د ناڤبەرا وی و عوثمان و سەعد و زوبەیر و طەلحەی دا د گەل ئەبووبەکری هەبوو، ب عەمرێ خۆ ڤە ئەبووبەکر ژ وان هەر پێنجان مەزنتر بوو، لەو وان ب چاڤەکێ مەزن بەرێ خۆ ددا ئەبووبەکری، گاڤا ئەبوو بەکر هاتییە د ئیسلامێ دا، بەری هەر تشتەکی هزر د هندێ دا کو ئەو بەرێ ڤان هەڤالان ژی بدەتە ئیسلامێ، و چەند کەیفا ئەبووبەکری یا مەزن بوو دەمێ دیتی وان ب ساناهی و زوی گوهدارییا وی کری و ئامادەبوونا خۆ بۆ هاتنا د ئیسلامێ دا دیارکری.. ئەو کۆما ئێکێ بوون ژ وان مرۆڤان یێن دلێ خۆ بۆ دینێ نوی ڤەکری، ژ بلی خەلکێ مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، لەو یا عەجێب نینە هێشتا ئەو دژینن دی مزگینییا چوونا بەحەشتێ بۆ وان هاتییەدان.

د جاهلییەتێ دا ناڤێ وی (عەبدێ عمری) بوو، بەلێ گاڤا ئەو هاتییە د ئیسلامێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وی کرە (عەبدێ رەحمانی)، و ژییێ وی هنگی ل دۆرێن بیست و دو سالییێ بوو.

ل دەسپێکا ژییێ خۆ مرۆڤەکێ دەولەمەند و بەرنیاس نەبوو، بەلێ پشتی هنگی، ب تایبەتی پشتی مشەختبوونا بەر ب مەدینێ ڤە، ناڤێ وی کەفتە سەر هەمی ئەزمانان، و جهێ وی د ناڤ جڤاکێ دا بەرچاڤ بوو؛ چونکی ئەو بوو ئێک ژ بازرگانێن موسلمانان یێن مەزن..

عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی، ئەوێ ژ هەشت مرۆڤێن ئێکێ دئێتە هژمارتن یێن کو بەراهییێ هاتینە د ئیسلامێ دا، ئەو ژی وەکی سەعدی ژ بابکێ زوهری یێن قورەیشییان بوو، ئەو بابێ دبنە خالێن پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن-، بابێ وی عەوف کورێ عەبدێ کورێ حارثێ کورێ زوهریێ کورێ کیلابییە. دەیکا وی (الشفاء) هەر مرۆڤا بابێ وی بوو، و ژ بەر کو ئەو ژ دۆتمامێن ئامینایا دەیکا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- ئەو -وەکی قاضی عیاض ڤەدگێرت- دەمێ پێغەمبەر بووی ئەو دادۆکا وی بوو، موسلمان بووبوو و ب مشەختی چووبوو مەدینێ.

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نێزیکی دەهـ سالان ئەو هاتبوو سەر دنیایێ، مەعنا دەمێ ئەو موسلمانبووی ژییێ وی ل دۆرێن سیهـ سالییێ بوو.

عەبدررەحمان ژ لایێ بەژن و بالایا خۆ ڤە مرۆڤەکێ درێژ بوو، و پێ چەپ بوو، و ل شەرێ ئوحودێ پێ وی برینداربوو لەو پشتی هنگی حەتا مری ژێ پیچەکێ دنجمی.

وەکی مە گۆتی ئەو ئێک ژ وان هەشت زەلامان بوو یێن ل دەسپێکێ هاتینە د ئیسلامێ دا، و چونکی ئەو ئێک ژ مرۆڤێن فەقیر بوو ئەو ژ وان بوو یێن نەخۆشی ژ کافرێن مەکەهێ گەهشتییێ ژ بەر موسلمانبوونا وی، ل سالا پێنجێ ژ هاتنا ئیسلامێ دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ موسلمانان کری کو مشەخت ببنە وەلاتێ حەبەشە، عەبدررەحمان ئێک ژ وان کەسان بوو یێن مشەختبووین، بەلێ پشتی هنگی ب دەمەکی ئەو زڤرییبوو مەکەهێ، و دەمێ موسلمان مشەختبووینە مەدینێ، ئەو دوبارە مشەختبوو و ڤێ جارێ چوو ل مەدینێ ئاکنجیبوو.

ل مەدینێ، ل دویڤ سیستەما (موئاخاتێ)، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- براینی د ناڤبەرا وی و سەعدێ کورێ رەبیعێ ئەنصاری دا پەیداکر، و هندی سەعد ما پێڤە کو ئەو مال و ملکێ خۆ د ناڤبەرا خۆ و وی دا ب نیڤی بکە، ئەو ل بەر نەهات و گۆتێ: خودێ بەرەکەتێ بۆ تە بێختە

مالێ ته و عەیالێ ته.. ئەز مرۆڤەکم حەز ژ بازرگانیییێ دکەم، کانێ رێکا بازارێ نیشا من بدە، و ته شۆل ژ من نەبت! هەر ژ رۆژا ئێکێ وی قستا بازارێ کر و دەست دا کارێ بازرگانیییێ و خودێ تەوفیق و بەرەکەت ئینا رێکا وی، حەتا عەبدررەحمان دبێژت: ئەگەر ئەز دەستێ خۆ بکەمە بەرەکی دێ تژی زێر و زیڤی ل بن بینم! مەعنا: ئەز د تجارەتێ دا هند یێ ب تالع و بەختم.

دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو عەبدررەحمان بوو ئێک ژ زەنگینترین مرۆڤان ل مەدینێ، ژ ئەنەسی دئێتە ڤەگوهاستن کو جارەکێ دەنگ و دۆرەکێ مەزن ل مەدینێ هات، خەلکی پسیارکر: ئەڤە چییە؟ هندەکان گۆت: ئەڤە کارەوانەکێ عەبدررەحمانێ کورێ عەوفی یێ بازرگانییە هات.. حەفتسەد حێشترێن بارکری بوون. وی ئەو هەمی کرنە خێر د رێکا خودێ دا، و ل سەر خەلکێ مەدینێ بەلاڤکرن.

ئیمامێ زوهری بەحسێ وی دکەت و دبێژت: ل سەر زەمانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- جارەکێ وی چار هزار کرنە خێر، پاشی چل هزار، پاشی بارێ پێنجسەد دەواران، و بەری ئەو بمرت وی وەصیەتکر بیسانەکێ وی بۆ ژنکێن پێغەمبەری بت -سلاڤ لێ بن- بهایێ وی بیستانی چارسەد هزار بوون.

مەعنا: د گەل دەستێ وی یێ ڤەکری ب دانا خێران، مالێ وی رۆژ بۆ رۆژێ زێدە دبوو، و خودێ بەرەکەت بۆ دئێخستێ. و هندەک زانایێن تەفسیرێ ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ ئایەتە: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ﴾ (البقرة: ٢٦٢) یەعنی: ئەوێن مالێ خۆ د رێکا خودێ دا خەرج دکەن پاشی ئەو چو منەت و نەخۆشییێ پێ ناگەهیننە کەسێ خێرا وان

ل نک خودایێ وانە، و نە چو ترس ل سەر وان هەیە و نە ئەو ب خەم دکەڤن. هندەک زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەڤ ئایەتە د دەر حەقا ئیمامێ عوثمان و عەبدررەحمانێ کورێ عەوفی دا هاتبوو خوارێ.

و دبێژن: دەمێ ئەو کەفتییە بەر سەکەراتێ وی وەصیەتکر کو هەر صەحابییەکێ مایە ساخ ژ خەلکێ بەدرێ چارسەد دیناران ژ مالێ وی بدەنێ، و هنگی سەد ژ وان مابوون، و هندەکێ وەکی عوثمانی و عەلی ژی ئەو مال وەرگرت، و دەمێ هندەکان گۆتییە عوثمانی: تو مرۆڤەکێ زەنگینی و تە منەت ب وی مالی نینە، وی ئاشکەراکر کو ڕاستە وی منەت پێ نینە بەلێ مالێ عەبدررەحمانی بەرەکەتە دڤێت مرۆڤ وەرگرت.

ل سەر زەمانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی هەڤالینییا وی د وان هەمی شەڕان دا کربوو یێن وی کرین، و ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن ڕۆژا ئوحودێماینە ل مەیدانا شەڕی و سست نەبووین، و بەری نوکە مە گۆت کو ل وێ ڕۆژێ برینەک کەفتە پێیێ وی و ژ بەر وێ برینێ حەتا ئەو مری ژی ئەو پیچەکێ دنجمی.

ئێک ژ وان تایبەتییێن کێم صەحابییان پشکدارییا وی تێدا کری، یان هەما بلا بێژین: ئەبووبەکری ب تنێ پشکدارییا وی تێدا کری، ئەو بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نڤێژ ل پشت وی کربوو، ئەو ژی ل دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی چووینە غەزایا تەبووکێ، دئێتە ڤەگوهاستن کو جارەکێ وەسا چێبوو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ کارەکێ خۆ یێ تایبەت ژ صەحابییان ڤەما، و حەتا ئەو هاتی دیت ئەو یێ نڤێژێ دکەن، و عەبدررەحمان ئیمامێ وانە، گاڤا عەبدررەحمانی زانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هات، و هنگی ئەو د رکاعەتا دوماهییێ دا بوو، وی ڤیا پاشپاشکی خۆ ڤەکێشت؛ دا پێغەمبەر بچتە جهێ وی و ببتە

ئیمام، بەلێ پێغەمبەری ب دەستی ئیشارەت داییێ کو ل جهێ خۆ بمینە و وی رکاعەتا دووماهیییێ یا نڤێژێ ل دویڤ عەبدررەحمانی کر پاشی ڕابووڤە نڤێژا خۆ تمامکر.

د گەل موژیلاهییا وی یا زێدە ب تجارەتێ ڤە، و ژ بلی مردینییا وی یا هەمی کسان پێ دزانی، ئەو مرۆڤەکێ زێدە زانا ژی بوو د دینی دا، و نە ب تنێ خەلیفەیان پسیارێن خۆ ب وی دکرن، بەلکی گەلەک صەحابی ژی دەمێ هەوجەی تشتەکی ژ دینێ خۆ بان، وان پسیارا خۆ ب وی دکر. و تشتێ ژ هەمییان بەرچاڤتر د ژیانا وی دا ل سەر دەمێ خەلیفەییێن راشدی هەلویستێ وی بوو دەمێ عومەری ئەو د گەل پێنج کسێن دی هلبژارتی دا صەحابی ئێک ژ وان بۆ خۆ بکەنە خەلیفە پشتی عومەر بریندارببووی.

ئاشکەرایە دەمێ عومەر هاتییە بریندارکرن، و دختۆران ئەو بێ هیڤی کری و داخواز ژێ کری ئەو ئێکی بدانتە جهێ خۆ، بڕیارا وی ئەو بوو ئەو وان هەر شەش صەحابییێن ماین ژ وان دەهێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب چوونا بەحەشتێ دایێ، و مری و ئەو یێ ژێ رازی، هلبژێرت و داخوازێ ژ صەحابییێن مەزن بکەت کو ئەو ئێک ژ وان بۆ خیلافەتێ هلبژێرن.

عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی ئێک ژ وان بوو، و بەری نوکە دەمێ مە ژیانا ئیمامێ عوثمان ڤەگێڕای مە ئەڤ سوحبەتە کربوو، تشتێ مە دڤێت ل ڤێرێ بەحس ژێ بکەین دەورێ عەبدررەحمانی یێ بەرچاڤ بوو د ناڤ ڤان هەر شەش کسان دا، و کانێ چاوا ئەو شیا وان هەمییان بگەهینتە ئێک گۆتنێ.

پشتی صەحابی ژ ڤەشارتنا عومەرێ کوڕێ خەطابی ب دووماهی هاتین، ئەو هەر شەش کسێن عومەری هلبژارتین دا ئێک ژ وان ببتە

خەلیفە، د گەل هندەک صەحابییێن مەزن ژ وان یێن ئەبووبەکر و عومەری رەئیا وان د کارێن مەزن دا دستاند، ل جهەکی کۆمبوون، دا دان وستاندنێ د مەسەلا هلبژارتنا خەلیفێ نوی دا بکەن. عەبدررەحمانی گۆتە وان: سێ ژ هەوە تەنازولێ بۆ سێیان بکەن. زوبەیری گۆت: من تەنازول بۆ عەلی کر، و طەلحەی گۆت: من تەنازول بۆ عوثمانی کر، و سەعدی گۆت: من تەنازل بۆ عەبدررەحمانی کر، ب ڤی رەنگی سێ کەس مان، عەبدررەحمان ل عوثمانی و عەلی زڤڕی و گۆتە وان: ئێک ژ هەوە خۆ ڤەکێشن دا ئەم یێ دی بکەینە خەلیفە. هەردو بێ دەنگ مان، عەبدررەحمانی گۆتە وان: هوین هەردو دێ من کەنە وەکیل، و سویند ب خودێ بت ئەز بەرێ خۆ ژ یێ باشتر ژ هەوە وەرنەگێرم؟ وان گۆت: بەلێ..

سێ رۆژان عەبدررەحمانی گۆتن و بۆچوونا صەحابییان وەرگرت، حەتا دبێژن: وی پسیارا خۆ ب ژن و زارۆک و مرۆڤێن عەبد ژی کر، و پشتی هەر سێ رۆژ تمامبووین، ب شەڤێ ئەو چوو مالا خوارزایێ خۆ و ژ خەو راکر و گۆتێ: هەرە بێژە سەعد و زوبەیری بلا بێنە ڤێرێ، و ئەو ما د گەل وان ئاخفت حەتا درەنگی شەڤ، پاشی ئەو چوون، وی گۆتە خوارزایێ خۆ: هەرە بێژە عەلی بلا بێت، عەلی هات و حەتا شەڤ ژ نیڤێ قولپی ئەو د گەل وی ئاخفت، و ئێک ژ گۆتنێن وی ئەو بوو وی گۆتێ: بێژە من: ئەگەر ئەز بەیعێ نەدەمە تە تو کێ هل دبژێری ژ صەحابییان؟ وی گۆت: عوثمانێ کوڕێ عەففانی. پاشی وی داخوازا عوثمانی کر، و حەتا بانگێ سپێدێ دای ئەو د گەل وی دئاخفت، و گۆتە وی ژی: ئەگەر ئەز بەیعێ نەدەمە تە تو کێ هلدبژێری ژ صەحابییان؟ وی گۆت: عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی. گاڤا بانگێ سپێدێ دای، ئەو هەردو دەرکەفتنە مزگەفتێ بۆ کرنا نڤێژێ، و ئیمامێ موسلمانان صوهەیبێ رۆمی بوو، ئەوێ عومەری کرییە

ئیمـام حـەتا خەلیفـە دئێتـە دەسنیشـانکرن. پشـتی نڤێـژ خلاصـبووی، عەبدررەحمان ل نک مینبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕاوەستیا، پشـتی کو صەحابی هەمی ڤەخواندینە مزگەفتێ، د گەل والییێن: شام و حمص و مـصرێ ژی، ئەوێن هنگی ل مەدینێ، و مەزنێن لەشکەری ژی، ئەو د ناڤ وان دا ڕابووڤە حەمدا خودێ کر و شاهدە دا، پاشی ل عەلی زڤڕی و گۆتێ: من گەلەک هزرا خۆ د مەسەلێ دا کر، و گۆتنا خەلکی ژی وەرگرت، مـن دیت ئەو کەسێ ژ عوثمانی باشتر نابینن. پاشی ئەو ل عوثمانی زڤڕی و گۆتێ: ئەز موبایەعا تە دکەم ل سەر سوننەتا خودێ و پێغەمبەرێ وی و هەردو خەلیفەیێن پشتی وی. و ئەو چوو دەستێ عوثمانی، و ئێکەمین کەسێ پشتی وی بەیعە دایە عوثمانی و چوویە دەستێ وی عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی بوو، پاشی هەمی صەحابییان بەیعە دا عوثمانی بێی کو ئێکێ ب تنێ ژی خۆ پاشدا ببەت.

هۆسا و ب ئیخلاص و شارەزاییا خۆ عەبدررەحمان شیا ئوممەتێ هەمییێ ل سەر ئێک گۆتنێ کۆم بکەت، و نەهێلت دلێ کەس ژ وان بمینت، و ئیخلاص و دەسپاکییا وی ژ هندێ ئاشکەرا دبت وی هەر ژ ڕۆژا ئێکێ خۆ ژ بەربژارییێ ڤەکێشا، و ئەگەر ئەو ئەو با یێ مەیلێ بکەت دڤیا وی مەیل بۆ پسمامێ خۆ سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی کربا، بەلێ وی وە نەکر، و سێ شەڤ و سێ ڕۆژان بێی کو ئەو بێنا خۆ ڤەدەت، یان هەست ب وەستیانێ بکەت، ئەو د ناڤبەرا صەحابییان دا هات و چوو، و گۆتن و بۆچوونا پترییا خەلکی وەرگرت، حەتا یا ژن و زارۆک و عەبدان ژی وەکی مە گۆتی. ئەڤە کورتییا ریوایەتا ڕاست و دورستا (شوورایێ) بوو، وەکی ب ڕێکێن دورست هاتییە ڤەگوهاستن، و هەر گۆتنەکا دی یا هەبت ژ ریوایەتێ ئەهلێ بیدعێیە، و چو ڕاستی بۆ نینە.

مرنا عەبدررەحمانێ کوڕێ عەوفی ل سەر دەمێ خیلافەتا ئیمامێ عوثمان بوو ل سالا (٣١)ێ یا (٣٢)ێ وەکی هندەک دبێژن، و مرنا وی ل مەدینێ بوو، و ژیێ وی هنگی حەفتێ و پێنج سال بوو، و ڤەشارتنا وی ل بەقیعێ بوو.

دبێژن: دەمێ ئەو کەفتییە بەر مرنێ وی کرە گری، گرییەکا دژوار، هندەکان پسیار ژێ کر: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: موصعەبێ کوڕێ عومەیری ژ من چێتر بوو، ئەو ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مر کفن نەبوو ئەم بکەینە بەر وی، و حەمزەیێ کوڕێ عەبدلموطەلبی ژی ژ من چێتر بوو، ئەو ژی ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مر و مە کفنەک نەبوو بکەینە بەر وی، و ئەز دترسم ئەز ژ وان بم یێن ل دنیایێ خۆشی بۆ هاتینەدان، و ئەز دترسم ئەز ژ هەڤالێن خۆ ڤەمینم ژ بەر مالێ من یێ زێدە!

## ئەبوو عوبەیدە
## عامرێ کوڕێ جەرراحی

عومەری کەسەک وەکی وی نەددیت، لەو دەمێ خەبەرێ مرنا وی گەهشتییە مەدینێ چاڤێن ئیمامێ عومەر تژی ڕۆندک بوون، چونکی عومەری دزانی مرنا وی ڤالاتییەکا وەسا دێ ل پاش خۆ هێلت کەسەک نەشێت تژی بکەت.. و پشتی مرنا وی ب چەند سالەکان ئیمامێ عومەر ڕۆژەکێ د ناڤ کۆمەکا صەحابییان دا یێ ڕوینشتیبوو، وی گۆتە هەڤالێن خۆ: وەرن هەر ئێک ژ مە خوزییەکێ ڕاهێلت، ئێکی گۆت: خوزی مـن تژی ڤی خانی مال هەبا حەتا ئێڤاری من تشتەک ژێ نەهێلابا، من ئەو هەمی د ڕێکا خودێ دا خەرج کربا، و ئێکێ دی خوزییا خۆ گۆت، و یێ دی و یێ دی، حەتا کەس نەمای، ئێک ژ وان گۆت: ئەی ئەمیرولموئمنین! خوزییا تە چییە؟ وی گۆت: خوزییا من ئەوە من تژی ڤی خانی زەلامێن وەکی ئەبوو عوبەیدەی هەبان! و خۆ دەمێ عومەر کەفتییە بەر مرنێ ژی وی دگۆت: ئەگەر ئەبوو عوبەیدە یێ زێندی با، ئەز دا وی ل جهێ خۆ کەمە خەلیفە..

بۆچی؟

چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دەر حەقا وی دا گۆتبوو: ((لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَـذِهِ الأُمَّـةِ أَبُـو عُبَيْـدَةَ بْـنُ الجَرَّاحِ)) هەر ئەممەتەکێ ئەمینەکێ هەی و ئەمینێ ڤێ ئوممەتێ ئەبوو عوبەیدەیێ کوڕێ جەرراحییە[1]. و ئەوێ ئەمین بت دێ د خێرا ئوممەتێ دا بت.

---

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

ناڤێ وی یێ دورست عـامر بـوو، کـوڕێ عەبدللاهێ کـوڕێ هیلالـێ فهرییـە، و (فهـر) کـو ئێـک ژ بـابکێن قورەیشـییانە دبتـە بـابێ وی یـێ حەفتێ، و نسەبا وی و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل وی دگەهتە ئێک.

ئـەو ژی وەکـی هەڤالـێـن خۆ یێن بـەری نوکـە مـە بەحسـێ وان کری ژ وان یـێن مزگینـی ب بەحەشـتێ بـۆ هاتییـەدان، ژ وان کەسـان بـوو یـێن هێشتا زوی هاتینە د ئیسلامێ دا بەری موسلمان بچنە مـالا ئەرقـەمی، و موسـلمانبوونا وی ژی ل سـەر دەسـتێ ئەبووبـەکری بـوو، و ژییـێ وی (٢٧) سال بوو دەمێ ئەو هاتییـە د ئیسـلامێ دا. و ئـەو ئێـک ژ وان صـەحابییان بوو یێن مشەختبوونە حەبشە، بەلێ دیارە ئـەو گەلـەک نـەمابوو ل وێـرێ و هەر زوی زڤڕیبـوو مەکەهێ، و پشـتی هنگـی ئـەو ژ مەکـەهێ مشـەختبووبوو مەدینێ.

کتێبـێن سـیرەتێ گەلـەک بەحسـێ وی ناکـەن دەمـێ ئـەو ل مەکـەهێ، بەلێ پشتی مشەختبوونێ د گەلەک سـەرهاتییان دا بەحسـێ وی ل پێشـییێ دئێتەکرن.. و سەرهاتییا ئێکێ ل ڕۆژا بەدرێ بوو، دەمێ ئەو و بابێ خۆ یێ کافر د شەڕی دا کەفتینە بەرانبەر ئێک، و وی بابێ خۆ کوشتی، و هندەک زانایێن تەفسیرێ دبێژن: ئەڤە ئایەتە د دەرحەقا وی دا هاتبوو خوارێ: ﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٢٢ ﴾ (المجادلـة: ٢٢) یەعنی: تـو -ئـەی پێغەمبـەر- مللەتـەکی نـابینی بـاوەرییێ ب خـودێ و ڕۆژا دووماهییێ بینت، و کاری ب وی شریعەتی بکەت یێ خودێ بۆ وان دانای، و د سـەر هنـدێ ڕا ڕابیـت حـەز ژ وی بکـەت یـێ دوژمناتییـا خـودێ و

پێغەمبەرێ وی کری و دوستینییا وی بکەت، ئەگەر خۆ ئەو بابێن وان بن یان کورێن وان بن یان برایێن وان بن یان مرۆڤێن وان بن، ئەوێن هە یێن ڤیان و نەڤیانا وان بۆ خودێ، خودێ باوەری د دلێن وان دا نڤیسییە، و ب سەرکەفتن و پشتەڤانییا خۆ وی د دنیایێ دا ئەو ب سەر دوژمنێن وان ئێخستینە، و ئەو ل ئاخرەتێ دێ وان کەتە د هندەک بەحەشتان دا رویبار د بن دار و بارێن وان دا دچن، دەمەکێ بێ ڤەبڕین ئەو دێ تێدا مینن، خودێ ژ وان ڕازیبوویە و ئێدی ئەو قەت ژ وان عێجز نابت، و ئەو ژ وی ڕازیبووینە ژ بەر وان دەرەجێن بلند یێن وی ئەو برینێ، ئەو پارتا خودێ و وەلییێن وینە، و ئەون یێن ل دنیایێ و ئاخرەتێ ددلخۆش.

ئەگەر ئەڤ ریوایەتە یا دورست بت ئەو دێ بتە مەزنترین مزگینی بۆ ئەبوعوبەیدەی، هەر چەندە حەدیسێن دورست گەلەک هاتینە کو ئەو ژ وان کسانە یێن دچنە بەحەشتێ.

ل ڕۆژا ئوحودێ ژی ئەبوو عوبەیدەی دەورێ بەرچاڤ هەبوو، دا گوهدارییا ئەبووبەکری بکەین چاوا ئەو بوو مە دیمەنەکی ژ دیمەنێن ڕۆژا ئوحودێ ڤەدگێڕت، ئەو دبێژت: ئەز ئێکەمین کەس بووم ل ڕۆژا ئوحودێ زڤڕین.. مەخسەدا وی ئەوە دەمێ تەنگاڤی چێبووی و شکستن کەفتییە ڕێزا موسلمانان هندەک ڕەڤین و هندەک ژ شەڕی سستبووین، پشتی گۆتگۆتکەک بەلاڤبووی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە کوشتن، و ئەو ب خۆ ئەو ل سنگێ شەڕی بوو، پشتی دەمەکی هاتە زانین کو درەوە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەهاتییە کوشتن، و ئەو یێ ل پێشییێ شەڕی دکەت، هندەک صەحابی چوون خۆ ڤێڕا بگەهینن دا بەرەڤانییێ ژێ بکەن، ئەبووبەکر دبێژت: هنگی ئەز ئێکەمین کەس بووم لێ زڤڕیم، من دیت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ شەڕی دکەت، و زەلامەک یێ ل بەر سنگێ

وی شەڕی دکەت و بەرەڤانییێ ژێ دکەت، من گۆتە خۆ: مادەم ئەو زەلام نە ئەزم، خوزی ئەو طەلحە بت، چونکی طەلحە پسمامێ من بوو و من دڤیا ئەو قەنجییا نەگەهشتییە من بگەهتە مرۆڤەکێ من! ئەز چووم خۆ بگەهینمە پێغەمبەری من دیت زەلامەک د ناڤبەرا من و کافران دا یێ ب نک پێغەمبەری ڤە دچت، و ئەز پتر ژ وی یێ نێزیکی پێغەمبەری بووم، بەلێ ئەو خۆشتر ژ من دچوو، من نەزانی ئەو کییە، پاشی بۆ من دیاربوو کو ئەو ئەبوو عوبەیدەیە.. گاڤا ئەز و ئەو گەهشتینە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مە دیت ددانێ وی یێ شکەستی و دێمێ وی یێ برینداربووی، دو خەلەکێن کومزری یێن ئاسنی یێن د ڕوییێ وی ڕا چووین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە مە: د هەوارا هەڤالێ خۆ هەرن. مەخسەدا وی طەلحە بوو و هنگی ئەو یێ برینداربوو خوین دهاڤێت، مە گوهێ خۆ نەدا گۆتنا وی و ئەم ب نک وی ڤە چووین، ئەز چووم دا وان هەردو خەلەکێن ئاسنی ژ ڕوییێ وی بینمەدەر، ئەبوو عوبەیدەی ئەز دامە سویندێ کو ئەز وی کاری بۆ وی بهێلم، من سویندا وی نشکاند، وی نەڤیا ب دەستی وان خەلەکان بکێشت دا نەخۆشی نەگەهتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و وی ئەو ب ددانێن ژێکڤەکرن، و د گەل هەر خەلەکەکێ ددانەکێ ئەبوو عوبەیدەی شکەست.

ژ ڤێ ریوایەتێ دئێتە زانین کو ئەبوو عوبەیدە ژ وان صەحابییان بوو یێن ل ڕۆژا ئوحودێ خۆڕاگر مایە ل مەیدانا شەڕی، و ل دەمێ تەنگاڤییێ ئەو و کتەکا کێم یا صەحابییان ل دۆر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ماین، و حەتا دووماهییێ بەرەڤانی ژێ کری.

بەلکی ژ بەر ڤان هەلویستێن وی یێ هۆسا بت، ئەو بووبوو ئێک ژ وان صەحابییان یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زێدە حەز ژێ دکر، و ئەو بۆ کارێن گرنگ هل دبژارت، دەمێ پسیار ژ عائیشایێ هاتییەکرن:

کیژ صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بەر وی خۆشتڤیتر بوو؟ وێ گۆت: ئەبووبەکر، پاشی عومەر، پاشی ئەبوو عوبەیدە.

ژ لایەکێ دی ڤە ئەبوو عوبەیدە ژ وان صەحابییان بوو یێن قورئان هەمی ژ بەر، و د دینی دا شارەزا، لەو دەمێ وەفدا نەجرانێ هاتییە مەدینێ، وان داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو صەحابییەکێ خۆ د گەل وان بهنێرت دا بەرسڤا پسیارێن وان بدەت و دینی نیشا وان بدەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ((ئەز دێ زەلامەکێ ئەمین د گەل هەوە هنێرم)) رۆژا د دویڤ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ ئەبوو عوبەیدەی را و ئەو د گەل وان فرێکر.. حوذەیفە دبێژت: هەر صەحابییەکی بەرێ وی لێ بوو پێغەمبەر وی بهنێرت، ژ بەر گۆتنا وی: ئەز دێ زەلامەکێ ئەمین د گەل هەوە هنێرم.. هەر ئێکی دڤیا یێ ئەمین ل بەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بت.

ژ سالۆخەتێن وی ئەو مرۆڤەکێ نەرم و حەلیم بوو، قەت خۆ مەزن نەدکر، و ئەخلاقەکێ زێدە باش ل نک هەبوو، و حەز ژ هەڤرکی و جەدەلێ نەدکر، و بەرێ وی هەمی گاڤان ل هندێ بوو رێزا موسلمانان ئێک بت، جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەشکەرەک ب سەرکێشییا عەمرێ کورێ عاصی ب لایێ توخوبێ شامێ دا هنارت، پشتی عەمر چوویە وی جهی ئەو ترسیا شەرێ رۆمێ پێڤە نەئێت، لەو وی داخواز ژ پێغەمبەری کر کو لەشکەرەکێ دی بۆ پشتەڤانییا وان بهنێرت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەشکەرەکێ دی بەرهەڤکر و هەر چەندە یێن وەکی ئەبووبەکر و عومەر ژی د ناڤ دا بوون، بەلێ وی ئەبوو عوبەیدە کرە مەزنێ وان، گاڤا ئەو گەهشتینە لەشکەرێ عەمری، عەمری گۆت: ئەز مەزنێ هەوەمە، موهاجرییان گۆتێ: نە.. تو مەزنێ هەڤالێن خۆیی، مەزنێ مە ئەبوو

عوبەیدەیە، گاڤا ئەبوو عوبەیدەی دیتی ئەو دێ ب هەڤرکی چن، ئەو چوو نک عەمری و گۆتێ: تو مەزنێ مە هەمیانی!

و ژ بەر سالۆخەتێن وی یێن باش، و چونکی ئەو ژ وان صەحابیان بوو یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری یێ ژێ رازی، و وی ناسناڤێ وی کربوو: (ئەمینێ ڤێ ئوممەتێ) دەمێ صەحابی ل بن کەپرا بەنووساعدییان ب هەڤرکی چووین کانێ کی دێ بتە خەلیفە ل جهێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەبووبەکری گۆتە وان: ئێک ژ ڤان هەردویان بکەنە مەزنێ خۆ: عومەری یان ئەبووعوبەیدەی.

دەمێ ئەبووبەکر بوویە خەلیفە، وی بڕیار دا مالێ دەولەتێ تەسلیمی ئەبوو عوبەیدەی بکەت، و وی بکەتە بەرپسیارێ مالی، ژ بەر ئەمانەتا وی یا زێدە.. و دەمێ ئەبووبەکری لەشکەرەک ب سەرکێشییا خالدێ کوڕێ وەلیدی هنارتییە شامێ ل دووماهییا زەمانێ خۆ، وی ئەبوو عوبەیدە د گەل هنارت.. و هنگی بوو دەمێ شەڕێ یەرمووکێ چێبووی.

د ڤی شەڕی دا سەرلەشکەرێ موسلمانان خالدێ کوڕێ وەلیدی هندەک شێوەیێن عەسکەری ب کارئینان بەری هنگی عەرەبان ئەو شێوە نەدیتبوون، وی لەشکەر ل سەر چل کوردۆسان لێکڤەکر هەر کوردوسەک هزار مرۆڤ بوو، و ئەو کوردۆس ل سەر پێنج پشکان لێکڤەکرن، پشکا پێشییێ و پاشییێ، و یا چەپێ و ڕاستێ، و یا نیڤێ، پشکا نیڤێ (القلب) ژ هەژدە کورۆسان پێک دهات و مەزنێ وان ئەبوو عوبەیدە بوو، و عەکرمە و قەعقاع هاریکارێن وی بوون. و د ڤی شەڕی دا موسلمانان سەرکەفتنەکا مەزن ل سەر رۆمێ ب دەست ڤە ئینا، و برایێ هیرقلی ب خۆ د ڤی شەڕی دا هاتە کوشتن. هێشتا شەڕ ب دورستی تمام نەبووی کاغەزەک ژ مەدینێ گەهشتە ئەبوو عوبەیدەی دو خەبەرێن مەزن تێدا بوون ئەو دەمەکی ما و

رەئیا صەحابییێ ناڤدار موعاذێ کورێ جەبەلی ژی وەرگرت بەری پێگاڤا خۆ بهاڤێت.. کاغەز ژ عومەرێ کورێ خەططابی بوو، و خەبەرێ ئێکێ ئەو بوو ئەبووبکر یێ مری و عومەر ل جهێ وی یێ بوویە خەلیفە، و خەبەرێ دوویێ ب فەرمانا خەلیفەیێ نوی عومەری ئەبوو عوبەیدە دێ بتە سەرلەشکەرێ موسلمانان ل جهێ خالدی!

ئەبوو عوبەیدەی ب شارەزاییا خۆ دزانی بەلاڤبوونا خەبەرێ ئێکێ د ناڤ لەشکەری دا ل دەمێ شەڕی دێ بەلبەلەکا مەزن پەیدا کەت، و زانینا خالدی ب خەبەرێ دوویێ دێ هزرا وی موشەووەش کەت و بتە ئەگەر کو ئەو پلانا خۆ یا عەسکەری ب دورستی نەبەتە سەری، لەو ئەبوو عوبەیدەی بڕیار دا ڤێ کاغەزێ ڤەشێرت حەتا شەڕ ب دووماهی بێت، و پشتی شەڕ ب دووماهی هاتی و موسلمانان سەرکەفتنەکا مەزن ب دەست خۆ ڤە ئینای، وی هەردو خەبەر گەهاندنە خالدی.. خالدی گازندە و لۆمە لێ کرن و گۆتێ: خودێ رەحمێ ب تە ببەت، ئەڤە هندە رۆژە خەلیفەی تو کرییە ئەمیرێ مە و ئەز نڤێژێ ل بەرا تە دکەم؟ ئەبوو عوبەیدەی گۆتێ: خودێ رەحمێ ب تە ژی ببەت! من نەدڤیا هزرا تە تێک بدەم حەتا شەڕ خلاص ببت، و تو دزانی من مەزنییا دنیایێ نەڤێت، و ئەز نە بۆ دنیایێ کار دکەم، و هەر تشتەکێ تو دبینی دووماهییا وی بۆ زەوالییە و ئەم برایێن ئێکین.

و دەمێ ئەبوو عوبەیدەی کاغەزا عومەری کرییە د دەستێ خالدی دا، خالدی گۆتێ: ژ ئەڤرۆ وێڤە تو ئەمری و ئەز جندییەکم ل بەر دەستێ تە.. و گاڤا ئەڤ سوحبەتە گەهشتییە عومەری ل مەدینێ، وی گۆت: خالد ل بەر نەهات کو ئەمیر نەبت! یەعنی: وی ب ڤی کارێ خۆ یێ مەزن ئیسبات کر کو ئەو هەر ئەمیرە، ئەگەر خۆ جندییەکێ عەدەتی ژی بت!

ئەڤە ل سالا (١٣) مشەختی بوو، پشتی هنگی لەشکەرێ ئیسلامێ بەر ب شامێ ڤە چوو، و ل سەر دەستێ ئەبوو عوبەیدەی و لەشکەرێ وی گەلەک جهـ و دەڤەر ل بەر ڕۆناهییا ئیسلامێ هاتنە ڤەکرن، و ئێک ژ وان جهان باژێرێ دیمەشقێ ب خۆ بوو.

دەمێ ل سالا (١٦) موسلمانان باژێرێ قودسێ دۆرپێچکری، مەزنێ قودسێ یێ رۆمی موسلمان ئاگەهدارکرن کو ئەو کلیلێن باژێری تەسلیم ناکەت حەتا خەلیفە ب خۆ نەئێت وان وەرگرت.. هنگی ئەبوو عوبەیدەی هنارتە ب دویڤ عومەری ڕا، و عومەری داخواز ب جهئینا، و ئەو ب خۆ هاتە شامێ دا کلیلێن قودسێ وەرگرت.. گاڤا عومەر هاتی و گەهشتییە ناڤ لەشکەرێ موسلمانان ئەو ل سەر کەری یێ سویار بوو، و مرۆڤەک ب تنێ د گەل بوو، دەمێ ئەبوو عوبەیدەی ئەو ب ڤی ڕەنگی دیتی گۆتێ: ئەی ئەمیرولمونمنین! نوکە مرۆڤێن مەزن دێ ئێنە پێشوازییا تە! هەر وەکی وی پێ خۆش نەبوو ئیمامێ عومەر ب ڤی ڕەنگی هاتی، دا هەیبەتا ئیسلامێ د چاڤێن خەلکی دا ب تایبەتی رۆمییان دا کێم نەبت، عومەری گۆتێ: خودێ ب ئیسلامێ هوین یێن سەرفەرازکرین، و هەر جارەکا هەوە داخوازا سەرفەرازییێ ب تشتەکێ دی کر، خودێ دێ هەوە ڕەزیل کەت!

پشتی هنگی عومەری گۆتە ئەبوو عوبەیدەی: من ببە مالا خۆ! ئەبوو عوبەیدەی گۆتێ: تە چ شۆل ل مالا من هەیە؟ تو دێ چاڤێن خۆ بۆ من گڤێشی! ئەبوو عوبەیدەی داخوازا وی ب جهئینا، عومەر چوو مالا وی، و گاڤا ناڤمالییا وی دیتی عومەر عەجێبگرتی بوو، ل سەر ملێ خۆ زڤڕی و گۆتێ: کا ناڤمالی و تشتێن تە؟ ژ بلی چرایەکی و گلدکەکێ و سێنیکەکێ و کونەکا ئاڤێ ئەز تشتەکی نابینم، و تو ئەمیری! تە زادەک هەیە بدەیە من؟ ئەبوو عوبەیدە چوو سەلکەک ئینا هندەک پرتێن نانێ ڕەق ژێ

دەرێخستن و دانانا بەر ئەمیرولموئمنینی، گاڤا عومەری ئەڤ چەندە دیتی، کرە گری، ئەبوو عوبەیدەی گۆتێ: مـن نەگۆتـە تـە دێ چاڤێن خـۆ بـۆ مـن گڤێشی؟ (یەعنی: دێ بۆ حالێ من کەیە گری) ئـەی ئـەمیرولموئمنین! تێـرا تە هەیە تە هند هەبت تە بگەهینتە جهێ بێنڤەدانێ.. هنگی عومـەری ب دو چاڤێن تـژی رۆنـدک ڤـە گـۆتێ: ئـەبوو عوبەیـدە، دنیـایێ ئـەم هـەمی یـێن گوهارتین، بەس تو تێ نەبی!

ئەڤە نموونەیەکە ژ وان (قائید) و سەرکێشان یـێن ئیسـلام بـەلاڤکری، و هێشـتا هنـدەک (ئەحمـەق) دبێـژن: ب هێجـەتا (فوتوحاتـان) صـەحابییان دڤیا دنیایێ بێخنە دەستێ خۆ.. ئەمیرێ شامێ ب مالـەکا ڤـالا، و ئـەمیرێ ئیسلامێ ل سەر پشتا کەرەکی دفنا قەیصـەرێ رۆمـێ و کیسـرایێ فورسـێ ل عەردی دا، و دیرۆک شاهدە ل سەر ڤێ چەندێ.

ل سـالا (١٨) مشـەختی، ل وی دەمـێ ئـەبوو عوبەیـدە ل شـامێ، (طاعوونەکا) مەزن ب سەر دەڤەرێ دا هات، وەکی ئاگری ل پیشـی چوو و ب هـزاران مـرۆڤ ژ بـەر مـرن.. عومـەری ب ڤـێ چەنـدێ زانـی، رابـوو کاغەزەک بـوو ئـەبوو عوبەیدەی هنارت تێدا نڤیسـی: مـن کـارەکێ فـەر یێ ب تە هەی لازم تو بزڤرییە مەدینێ. مەخسەدا وی ئەو بـوو ئـەبوو عوبەیدەی ژ وی جهی ڤەکێشت یێ طاعوون لێ.. و ب راستـی ژێ عومـەری کـارەکێ فـەر پێ هـەبوو، رۆژا عومـەر کەفتییـە بـەر مرنـێ وی ئـەو کـار ئاشـکەراکر، دەمێ گۆتی: ئەگەر ئەبوو عوبەیدە یێ ساخ با ئەز دا وی ل شوینا خۆ کەمـە خەلیفە!

کاغـەزا عومـەری گەهشـتە ئـەبوو عوبەیـدەی، وی زانـی کـو عومـەری دڤێت وی ژ ناڤ طاعوونێ ڤەکێشت، بەلێ ئەبوو عوبەیدە نە ئەوە یـێ رحا خۆ پتر ژ یا لەشکەرێ خۆ بڤێت، د بەرسڤا خۆ دا بـۆ عومـەری وی گۆت:

من زانی کاریّ ته یێ فەر ب من چییه، ل من ببۆره، ئەز یێ د ناڤ هندەک لەشکەرێن ئیسلامیّ دا، و من خۆ ژ وان پتر نەڤێت.. گاڤا کاغەزا وی گەهشتییە عومەری وی کره گری، هندەکان گۆتیّ: خێره، چ قەومییه؟ ئەبوو عوبەیدە مر؟ وی گۆت: نه.. بەلێ هەر وەکی ئەو مری!

و وەسا چێبوو وەکی عومەری هزرکری.. ئەبوو عوبەیده ب طاعوونیّ مر، و خێرا شەهیدان ب دەست خۆ ئێخست، و دەمیّ ئەو مری ژییێ وی پێنجی و هەشت سال بوو.

# سەعیدێ کوڕێ زەیدی

ڤێ جارێ ژڤانێ مە د گەل زەلامێ دەهێیە ژ وان یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێشتا د ساخییا وان دا مزگینی پێکڤە دایە وان ب چوونا بەحەشتێ، پسمامێ عومەری و زاڤایێ وی بوو، و ئەو ژنکا خۆ ئەگەرا ئێکسەر بوون د موسلمانییا عومەری دا، دەمێ عومەر کەفتییە بەر مرنێ و شەش زەلام هلبژارتین دا صەحابی ئێک ژ وان بۆ خۆ بکەنە خەلیفە ل جهێ وی، و گۆتی: ئەڤە ئەون یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری و ئەو یێ ژێ رازی، عومەری گۆتە ڤی پسمامێ خۆ: ئەز شاهدەییێ ددەم کو تو ژی ئێک ژ ڤانی، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ ژ تە ژی رازیبوو و تو ژی ب کێر دئێی ببیە خەلیفە، بەلێ چونکی تو پسمامێ منی تو د گەل وان نابی، ئەگەر خەلیفاتی شۆلەکا باش بت ئێک ژ مالباتا من بەسە پێ ڕابووی، و ئەگەر ئەو شۆلەکا خراب بت تێرا عومەری هەیە وی ئەڤ کارە کری..

سەعیدێ ناڤێ ڤی مرۆڤێ بژارە بوو، بابێ وی زەید کوڕێ عەمری بوو و عەمر و خەططابێ بابێ عومەری برایێن ئێک بوون، و ئەو هەردو کوڕێن نوفەیلێ کوڕێ عەبدلعوززایێ عەدەوی یێ قورەیشی بوون، باپیرێ وان یێ مەزن عەدی کوڕێ کەعبێ کوڕێ لوئەیێ قورەیشی بوو، و مالباتا وان ب وی دئێتە نیاسین، و ژ بەر وی دبێژنێ: عەدەوی.. عەدەوی ئێک ژ بابکێن ئویجاخا قورەیشییان بوو.

زەیدێ بابێ سەعیدی ئەوێ مری بەری وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بێت، ئێک ژ وان زەلامێن قورەیشییان بوو یێن باوەری ب دینێ قورەیشییان، کو صەنەمپەرێسی بوو، نەدئینا، و وی دگۆت: ئەڤە نە ئەو

دینه یێ ئیبراهیم و ئیسماعیل پێ هاتین، ئه‌ڤه شرکه و نه‌مومکنه به‌ره‌کێ ڕه‌ق خودێ بت یان شریکێ خودێ بت! ئه‌ڤ زه‌لامێن هه ئه‌ون یێن د کتێبێن دیرۆکێ دا ب ناڤێ (حه‌نیفی) دئێنه نیاسین، ئه‌وێن ڕوییێ خۆ ژ په‌رستنا صه‌نه‌مان وه‌رگێڕای. زه‌یدی هه‌ڤالـه‌کێ وه‌کی خۆ هه‌بوو دگۆتنێ: وه‌ره‌قه‌یێ کوڕێ نه‌وفه‌لی، وان هه‌ردویان باوه‌ری ب صه‌نه‌مان نه‌دئینا، لـه‌و وان بڕیار دا ئه‌و ژ مه‌که‌هێ ده‌رکه‌ڤن و بچن ل دینێ ئیبراهیمی یێ دورست بگه‌ڕیێن، ده‌مێ ئه‌و گه‌هشتینه شامێ ئه‌و ب سه‌ر هنده‌ک فه‌له‌یان هلبوون، وه‌ره‌قه چوو سه‌ر دینێ وان و ده‌مه‌کی ما ل نک وان خۆ فێری کیتابا وان و دینێ وان کر.. زه‌یدی گۆت: ئه‌ڤه ژی نه ئه‌و دینه یێ ئیبراهیم ل سه‌ر، ئه‌و چوو قه‌ستا باژێرێ موسلێ کر، ل وێرێ وی راهبه‌ک دیت راهبی پسیار ژێ کر: تو ژ کیڤه دئێی؟ وی گۆت: ژ مالا ئیبراهیمی. گۆتێ: تو هاتییه چ؟ وی گۆت: ئه‌ز یێ هاتیم ل دینێ ئیبراهیمی یێ دورست دگه‌ڕیێم. راهبی گۆتێ: ماده‌م ته دینێ فه‌لاتییێ نه‌ڤێت، بزڤڕه وه‌لاتێ خۆ نێزیکه ئه‌و دینێ تو لـێ دگه‌ڕییێ ل جهێ ته ده‌رکه‌ڤت.. وی ب شیره‌تا راهبی کر و زڤڕی مه‌که‌هێ و ل هیڤییا وی دینی ما یێ راهبی به‌حس ژێ کری..

ل مه‌که‌هێ وی هزر و بیرێن خۆ ئاشکه‌را دکرن، و گه‌له‌ک جاران ئه‌و دچوو که‌عبێ و د ناڤ خه‌لکی دا دگۆت: گه‌لی قوره‌یشییان، ئه‌ز ب خودێ که‌مه ئێک ژ هه‌وه ل سه‌ر دینێ ئیبراهیمی نینه ژ بلی من! و ده‌مێ وی زانیبا مرۆڤه‌کی کچه‌کا بووی و ئه‌و دێ وێ به‌ت بن ئاخ که‌ت، ئه‌و دچوو نک و دگۆتێ: وێ نه‌کوژه، ئه‌گه‌ر تو نه‌شێی ب خودان بکه‌ی بده من ئه‌ز دێ وێ ب خودان که‌م، و ئه‌و دا وێ به‌ت و ب خودان که‌ت حه‌تا مه‌زن دبوو، هنگی ئه‌و دا وێ ئینته نک بابێ وێ و بێژتێ: ئه‌ڤه کچا ته مه‌زنبوو ته دڤێت دێ بۆ ته زڤڕینم، ته دڤێت ژی ئه‌ز دێ ب خودان که‌م.

ژ بەر ڤی ڕەفتارێ وی، مامێ وی خەططابێ کوڕێ نوفەیلی -بابێ عومەری- ئەو گرت و باش گرێدا و گەلەک عەزاب دا؛ دا ئەو ژ ڤان گۆتنێن خۆ لێڤە ببت، بەلێ وی گوهدارییا مامێ خۆ نەکر، دووماهییێ مامێ وی گۆتێ: هەما ئەز تە ل بازێڕی ببینم ئەز دێ تە کوژم، ژ بەر وێ چەندێ زەید ب ڕۆژێ ژ مەکەهێ دەردکەڤتە چۆل و پەتەنێن مەکەهێ، و خۆ د شکەفتان ڤە دپاراست، و هندەک جاران ب شەڤێ ب دزی ڤە دهاتە مالا خۆ دا مامێ وی وی نەبینت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتبوو، بەلێ زەید وەکی وەرەقەیێ کوڕێ نەوفەلی مربوو بەری وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێت.. و د حەدیسەکێ دا هاتییە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((دَخَلْتُ الجَنَّةَ فَرَأَيْتُ لِزَيْدِ بنِ عَمْرِو بنِ نُفَيْلٍ دَوْحَتَيْنِ)) یەعنی: ئەز چوومە بەحەشتێ من دیت دو مێرگ بۆ زەیدێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ نوفەیلی هەبوون[1].

ئەو زەلامێ ڤێ جارێ ئەم دێ بەحسێ وی کەین کوڕێ ڤی خودێناسی بوو، و ل سەر دەستێ وی هاتبوو پەروەردەکرن، لەو یا غەریب نینە ئەو ئێک ژ وان کەسان بت یێن هەر ژ ڕۆژا ئێکێ ژ هاتنا ئیسلامێ باوەری ئینای.. سەعیدێ کوڕێ زەیدی نەڤیانا صەنەمپەرێسییێ ژ بابێ خۆ وەرگرتبوو، و وی ب تەئسیرا بابێ خۆ دزانی کو ئەڤ دینێ قورەیشی ل سەر نە دینەکێ دورستە و نە ئەوە یێ ئیبراهیم و ئیسماعیل پێ هاتین، گاڤا وی ژ هندەک هەڤالێن خۆ یێن نێزیک زانی کو موحەممەدێ هاشمی یێ دبێژت: ئەز پێغەمبەرێ خودێمە.. و مسۆگەر نوکە وی سەرهاتییا ڕاهبێ مویسلێ ژ بابێ خۆ بهیستبوو، ئەو ئێکسەر هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و

---

(١) ئبن عەساکر ب سەنەدا باش ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت.

بـاوەری پــێ ئینـا.. سـەعید هنگـی زەلامـەکێ ب ژن بـوو، و ژنکـا وی فاطمایـا کچـا خـەططابی بـوو، دۆتمامـا وی و خویشـکا عومـەری، و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ئەوێن ب تبلێن دەستی دهاتنە هژمارتن، هێشتا نەچووبوونە د مالا ئەرقەمی ڤە، د گەل سەعیدی ژنکا وی فاطما ژی موسلمانبوو، و چونکی ئەو ژ مـرۆڤێن هـەژار و لاواز بـوون وان موسلمانەتییا خۆ ل بەر خەلکی ڤەدشارت.

نێزیکی پێنج سالان سەر و بەر ب ڤـی ڕەنگی دەرباسبوو، پاشـی ئـەو ڕۆژ هات یا سەعید و فاطـما ژێ دترسیان، ڕۆژەکێ بێنا عومەری ژ گازییا ئیسلامێ تەنگبوو، و عومەر -وەکی بابێ خۆ خـەططابی- مرۆڤـەکێ زێدە ڕژد و حەریص بوو ل سەر دینێ باب و باپیران، و تەحـەمولا هندێ نـەدکر ئێک هەبت دژاتییا ڤی دینی بکەت، لەو ئەو ئێـک ژ وان کەسـان بـوو یێن زێدە نەخۆشی دگەهاندە موسلمانان و ئەو عـەزاب ددان دا ژ ئیسـلامێ لێڤـە ببن، وێ ڕۆژا بێنا وی تەنگبووی وی شیرێ خۆ هلگرت و گۆت: ڤـێ جارێ ئەز هنگی ڕادوەستم حەتا موحەممەدی بکوژم! و ئـەو ژ مـالا خـۆ دەرکـەفت، بـەلێ وی نـەزانی دێ موحەممـەدی ل کیڤـە بینـت، لـەو ئـەو د کـۆلانێن مەکەهێ دا هات و چوو و شیرێ وی یێ ڕویس د دەستان دا بوو، مرۆڤـەکی ئـەو دیـت گـۆتێ: تـەخێرە، دێ چ کـەی؟ وی ب کـەرب ڤـە گـۆت: دێ موحەممـەدی کـوژم، ئـەوێ فتنـە د نـاڤ مـە دا هلکـری و دینـێ نـوی دەرێخستی.. وی زەلامی گۆتێ: یا ژ تـە ڤـە ئەگـەر تـە موحەممـەد کوشت، بنەمالا هاشمییان دێ تە هێلتە ساخ؟! کانێ تو ئێکـەمین جار هـەرە مـالا خـۆ صـافی کـە پاشـی وەرە ل موحەممـەدی بگـەڕێ! عومـەری گـۆتێ: مـالا من؟! کی ژ مالا من ب دویڤ موحەممەدی کەفتییە؟ وی گـۆتێ: پسمامێ تە سەعید و خویشکا تە.

عومەری رێکا خۆ ڤەگوهاست، و قەستا مالا پسمامێ خۆ و زاڤایێ خۆ سەعیدی کر.. ل وی دەمی (خەببابێ کورێ ئەرەتتی) ل مالا وان بوو هاتبوو قورئانێ نیشا وان بدەت، دەنگێ وی گەهشتە عومەری، و دەنگێ عومەری ژی گەهشتە وان، خەببابی ژ ترسان دا خۆ ڤەشارت، فاطمایێ ئەو پەرێن قورئانێ ژێ وەرگرتن، و د ناڤ کراسێ خۆ دا ڤەشارتن، گاڤا عومەر ب ژۆر کەفتی ل وان خورِی: ئەو چ دەنگ بوو دهاتە من؟ وان گۆتی: تە چ گوهـ لێ بوویە؟ وی گۆت: من یێ زانی هوین یێن ب دویڤ موحەممەدی کەفتین، و وی کولمەک ل سەعیدی دا، فاطما چوویێ دا وی ژ سەعیدی ڤەکەت، عومەری کولمەک دانا وێ ژی خوین ژ دەڤ و دفنێ هات. گاڤا عومەری دیتی خویشکا وی بریندار بوو ئەو راوستیا و هێدی گۆتێ: ئەو چ بوو ف تە کا بدە من، عومەری ژێ وەرگرت، و د گەل خۆ خواند: ﴿ طه ① مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ② ﴾ و عومەر پێدا چوو حەتا گەهشتیە ڤێ ئایەتێ: ﴿ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ⑭ ﴾ ل ڤێرێ عومەر ژ خواندنێ راوەستییا، پێ حسیا هەر وەکی سنگێ وی بەرفرەهـ بوو.. ئەڤە چ گۆتنە ئەو دخوینت؟ پاشی هەر زوی وی بۆ خۆ گۆت، و ئەو کەسێن ل نک گوهـ ل ئاخفتنا وی بوو، عومەری گۆت: خودانێ ڤێ گۆتنێ دڤێت پەرستنا کەسێ د گەل وی نەئێتەکرن!

د پشت پەردەیێ ترسێ را خەببابی بەرێ خۆ ددا عومەری، گاڤا وی دیتی عومەر نەرمبوو ئێکسەر وی خۆ ئاشکەراکر و گۆت: مزگینی ل تە بت ئەی عومەر، هیڤییا من ئەوە تو ب بەر دوعایا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەفتبی، دوهی من گوهـ ل وی دبوو وی دوعایەک ژ خودێ دکر کو خودێ ئیسلامێ ب (ئەبولحەکەمێ کورێ هیشامی) یان (عومەرێ کورێ خەططابی) عەزیز بکەت.

عومەر لێ زڤڕی و گۆتێ: موحەممەدی نیشا من بدە.. خەببابی مالا ئەرقەمی نیشا وی دا، عومەری شیرێ خۆ ڕاکر، و قەستا مالا ئەرقەمی کر.. و چەند دەلیڤەیەک بوون عومەر گەهشتە بەر دەرگەهی، دەرگەهـ قوتا، ئێکی د کونا دەری ڕا بەرێ خۆ دایێ و ب ترس ڤە زڤڕی و گۆت: ئەڤە عومەرە شیرێ وی یێ د دەستان دا، بەری پێغەمبەر بەرسڤێ بدەت، حەمزە ڕابوو سەر پییان و گۆت: دەرگەهی بۆ وی ڤەکەن ئەگەر وی خێر دڤێت ب خێر بێت ئەگەر نە.. ئەم ب شیرێ وی دێ وی کوژین.

بەلێ ڤێ جاری وی خێر دڤیا؛ لەو دەمێ ب ژۆرکەفتی وی ب دەنگەکێ نەرم ڤە گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ هاتیم دا باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینم.

ب هاتنا عومەری د ئیسلامێ دا ل سالا شەشێ ژ هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمانان هەست ب سەرفەرازی یێ کر، و مسۆگەر بەری هەمییان پسمامێ وی سەعیدی، ئەوێ پشتەڤانەکێ ب هێز بۆ خۆ د عومەری دا دیتی.. د کتێبێن سیرەتێ دا ب بەرچاڤێن من نەکەفتییە کو سەعید و ژنکا وی فاطما ژ وان صەحابییان بن یێن ب مشەختی چووینە حەبەشە، و چو سەرهاتییێن وان یێن وەسا بەری مشەختبوونا وان بۆ مەدینێ نینن.



ل مەدینێ، سەعید ئێک ژ وان کەسان بوو یێن نێزیک ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، لەو گەلەک جاران پێغەمبەری هندەک کارێن گرنگ دهێلانە ب هیڤیا وی ڤە، ئێک ژ وان جاران ئەو بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو د گەل طەلحەیێ کوڕێ عوبەیدوللاهی هنارتینە د ڕێکا شامێ دا دا ئەو دەنگ و باسێن کاروانێ قورەیشییان بۆ وی بینن، ئەو

کاروانێ بوویە ئەگەر کو شەڕێ بەدرێ ڕوی بدەت، پشتی سەعیدی و هەڤالێ خۆ طەلحەی هندەک دەنگ و باس کۆمکرین و ڤەگەڕیاینە مەدینێ، وان زانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هژمارەکا صەحابییان یێن دەرکەفتینە بەراهییا کاروانێ قورەیشییان، ئەو ژی ب دویڤ وان دا چوون، بەلێ حەتا ئەو گەهشتینە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وان دیت شەڕێ بەدرێ یێ ب دووماهی هاتی، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکا وان هەردویان د دەسکەفتییان دا دانا، و ئەو وەکی وان هژمارتن یێن شەڕکری.

ژ بلی شەڕێ بەدرێ، سەعیدی پشکداری د وان هەمی شەڕان دا کربوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ژیانا خۆ دا کرین.. و د گۆتنەکا خۆ دا سەعید دبێژت: جارەکێ ئەم د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر چیایێ ئوحودێ بووین، ئەو هژیا، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((اثْبُتْ حِرَاءُ فَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ)) ئەی حەرراء موکوم بە، کەس ل سەر پشتا تە نینە ژ بلی پێغەمبەر و ڕاستگۆ و شەهیدان. هندەکان گۆتێ: ئەو کی بوون؟ سەعیدی گۆت: ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و طەلحە و زوبەیر و سەعد و عەبدررەحمان.. گۆتنێ: و یێ دەهێ کی بوو؟ وی گۆت: یێ دەهێ ئەز بووم[1].

سەعید -وەکی سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی- ژ وان کەسان بوو یێن دوعاییێن وان دئێکسەر دهاتنە قەبویلکرن.

ل سەر زەمانێ ئەبووبەکر و عەمەری دەمێ شەڕێن موسلمانان ل عیراق و شامێ دەسپێکرین، سەعید ئێک ژ وان کەسان بوو یێن دەرکەفتینە

---

(١) ترمذی ڤەدگوهێزت.

جیهـادێ، و ئـەو د گـەل ئـەبوو عوبەیـدەی بـوو ل چەپـەرێ شـامێ، و پشکدارییەکا بەرچاڤ وی د شەرێن شامێ دا هەبوو، و دەمێ موسلمانان باژێرێ دیمەشقێ ستاندی ئەبوو عەبەیدەی ئەو کرە والییێ شامێ، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێکەمین والییێ موسلمان حوکم ل شامێ کری پشتی دەرێخستنا وێ ژ دەستێن رۆمێ.

بەلێ دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو وی کاغەزەک بۆ ئەبوو عوبەیدەی هنارت تێدا گۆتێ: ڤیانا من بۆ جیهادێ ژ یا تە و هەڤالێن تە کێمتر نینە، و من ژی وەکی هەوە دڤێت خۆ نێزیکی خودێ بکەم، ڤێجا ئەگەر ئەڤ کاغەزا من گەهشتە تە، تو کەسەکی بهنێرە دا ل جهێ من بۆ تە ببتە والی؛ چونکی نێزیک ئەز دێ گەهمە وە.. گاڤا کاغەزا وی گەهشتییە ئەبوو عوبەیدەی وی گۆت: ئەز دزانم ئەو دێ وێ هێلت! پاشی وی هنارتە ب دویڤ یەزیدێ کورێ ئەبوو سوفیانی ڤە و گۆتێ: هەرە دیمەشقێ ل جهێ وی ببە والی.

هۆسا.. ژ بەر زوهدا وی و ڤیانا وی بۆ جیهادا د رێکا خودێ دا وی دەست ژ والیاتییێ بەردا، و جارەکێ ئیمامێ عومەر کاغەزەک بۆ ئەبوو عوبەیدەی هنارتە شامێ و گۆتێ: بەحسێ خەلکی بۆ من بکە، و بەحسێ خالدێ کورێ وەلیدی کانێ ئەو چ زەلامە.. ئەبوو عوبەیدەی د بەرسڤا وی دا گۆت: خالد چێترین زەلامە، و ژ هەمی کەسان پتر ئەو یێ د خێرا موسلمانان دا، و ئەو ژ هەر کەسەکی دژوارترە ل سەر نەیاران، و عەمرێ کورێ عاصی و یەزیدێ کورێ ئەبوو سوفیانی دوەسانن وەکی تو حەز دکەی، و هەردو برایێن تە سەعیدێ کورێ زەیدی و موعاذێ کورێ جەبەلی، دوەسانن وەکی تە دیتین، بەلێ رەشاتییێ (یەعنی: مالێ دنیایێ و کەسکاتییێ) ئەو پتر د دنیایێ دا یێن زاهدکرین و ئاخرەت پتر ل بەر وان

یـا شـرینکری. و ئەڤـە باشـترین شـاهدەییە ژ صـەحابییەکێ خـودان بهـا بـۆ سەعیدی کو دنیا ب هەمی خۆشییا خۆ ڤە نەشیایە وی بگوهۆڕت.

سـەعید ژ وان صـەحابییان بـوو یـێن ل دەمـێ فتنـێ (ل سـەر زەمـانێ عوثمـان و عـەلی) پشـتدایە خـەلکی و خـۆ ڤـەدەرکری.. و ل سـەر زەمـانێ خـیلافـەتا موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی ل سـالا (٥١) مشـەختی ئـەو ل مالا خۆ ئەوا ل عەقیقێ مر، و جەنازەیێ وی ئینانە مەدینێ و ل بـەقیعێ هاتـە ڤەشـارتن. و وی شـیرەتکربوو گاڤـا ئـەو مـر سـەعدێ کـوڕێ ئـەبوو وەققاصـی نڤێـژێ ل سـەر بکـەت، و دەمـێ وان ئـەو داهێلایـە د قـەبری دا سـەعد و عەبـدللاهێ کـوڕێ عومـەری چوونـە د قـەبری دا و جهـێ وی دورستکر.

ئەڤـە د گـەل هـەر چار خەلیفـەیێن راشـد، ئـەو دەهـ کـەس بـوون یـێن دبێژنێ: (العشرة المبشرة) ئـەوێن پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- د ساخییا وان دا مزگینییا چوونا بەحەشتێ دایێ، و وەکی مـە دیتـی ئـەو هـەمی ئـەو بوون یێن ل ڕۆژێن ئێکێ ژ هاتنا ئیسلامێ موسلمانبووین، و هەردەم ملـێن وان ب ملێن پێغەمبەری ڤە -سلاڤ لێ بن- بـۆ خـزمەتا ئیسلامێ، و ئـەو ژ وان بـوون یـێـن پشـتـی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەورەکێ بـەرچاڤ د بەلاڤکرنا ئیسلامێ دا هەی.. خودێ خێرا وان مەزن بکەت، و مە ب بـەر مەهدەران وان بێخت.

## پشکا چارێ

# ژ زەلامێن دەمەکێ شاریای

- موعاویەیێ کورێ ئەبوو سوفیانی
- عەمرێ کورێ عاصی
- ئەبوو مووسایێ ئەشعەری
- عەممارێ کورێ یاسری

# موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی

بەری نوکە، و دەمێ مە ژینەنیگارا خەلیفەیێ چارێ، ئیمامێ عەلی، ڤەگێڕای، هەر وەسا دەمێ مە بەحسێ ئیمامێ عوثمان ژی کری، مە پتر ژ جارەکێ بەحسێ موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی کر، و هندەک ڕویدانێن پەیوەندی ب وی ڤە هەین مە ڤەگێڕان.. بەلێ ژ بەر کو موعاویە ئێک ژ وان زەلامان بوو یێن دەورەکێ مەزن ل دەمەکێ شاریای ژ دیرۆکا ئیسلامێ هەی، ئەو دەمێ هندەک دبێژنێ: زەمانێ ژێکجودابوونێ، یان زەمانێ فتنا مەزن.. و ژ بەر کو گەلەک دان و ستاندن، و (تشویه) و کرێتکرن، یان شێلیکرن ل دۆر ڤی صەحابییێ خودان قەدر هاتییەکرن نە ب تنێ ژ لایێ دوژمنێن ئیسلامێ ڤە ژ رافزی و ڕۆژهەلاتناسان، بەلکی خۆ ژ لایێ هندەک ژ وان کسان ژی ڤە یێن خۆ ب سوننی دزان، مە ڤیای ل ڤێرێ ل سەر هندەک ژ وان صەحابییان باخڤین یێن ناڤێن وان گەلەک ب بەرچاڤێن مە دکەڤن دەمێ ئەم ڤی دەمێ شاریای ژ دیرۆکا خۆ دخوینین. و کسێ ئێکێ ئەمیرولموئمنین بابێ عەبدررەحمانی موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانێ ئومەوییە.

موعاویە، کوڕێ ئەبوو سوفیانی بوو، و ئەبوو سوفیان -ئەوێ مەزناتییا قورەیشییان د جاهلییەتێ دا دکر- ناڤێ وی یێ دورست صەخر بوو، کوڕێ حەربێ کوڕێ ئومەییەیێ کوڕێ عەبدشەمسێ کوڕێ عەبدمەنافێ قورەیشی بوو، و ئاشکەرایە کو بنەمالا موعاویەی ئەوا ب ناڤێ: بنەمالا

ئومـەوییان دئێتـە نیاسـین، ژ بـەر بـابێ وان (ئومـەییـەی)، ل عـەبدمـەنافی دگەهتـە بنـەمالا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئـەوا ب نـاڤێ بنـەمالا (هاشمییان) دئێتـە نیاسین، چونکی پێغەمبـەر نـەڤیێ عەبدلموطـطـەلبی بـوو، و عـەبدلموطـطـەلب کـوڕێ هاشـمی بـوو، و هاشـم کـوڕێ عـەبدمـەنافی بوو.

هندەک دیرۆکنڤیسێن هەڤچاخ دەمێ بەحسێ وێ هەڤڕکییێ دکەن ئـەوا د ناڤبەرا ئیمام عەلی و موعاویەی دا پەیدابووی، دڤێن وەسا بدەنـە زانـین کو ڤێ هەڤڕکییێ هندەک ڕەهـ و ڕیشالێن دیرۆکی د پشت ڕا هەنـە، و کـو هێشتا د جاهلییەتێ دا ڕەنگەکێ دوژمنی و هەڤڕکییێ د ناڤبەرا ڤان هـەردو بنەمالان دا هەبوو، حەتا دبێژن: عەبدشەمس و هاشم هەڤالجێمک بـوون، و دەمێ ئەو هاتینە سـەر دنیـایێ، ئـەو پێکڤـە دگرێدای بـوون، و مـرۆڤێن وان نەچاربوون وان ب شیری ژێکڤە کەن، و ژ بەر هندێ د ناڤبـەرا عـەیالێ وان دا ژی خوین هاتە ڕێتن!

ڤێ چیڤانۆکێ چو ڕاستی بۆ نینن، نەخاسم ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینـین کـو ریوایـەتێن دورسـت دبێـژن: عـەبدشـەمس کـوڕێ نـەخری یـێ بـابێ خـۆ عەبدمەنافی بوو، و هاشم چەند سالان ژ وی بچویکتر بوو.

پشتی هنگی دەمێ ئەم دیرۆکا ڤان هەردو بنەمالان بـەری ئیسـلامێ و پشـتی ئیسلامێ ژی دخوینین، ئەم دبینین هـەڤالینی و خزمایەنییـەکا مـوکم د ناڤبەرا وان دا هەبوو، و هەما بەسە بێژین: پـێـغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- ژ چار کچێن خۆ سێ دابوونە ئومەوییان، و ئێکا ب تنێ دابوو هاشمییان.. و بەری ئیسلامێ هەڤالینییەکا موکم د ناڤبەرا عەبدلموطـطـەلبێ هاشـمی و حەربێ ئومەوی دا هەبوو، هەر وەسـا د ناڤبـەرا کوڕێن وان عـەبباس و ئـەبوو سـوفیانی ژی دا.. و هـەر چاوا بت ڤەهانـدنا ڤـان ڕەنگـە درەوێـن ئاشـکەرا

شوینتبلێن دیرۆکنڤیسێن شیعەیێن رافزی د پشت ڕا ددیارن بۆ هەر کەسەکێ دیرۆکێ ب دو چاڤێن ڤەکری بخوینت.

موعاویە، بەری هنارتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب پێنج سالان، یان حەفتان، هاتبوو سەر دنیایێ، مەعنا: ئەو و ئیمام عەلی د ژییێ خۆ دا نێزیکی ئێک بوون، و مەزنێ مەکەهێ بابێ وی ئەبوو سوفیانێ ئەمەوی بوو، ئەوێ پشتی مرنا بابێ خۆ حەربێ ئەمەوی و هەڤالێ وی عەبدلموطەلبێ هاشمی، بوویە ماقویلێ ئێکێ د ناڤ قورەیشییان دا.. و دەیکا وی هندا کچا عوتبەیێ کوڕێ رەبیعەیێ کوڕێ عەبدشەمسێ کوڕێ عەبدمەنافێ قورەیشی بوو.

دەمێ ئیسلام هاتی، بابێ وی ئەبوو سوفیان ئێک ژ مەزن و ماقویلێن مەکەهێ بوو، و وی بۆ دەمەکێ درێژ سەرکێشییا کافرێن قورەیشییان دکر، ب تایبەتی پشتی شەڕێ بەدرێ، دەمێ هژمارەکا نە یا کێم ژ سەر و گرگرێن موشرکان هاتینە کوشتن، و کتێبێن سیرەتێ و دیرۆکێ دتژینە ژ بەحسێ وان کارێن وی دژی ئیسلامێ و موسلمانان کرین، و د شەڕێ ئوحودێ و خەندەقێ دا وی سەرۆکاتییا لەشکەرێ کافران کربوو، و بەری موسلمان مەکەهێ ڤەکەن ل سالا (٨) مشەختی، ئەبوو سوفیان هاتە د ئیسلامێ دا، و پشتی موسلمانبوونا وی وی گەلەک هەلویستێن باش هەبوون، و خزمەتا وی بۆ ئیسلامێ و پشکدارییا وی د جیهادێ دا تشتەکێ ڤەشارتی نینە.. ل زەمانێ ئیمامێ عوثمان، دەمێ ژییێ وی حەشتێ و تشتەک سال ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

دەیکا موعاویەی ژی، ئەوا بۆ دەمەکێ درێژ نەیارەتییا ئیسلامێ کری، پشتی ڤەکرنا مەکەهێ هاتە د ئیسلامێ دا، و ئەو ژنکەکا تێگەهشتی و شاعر و سەربلند بوو!

وی هژمارەکا خویشک و برایان هەبوون، ژ برایێن وی: یەزید، و ئەڤە صەحابییەکێ خودان قەدر بوو، ل سالا ڤەکرنا مەکەهێ موسلمان بووبوو، و پشکداری د شەڕێ حونەینێ دا کربوو، و ئەبووبەکری ئەو کربوو سەرۆکێ وی لەشکەرێ قەستا شامێ کری، و عومەری ئەو کربوو والی ل شامێ، و ل سەر زەمانێ عومەری ئەو مربوو، و عومەری برایێ وی موعاویە دانا جهێ وی وەکی دێ د گەل مە ئێت.

ژ خویشکێن وی: (أم حبیبە) و ناڤێ وێ یێ دورست رەملە بوو، و ئەو ژ وان کەسان بوو یێن زوی موسلمانبووین، و د گەل زەلامێ خۆ عوبەیدللاهێ ئەسەدی مشەختبووبوو حەبەشە، و پشتی زەلامێ وێ ل وێرێ بوویە فەلە و ل سەر کوفرێ مری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو مارەکر، و د ناڤ ژنکێن پێغەمبەری دا کەس نەبوو د نەسەبا خۆ دا نێزیکتر بت بۆ پێغەمبەری ژ وێ.



دیرۆکێ سەرهاتییێن ژیانا موعاویەی دەمێ هێشتا ئەو زارۆک و حەتا مەزنبووی، ب بەرفرەهی بۆ مە نەڤەگێڕاینە، و ئاشکەرایە کو دەمێ ئیسلام هاتی ژییێ وی ل دۆرێن پێنج سالییێ بوو، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و موسلمان ژ مەکەهێ مشەختبووینە مەدینێ ژییێ موعاویەی ل دۆرێن هەژدە سالییێ بوو، و نەهاتییە زانین کو موعاویەی پشکداری د وان شەڕان دا کربت یێن کافرێن مەکەهێ دژی موسلمانان کرین وەکی بەدرێ و ئوحودێ. و ل دۆر دیرۆکا موسلمانبوونا وی دو بووچوون هەنە: یا بەلاڤ ئەوە کو ئەو د گەل دەییاب و برایێ خۆ یەزیدی ل دەمێ ڤەکرنا مەکەهێ یێ موسلمانبووی، و هنگی ژییێ وی ل دۆرێن (٢٦) سالییێ بوو. و بۆچوونەکا دی هەیە ژێ دئێتە ڤەگوهاستن کو ئەو ل سالا (٧) مشەختی

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابی چوویینە مەکەهێ بۆ کرنا عومرێ ئەوا دبێژنێ: (عمرة القضاء)، هنگی موعاویە موسلمانبووبوو، بەلێ وی ئیسلاما خۆ ڤەشارتبوو ژ بەر بابێ خۆ دا پێ نەحەسییێت. و هەر چاوا بت ئەو نە ژ وان صەحابییان بوو یێن زوی هاتینە د ئیسلامێ دا، بەلێ د گەل هندێ ژی ئیسلاما وی یا دورستبوو، و پشتی ئەو هاتییە د ئیسلامێ دا وی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکداری د شەڕێ حونەینێ دا کربوو، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەد حێشتر و چل وەقییێن زێڕی ژ غەنیمە و دەسکەفتییێن شەڕی دانێ.

چونکی موعاویە مرۆڤەکێ خواندەڤان بوو، و وی نڤیسین دزانی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کرە ئێک ژ نڤیسەرێن وەحییێ، دەمێ هندەک ژ قورئانێ هاتبا خوارێ، وی دهنارتە ب دویڤ موعاویەی ڕا؛ دا وەحییێ بنڤیست. هەر وەسا هندەک جاران وی کاغەزێن پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- بۆ مەلک و مەزنێن وەلاتان دنڤیسین.

د حەدیسەکا دورست دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعا بۆ موعاویەی کربوو، و گۆتبوو: ((**اللهم اجعله هاديا مهديا واهد به**)) یەعنی: یا ڕەببی تو وی بکەیە هیدایەت بۆ خەلکی، و بەرێ وی بدەیتە هیدایەتێ، و هیدایەتێ پێ بکەی[1]. و د حەدیسەکا دی دا هاتییە: ((**اللهم علم معاوية الكتاب والحساب وقه العذاب**)) یەعنی: یا ڕەببی تو موعاویەی فێری نڤیسین و حسابێ بکە، و وی ژ عەزابێ بپارێزە[2]. و د حەدیسەکێ دا یا بوخاری ژ (أم حرام) ڤەدگوهێزت هاتییە: ((**أَوَّلُ جَيْشٍ**

(١) ترمذی ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزت.

(٢) ئەحمەد و طەبەرانی ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزن.

مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا)) یەعنی: ئێکەمین لەشکەر ژ ئوممەتا من جیهادێ د دەریایێ دکەن، ئەو کارەکێ وەسا دکەن پێ بچنە بەحەشتێ، گۆت: من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز د ناڤ وان دا مە؟ گۆت: بەلێ. و ئەڤ لەشکەرە ئەو بوو یێ موعاویەی سەرکێشییا وی کری ل سەر زەمانێ عوثمانی.

موعاویەی -خودێ ژێ رازی بت- (١٦٣) حەدیس ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- روایەتکرینە، و هندەک ژ وان روایەتێن بوخاری و موسلمینە.



ل سەر زەمانێ ئەبووبەکری ناڤێ ژ هەمییان بەرچاڤتر ژ ناڤێن بنەمالا ئەبوو سوفیانی ناڤێ کوڕێ وی یەزیدی بوو، ئەوێ ئەبووبەکری سەرۆکاتییا وی لەشکەری کرییە د دەستان دا ئەوێ ل شامێ جیهاد دکر، و د گەلەک شەڕان دا بابێ وی ئەبوو سوفیان و برایێ وی موعاویەی ل ژێر ئالایێ وی جیهاد دژی رۆمێ دکر.. بەلێ ناڤێ موعاویەی وەک سەرکێشەک د مەیدانا لەشکەری و سیاسی دا ل سالا (١٥) مشەختی بەرچاڤبوو، دەمێ خەلیفێ راشدی یێ دویێ عومەری کارێ ڤەکرنا باژێرێ قەیسارییە هلپسارتییە وی، و برایێ وی یەزیدی، والییێ شامێ، لەشکەرەک بۆ بەرهەڤکری، و ئەو شیای پشتی چەند شەڕەکان ڤی باژێرێ گرنگ بستینت و ب سەر دەولەتا ئیسلامی ڤە بەردەت، هەر وەسا وی هژمارەکا باژێرێن دی ژی ل بەر لێڤا دەریایێ ڤەکرن..

پشتی ڤان سەرکەفتنان یێن وی ب دەست خۆ ڤە ئینایین، ئیمامێ عومەر ل سالا (١٧) ئەو کرە والییێ (ئوردونێ)، و دەمێ ل سالا د دویڤ دا برایێ وی یەزید مری، عومەری ئەو ل جهێ وی کرە والییێ شامێ، و

دیاره هندەک کەسان ئەڤ چەندە ژ عومەری ب غەریب ڤە وەرگرت، کو چاوا ئەو وی دکەتە والی ل سەر صەحابییێن ژ وی ب عەمرتر و چێتر، لەو ئیمامێ عومەر گۆت: ئەو لۆمەی من دکەن کو من ئەو کرە والی، و من یێ گوهـ ل پێغەمبەری بووی -سلاڤ لێ بن- دوعا بۆ وی کرین و گۆتی: ((اللهم اجعله هاديا مهديا واهد به)).

دەمێ عومەر هاتییە شامێ دا کلیلێن قودسێ وەربگرت، موعاویە ب مەوکبەکێ مەزن ڤە هاتە بەراهییێ، و دەمێ عومەری ئەو ب وی مەوکبێ مەزن ڤە دیتی، گۆتێ: تویی خودانێ ڤی مەوکبی؟ و من یێ گوهـ لێ بووی کو خەلک ل بەر دەرێ تە ڕادوەستن؟ یەعنی: تە دەرگەهڤان بۆ خۆ یێن دانین.. و ئەڤە تشتەکێ جودابوو ژ سیاسەتا عومەری، موعاویەی گۆتێ: بەلێ ئەی ئەمیرولموئمنین ئەوا گەهشتییە تە تشتەکێ ڕاستە، عومەری گۆتێ: ڤێجا بۆچی تو وە دکەی؟ دلێ من دچیتێ ئەز تە پێخواس بهنێرمە وەلاتێ حیجازێ!

وی گۆت: ئەی ئەمیرولموئمنین ئەم یێن ل وەلاتەکی جاسووسێن دوژمنی لێ دمشەنە، لەو دڤێت ئەم وەسا خۆ نیشا وان بدەین کو هەیبەتا ئیسلامێ و ترسا موسلمانان بکەفتە دلێن وان، و ئەز دێ وێ کەم یا تو فەرمانێ ل من دکەی، و دێ خۆ ژ وی تشتی دەمە پاش یێ تو من ژێ ددەیە پاش، عومەری گۆتێ: چی تشتێ ئەز پسیارا وی ژ تە دکەم، تو ڕێکێ ل بەر من تەنگ دکەی، نە ئەز فەرمانێ ل تە دکەم، و نە تە ژ چو ددەمە پاش!

ژ بەر ڤێ سیاسەت و سەر و بەرێ موعاویەی، دەمێ عومەری ئەو ددیت دگۆت: ئەڤە کیسرایێ عەرەبانە! و د گەل کو ئەو مەزنی و هەیبەتا موعاویەی ل دۆر حوکمێ خۆ ددانا، و ئەو سیاسەتا وی ب کار دئینا، وەکی

وی سەر و بەری نەبوو یێ عومەری ب خۆ ب کاردئینا ژی، بەلێ عومەری خۆ ژێ بێ دەنگ کربوو؛ چونکی وی دزانی موعاویەی مەخسەدەکا شەرعی پێ هەیە، و هەر چەندە عومەری گەلەک والی دئێخستن و دەم بۆ دەمی ئەو دگوهارتن ژی، بەلێ وی موعاویە هێلا، و ویلایەتا وی بەرفرەهکر، و حەتا عومەر مری ژی موعاویە هەر والی بوو ل وەلاتی شامێ.

دەمێ عوثمان بوویە خەلیفە وی موعاویە هێلا ل سەر کارێ وی، و موعاویە یێ بەردەوامبوو د جیهادا خۆ دا دژی دەولەتا رۆمێ، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێکەمین مەزنێ (ئسطوولێ ئیسلامی یێ بەحری) ئاڤاکری، و ئەو ئێکەمین سەرلەشکەرێ موسلمان بوو جیهاد د دەریایێ دا کری.

دەمێ فتنە ل زەمانێ ئیمامێ عوثمان پەیدابووی، موعاویە ئێک ژ وان کەسان بوو یێن داخواز ژ عوثمانی کری کو ئەو دەستویرییێ بدەتە والییێن خۆ هەر ئێک ل جهێ خۆ ب توندی سەرەدەرییێ د گەل فتنەچییان بکەت؛ دا فتنە هێشتا ل دەسپێکا خۆ بمرت، بەلێ عوثمان د گەل ڤێ چەندێ نەبوو، و هزرا وی ئەو بوو کو توندی پتر دێ فتنێ بەرفرەهـ کەت، و دڤێت ب نەرمی و رحەتی سەرەدەری د گەل وان بێتەکرن، و بەری موعاویە ژ مەدینێ ڤەگەرییتە شامێ، وی گۆتە خەلیفەی: د گەل من وەرە شامێ، بەری مسەلە بگەهتە وێ دەرەجەیێ کو تو نەشێیە وان، عوثمانی گۆت: ئەگەر ستوییێ من بێتە برین ئەز جیرانییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناهێلم! موعاویەی گۆتێ: باشە، ئەز دێ لەشکەرەکی ژ شامێ هنێرمە مەدینێ، دا ئەگەر بوو تەنگاڤی ئەو بەرەڤانییێ ژ تە بکەن. عوثمانی گۆتێ: ئەز ل سەر خەلکێ باژێرێ پێغەمبەری ناکەمە تەنگاڤی. هنگی موعاویەی گۆتێ: ئەی ئەمیرولمۆئمنین ب خودێ یان دێ ئێیە کوشتن، یان ژی ئەو دێ ئێنە تە ل ڤێرێ.. عوثمانی گۆت: (حسبی الله و نعم الوکیل).

پاشی ئەو چێبوو یا بەری نوکە مە ڤەگێڕای دەمێ مە بەحسێ ئیمامێ عوثمان کری، و تشتێ بەرچاڤ ئەوە ل دەمێ فتنێ، و ژ بەر هشیاری و موکمییا موعاویەی، فتنەچییان بەرپییێن خۆ ل شامێ نەدیتن، وەکی کو ل عیراقێ و مصرێ دیتی، و موعاویە شیا جهێ خۆ ژ خرابییا فتنەچییان بپارێزت..

پشتی ئیمام عەلی بوویە خەلیفە، و هژمارەکا مەزن ژ فتنەچییان -بۆ سیاسەت- خۆ دایە د گەل لەشکەرێ وی، وان گڤاشتن ل سەر ئیمامی کر دا ئەو چەند والییەکان بێخت، و ئێک ژ وان موعاویە بوو، و دەمێ ئیمامی ڤیای ڤێ چەندێ ب جە بینت، موعاویەی و خەلکێ شامێ بڕیارا ئیمامی ب جە نەئینا، و وان هنگی بەیعە نەدابوو عەلی.. و ئەو چێبوو یا مە بەری نوکە ڤەگێڕای دەمێ مە بەحسێ ژیانا ئیمام عەلی کری، و هەوجە ناکەت ل ڤێرێ دوبارە بکەین.

مەسەلە گەهشتە هندێ ئیمام عەلی هاتە شەهیدکرن ب دەستێن خەوارجان، و خەلکێ کووفە کوڕێ وی حسەن ل جهێ وی دانا، و پشتی شەش هەیڤان، حسەن ژ وان بێ هیڤی بوو، و کاغەزەک بۆ موعاویەی هنارتە شامێ، و ئەو بوو ئەو صولح د ناڤبەرا وان دا چێبوو، یا بەری نوکە مە بەحس ژێ کری دەمێ مە بەحسێ ئیمام حسەن کری.

ل وی دەمێ خەوارج ب کوشتنا ئیمام عەلی ڕابووین، و ئەو د ڤێ تاوانا خۆ دا سەرکەفتین، وان بەرگەڕیانا کوشتنا موعاویەی ژی کر، و هەر چەندە وان ئەو بریندارکر ژی بەلێ ئەو نەمر.

ل وی دەمێ هەڤڕکی و شەر د ناڤبەرا وی و ئیمام عەلی دا هەی ژی، دەمێ مەسەلەکا علمی ل بەر موعاویەی ئالۆز ببا، وی کاغەزەک بۆ عەلی دهنارت، و پسیارا خۆ پێ دکر، لەو دەمێ خەبەرێ شەهیدبوونا ئیمام عەلی

گەهشتییێ وی کرە گری، و دەمێ پسیار ژێ هاتییەکرن: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: تو نزانی چ قەنجی و علم ئەڤرۆ ژ دەست خەلکی دەرکەفت!



ل هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سالا (٤١) مشەختی، و ب دورستی پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب سیه سالان، حسەنێ کورێ عەلی تەنازول ژ خیلافەتێ کر، پشتی بۆ وی دیاربووی کو هەڤالێن وی ژ خەلکێ کووفە نە یێن هندێنە مرۆڤ خۆ پێ پشتگەرم بکەت، لەو وی هنارتە ب دویڤ موعاویەی ڕا و داخواز ژێ کر ئەو بێت دا صولحێ بکەن، و ئەڤ صولحە ل بازێڕێ کووفە هاتەکرن، و ب ئامادەبوونا حسەنی و حوسەینی و موعاویەی ئەو هاتە مۆرکرن، و خەلکێ کووفە بەیعە دا موعاویەی، و حسەن د گەل بنەمالا خۆ زڤڕی مەدینێ.. و ژ بەر کو د ڤێ سالێ دا دوبەرەکی د ناڤ ئوممەتێ دا نەما، ناڤێ ڤێ سالێ (سالا ٤١) بوو سالا کۆمبوونێ (عام الجماعة).

و ژ بەر وێ حەدیسا دورست یا تێدا هاتی کو (خلافەت پشتی من سیه سالن) هندەک کەس بۆ هندێ چووینە کو چێ نابت بێژینە موعاویەی و ئەوێن پشتی وی هاتین: خەلیفە، بەلکی دڤێت بێژینێ: مەلک.

بەلێ د بەرسڤا ڤێ چەندێ دا زانایێ مەزن (شیخ الإسلام ابن تیمیە) ئاشکەرا دکەت کو دورستە بۆ وان یێن پشتی سیه سالان ژی هاتین بێتەگۆتن: خەلیفە، ئەگەر خۆ ئەو مەلک ژی بن، و دەلیل ل سەر ڤێ چەندێ ئەو حەدیسە یا (بوخاری و موسلم) ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزن، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((**کانت بنو إسرائیل تسوسهم الأنبیاء، کلما هلک نبي خلفه نبي، وإنه لا نبي بعدي، وسیکون خلفاء**

**فیکثرون))** و ژ ڤێ حەدیسێ ئاشکەرا دبت کو گەلەک خەلیفە دێ هەبن، و د حەدیسەکا دی دا یا (موسلم) ژ جابرێ کورێ سەمورەی ڤەدگوهێزت هاتییە: **((لا یزال هذا الدین عزیزا منیعا إلی اثنی عشر خلیفة..))** مەعنا: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ خەلیفە یێ دانایە سەر پتر ژ هەر چار خەلیفەیێن راشدی.

هەر چاوا بت دەمێ موعاویە بوویە خەلیفە هژمارەکا مەزن ژ صەحابییێن خودان بها، و تابعییێن خودان قەدر دزێندی بوون، و وان هەمییان موبایەعا وی کر، تشتێ هندێ دگەهینت کو ئەو یێ ژ هەژی خەلیفاتییێ بوو، ئەگەر نە.. وان موبایەعا وی نەدکر؛ چونکی صەحابی نە ئەو بوون یێن ژ ترسێن کسەکی دا یان بۆ مەصلحەتەکا دنیایێ، حەقییێ ڤەشێرن، یان خۆ ل سەر باطلی بێ دەنگ بکەن.

نێزیکی بیست سالان (ژ سالا ٤١ حەتا ٦٠ مشەختی) موعاویەی حوکمکر، و ل سەر دەمێ وی باژێرێ دیمەشقێ پایتەختا دەولەتا ئیسلامێ بوو، و فتووحاتێن ئیسلامی ل لایێ رۆژئاڤایێ ڤە زێدەبوون، و جیهادا ئیسلامی دژی دەولەتا بیزەنتی مشە بوو، و ل ڤێرێ دەلیڤە دەست نادەت ئەم ڤی بابەتی بەرفرەه بکەین، ب تنێ دێ بێژین: ئەگەر دەمێ خیلافەتا موعاویەی د گەل زەمانێ پشتی وی بێتە هەڤبەرکرن دەمێ وی ژ یێ پشتی وی باشتر و چێتر بوو، خۆ دەمێ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی ژی، چونکی موعاویە ژ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی باشتر و ب رەحمتر بوو، پسیار ژ عەبدللاهێ کورێ موبارەکي هاتەکرن: ئەرێ کی چێترە موعاویە یان عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی؟ وی گۆت: ئەو تۆزا د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چوویە دفنا موعاویەی ژ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی چێتر بوو! و جارەکێ پشتی بوویە زەمانێ عەبباسییان، هندەکان ل دیوانا ئیمامێ

ئەعمەش بەحسێ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی و عەدالەتا وی کر، ئەعمەشی گۆت: پا ئەگەر هەوە زەمانێ موعاویەی دیتبا هوین دا چ بێژن؟ وان گۆت: هندی یێ بێنفرەهبوو؟ وی گۆت: نە، هندی یێ ب عەدالەت بوو.

بەلێ ئەگەر دەمێ موعاویەی د گەل یێ هەر چار خەلیفەیان بێتە قیاسکرن، بێ گومان دەمێ وان ژ یێ وی چێترە.



تشتێ ژ هەمییێ پتر بوویە جهێ رەخنە و دان و ستاندنێ، یێ کو موعاویە ل دەمێ حوکمدارییا خۆ پێ رابووی، ئەو بوو دەمێ وی بریار دای پشتی وی کورێ وی یەزید ببتە خەلیفە، و ب ڤێ چەندێ وی مەسەلا شوورایێ راکر، و مەسەلا جێگری یان (وەلی عەهدی) دەرێخست، ئەوا پشتی وی بوویە عەدەت د ناڤ ئوممەتێ دا.

بەری نوکە ژی، دەمێ مە بەحسێ حەسەن و حوسەینی کری، هندەک ئیشارەت مە دانە ڤێ مەسەلێ، بەلێ مە دڤێت ل ڤێرێ پتر بەحس ژێ بکەین.. ئیمامێ طەبەری ئاشکەرا دکەت کو ئەڤ هزرە ل سالا (٥٦) بۆ موعاویەی چێبوو، یەعنی: پشتی مرنا ئیمامێ حەسەن ب حەفت سالان، و سالەکێ پشتی مرنا صەحابییێ دووماهییێ ژ وان دەهێن مزگینی ب بەحشتێ بۆ هاتییەدان، و یێ دووماهییێ ژ وان شەشێن عومەری بۆ خیلافەتا پشتی خۆ هلبژارتین، کو سەعدێ کورێ ئەبوو وەققاصی بوو.

ڤێجا مەسەلا هلبژارتنا (یەزیدی) و پێلێدانا شوورایێ چاوا بوو؟

ل سەری چەند خالەک هەنە دڤێت ل بیرا مە بن:

ئێک: هندی یەزیدێ کورێ موعاویەی بوو، نە ژ صەحابییان بوو؛ چونکی ئەو ل زەمانێ عوثمانی ل سالا (٢٦) مشەختی، بووبوو.

دو: دەمێ موعاویەی ڤیای بەیعێ بۆ کورێ خۆ ژ خەلکی وەرگرت، هژمارەکا صەحابییان دزێندی بوون، و ئاشکەرایە کو صەحابی ژ وی دچێتر بوون، مەعنا: یەزید، کەسێ باشتر نەبوو، ئەگەر خۆ ئەم بێژین: ئەو یێ باش ژی بوو! و هەر چەندە شەرت نینە یێ باشتر ببتە خەلیفە مادەم ئەوێ دبتە خەلیفە یێ باش بت، بەلێ دانانا یێ باش ل دەمێ هەبوونا یێ باشتر دبتە جهێ رەخنەگرتنێ.

سێ: ئەڤ کارێ موعاویەی کری، کو هێشتا د ساخییا خۆ دا، و دەمێ ئەو خەلیفە، کەسێ بەری وی نەکربوو، چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و عوثمانی و عەلی کەس ل جهێ خۆ نەدانابوو، و ئەبووبەکری راستە عومەر پشتی خۆ دانا، و عومەری شەش کەس دەسنیشانکرن کو ئێک ژ وان پشتی وی ببتە خەلیفە، بەلێ هندی ئەو دساخ بەیعە بۆ یێ دی نەهاتبوودان.. و پشتی هنگی ژی، کەسێ ژ وان هەردویان کورێ خۆ نەدانابوو شوینا خۆ، لەو دەمێ موعاویەی هێجەت بۆ خۆ گرتی کو ئەوا وی کری رێکا ئەبووبەکری و عومەرییە هندەک صەحابییان گۆتێ: نەخێر، ئەو رێکا کیسرای و قەیصەرییە.

چار: ئەو صەحابییێن بەرهنگارییا موعاویەی کری، و بەیعە نەدایە کورێ وی، وەکی: عەبدللاهێ کورێ عومەری، و عەبدررەحمانی کورێ ئەبووبەکری، و عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، ژ کەس ژ وان نەهاتییە ڤەگوهاستن کو وان گۆت بت: ئەم بەیعێ نادەینە یەزیدی چونکی ئەو ب کێر نائێت، بەلکی وان دو هێجەت هەبوون، ژ گۆتنێن وان دئێنە وەرگرتن: ئێک: چونکی ژ حەدیسان دئێتە وەرگرتن کو نابت ل ئێک دەمی بەیعە بۆ دویان بێتەدان، لەو هندەک ژ وان گۆت: بلا موعاویە خۆ بێخت ئەم دێ بەیعێ دەینە کورێ وی. دو: وان دگۆت: ئەڤە رێبازا خەلیفێن راشدی نینە،

کو ئێک کوڕێ خۆ بدانتە جهێ خۆ، بەلکی ئەو ڕێبازا کیسرا و قەیصەرییە.

پێنج: د عەقیدا مە دا موعاویە -خودێ ژێ رازی بت- صەحابییەکێ باوەرپێیە، و نە یێ هندێیە گومان ل سەر هەبت، یان بێتە (ئێتتهامکرن)، و ئەم ل وێ باوەرێینە کو وی هزر دکر یا باشتر بۆ ئوممەتێ ئەوە یەزید پشتی وی ببتە خەلیفە؛ دا دەرگەهێ دوبەرەکییێ جارەکا دی ڤەنەبت، و ئەڤە نابتە مانع کو مەسەلا بابینییێ ژی دەورێ خۆ هەبت، بەلێ ئەگەر وی زانیبا یەزید ب کێر نائێت، مسۆگەر وی ئەڤ چەندە نەدکر.

شەش: بەلێ د گەل هندێ ژی، (ئەهلێ سوننەتێ) ل وێ باوەرێنە کو یا باشتر ئەو بوو موعاویە -خودێ ژێ رازی بت- ئەڤ چەندە نەکربا، و ئەو د ڤێ ئجتهادا خۆ دا یێ خەلەت بوو، و ڕاستە موجتەهد ئەگەر خۆ یێ خەلەت ژی بت یێ خودان خێرە، بەلێ ئەگەر وی ئەڤ کارە نەکربا دا بۆ ئوممەتێ باشتر بت؛ چونکی ئەڤ چەندە پشتی وی بوو عەدەت د ناڤ ئوممەتێ دا و (خیلافەت) بوو مەلکاتی، هەر خەلیفەیەکی کوڕێ خۆ ل شوینا خۆ ددانا، ئەگەر خۆ ئەو کەسەکێ ب کێرهاتی نەبا ژی، یان زارۆکەکێ ساڤا و بێفام ژی با.

حەفت: چێ نابت، نە ئەڤ مەسەلە، و نە مەسەلا شەڕێ موعاویەی د گەل ئیمامێ عەلی ژی، ببتە ئەگەرا هندێ کو ئەم ئەزمانێ خۆ د دەر حەقا موعاویەی دا بەردەین، و بێژین: ئەو یێ نەحەق و گونەهکار بوو، یان گۆتنێن سەقەت بێژینێ.. موعاویە صەحابی بوو، و مرۆڤەکی زانا و موجتەهد بوو، و مە باوەری هەیە کو ئنیەتا وی یا باش و دورست بوو، و ئەگەر ئەو د ئجتهادا خۆ دا یێ خەلەت ژی بت، ئەو یێ خودان خێرە، و دیرۆکا کەڤن و نوی یا ئوممەتێ ئاشکەراکرییە کو هەر کەسەکێ ڤیا بت

بهایێ صەحابییان کێم بکەت، یان دیرۆکا ئیسلامێ (تەشویە) و کرێت بکەت، وی ژ موعاویەی دەست پێ کرییە، لەو چێ نابت -ب چو هێجەتا هەبت- بهایێ ڤی صەحابی و هەر صەحابییەکێ دی یێ هەبت بێتە کێمکرن؛ چونکی دین د رێکا وان را یێ گەهشتییە مە، و ئەگەر ئەو یێن باوەرێ نەبن، مەعنا: گومان دێ کەفتە د وی دینی ژی دا یێ وان گەهاندییە مە.

پشتی ڤان خالێن کورت و گرنگ دێ بێژین: دەمێ موعاویە پێ حەسیای کو ئەو یێ بەر ب دووماهییا عەمرێ خۆ ڤە دچت، و وی دیتی کو ئەگەر ئەو کورێ خۆ یەزیدی ل جهێ خۆ بدانت، دێ شێت ئوممەتێ ژ هندێ پارێزت کو دوبارە ژێکڤە ببت، و وی بۆ ڤێ چەندێ دان و ستاندن د گەل هندەک هەڤالێن خۆ کر، و بیر و بۆچوونێن وان وەرگرتن، و ئێک ژ وان (زیاد بن أبیه) بوو، ئەوێ گۆتییێ: لەزێ د ڤی کاری دا نەکە.. و وی ب یا زیادی کر، بەلێ پشتی دەمەکی دوبارە وی مەسەلە هلێخست، و خەلکێ شامێ پشتەڤانییا وی کر، و وان هەمییان بەیعە دا یەزیدی، و ئەڤ چەندە وەکی مە گۆتی ل سالا (٥٦) مشەختی بوو.

موعاویەی داخواز ژ خەلکێ هەمی ولایەتان کر کو وەفدێن خۆ بهنێرنە شامێ؛ دا بەیعێ بدەنە یەزیدی، و وان ئەڤ چەندە کر، ب تنێ خەلکێ مەدینێ تێ نەبن، وان ئەڤ مەسەلە ژ بنی قەبویل نەکر! هژمارەکا صەحابییان بەرانبەر والییێ موعاویەی (مەروانێ کورێ حەکەمی) رابوونە ڤە و ئاشکەرا گۆتنێ: ئەڤ کارێ موعاویەی دڤێت بکەت، چاڤلێکرنە بۆ رێبازا کیسرا و قەیصەری، و لادانە ژ رێبازا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و خەلیفەیێن وی. و دەمێ موعاویەی ب ڤێ چەندێ زانی قەستا جیحازێ کر، و پشتی ژ کرنا حەجێ خلاصبووی، چوو مەدینێ، دا ئەو ب خۆ دان و

ستاندنێ د ڤێ چەندێ دا د گەل وان بکەت، و پشتی چەند (موناقشەیێن گەرم) بۆ وی دیاربوو کو نەرازیبوونا وان نە ژ بەر هندێیە کو یەزید ب کێر نائێت، بەلکی ژ بەر (حرصا) وانە ل سەر خیلافەتێ، و ترسا وانە ل سەر پاشەڕۆژا ئوممەتێ، و ڤێ چەندێ دلێ وی خۆش کر!

هەژییە بێژین: مەزنترین هەڤڕک بوو موعاویەی و خەلکێ شامێ د ڤێ مەسەلێ دا چار صەحابی بوون:

أ- عەبدللاهێ کوڕێ عومەری، و ئەوی دگۆت: ئەز موخالەفا ئوممەتێ ناکەم، و ئەگەر خەلک هەمی رازیبوون، ئەز ژی دێ رازی بم، هەر چەندە ئەڤ شێوە د هلبژارتنا خەلیفەی دا نە ب دلێ منە.

ب- عەبدڕەحمانێ کوڕێ ئەبووبەکری، و ئەڤە ژ هەمییان دژوارتر بوو، وی ل بەر دەڤێ موعاویەی دا و ڕابوو ژ دیوانا وی دەرکەفت، و گەف ژی ل موعاویەی کرن، ئینا موعاویەی گۆت: یا رەببی تو بەلا وی ژ من ڤەکەی!!

ج- عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری، و موعاویەی دگۆتێ: هەمی خەتایێن تەنە کو یێن دی ژی بەیعێ نەدەن! بەلێ وی گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەم یێن داینە پاش کو بەیعێ بدەینە دو ئەمیران د ئێک دەمی دا، ئەگەر تو وەستیابی، خیلافەتێ بهێلە و یەزیدی بدانە جهێ خۆ، و ئەز دێ بەیعێ دەمێ.

د- حوسەینێ کوڕێ عەلی، و بەلکی رەئیا وی -د گەل ڤان ئەگەرێن بۆرین ژی- ئەو بت کو یەزید ب کێر ڤی کاری نائێت.

هەر چاوا بت، گەلەک صەحابییان -ل مەدینێ- موافەقا موعاویەی ل سەر ڤێ چەندێ کر، و هژمارا وان -وەکی دیرۆکڤان دبێژن- نێزیکی شێست صەحابییان بوو، و پشتی موعاویە ژ مەدینێ دەرکەفتی ب دەمەکێ

کێم عەبدررەحمانێ کورێ ئەبووبەکری مر، و سێ کەس مان بەیعە نەدای: عەبدللاهێ کورێ عومەری و ئەڤی پشتی مرنا موعاویەی بەیعە دا یەزیدی دەمێ دیتی ئوممەت ل سەر کۆمبوو، و عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، و حوسەینێ کورێ عەلی، و ئەڤان بەیعە نەدایێ و هەردو ژ مەدینێ دەرکەفتن و چوونە مەکەهێ.

مەسەلە هۆسا ما حەتا مرنا موعاویەی ل سالا (٦٠) مشەختی، و یەزید ل جهێ وی بوویە خەلیفە، و خەلەتییا یەزیدی یا مەزن ئەو بوو هەر ژ دەسپێکێ وی ڤیا ب کوتەکی بەیعێ بۆ خۆ ژ عەبدللاهێ کورێ زوبەیری و حوسەینێ کورێ عەلی بستینت، و دەمێ ئەو ل بەر ڤێ چەندێ نەهاتین، هەڤرکی مەزن بوو حەتا گەهشتییە هندێ مەسەلە ب دەرکەفتنا حوسەینی بۆ عیراقێ ب دووماهی هاتی، پاشی شەهیدبوونا وی ل دەسپێکا سالا (٦١)، وەکی بەری نوکە مە بەحس ژێ کری، دەمێ مە ژینەنیگارا ئیمامێ حوسەین ڤەگوهاستی، و ئەڤ سەرهاتییە بوو ئەگەرا هندێ یەزید و حوکمێ وی د چاڤێن موسلمانان دا ڕەش ببت حەتا ئەڤرۆ!

پشتی هنگی دەمێ یەزیدی نیشانێن دەرکەفتنا ئاشکەرا ژ عەبدللاهێ کورێ زوبەیری ل سەر دەسهەلاتا وی دیتین، وی ڤیا ب هێزێ دووماهییەکێ بۆ وی ژێ بدانت، لەو وی لەشکەرەک هنارتە مەکەهێ بۆ گرتن، یان حەتا کوشتنا کورێ زوبەیری، بەلێ خودێ وەسا حەزکر یەزید ل سالا (٦٤) بمرت بەری لەشکەرێ وی دووماهییەکێ بۆ کورێ زوبەیری بدانت، و پشتی مرنا وی کورێ وی (موعاویە) ل جهێ وی بوو خەلیفە، بەلێ ژ بەر کو ئەو مرۆڤەکێ نساخ بوو، هەر وەسا ژ بەر کو وی دل د حوکمدارییێ نەبوو، وی دەست ژ خەلیفاتییێ کێشا، و د ناڤ خەلکی دا ڕابوو و گۆت: من حەزکر وەکی ئەبووبەکری بکەم، بەلێ من کەسەکێ وەکی

عومەری د ناڤ هەوە دا نەدیت ل جهێ خۆ بدانم، و من ڤیا وەکی عومەری بکەم، بەلێ من د ناڤ هەوە دا کەس وەکی وان هەر شەشان نەدیت یێن عومەری هلبژارتین، ڤێجا یێ هەوە بڤێت بۆ خۆ هلبژێرن.. پاشی ئەو چوو د مال ڤە و دەرنەکەفت حەتا مری. و بەری ئەو بمرت هندەکان گۆتێ: ما تو ئێکی ژ مالا خۆ نادانییە جهێ خۆ؟ وی گۆت: من نەڤێت تەعلییا وێ تام بکەم و شرینییا وێ بۆ بنەمالا ئومەییەی بهێلم!

پشتی ئەو مری، دوبەرەکییەکا مەزن د ناڤ ڕێزێن ئوممەتێ دا پەیدابوو، خەلکێ حیجازێ بەیعە دا عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، بەلێ خەلکێ شامێ ب ڤێ چەندێ رازی نەبوون، و گۆتن: ئەم قەبویل ناکەین ئەڤ مەسەلە ژ دەست مە دەرکەڤت، لەو وان بەیعە دا مەروانێ کورێ حەکەمێ ئومەوی، و پشتی مەروانی کورێ وی عەبدلمەلک هاتە شوینێ، و هەڤرکییەکا دژوار د ناڤبەرا وی و عەبدللاهێ کورێ زوبەیری دا پەیدابوو، ب شەهیدبوونا عەبدللاهێ کورێ زوبەیری ب دووماهی هات[1].



زڤرین ل موعاویەیێ کورێ ئەبوو سوفیانی -خودێ ژێ رازی بت- دێ بێژین: پشتی سالا (٦٠) مشەختی ب نیڤی بووی، و پشتی نێزیکی بیست سالان ژ خەلیفاتییێ، ئەمیرولموئمنین موعاویە نەخۆش کەفت، و ژییێ وی هنگی نێزیکی حەفتێ و هەشت سالان بوو، و تشتێ ژێ هاتییە ڤەگوهاستن بەری مرنێ ئەو بوو وی وەصیەت کر نیڤا مالێ وی پشتی مرنێ بۆ خزینەیا دەولەتێ (بیت المال) بێتەدان، و وی گۆتە مرۆڤێن خۆ:

---

(١) سەرهاتییا شەهیدبوونا عەبدللاهێ کورێ زوبەیری -خودێ ژێ رازی بت- مە د کتێبا خۆ (چیرۆک و دیرۆک) دا چیرۆکا شەڤا خاترخواستنێ ڤەگێرایە، و هەچییێ بڤێت دشێت ل وێرێ لێ بزڤرت.

د فلان سندووقێ دا کراسەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەیە، د گەل هندەک موی و نینۆکێن وی من بۆ ئەڤرۆ یێن هلگرتین، ئەگەر ئەز مرم، وی کراسی د بن کفنی دا بکەنە بەر من، و وان پرتێن نینۆکان و موی بکەنە د دەڤ و دفن و چاڤێن من دا.. و ئەگەر هەوە ئەز کرمە د قەبرێ من دا موعاویەی بهێلنە د گەل (أرحم الراحمين)ی.

دەمێ نساخی ل سەر وی دژواربووی وی گۆت: تێچوون بۆ وێ مالێ بت یا چل سالان من مەلکاتی لێ کری، بیست سالان ئەمیر، و بیست سالان خەلیفە، و ئەڤە حالێ منە تێدا، تێچوون بۆ دنیایێ بت و عاشقێن وێ!

گاڤا ئەو کەفتییە بەر مرنێ وی گۆت: خوزی ئەز زەلامەکێ قورەیشی بامە ل (ذی طوی)، و تشتەک ژ ڤی کاری نەکەفتبا د دەستێ من دا.. پاشی کرە گری، هندەکان گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: گرییا من نە ژ بەر وێ مرنێیە ئەوا ب سەر من دا هاتی، و نە ژ بەر وێ دنیاییێیە یا ئەز ل پشت خۆ دهێلم، بەلێ مەسەلە دو مستن: مستەک بۆ بەحەشتێیە، و ئێک بۆ جەهنەمێیە، و ئەز نزانم کانێ ئەز دێ ژ کیژ هەر دویان بم.

پاشی وی ڕویێ خۆ دانا سەر عەردی و کرە گری و گۆت: یا رەببی تە د کیتابا خۆ دا گۆتییە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾ (النساء: ٤٨) یا رەببی تو من ژ وان حسێب بکەی یێن تو حەز دکەی گونەهێن وان بغەفرینی. و مرنا وی و ڤەشارتنا وی ژی -خودێ ژێ رازی بت- ل باژێرێ دیمەشقێ بوو.

# عەمرێ کوڕێ عاصی

زەلامێ دویێ ژ زەلامێن دەمێ شارپای، عـەمرێ کـوڕێ عاصی بوو، ئێـک ژ مـەزنترین عەقلدار و تێگەهشـتییێن عـەرەبان، دەمـەک ب سـەر دا هاتبوو مەزنترین دوژمنێ ئیسلامێ ئەو بوو، ئەگەر هنگی مربا جەهنەم دا بۆ وی واجب بت.. پاشی دەمەکی دی ب سەر دا هات بەیعە دا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- و هندی هند وی شەرم ژێ دکر تێر بـەرێ خۆ نەدایێ حەتا مـری، ئەگـەر هنگـی ئـەو مربـا خـەلک دا بێـژن: خـوزییێن وی دێ چتـە بەحەشـتێ.. پاشـی دەمـەکێ دی ب سـەر دا هـات تێکـەلی دەسـهەلاتێ و هندەک شۆلێن دی بوو، دەمێ کەفتییە بەر مرنێ وی دگۆت: ئەز نزانم چاوا دێ ژێ دەرکەڤم، بۆ من یان ل سەر من!

عەمرێ کوڕێ عاصی، ئەوێ پێغەمبەری -سـلاڤ لـێ بـن- د دەر حـەقا وی دا گۆتی: ((**أسلم الناس وآمن عمرو بن العاص**))[1] یـەعنی: خـەلک تەسلیمبوون، بەلێ عەمرێ کوڕێ عاصی باوەری ئینا..

ڤێجا عـەمر کـی بـوو؟ و سـەرهاتییا وی ل دەمـێ شـارپای ژ دیرۆکـا ئومەتێ چ بوو؟

بابێ عەبدللاهی، عەمر کوڕێ عاصی بوو، و عاص کوڕێ وائلێ کوڕێ هشـامێ کـوڕێ سـەعدێ کـوڕێ سـەهمییە، و سـەهم ئێـک ژ بـابکێن قورەیشییانە ئەو د نەسەبا خۆ دا دگەهتـە کـەعبێ کـوڕێ لوئـەیێ قورەیشـی..

---

(١) ترمذی ڤێ حەدیسێ ژ عوقبەیێ کوڕێ عامری ڤەدگوهێزت.

ئێــک ژ مــاقویلێن مەکــەهێ بــوو، ل وێ ســالا مــەزنێ مەکــەهێ عەبدلموطـطەلب تێدا مری، یەعنی: دەمێ ژییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەشت سال، عەمرێ کورێ عاصی هاتبوو سەر دنیـایێ، و سیهـ و دو سالان پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو مابوو ساخ؛ چونکی مرنا وی ل سالا (٤٣) مشەختی بوو، مەعنا: ئەو نێزیکی حەشتێ و حەفت سالان ژیابوو.

بوونا وی ل مەکەهێ بوو، و مرنا وی ل مصرێ بوو، دەمێ موعاویەی -خودێ ژێ رازی بت- ئەو کرییە والی ل وێرێ.



دیرۆکـێ دەنـگ و باسـێن وی ژ هنگـی وەرە د نـاڤ بەرپـەرێن خـۆ دا هلگرتینە دەمێ هـژمـارەکـا مـوسلمانان (سێزدە زەلام و چار ژن) بۆ خۆ ژ مەکەهێ رەڤین و قـەسـتـا وەلاتێ حەبەشە کرین، ئینا مـەزنێن مەکـەهێ ل سـەر هنـدێ پێکهـاتن کـو کـورێ خـۆ عـەمرێ کـورێ عاصـی، هـەڤالێ نەجاشییێ مەلکێ حەبەشە، د دویڤ وان موسلمانان دا بهنێرنە حەبەشـە؛ دا داخوازێ ژ نەجاشی بکەت کو ئەو وان مرۆڤان دەربێخت یێن ژ مەکـەهێ هاتینە وەلاتێ وی.. و د گەل وێ هەمی شارەزایی و تێگەهشتنا عـەمری هـەی، بـەلێ ئـەو حـەقیبا خودێ ل سـەر ئـەزمانێ جەعفـەرێ کـورێ ئـەبوو طالبی گێرای ئەو هەمی (عەبقەرییەتا عەمری) هەی پویچ کر!

پشـتی ڤـێ (شکەسـتنێ) یـا عـەمری دیتـی، جارەکـا دی ئـەو ژ بـەر چاڤێن دیرۆکـێ بـەرزە دبت، بـەلێ هەڤرکی ل مەکـەهێ یـا بـەردەوام بـوو، و دەمێ مەیدانا هەڤرکییێ هاتییە گوهارتن و پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- و صەحابییێن وی قەستا مەدینێ کری، و ب دەسـتێن موهاجر و ئەنصارییان دەولەتا خۆ ل وێرێ داناى، قورەیشی گەهشتنە وێ باوەرێ کو مەسەلە ئێدی

یـا ژ دەسـت وان دەردکـەڤت، لـەو وان هـزر ل هنـدێ کـر کـو ڕەنگـێ گێڕنـا هـەڤڕکییێ بگوهـۆڕن.. و عـەمری ژی د گـەل هـەمی مـەزنێن دی یـێن قورەیشییان هزرا خۆ دا کاری، و نەخشە و پیلان گێڕان، ڕۆژا بـەدرێ هات، و یا ئوحودێ چوو، و ڕۆژا خەندەقێ ئـەو مەندەهووش کرن، و یا صولحا حودەیبییێ ئەو مەجبوور کرن ئعترافێ بکەن کو موحەممەد یێ هاتییە ڕێزا وان، و دەم هـات عـەمـر -وەکی هنـدەک ماقـویلێن دی یێن مەکەهێ- ب هویری هزرا خۆ د وی دینی دا بکەت یێ موحەممەد پێ هاتی، تـو بێـژی ئەو دینەکێ ڕاست بت؟ بەلێ چاوا عەمر وی دینی بهێلت یێ بـا و باپیرێن وی ل سەر چووین!

بەلێ بـەری عـەمر بگەهتـە ئەنجامـەکا دورسـت وی د گەل خۆ گـۆت: هندە خلاص! مادەم مـسەلا موحەممەدی گـەهشتە وێ دەرەجێ ئـەو بێـت و ل بەر دەرگەهێ مەکەهێ صولحێ ل سەر قورەیشییان فەر کەت، مـەعنا ئـەو ب سەرکەفت، ئێدی جهێ من لِ ڤێرێ نەما، یا باش بۆ مـن ئـەوە ئـەز بچم قەستا حەبەشە بکەم، ل نک هەڤالێ خۆ یێ نەجاشی، و ئەگـەر مللـەتێ مـە شیانە موحەممەدی دێ زڤڕمە نـاڤ وان، ژ خۆ ئەگـەر موحەممـەد شـیا وان، ژیانا ل بن دەسـتێ نەجاشـی بت مـن پێ خۆشـترە ژ هندێ کـو ژیانـا ل بـن دەستێ موحەممەدی!

بەلێ مەندەهووشییا عەمری چەند یـا مـەزن بـوو دەمـێ وی ل حەبەشـە دیتی هەڤالێ وی یێ نەجاشی گۆتییێ: ئەی عەمر، ئەز ب خودێ کەمە ئـەو نامووسێ دئێتە نک موحەممەدی هەر ئەوە یێ دهاتە نک مووسـایی ژی، و ئـەو دێ ب سەرکەڤت کانێ چاوا مووسا ب سەرکەڤت، ڤێجا ئەگـەر تـو دێ ب یا مـن کـەی، بزڤـڕە وەلاتـێ خۆ و هەڕە بـاوەرییێ پـێ بینـە، ئەو بۆ تـە باشترە.

عەمری ب یا وی کر.. زڤری مەکەهێ، و ڕۆژەکێ ل دەسپێکا سالا هەشتێ مشەختی، و پشتی بیست سالان ژ هەڤڕکییەکا دژوار د گەل ئیسلامێ، بەرێ عەمری ب هەر دو هەڤالێن وی کەفت: خالدێ کوڕێ وەلیدی و عوثمانێ کوڕێ طەلحەی، ئەو دسویار بوون، و دا ژ مەکەهێ دەرکەڤن، عەمری گۆتە وان:

- دێ کیڤە چن؟

خالدی گۆت: دێ چینە مەدینێ..

- مەدینێ؟! مەدینێ بۆچی؟

خالدی گۆتێ: چونکی پێغەمبەرێ خودێ یێ ل مەدینێ..

عەمری هەوجەیی ب دەمەکێ درێژ نەبوو کو خەطەرترین بڕیارێ د ژینا خۆ دا بدەت، بڕیارا چوونا مەدینێ د گەل خالدی و عوثمانی! و دەمێ ئەو گەهشتینە مەدینێ، و موسلمانان ب هاتنا وان زانی هند کەیفا وان هات دا بێژی ڕۆژا جەژنێیە، و ما وان چ ددی دڤێت ژ بلی هندێ کو خالد و عەمر د ئێک ڕۆژێ دا ب مشەختی بێن و ئیعلانا ئیسلاما خۆ بکەن؟!

پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- کەیف ب هاتنا وان هات، و دەمێ ئەو ب ژۆر کەفتینە مزگەفتێ، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ نڤێژا ئێڤاری خلاصبووبوون، خالد ب نک پێغەمبەری ڤە چوو و دەستێ خۆ کرە د دەستی دا و شاهدە دا، پاشی عوثمانێ کوڕێ طەلحەی ژی، و بوو دۆرا عەمری.. دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێ خۆ ب نک وی ڤە درێژکری، عەمری دەستێ خۆ ڤەکێشا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تە خێرە ئەی عەمر؟ عەمری گۆتێ: من شەرتەکێ هەی! پێغەمبەری گۆتێ: شەرتێ تە چییە؟ وی گۆت: کو خودێ گونەهێن من یێن بۆرین هەمییان بۆ من بغەفرینت.. ، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەی

عەمر! ما تو نزانی ئیسلام تشتێ بەر خۆ ژێ دبەت، و مشەختبوون تشتێ بەری خۆ ژێ دبەت؟[1]

هۆسا ل هەیڤا صەفەرێ ژ سالا هشتێ عەمر هاتە د ئیسلامێ دا.



هەر ژ دەسپێکا هاتنا وی د ئیسلامێ دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پویتەیەکێ مەزن پێ کر، و سەنگەکێ گران دایێ.. و پشتی چەند هەیڤەکێن کێم چووین، رۆژەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتە ب دویڤ عەمری را، عەمر دبێژت: ئەز هاتمە نک وی دەسنڤێژا خۆ دشویشت، بەرێ خۆ دا من پاشی سەرێ خۆ چەماند و گۆت: من دڤێت تە بکەمە مەزنێ لەشکەرەکی و تە ب غەزایەکێ بهنێرم، خودێ دێ تە ب سلامەتی زڤرینت، و مال ژی دێ ب دەست تە کەڤت، و من ژ دل دڤێت مال بگەهتە تە.. عەمری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ژ بەر مالی ئەز موسلمان نەبوویمە، بەلکی ژ بەر ڤیانا من بۆ ئیسلامێ و دا کو ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ بم ئەزێ هاتیم موسلمانبوویم، پێغەمبەری گۆت: ئەی عەمر، چ باشە مالێ باش د دەستێ مرۆڤێ باش دا بت!

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کرە ئەمیرێ لەشکەرەکی ژ سێسەد کەسان پێک دهات و ب لایێ شامێ دا هنارت؛ دا وان ئویجاخێن عەرەب ئەدەب بدەت یێن هەڤالینیا رۆمێ دژی موسلمانان کری ل شەڕێ (موئتە) و پشتی هنگی لەشکەرەکێ دی ژی بۆ هاریکاری هنارت هندەکێن وەکی ئەبووبەکری و عومەری و ئەبوو عوبەیدەی د ناڤ دا بوون، و عەمر ئەمیرێ وان بوو، تشتێ هندێ دگەهینت کو بهایێ عەمری د ناڤ کۆما موسلمانان

---

(١) عەمر پشتی هنگی پەشێمانبووبوو کو هنگی بیرا وی نەهات ئەو بێژت: گونەهێن بۆرین، و یێن ژ نوی ئەز دکەم ژی!!

دا هەر ژ سەری گەلەک بوو.. و ئەڤ غەزایا هە ب ناڤێ (ذات السلاسل) دئێتە نیاسین.

پشتی هنگی و ل هەیڤا رەمەزانێ هەر ژ وێ سالێ (سالا هەشتێ) عەمری د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکداری د ڤەکرنا مەکەهێ دا کر، و پشتی ڤەکرنا مەکەهێ عەمر ئێک ژ وان ئەمیران بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هنارتین دا صەنەمێن ناڤدار بشکێنن، و بارا عەمری ژ وان صەنەمێ (سواع) بوو، ئەوێ د ناڤ ئویجاخا (هوذەیلییان) دا هەی.

پشتی هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتە (عومانێ) دا ل وێرێ ببتە ئەمیر پشتی خەلکێ وێ هاتینە د ئیسلامێ دا، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا خودایێ خۆ کری ل سالا (١١) مشەختی عەمری ئەمیرێ عومانێ بوو.. و پشتی ئەبووبەکر بوویە خەلیفە وی ژی عەمر هێلا ل سەر کارێ وی دەمەکی، پاشی هنارتە ب دویڤ ڕا و ئەو کرە ئێک ژ سەرکێشێن لەشکەرێ ئیسلامێ یێ کو بەر ب شامێ ڤە چووی.

ل وی دەمێ ئەبووبەکری خاترا ژ ڤێ دنیایێ دخواست و قەستا خودایێ خۆ دکر، عەمر یێ بەردەوام بوو د سەرکەفتنێن خۆ دا ل چەپەرێ شامێ، و دەمێ خەبەرێ مرنا خەلیفەی و هلبژارتنا عومەری گەهشتییە عەمری و لەشکەرێ وی، بارا پتر ژ وەلاتێ فلسطینێ کەفتبوو ژێر ئالایێ ئیسلامێ، و عومەر.. ئەوێ گەلەک ب کسینی و عەقلدارییا عەمری یێ (موعجب) ئەو کار هێلانە د دەستێ وی دا یێن ئەبووبەکری کرینە د دەستی دا، و پشتی فلسطین بوویە پشکەک ژ وەلاتێ ئیسلامێ، و سەر و کرگرێن رۆمێ بەر ب مصرێ ڤە رەڤین، عەمری بەرگەریان کر کو عومەر

دەستویرییێ بدەتێ کو ئەو د دویڤ وان دا بچتە مصرێ، و ڤی وەلاتی ژی بستینت؛ دا رۆمی وی بۆ خۆ نەکەنە بنگەهـ بۆ هێرشکرنا ل سەر وەلاتێ شامێ.

عومەر ل دەسپێکێ ب ڤێ هزرێ یێ قانع نەبوو؛ چونکی وی نەدڤییا بەرێ لەشکەرێ خۆ بدەتە وەلاتەکێ بەرفرەهـ، و دەریا بکەڤنە ناڤبەرا وی و لەشکەرێ وی، بەلێ پشتی دەمەکی عەمر ب سیاسەتا خۆ شیا وی قانع بکەت، و لەشکەرەکێ پێکهاتی ژ چار هزار کەسان ب سەرۆکاتییا عەمری بەرهەڤکر، و ل سالا هەژدێ لەشکەرێ ئیسلامێ قەستا وەلاتێ مصرێ کر..

ل درێژییا پتر ژ سالەکێ عەمر شییا رۆناهییا ئیسلامێ ل وەلاتێ فیرعەونی بەلاڤ بکەت، و پشتی مصر ژی بوویە پشکەک ژ وەلاتێ ئیسلامێ، عومەرێ کورێ خەططابی عەمر کرە میرێ مصرێ[1].

بەلێ عومەری قانوونەکا دژوار هەبوو، وی د گەل میر و والییان ب کار دئینا، هەردەم وی زێرەڤانی ل وان دکر، و هەر جارەکا وی خەلەتییەک دیتبا، دەلیڤەیەکێ وی خۆ ژ چارەسەرییێ گیرۆ نەدکر.. جارەکێ گەهشتە گوهان کو مالێ عەمری یێ زێدەبووی، و پشتی عومەری حسێبا خۆ کری، دیت ئەگەر ئەڤ هەمی مالە بمینتە د دەستێ عەمری دا دەمەک دێ ئێت ئەو دێ بتە تەخەیەکا جودا ژ مللەتی، لەو عومەری (موحەممەدێ کورێ مەسلەمەی) هنارتە مصرێ و گۆتێ: مالێ عەمری هەمییێ بهژمێرە، پاشی ب نیڤی بکە، نیڤەکێ بۆ وی بهێلە، و نیڤا دی ل خزینەیا دەولەتێ

---

(١) د ڤەکرنا عەمری دا بۆ مصرێ سەرهاتییەکا غەریب رویدابوو، ب سەرهاتییا کۆترکا عەمری دئێتە نیاسین، ئەو سەرهاتی مە ب بەرفرەهی د کتێبا خۆ (چیرۆک و دیرۆک) دا ڤەگێرایە، لەو مە ب فەر نەدیت ل ڤێرێ دوبارە بکەینەڤە.

بزڤڕینه! عەمر ب بڕیارا عومەری ڕازیبوو.. چونکی وی بەری هەر کەسەکێ دی دزانی کو عومەر بۆ ئوممەتێ ئەو پەردەیە یێ وان ژ غەفلەتێ و سەرداچوونێ و فتنێ دپارێزت.

و هۆسا عەمر ل مصرێ و د گەل وی هەمی ئوممەت پاراستی ما هندی عومەر یێ ساخ، بەلێ پشتی عومەر چووی، حال ل عەمری ژی و ل ئوممەتێ ژی هاتەگوهاڕتن!!



پشتی ئیمامێ عوثمان بوویە خەلیفە بۆ دەمێ چار سالان عەمر والییێ وی بوو ل مصرێ، پاشی ل سالا (٢٧) و پشتی نێزیکی هەشت نەهـ سالان ژ والیاتییا وی بۆ مصرێ خەلیفەی بڕیار دا ئەو بێتە لادان، و ل شوینا وی عەبدللاهێ کوڕێ سەعدێ کوڕێ ئەبوو سەرحی ببتە والییێ مصرێ، و هەر چەندە عەمری بڕیارا خەلیفەی ب جهئینا و خۆ نەرازی نەکر ژی، بەلێ هەر وەکی پیچەکێ ئەو عێجزبوو ژ ڤی کارێ عوثمانی کری، لەو وی خۆ ڤەدەرکر، و سالێن مایی ژ خیلافەتا عوثمانی ئەو ل وەلاتێ فلسطینێ ئاکنجی بوو، و چو دەور وی د ڕویدانان دا نەبوو!



پشتی شەهیدبوونا ئیمامێ عوثمان و هلبژارتنا ئیمامێ عەلی بۆ خیلافەتێ، و دەسپێکرنا دەمێ شارپای ژ دیرۆکا ئوممەتێ، جارەکا دی ناڤێ عەمری هاتە بەرچاڤ، و دەورێ وی ئاشکەرا هاتە دیتن..

بەری نوکە مە ئاشکەرا کربوو کو دەمێ عەلی بۆ خیلافەتێ هاتییە هلبژارتن، وی بڕیار دا والییێن چەند وەلاتەکان بگوهۆڕت، و ئێک ژ وان موعاویە بوو، والییێ شامێ، و ژ بەر کو موعاویەی و خەلکێ شامێ بەیعە نەدابوو عەلی، وان دیت کو ب جهئینانا فەرمانا عەلی ل سەر وان

واجب نینه، لەو وان ئەو فەرمان ب جھ نەئینا. و پشتی ڤێ چەندێ، ئەو صەحابییێن هنگی ئامادە د مەسەلا ب جھئینانا حەددێ کوشتنێ دا ل سەر کوژەکێن ئیمامێ عوثمان، ل سەر سێ بۆچوونان ژێک جودابوون، وەکی بەری نوکە ژی مە ڤەگێرای:

- هندەکان گۆت: کوشتنا وان پێش ئیمامی ڤە یا ب ساناهی نینە؛ ژ بەر کو ئەو کوشتنا وان ب ڤێ لەزێ دێ فتنێ مەزنتر لێ کەت. و دێ ئوممەتێ تووشی دوبەرەکییێ کەت، و گیرۆکرنا ب جھئینانا حەددەکی (یان حەتا ب کارنەئینانا وی) چێترە ژ پەیداکرنا دوبەرەکییێ د ناڤ ئوممەتێ دا.. و ئەڤە بۆچوونا ئیمام عەلی بوو، و ژ بەر کو ئەو خەلیفە بوو، و طاعەتێ خەلیفەی واجبە، دڤیا هەمییان گوهدارییا وی کربا، ئەگەر خۆ ب دلێ وان نەبا ژی، بەلێ قەدەرا خودێ ب رەنگەکێ دی بوو!

- هندەک صەحابییێن دی گۆتن: پێتڤییە کوژەکێن ئیمامێ عوثمان بەری هەر تشتەکی بێنە کوشتن، و ئەگەر ب ئیمام عەلی ڤە نەئێت ئەو وان بکوژت، ئەم ب خۆ دێ کاری بۆ کوشتنا وان کەین، و دەمێ وان زانی کو کوژەکێن ئیمامی یێن رەڤین و چووینە بەصرا، ئەو رابوون قەستا بەصرا کرن، و ئەو بوو ئەو شەڕ چێبوو یێ ب ناڤێ (معرکة الجمل) هاتییە نیاسین، و بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ ژیانا ئیمام عەلی کری، مە بەحس ژێ کربوو.. و طەلحە و زوبەیر و هژمارەکا دی صەحابییان خودانێن ڤێ بۆچوونێ بوون.

- هندەک صەحابییێن دی هەبوون مایێ خۆ د ڤێ مەسەلێ نەکر، و گۆتن: ئەڤە فتنەیە، و یا باشتر بۆ دینێ مە ئەوە ئەم خۆ ژ ڤێ مەسەلێ بدەینە پاش، لەو وان خۆ ڤەدەر کر و ئەو نەچوونە د گەل چو ژ هەردو دەستەکێن بۆرین، و ژ خودانێن ڤێ بۆچوونێ: سەعدێ کوڕێ ئەبوو

وەققاصی، و عەبدللاهێ کورێ عومەری، و ئەبوو هورەیرە، و ئوسامە.. و هندەکێن دی بوون.

هنگی عەمرێ کورێ عاصی ل کیڤە بوو؟ و بۆچوونا وی چ بوو؟

بۆری د گەل مە کو ل سالا (٢٧) مشەختی ئیمامێ عوثمان بڕیار دا عەمرێ کورێ عاصی ژ والیياتییا مصرێ بێخت، و هنگی عەمر چوو فلسطینێ و ل وێرێ ئاکنجیبوو، و ئێدی مایێ خۆ د چو تشتان نەکر، و پشتی فتنە دژی عوثمانی ڕابووی، و دووماهیيێ ئەو هاتییە شەهیدکرن، و مسەلا ستاندنا تۆلا وی هاتییە مەیدانێ، دەورێ صەحابییان -ئەوێن مایی ژ وان- هاتە پێش؛ چونکی ئوممەت هەوجەیی ڕەئیا وان بوو، و ئەو بوو ئەو *ل سەر وان هەر سێ بۆچوونان لێکڤەبوون یێن مە بەحس ژێ کری.. و عەمر* -وەکی پترییا خەلکێ شامێ- ل وێ باوەرێ بوو کو پێتڤییە ل سەر ئیمام عەلی بەری هەر تشتەکی کوژەکێن ئیمامێ عوثمان بکوژت، و ژ بەر کو والییێ شامێ موعاویە (و ئەو پسمامێ عوثمانی بوو) بۆچوونا وی ژی هەر ئەڤە بوو، عەمری -وەکی هژمارەکا صەحابییێن دی- خۆ دا د گەل موعاویەی.

دەمێ ئیمام عەلی دیتی کو موعاویە و خەلکێ شامێ بەیعێ نادەنێ، وی بڕیار دا هێزێ ب کار بینت دا وان نەچار بکەت کو ئەو بەیعێ بدەنێ، و د ئەنجامێ ڤێ مەسەلێ دا ئەو شەڕ پەیدابوو یێ ب ناڤێ (معركة صفين) هاتییە نیاسین.

عەمرێ کورێ عاصی ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن پشکداری د ڤی شەڕی دا کرین د گەل لەشکەرێ موعاویەی، و وی دەورەکێ بەرچاڤ ژی تێدا هەبوو، و بەری هەر تشتەکی دڤێت بێتە زانین کو نە موعاویەی و نە خەلکێ شامێ شەڕێ عەلی نەکر چونکی ئەو ب کێر خیلافەتێ نائێت،

یان چونکی وان دگۆت: دڤێت موعاویه خەلیفه بت.. نە! سوحبەت ل سەر ڤێ چەندێ هەمییێ نەبوو، داخوازا لەشکەرێ شامێ ئەو بوو عەلی کوژەکێن عوثمانی بدەتە وان؛ دا ئەو وان بکوژن، و گۆتن: ئەگەر ئەو ڤێ چەندێ بکەت ئەم دێ بەیعێ دەینێ، و دەمێ عەلی داخوازا وان ب جهـ نەئینای، وان بەیعە نەدایێ.

ب سەنەدەکا دورست هاتییە کو (ئەبوو موسلمێ خەولانی) چوو نک موعاویەی و گۆتێ: ما تو ل ڕێزا عەلی یی تو هەڤڕکیێ د گەل وی دکەی؟ وی گۆت: نە ب خودێ، ئەز دزانم ئەو ژ من چێترە، و ئەو یێ هەژی ڤی کارییە، بەلێ ما هوین نزانن زۆرداری ل عوثمانی هاتەکرن حەتا ئەو هاتییە کوشتن؟ و ئەز پسمامێ ویمە، ئەز داخوازا خوینا وی دکەم، بێژنە عەلی بلا ئەو کوژەکێن عوثمانی بدەتە من، وی چ دڤێت ئەز دێ کەم. و گاڤا ئەو چوونە نک عەلی، و ئەڤ داخوازا موعاویەی گەهاندییێ، عەلی داخوازا وی ب جهـ نەئینا.

پشتی شەڕێ (صففینێ) ب دوماهی هاتی، بێی سەرکەفتنا لایەکی ل سەر لایێ دی، بڕیارا هەردو لایان ئەو بوو ل هەیڤا رەمەزانێ پێکڤە روینن دا چارەیەکێ بۆ مەسەلێ ببینن، و ئەو بوو ئیمامێ عەلی هەڤالێ خۆ صەحابییێ ناڤدار (ئەبوو مووسایێ ئەشعەری) پێش خۆ ڤە هنارت، و موعاویەی هەڤالێ خۆ صەحابییێ ناڤدار (عەمرێ کوڕێ عاصی) پێش خۆ ڤە هنارت، و گاڤا ئەو گەهشتینە ئێک، و پشتی چەند دان و ستاندنەکا ئەو نەگەهشتنە چو چارەیان، دوماهییێ عەمری گۆتە ئەبوو مووسای: ڤێجا تو چ دبێژی ئەڤ مەسەلە چاوا دێ چارەسەر بت؟ ئەبوو مووسای گۆت: ئەز دبێژم ئەڤ مەسەلە ب مە ڤە نائێت، و یا باش ئەوە ئەم وێ بهێلینە ب هیڤییا وان صەحابییان ڤە یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری و ئەو

یێ ژێ رازی.. یەعنی: ئەم دێ صەحابییێن مەزن کۆمکەین، و بلا ئەو بڕیارەکا ئێککگرتی د ڤێ مەسەلێ دا بدەن، و ئەم هەمی دێ پێ رازی بین.

عەمری گۆتێ: و تو من و موعاویەی ددانییە کیڤە؟

ئەبوو مووسای گۆتێ: ئەگەر وان صەحابییان دیت هەوە بکەنە هاریکار، هوین ب کێر هاریکارییێ دئێن، و ئەگەر وان خۆ ژ هەوە بێ منەت کر، دەمەکێ درێژ دینێ خودێ منەت ب هەوە نەبوو!

هەردو (حەکەم) ل سەر ڤێ چەندێ پێکهاتن، و هەر ئێک زڤڕی نک هەڤالێ خۆ، و ئەو بوو (خەوارجان) ب ئەحمەقییا خۆ مەسەلە خرابکر، دەمێ ئیمام عەلی کوشتی، و نەهێلای صەحابی ڕێکەکێ بۆ مەسەلێ ببینن وەکی هەردو حەکەمان بڕیار دای..

ل ڤێرێ مە دڤێت بێژین: د هندەک کتێبێن دیرۆکی دا سەرهاتییەکێ ل دۆر مەسەلا هەردو حەکەمان ڤەدگوهێزن کو عەمری ئەبوو مووسا خاپاند، و گۆتێ: ئەم دێ عەلی و موعاویەی ئێخین! و دەمێ ئەبوو مووسا ڕابوویەڤە و گۆتی: من عەلی ئێخست وەکی کو من ئەڤ گوستیرکا خۆ ئێخستی.. عەمر ژی ڕابوو و گۆت: من ژی وەکی تە عەلی ئێخست، و من موعاویە بنەجهکر وەکی کو من ئەڤ گوستیرکە بنەجهکری!

ئەڤ سەرهاتییە ژ گەلەک لایان ڤە یا بێ بنەجهە:

ئێک: ژ لایێ سەنەدێ ڤە راوییێ وێ شیعەیەکێ درەوینە دبێژنێ: (ئەبوو موخنف) و زانایێن (جەرح و تەعدیلێ) هەمی ل وێ باوەرێنە کو ئەو مرۆڤەکێ درەوینە و گۆتنێن وی نە یێن باوەرێنە.

دو: چاوا بۆ دو مرۆڤان چێ دبت (ئەگەر خۆ حەکەم ژی بن) وی خەلیفەیی بێخن یێ پتریا ئوممەتێ بەیعە دایێ؟ و پشتی هنگی کەنگی کۆمبوونا وان بۆ هندێ بوو ئەو خەلیفەکی ڕاکەن یان ئێکی بدانن؟ و ئەگەر

مەسەلە یا وەسا با بۆچی عەلی پشتی هنگی خیلافەت نەدهێلا و ب رەئیا حەکەمێ خۆ رازی نەدبوو؟

سێ: تو بێژی ئەبوو مووسایێ ئەشعەری، ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دهنارتە هندەک وەلاتان دا حوکمی د ناڤبەرا وان دا بکەت، هندە مرۆڤەکێ سادە بت، کو هۆسا ب ساناهی بێتە خاپاندن؟ و ئەگەر ئەو یێ وەسا با چاوا ئیمام عەلی دا وی پێش خۆ ڤە هنێرت، و ئەو دزانت عەمر مرۆڤەکێ تێگەهشتی و شارەزایە؟!

چار: ئەگەر عەمرێ کورێ عاصی مرۆڤەکێ هندە فێلباز و -حاشا- درەوین بت، چاوا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و پشتی وی ئەبووبەکری و عومەری کار دئێخستنە دەستێ وی، و مەزنییا هندەک وەلاتان دهێلا ب هیڤییا وی ڤە؟



د شەرێ (صفینێ) دا تشتەکێ وەسا چێبوو عەمر پالدا کو د ئجتهادا خۆ دا بکەفتە گومانێ، و دوبارە هزرا خۆ د مەسەلێ دا بکەت، ئەو ژی مەسەلا کوشتنا صەحابییێ ناڤدار (عەمماری کورێ یاسری) بوو.

تشتەکێ بەلاڤبوو د ناڤ صەحابییان دا کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتبوو عەمماری: ((ویح عمار تقتله الفئة الباغیة، یدعوهم إلى الجنة، ویدعونه إلى النار))[1] یەعنی: خودێ رەحمێ ب عەمماری ببەت، ئەو دەستەکا ژ بن حوکمێ ئیمامی دەردکەڤت وی دکوژت، ئەو بەرێ وان ددەنە بەحەشتێ، و ئەو بەرێ وی ددەنە ئاگری. لەو دەمێ بوویە شەڕ د ناڤبەرا لەشکەرێ عەلی و موعاویەی دا، و عەمماری خۆ دایە د گەل

(١) بوخاری و موسلم هەردو ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزن.

لەشکەرێ ئیمام عەلی، هەڤالێن موعاویەی ئەوێن گوهـ ل ڤێ حەدیسێ بووی د هەلویستێ خۆ دا کەفتنە شکێ، بەلێ عەمری دلێ خۆ ب هندێ خۆش دکر کو عەممار دێ لەشکەرێ عەلی هێلت و ئێت گەهتە وان.. بەلێ پشتی عەممار هاتییە کوشتن، مەسەلە کەفتە لەپێن وان، د هندەک روایەتان دا هاتییە کو دەمێ خەبەرێ کوشتنا عەمماری گەهشتییە موعاویەی و عەمری، عەبدللاهێ کورێ عەمری ژی د گەل وان بوو، و عەبدللاهی بیرا بابێ خۆ ل وێ حەدیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیناڤە یا بەری نوکە د گەل مە بۆری، عەمر ل معاویەی زڤڕی و گۆتێ: تە گوهـ ل عەبدللاهی هەیە؟

هنگی موعاویەی گۆتێ: عەممار نە مە کوشتییە، وان ئەو کوشت یێ ئەو ئینایە شەڕی!

هەر چەندە ئەڤ هێجەتا موعاویەی بۆ خۆ گرتی و ئەو (تەئویلا) وی دایە حەدیسێ یا د جهێ خۆ دا نەبوو، بەلێ وەسا دیارە کو موعاویەی ژی خۆ پێ قانع کر، بەلێ عەبدللاهی رەئیا خۆ ئاشکەراکر کو ئەو یێ قانع نینە، و ژ ئەڤرۆ وێڤە ئێدی ئەو چو شەڕان د گەل وان ناکەت، و گاڤا موعاویەی لۆمەی وی کری بۆچی ئەو مایە د گەل وان، وی گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فەرمان ل من کرییە کو ئەز گوهداریا بابێ خۆ بکەم هندی ئەو یێ ساخ بت.

پشتی مەسەلە بۆ موعاویەی صافیبووی، موعاویەی هەڤالێ خۆ عەمر زڤڕاندە وی کاری یێ بەری هنگی عومەرێ کورێ خەططابی ئەو لێ دانای، موعاویەی ئەو کرە والییێ مصرێ، و ئەو ل سەر ڤی کاری ما حەتا ئەو مری.



دەمێ مرن ب سەر دا هاتی، ئەو والی بوو ل مصرێ، و گاڤا ئەو پێ حەسیای کو مرن هات، وی گازی حەرەس و لەشکەرێ خۆ کر، گۆتێ: وەرنە ژۆر.. پاشی گۆتێ: ئەز هەڤالەکێ چاوا بووم بۆ هەوە؟

وان گۆت: تو باشترین هەڤال بووی بۆ مە، تە قەدرێ مە دگرت.. و تە هۆ کر و هۆ کر.. و دەست دانە مەدحێن وی.

عەمری گۆتە وان: من ئەو هەمی بۆ هەوە دکر؛ دا هوین مرنێ ژ من دویر بکەن، و هوین یێ دبینن مرن یا دئێتە من، ڤێجا هوین وێ ژ من بدەنە پاش!

وان گۆت: ئەی ئەمیر یێن وەکی تە ڤێ ئاخفتنێ دبێژن؟! ئەڤە ئەمرێ خودێیە، دەمێ دئێت کەس نەشێن وی بزڤرینت..

عەمری گۆت: ئەز ژی وێ دزانم یا هوین دزانن، بەلێ من ڤیا هوین عیبرەتەکێ بۆ خۆ ژ من وەربگرن!

بەلێ.. عەمر ئەوێ دنیا تێکڤەدای، و د گەلەک ڕەنگان ڕا بۆری، کوفر دیتی، و تامکرییە شرینییا باوەرێ، فەقیری دیتی و دەولەمەندی، وەختەکی خۆ دیتی یێ دەربەدەر و بێ خودان، پاشی خۆ دیتی مەزنێ مصرێ.. نوکە مرنێ خۆ نیشا دا، ل بەر دەرێ وی تژی حەرەس و زێرەڤان هەنە، چەکێ وان یێ د دەستی دا، و چاڤێن وان دڤەکرینە، و کەسەک ژ وان نەشێت ڤی مێڤانێ وی پێ نەخۆش ژێ بدەتە پاش، و ئەو ئەو بوون یێن گەلەک جاران خەطەر و نەخۆشی ژ دەرێ وی داینە پاش..

کوڕێ وی عەبدللاهی گۆتێ: باب، گەلەک جاران من گوهـ ل تە دبوو تە دگۆت: خوزی من زەلامەکێ ب عەقل دیتبا دەمێ دکەفتە بەر مرنێ دا بۆ من بەحسێ وی تشتی بکەت یێ ئەو دبینت، و تو ئەو زەلامی، ڤێجا تو بۆ مە بەحسێ مرنێ بکە.

عەمری گۆت: کورێ من، ب خودێ هەر وەکی تەنشتا من ب دەپەکی ڤە یا گرێدایە، و هەر وەکی ئەز یێ د کونا دەرزیکێ ڕا بێهنا خۆ هل دکێشم، و هەر وەکی چەقەکێ سترییان ژ بنێ پییێن من حەتا کولۆڤانکا سەرێ من یێ دئێتە کێشان. پاشی وی ئەڤ مالکا شعرێ گۆت:

**ليتني كنت قبل ما قد بدا لي**

**في تلال الجبال أرعى الوعولا**

خوزی بەری ئەڤ تشتێ بۆ من ئاشکەرابووی، من ل سەرێن چیا پەزکیڤی چەراندبان.. یەعنی: خوزی من مایێ خۆ د چو تشتان نەکربا؛ دا ئەز نوکە یێ پشتڕاست بامە. پاشی وی ڕوییێ خۆ ب نک دیواری ڤە لێدا، و گۆت: یا ڕەببی تە فەرمان ل مە کر مە گوهداری نەکر، و تە نەهییا مە کر و مە خۆ نەدا پاش، و ژ عەفووا تە پێڤەتر تشتەک تێرا مە ناکەت ئەی (أرحم الراحمين). پاشی وی دەست حەفکا خۆ نا و گۆت: یا ڕەببی ئەز نە یێ بەریمە عوزرێ ڤەخوازم، و نە من شیان هەنە خۆ ب سەربێخم، و ئەگەر ڕەحما تە نەگەهتە من ئەز دێ ژ وان بم یێن دچنە هیلاکێ، بەلێ (لا إله إلا الله)! و ئەو ما ئەڤ گۆتنە گۆت (لا إله إلا الله) حەتا ڕحا وی هاتییە کێشان.. خودێ ژێ ڕازی بت.

دوومـاهییێ دێ بێژین: عەمر ئێک ژ بەرچاڤترینێ وان صەحابییانە یێن نەیارێن ئیسلامێ درەو ب دویڤ ڤە نایین، و دیرۆکا وی تەشویهکری، و هێجەتا وان هەلویستێ وی بوو ل دەمێ فتنی، کو پشتەڤانییا موعاویەی کری، خودێ ژ هەردویان ڕازی بت.. و یا غەریب نینە ئەڤە بۆچوونا وان بت د دەر حەقا دو صەحابییێن وەسا دا یێن ئمبراتوورییەتا کوفرێ و شرکێ (ئمبراتوورییەتا ڕۆمێ) هژاندی، و ڕۆناهییا ئیسلامێ ل شامێ و مصرێ بەلاڤکری.

# ئەبوو مووسایێ ئەشعەری

ئێک ژ وان زەلامان بوو یێن خودێ کیتابا خۆ پێ پاراستی، قورئان ب تەڕی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرتبوو، هەر جهەکێ چووبایێ خەلک لێ کۆم دبوون دا قورئانێ ژێ فێر ببن، و دلێ خۆ ب گوهدانا دەنگێ وی خۆش بکەن، بورەیدەیێ صەحابی دبێژت: شەڤەکێ ئەز دەرکەفتمە مزگەفتێ من پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیت ل بەر دەرێ مزگەفتێ یێ ڕاوەستیای بوو، ئەز گەهشتمە نک وی، من دیت زەلامەکی ل مزگەفتێ نڤێژ کر، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە من: ((بورەیدە، تو بێژی ئەو ڕیمەتیییێ دکەت؟)) من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن. گۆت: وی گۆت: ((نە، ئەو خودان باوەرەکێ تربەدارە، مزمارەک ژ مزمارێن مالباتا داوودی بۆ وی یا هاتییەدان))[1] مەخسەد دەنگەکێ وەکی یێ داوودی یێ خۆش خودێ یێ دایێ. بورەیدە دبێژت: من خۆ نێزیکی وی کر من من دیت ئەو ئەبوو مووسایە.. گەلەک جاران بێی ئەو پێ بحەسییێت پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دچوو گوهێ ددا دەنگێ وی دەمێ وی قورئان دخواند، هندی هند دەنگێ وی یێ خۆش بوو. و جارەکێ ژێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ دوعایا مەزن بۆ وی کر: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللهِ بنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ مُدْخَلاً كَرِيماً))[2] یەعنی: یا ڕەببی تو گونەها

(١) ئەحمەد ڤەدگوهێزت.

(٢) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن.

عەبدللاهێ کورێ قەیسی بۆ وی بغەفرینە، و رۆژا قیامەتێ تو وی ببە جهەکێ ب قەدر و قیمەت. ڤێجا ئەو کی بوو؟ و سەرهاتییا وی چ بوو؟

ناڤێ وی عەبدللاهێ کورێ قەیسێ کورێ سولەیمێ ئەشعەری یێ تەمیمی بوو، و ئەو ب ناسناڤێ (ئەبوو مووسایێ ئەشعەری) یێ بەرنیاسە، و ئەشعەری کو ئویجاخا وی بوو، خەلکێ یەمەنێنە.

هێشتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مەکەهێ، ئەو ژ یەمەنێ هاتبوو مەکەهێ و بۆ دەمەکی ل وێرێ ئاکنجیبووبوو، و دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی ئەو ژ وان بوو یێن زوی باوەری پێ ئینای موسلمانبووی، و ل ڤێرێ دو گۆتن هەنە: هندەک دبێژن: ئەو ژ وان بوو یێن مشەختبووینە حەبەشە، و هندەک دبێژن: نەخێر! ئەو زڤری بوو وەلاتێ خۆ یەمەنێ؛ دا بەرێ مللەتێ خۆ بدەتە ئیسلامێ، و پشتی پێغەمبەر و صەحابی مشەختبووینە مەدینێ ب چەند سالەکان، ئەو د گەل چەند کەسەکان ژ مرۆڤێن خۆ ب رێکا دەریایێ هات دا قەستا مەدینێ بکەت، بەلێ گەمییا وان ژ بەر هاربوونا دەریایێ بەرێ وان دا وەلاتێ حەبەشە، و وان جەعفەر و هەڤالێن وی ل وێرێ دیتن، ڤێجا ئەو ل سالا فەتحا خەیبەرێ د گەل وان زڤرینە مەدینێ، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتین گۆتە وان: ((دو مشەختبوون بۆ هەوە هەنە، هوین مشەختبوونە نک نەجاشی و هوین مشەختبوونە نک من))(١).

هەر چاوا بت پشتی موسلمانبوونا وی یا زوی ل مەکەهێ و حەتا سالا حەفتێ پشتی مەخشتبوونێ، دەنگ و باسێن ئەبوو مووسایی نینن، ل ڤێ سالێ و پشتی موسلمانان خەیبەر ژ دەستێن جوهییان ئینایەدەر، ئەبوو مووسا و هندەک مرۆڤێن وی یێن ئەشعەری د گەل جەعفەری و

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

هەڤالێن وی ژ مشەختێن حەبەشە هاتنە مەدینێ، و کەیفا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک ب هاتنا وان هات.

ل مەدینێ ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن نێزیکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و وی گرنگییەکا زێدە دا علمی و ب تایبەتی خواندن و ژ بەرکرنا قورئانێ، و چونکی خودێ زهنەکا تیژ و دەنگەکێ خۆش دابوویێ ئەو د ناڤ صەحابییان دا وەک زانا و قورئانخوین هاتە نیاسین. و ژ بەر زیرەکی و شارەزاییا وی د دینی دا دەمێ خەلکێ یەمەنێ هاتین موسلمانبووین پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو و موعاذ هەردوو هنارتنە وێرێ دا دینی نیشا خەلکی بدەن، و هنگی بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییە وان : ((یسرا و لا تعسرا، و تطاوعا و لا تنفرا))[1] یەعنی: دینی ب ساناهی بێخن و ئاسێ نەکەن، و مزگینییێ بدەنە خەلکی و وان ژ دینی نەرەڤینن.، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کرە والییێ زەبید و عەدەنێ.

دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ (المائدة: ٥٤) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب نک ئەبوو مووسایی ڤە ئیشارەت کر و گۆت: ئەو مللەتێ تەنە[2]. و ئەڤە مەدحەکا مەزنە بۆ وان.

* * *

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

(٢) حاکم ڤەدگوهێزت.

ژ بەر کو ئەبوو مووسایێ ئەشعەری ئێک ژ زانا و شارەزایێن صەحابییان بوو ب ئەحکامێن دینی ب گشتی، و ب قورئانێ و تەجویدا وێ ب تایبەتی، پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی کارێ خۆ کرە بەلاڤکرن زانینێ د ناڤ خەلکی دا و نیشادانا قورئانێ بۆ وان، و گەلەک جاران وی د خوتبێن خۆ دا ل سەر مینبەرێ دگۆتە موسلمانان: ((هەچییێ خودێ علمەک نیشادا بلا ئەو ژی وی نیشا خەلکی بدەت، و تشتێ ئەو نەزانت بلا نەبێژت، ئەگەر نە.. ئەو دێ ژ دینی دەرکەڤت)).

هەر وەسا و ژ بەر دەنگێ خۆ یێ خۆش، ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دەنگێ داوود پێغەمبەری ڤە تەشبیهکری، وی دلێ موسلمانان ب خواندنا قورئانێ خۆش دکر، و ژ ئیمامێ عومەر دئێتە ڤەگوهاستن کو ل سەر دەمێ خیلافەتا وی هەر جارەکا ئەبوو مووسا هاتبا مەدینێ، ئەو دا هنێرتە ب دویڤ ڕا و بێژتێ: بیرا مە ل خودایێ مە بینەڤە.. یەعنی: هندەک قورئانێ بۆ مە بخوینە. و ژ بەر علمێ وی یێ زێدە ب ئەحکامان ئیمامێ شەعبی دبێژت: قازییێن ئوممەتێ چارن: عومەر و عەلی و زەیدێ کورێ ثابتی و ئەبوو مووسا. و ژ صەفوانێ کورێ سولەیمی دئێتە ڤەگوهاستن دبێژت: ل زەمانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کەسێ ل مزگەفتێ فەتوایەک نەددا ژ بلی عومەر و عەلی و موعاذ و ئەبوو مووسایی.. مەعنا: هێشتا د ژیانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- ئەبوو مووسایی دین نیشا خەلکی ددا.

ل سەر زەمانێ خیلافەتا عومەری، و پشتی وەلاتێ فورسێ کەفتییە دەستێ موسلمانان، و گەلەک کەس هاتینە د ئیسلامێ دا، ئیمامێ عومەر ئەبوو مووسا هلبژارت دا ببتە والییێ بەصرا، نە ب تنێ دا ئەو ببتە مەزنێ وان و حوکمی د ناڤبەرا وان دا بکەت، بەلکی بۆ هندێ ژی دا ئەو دینی و

قورئانێ نیشا وان بدەت، و ب ڕاستی ئەبوو مووسایی ئەڤ دەورە گێڕا، لەو ئیمام حسەنێ بەصری دبێژت: ((سویارەک نەهاتییە بەصرا بۆ خەلکێ وێ چێتر ژ ئەبوو مووسایی)).

ل سەر دەمێ ویلایەتا ئەبوو مووسایی وی مزگەفتا بەصرا کربوو زانینەگەها مەزن، یا ب سەدان حافظێن قورئانێ و زانایێن دینی لێ هاتینە پەروەردەکرن، و پترییا وەختێ خۆ وی ل مزگەفتێ دبۆراند دین نیشا خەلکی ددا، و دەمێ ئیمامێ عومەر داخواز ژ والییێن خۆ کری کو ئەو ناڤێن وان کەسان بۆ وی بهنێرن یێن قورئان هەمی ژ بەرکری؛ دا ئەو راتبەکێ زێدە بدەتە وان، ئەبوو مووسایی گۆتێ: حەتا ڤێ گاڤێ سێسەد و تشتەک زەلامان قورئان هەمی یا ژ من وەرگرتی.

ژ بەر ڤێ بزاڤا وی یا زێدە، دەمێ عومەر کەفتییە بەر مرنێ، وی شیرەت ل خەلیفەیێ پشتی خۆ کر کو ئەو چۆ ژ وان والییان یێن وی دانایین ژ سالەکێ زێدەتر نەهێلتە ل مەنصبێن وان، ئەبوو مووسا تێ نەبت بلا ئەو چار سالان ل جهێ خۆ بمینت.

ژ بلی والییاتییێ بەصرا، ئەبوو مووسا ل سەر زەمانێ عومەری بووبوو قاضی ژی، عومەری ئەو دەسنیشان کربوو دا ئەو حوکمی د ناڤبەرا خەلکی دا بکەت، و عومەری کیتابەک بۆ وی نڤیسیبوو دا ئەو کاری پێ بکەت، و حەتا ئەڤرۆ ژی ئەو کیتاب دئێتە هژمارتن بناخە بۆ حوکم و ئەحکامان، و چو قاضی و موفتی نشێن خۆ ژێ بێ منەت بکەن.

ژ بلی والییاتییێ، ل سەر دەمێ ئیمامێ عومەر ئەبوو مووسایی پشکداری د گەلەک شەڕان ژی دا کربوو ل وەلاتێ فورسێ، و وی پشکداری د ڤەکرنا هندەک باژێڕێن مەزن ژی دا کربوو وەکی ئەصفهان و نەهاوەندێ.

پشتی ئیمامێ عوثمان بوویە خەلیفە، وی ژی وەکی عومەری ئەبوو مووسا هلبژارت دا ببتە والی و قاضی ل بەصرا. و دەمێ ئیمام عوثمان شەهیدبووی ئەبوو مووسا والییێ کووفە بوو.. و پشتی صەحابییان ئیمام عەلی بۆ خیلافەتێ هلبژارتی ئەبوو مووسایی داخواز ژ خەلکێ کووفە کر کو ئەو بەیعێ بدەنە عەلی.

ئیمام عەلی -وەکی هەردو خەلیفەیێن بەری خۆ- ئەبوو مووسا کرە والی، یان بلا بێژین: ئەو هێلا والی ل کووفە، و دەمێ ئیمام دەرکەفتییە عیراقێ دا نێزیکی شامێ بت و سوجبەتا موعاویەی و خەلکێ شامێ چارەسەر بکەت، پاشی وی زانی کو طەلحە و زوبەیر یێن دەرکەفتینە بەصرا، وی رێکا خۆ گوهارت دا بچت بەرسنگێ وان بگرت، بەری ئەو بگەهتە بەصرا ل دەڤەرا ذیقار وی داخواز ژ خەلکێ کووفە کر کو ئەو بچنە هاری وی دا رێکێ ل طەلحە و زوبەیری بگرت، والییێ کووفە ئەبوو مووسایی گۆتە خەلکێ کووفە: ئەز شیرەتێ ل هەوە دکەم کو کەس ژ هەوە دەرنەکەڤت؛ چونکی ئەڤە ئەو فتنەیە یا بۆ مرۆڤی ب خێرتر مرۆڤ پشکدارییێ تێدا نەکەت. گاڤا ئیمام عەلی ئەڤ چەندە ژ وی زانی ئەو ژ والییاتییا کووفە ئێخست.

ژ ڤێ چەندێ دئێتە زانین کو ئەبوو مووسا ژی -وەکی پترییا صەحابییان- ل وێ باوەرێ بوو کو یا باشتر بۆ موسلمانی ئەوە ئەو خۆ بدەتە پاش، و پشکدارییێ د شەرەکێ وەسا دا نەکەت هەردو لا موسلمان بن.

گاڤا ل صففینێ شەڕ د ناڤبەرا لەشکەرێ ئیمام عەلی و موعاویەی دا چێبووی، و پشتی سێ رۆژان ڤەکێشای بێی ئەنجامەک پێڤە بێت، رەئیا هەردو لایان بوو ئەو کو پێک بێن و صولحێ بکەن، و ئەو ل سەر هندێ رێککەفتن کو هەر لایەک (حەکەمەکی) بهنێرت دا ئەو هەردو پێکڤە کۆم

ببن و بڕیارێ ل سەر وی تشتی بدەن یێ مەصلحەتا گشتی یا موسلمانان تێدا هەی.. ئیمام عەلی ئەبوو مووسا کرە وەکیلێ خۆ، و موعاویەی عەمرێ کوڕێ عاصی کرە وەکی خۆ، و ئەو هەردو ژ صەحابییێن زانا و خودان قەدر بوون، و ئەو هەردو ل صەفەرا سالا ٣٧ مشەختی ل وی جهێ دبێژنێ: (دومة الجندل) گەهشتنە ئێک.

ئەڤە مسەلە ئەوە یا دبێژنێ: (قضية التحكيم)، و ئەڤە ئێک ژ وان رویدانێن دیرۆکییە یێن ژ بەرێ وەرە و حەتا ئەڤرۆ ژی نەیارێن صەحابییان ژ شیعە و بێدینان ئەوێن ئارمانجا خۆ یا مەزن کرییە کرێتکرنا دیمەنێ صەحابییان د چاڤێن خەلکی دا؛ دا باوەرییا وان ب هلگرێن ڤی دینی نەمینت، ژ وان بێبەختییێن ئەو ڤەدگێڕن ئەڤەیە کو ب دلێ ئیمام عەلی نەبوو ئەو ئەبوو مووسایی بکەتە وەکیلێ خۆ؛ چونکی ئەو مرۆڤەکێ نەزان و خشیم بوو، و ب ساناهی دهاتە خاپاندن! بەلێ هندەک هەڤالێن وی ئەو نەچارکر ڤێ چەندێ بکەت، بەرانبەر وی عەمر هاتبوو و ئەو مرۆڤەکێ فێلباز و خاپینۆک بوو! و هۆسا ئەو ڤان سالۆخەتێن کرێت و پیس بۆ ڤان هەردو صەحابییێن ب قەدر و بهار ڕاددەن، و ئەڤە یا غەریب نینە ژ وان ئەگەر ئەم بزانین ئەو ب نەڤیان و کافرکرنا صەحابییان خۆ نێزیکی خودێ دکەن، و گۆتنا ئاخفتنێن سەقەت و خەبەرێن کرێت د دەر حەقا صەحابییان دا حسێب دکەن باشترین قەنجی و خێر!

بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ عەمرێ کوڕێ عاصی کری مە ئیشارەت دابوو بێهایی و خەلەتییا وان گۆتنێن ئەو د ڤێ مەسەلێ دا دبێژن، و هەر کەسەکێ بڤێت ڕاستییا سەرهاتییا (تەحکیمێ) و ئەنجامێ وێ بزانت، دڤێت ئەو یێ هشیار بت ژ وان ریوایەتان یێن کو ژ هندەک کەسێن رافزی هاتینە ریوایەتکرن و د کتێبێن سوننییان دا هاتینە ڤەگێڕان، و د گەل کو

ئـەم ل وێ باوەرێینە کو صەحابی د(مەعصـووم) و بێگونەهـ نـەبوون، و ئـەو ژ خەلـەتییان دپاراسـتی نـەبوون، بـەلێ ئـەو ددویربـوون ژ وان (چیـرۆک و چیڤانۆکێن) دلـڕەش د دەر حـەقا وان دا ڤـەدهینن؛ دا مـە تـێ بگـەهینن کـو دیرۆکا مە هەما هندەک پەڕێن ڕەشن، و صەحابی هندەک مـرۆڤێن فێلباز و درەوین بوون، سەرا کورسیکێ ئێک و دو دکوشتن!

پشـتی هەردو (حەکەم) گەهشتینە ئێک، و پشـتی دان و ستاندنێ، ئەو ل سـەر هنـدێ پێکهاتن کـو ئـەو ب حـوکمێ خودێ رازی ببن، و شـەڕی د ناڤبەرا خۆ دا ڕاگرن، و مەسەلێ بۆ ئومـمـەتێ بزڤـڕینن ب تایبـەتی ئـەهلێ شوورایێ ژ مەزنێن صـەحابییان. و ب دەهـان کـەس ژ صـەحابی و تابعییـان بوونە شاهد ل سەر ڤێ صولحی و حەسەن و حوسەین ب خۆ ژ شاهدان بوون یێن ڕێککەفتن ئیمزاکری.

هێژای گۆتنێیە ئەڤ کۆمبوونا وان ل سەر هندێ نەبوو کانێ عەلی یـان موعاویە دێ بتە خەلیفـە، و هنـدی عـەلی یـێ ساخ ڕۆژەکا ب تنـێ ژی نـە موعاویەی و نە هەڤالێن وی نەگۆتییە: خیلافەت بۆ مەیە، حەتا ئەو دان و ستاندنێ ل سەر ڤێ مەسـەلێ بکـەن، و هـەڤڕکییا وی هـەمی ل سـەر هندێ بوو کانێ چاوا و کەنگی تـۆلا عـوثمانی دێ ئێتـە ستاندن. و ئەگـەر عـەمر ب شارەزاییا خۆ شـیا بت ئـەبوو مووسایی بخاپینـت -وەکـی نـەزان دبێـژن- ئەرێ چاوا ئەو شیا وان هەمی کەسێن دی بخاپینت ئەوێن ل سەر ئتتیفاقێ ئیمزاکرین کو ب دەهان بوون و حەسەن و حوسەین ب خۆ ژ وان بوون؟!

پشـتی صـولح د ناڤبـەرا هـەردو لایـان دا هاتییـە ئیمزاکـرن، و شـەڕ ڕاوەسـتای، فتنـا خـەوارجان د نـاڤ لەشکەرێ ئیمـام عـەلی دا پەیدابوو، و ئیمام ب وان و شەڕێ وان ڤە موژیل بوو، حەتا دووماهییێ ب دەسـتێ وان

شەهیدبووی.. و ب ڤێ چەندێ مەسەلا (تەحکیمێ) هاتە گیرۆکرن، پاشی ئەو ب شەهیدبوونا ئیمام عەلی هاتە لادان.

زڤڕین ل ئەبوو مووسایێ ئەشعەری دێ بێژین: پشتی خیلافەت گەهشتییە موعاویەی، ئەبوو مووسایی بەیعە دایێ و هندەک جاران دهاتە نک وی ل دیمەشقێ، و دبێژن: موعاویە ب شەڤێ دچوو گوهێ ددا وی دەمێ وی قورئان دخواند.

پشتی ڤان ڕویدانان و ل سالا چل و دویێ مشەختی ئەبوو مووسا مربوو، هندەک دبێژن: مرنا وی ل کووفە بوو، و هندەک دبێژن: ئەو زڤڕیبوو مەکەهێ و ل وێرێ مربوو. و دەمێ ئەو مری ژییێ وی ژ شێستێ بۆری بوو.

# عەممارێ كورێ یاسری

دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی مزگەفتا مەدینێ ئاڤادكر پشتی مشەختبونا وان، هەر صەحابییەكی لبنەك لبنەك دئینا بەر دەستێ (بەننائی) دا بدانتە سەر دیواری، ئەو تێ نەبت، وی دو لبنەك پێڤكە دئینان، گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتی وی تۆز ژ سەرێ وی داقوتا، و گۆتێ: ((وەی بۆ كورێ سومەییایێ! دەستەكا تەعداكەر وی دكوژت، ئەو بەرێ وان ددەتە بەحەشتێ و ئەو بەرێ وی ددەنە ئاگری)) و پشتی هنگی ب سیه و حەفت سالان ئەڤ گۆتنە ب جههات، و ئەو گۆتن د گەل كوشتنا (كورێ سومەییایێ) بوو نیشانەكا ئاشكەرا ل سەر دیاركرنا حەقییەكا گەلەك مرۆڤ تێدا كەفتینە گومانێ..

عەممارێ كورێ یاسری، ئێك ژ زەلامێن دەمێ شارپای ژ دیرۆكا ئوممەتا مە، جارەكێ د ناڤبەرا وی و خالدی دا هەڤركییەك چێبوو، ئینا خالد چوو نك پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گازندە ژ عەمماری كرن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ((مَنْ عَادَى عَمَّاراً عَادَاهُ اللهُ، وَمَنْ أَبْغَضَ عَمَّاراً أَبْغَضَهُ اللهُ))[1] یەعنی: هەچییێ نەیارەتییا عەمماری بكەت، خودێ دێ نەیارەتییا وی كەت، و هەچییێ كەربێن وی ژ عەمماری ڤەببن كەربێن خودێ ژی دێ ژ وی ڤەبن.

---

(١) ئەحمەد و حاكم ڤەدگوهێزن.

عـەممار کـوڕێ یاسـرێ کـوڕێ عـامرێ کـوڕێ مـالکێ عەنسـییە، و عەنســی ئێــک ژ ئویجـاخێن عـەرەبێن قەحطـانییـە، بنیـاتێ وی خـەلکێ یەمەنێ بوو، بابێ وی یاسر د گەل دو برایێن خۆ هاتنە مەکەهێ ل برایەکێ خۆ دگەڕیان، و پشتی ئەو ژ دیتنا وی بێ هیڤی بووین، برایێن وی زڤڕینە مەکـەهێ و ئـەو مـا ل وێـرێ، و بـوو ئێـک ژ حـەلیفێن ئـەبوو حوذەیفـەیێ مـەخزوومی. پشـتی دەمـەکی ئـەبوو حوذەیفـەی جارییـەکا خـۆ ئـەوا دگـۆتنێ سومەییا لێ مارەکر، و ئەنجامێ وێ زەواجێ ئەو بوو خـودێ کـوڕەک دا وان وان ناڤی وی کره (عەممار).

عەممار بەحسێ ژییـێ خۆ دکـەت و دبێـژت: ئـەز و پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- د عـەمرەکی دا بـووین، مـەعنا: دەمـێ هاتنـا ئیسـلامێ ژییـێ وی نێزیکی چل سالییێ بوو.

عەممار و دەیک و بابێن وی ژ وان صەحابییان بوون یێن زوی هاتینە د ئیسلامێ دا، هێشـتا پێغەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- و هەڤالێن وی ل مـالا ئەرقەمی، و سەرا ئیسـلامێ وان نەخۆشییەکا مەزن ژ دەسـتێ مـەخزوومییان دیت، و دەیکـا وی ئێکـەمین موسـلمان بـوو ل بـن ئەشـکەنجەدانێ هاتییـە شەهیدکرن ب دەستێ فیرعەونێ ڤێ ئوممـەتێ ئـەبوو جەهلێ مـەخزوومی، و وان گەڤێن کوشتنێ ل عەمماری ژی کرن ئەگەر ئەو ئاخفتنا کوفرێ نـەبێژت، لەو وی ئەو گۆت، و گاڤا پێغەمبەر -سلاڤ لـێ بـن- هاتییـە نـک وی، وی کره گری و گۆتە پێغەمبـەری: وان ئـەز مـەجبوورکرم ئاخفتنـا کـوفرێ بێـژم، و گۆتنێن کرێت بێژمە تە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تـو چەوا دلـێ خۆ دبینی؟ وی گۆت: دلـێ من یێ تژی باوەرییـە، ئینـا پێغەمبـەری -سـلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەگەر ئەو ل تە زڤڕین، تو ل وان گۆتنان بزڤڕە، و هنگی بوو دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ

أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (النحل: ١٠٦).

ل دەسپێکێ کافران مرۆڤێن هەژار و بێ خودان ژ موسلمانان گرتن، و هندەک جلکێن ئاسنی کرە بەر، و ئەو ل سەر خیزێ مەکەهێ یێ شاریای و ل بەر حەتاڤا وێ یا ئاریای رازاندن، و هەر عەزابەکا هاتییە سەر هزرا وان د گەل وان ب کارئینا، و جارەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د وان ڕا بۆری دیت کافر یێ عەمماری و دەیک و بابێن وی عەزاب ددەن، ئینا وی گۆتە وان: ((صَبْراً يَا آلَ يَاسِرٍ، فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الجَنَّةُ))[1] ئەی مالباتا یاسری بێنا خۆ فرەهـ بکەن، ژڤانێ هەوە بەحەشتە. و جارەکا دی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن د بەر عەمماری ڕا چوو و دیت کافران ئەو ب ئاگری عەزاب ددا، ئینا وی دەستێ خۆ دانا سەر سەرێ وی و گۆت: ((يا نارُ كوني برداً وسلاماً عَلَى عَمَّارٍ كَمَا كُنْتِ عَلَى إِبْرَاهِيْمَ))[2] یەعنی: ئەی ئاگر تو سار ببە و ببە سلامەتی ل سەر عەمماری کانێ تو یێ چاوا بووی بۆ ئیبراهیمی.

ژ تایبەتیێن عەمماری د ناڤ وان صەحابییان دا هەین یێن زوی موسلمانبووین و مشەختبووین، کو ژ بلی ئەبووبەکری کەس پشکدارییا وی تێدا ناکەت ئەو بوو دەیک و بابێن وی هەردو پێکڤە موسلمانبووبوون، و نەخۆشی سەرا ئیسلامێ دیتبوون، و د ڕێکا خودێ دا شەهیدبوون ژی. و پێ نەڤێت بێژین ئەو ژ وان صەحابییان یێن سەرکەفتی ژ بەلایێ دەرکەفتی، حەتا خودێ ڕێکەک بۆ وان ڤەکری و ئەو بەر ب مەدینێ ڤە مشەختبووین، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا شاهدەیی بۆ وی دا کو ئەو

---

(١) حاکم ڤەدگوهێزت.

(٢) موسلم ڤەدگوهێزت.

یێ تژییه ژ باوەرییێ، دەمێ گۆتی: ((إِنَّ عَـمَّاراً مُلِيَ إِيمَانـاً إِلَى مُشَاشِـهِ))[1]

یەعنی: هندی عەممارە حەتا هەستییان یێ هاتییە تژیکرن ژ باوەرێ!



عەممار ئێک ژ موسلمانێن دەسپێکێ بوو، و ئەو ژ دەرچوویێن مالا ئەرقەمی بوو، و وی گەلەک عەزاب سەرا ڤی دینی ژ دەستێن کافران دیت، و ئەو ژ وان صەحابییان بوو یێن مشەختبووینە مەدینێ، لەو زانایێن تەفسیرێ دبێژن: ئەو ئێک ژ وان مرۆڤان بوو یێن ئەڤ ئایەتە د دەر حەقا وان دا هاتییە خوارێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَـوِّئَنَّهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةًۖ وَلَأَجْرُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُـونَ ۝ ٱلَّذِيـنَ صَـبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِـمْ يَتَوَكَّلُـونَ ۝ ﴾ (النحل: ٤١-٤٢) یەعنی: ئەوێن د رێکا خودێ دا مشەختبووین پشتی کو زۆرداری ل وان هاتییەکرن، د دنیایێ دا ئەم دێ وان ل جهەکێ باش دانین، و خێرا ئاخرەتێ مەزنترە، ئەگەر ئەو بزانن. ئەوێن صەبر کێشای و خۆ هێلایە ب هیڤییا خودایێ خۆ ڤە.

پشتی مشەختبوونێ و حەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ دنیایێ وەغەرکری عەممار ژ وان کەسان بوو یێن نێزیک ژ وی، هەر ژ سەرهاتییا ئاڤاکرنا مزگەفتێ و حەتا سەفەرا حەجا خاترخواستنێ چو جاران عەممار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پاشڤە نەمابوو، و چونکی ئەو هەمی سەرهاتی مە د (ژیاننامەیا پێغەمبەری) دا -سلاڤ لێ بن- ڤەگێراینە، هەوجە ناکەت ئەم وان ل ڤێرێ دوبارە بکەین.

ل سەر زەمانێ ئەبووبەکری عەممار ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پشکداری د شەرێ (مورتەددان) دا کری، و رۆژا شەرێ (یەمامێ) د گەل

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

(موسەیلەمەیێ درەوین) هاتییەکرن، عەممار ئێک ژ بەرچاڤترین لەشکەرێن خالدی بوو، ئەو ڕۆژ ڕۆژەکا ب زەحمەت و وەستیان بوو، لەشکەرێ موسەیلەمەی ژ هندێ ب هێزتر بوو یا موسلمانان هزر بۆ کری، و ل دەمەکی نێزیکبوو موسلمان پاشدا بڕەڤن، هنگی عەممار ب سەر کەڤرەکێ بلند کەڤت، و ب هەمی دەنگێ خۆ گازیکر:

- گەلی موسلمانان.. هوین ژ بەحەشتێ دڕەڤن؟! ئەز عەممارێ کوڕێ یاسریمە، وەرن ل دۆر من کۆم ببن!

ب ڤی ڕەنگی عەمماری (مەعنەوییاتێن لەشکەری) بلندکرن، و ئەو بۆ پێشڤەچوونێ پالدان، و دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو، خودێ سەرکەفتن ب دەست وان ڤە ئینا، و دوژمنێ خودێ موسەیلەمەیێ درەوین ب دەستێ وەحشی دا کوشتن.

ل سەر زەمانێ عومەری، وی عەممار هەیامەکی کرە والییێ کووفە، پاشی ژ بەر گازندەیا خەلکی کو ئەو چو ژ سیاسەتا مرۆڤان نزانت، عومەری هنارتە ب دویڤ ڕا و ئەو ژ والییاتییێ عەفووکر، و ئێکێ دی دانا جهێ وی، ئیمامێ شەعبی دبێژت: عومەری گۆتە عەمماری: ئەرێ تە پێ نەخۆشبوو کو مە تو عەزلکری؟ عەمماری گۆتێ: دەمێ تە ئەز کریمە والی من پێ نەخۆشبوو، و دەمێ تە ئەز عەزلکریم ژی من پێ نەخۆشبوو!

عەممار نە ژ وان کەسان بوو یێن مەزنی و مەنصب دڤیان، لەو ڕۆژا خەلیفەی ئەو کرییە والی وی ب ڤێ بڕیارێ خۆش نەبوو، بەلێ ڕۆژا ئەو ژ ڤی مەنصبی ژی هاتییە لادان وی پێ خۆش نەبوو کو ئەو ب کێر وی کاری نەئێت یێ خەلیفەی ژێ خواستی.

دەمێ مە بەحسێ ئیمام عوثمانی و ژیانا وی کری، مە گۆت: پشتی ئەو بوویە خەلیفە وی د هندەک کار و باران سیاسەتا خۆ یا تایبەت هەبوو،

ئەو سیاسەتا حەتا حەددەکی جودا ژ سیاسەتا عومەری، هندەک صەحابییان ب ڤێ چەندێ خۆش نەبوو، و گۆتنە عوثمانی یا باشتر ئەوە تو ڤێ چەندێ نەکەی، بەلێ عوثمانی ب گۆتنا وان نەکر، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ وان خۆ ڤەکێشا، و مایێ خۆ د چو کار و باران دا نەکر، و عەممار ئێک ژ وان کەسان، بەلێ مەعنایا ڤێ ئەو نینە ئەڤ خیلافا د بیر و بۆچوونان دا بووبوو ئەگەر کو دلێ وان ژ عوثمانی بمینت یان ئەو نەیارەتییا وی بکەن، نەخێر! صەحابی ژ ڤێ چەندێ مەزنترن، بەلێ چونکی ئەو ژی مرۆڤن، و دبت ئەو ژی د بیر و بۆچوونێن خۆ دا ژێکجودا بن، تشتەکێ گەلەکێ سورشتییە عێجزی و دلمان یان ڕەنگەکێ سارییێ د ناڤبەرا وان دا پەیدا ببت.

ل ڤێرێ من دڤێت ئیشارەتێ بدەمە بێبەختییەکێ کو هندەک نڤیسەرێن دیرۆکێ یێن نوی و یێن کەڤن ژی بەحس ژێ دکەن، پشتی ئەو پالددەنە سەر هندەک ریوایەتێن درەو یێن تبلێن رافزییان د پشت ڕا دئاشکەرا، دەمێ دبێژن: عوثمانی داخواز ژ هندەک زەلامێن خۆ کر کو ئەو عەمماری بقوتن، پاشی پشتی وان ئەو ئێخستییە عەردی، عوثمان ب پییان ڤە چوو سەر زکێ وی حەتا ڕویڤیکێن وی قەتاندین.. و حەتا دوومـاهییێ ژ وان درەوێن ب شاخ!! هەر وەسا ئەو دبێژن: دەمێ فتنەچی هاتین دۆر ل مەدینێ گرتین ئەو شیان عەمماری و هندەک صەحابییێن دی ژی ب لایێ خۆ ڤە بکێشن و دژی عوثمانی ڕاکەت، و دبێژن: وان پێ خۆشبوو کو عوثمان هاتییە کوشتن!

زانایێن ئیسلامێ و دیرۆکڤانێن ڕاستگۆ و (موحەقق) د کەڤن دا[1] دویچوونا ڤان گۆتن و ریوایەتان کرییە، و درەوا وان ب دەلیل و بورهان بۆ خەلکی ئاشکەرا کرییە، لەو هەوجە ناکەت ئەم زێدە خۆ پێڤە موژیل

(١) وەکی (ابن العربی) د کتێبا (العواصم والقواصم) دا بۆ نموونە.

بکەین، ب تنێ من ڤیا ل ڤێرێ ئیشارەتا کورت بدەمێ چونکی دبت هندەک کەس ژ کێم زانینا خۆ پێ بێنە خاپاندن، یان هزر بکەن کو دبت ڕاستییەک بۆ ڤان گۆتنا هەبت.



پشتی صەحابییان بەیعە دایە ئیمام عەلی، و ئەو ل جهێ عوثمانی کرییە خەلیفە، د مەسەلە ستاندنا تۆلا ئیمام عوثمانی دا صەحابی -وەکی پتر ژ جارەکێ مە گۆتی- بوونە سێ پشک، ڕەئیا ئیمام عەلی ئەو بوو نوکە ئەڤ مەسەلە پێتە پاشخستن، و کار بۆ هندێ بێتەکرن کو ڕێزێن موسلمانان بێنە موکومکرن، و پشکەکا صەحابییان ل سەر ڤێ بۆچوونێ بوون، و عەمماری کوڕێ یاسری ئێک ژ وان بوو، لەو وی خۆ دا د گەل خەلیفەی و لەشکەرێ وی، و بۆچوونا وی ئەو بوو کو ئەو یێ حەقە، و گوهدان و پشتەڤانییا وی ژی واجبە؛ چونکی ئەو خەلیفەیە و مە (بەیعە) یا دایێ و دڤێت ژ فەرمانا وی دەرنەکەڤین.. و د عەقیدەیا ئەهلێ سوننەتێ دا ئەڤە بۆچوونە بوو یا دورست، هەر چەندە ئەو دبێژن: صەحابییێن دی ژی (موجتەهد) بوون، و د گەل خەلەتییا بۆچوونا وان ئەو خودان خێرن.

دەمێ ئیمام عەلی بڕیار دای ژ مەدینێ دەرکەڤت و بەر ب عیراقێ ڤە بچت، وەکی مە د سیرەتا وی دا ڤەگێڕای، عەممار -د سەر پیراتییا خۆ ڕا- ئێک ژ وان کەسان بوو یێن بڕیار دای پشتەڤانییا ئیمامی بکەت، و د گەل وی دەرکەڤت، و پشتی ئیمامی بڕیار دای ڕێکا خۆ ڤەگوهێزت و بچتە بەصرا دا بەرێ خۆ بدەتە مەسەلا طەلحە و زوبەیری، وی داخواز ژ خەلکێ کووفە کر کو هاری وی بکەن، ئینا وی کوڕێ خۆ حسەن و عەممار هنارتنە وێرێ دا ئەو داخوازا وی بگەهیننە خەلکی، و بەری نوکە دەمێ مە بەحسێ ئەبوو مووسایێ ئەشعەری کری، مە گۆت: ئەبوو مووسا وی دەمی والییێ

کووفە بوو، و بۆچوونا وی ئەو بوو موسلمان پشکدارییێ د ڤێ فتنێ دا نەکەن، و هەر ئێک ل مالا خۆ روینت.. گاڤا عەممار گەهشتییە کووفە و داخواز ژ خەلکی کری کو ئەو پشتەڤانییا ئیمام عەلی بکەن، خەلکی گۆتێ: چاوا ئەم بچین دژی دەیکا موسلمانان عائیشایێ راوەستین؟ عەمماری گۆتە وان: ئەز دزانم کو عائیشا ل دنیایێ و ئاخرەتێ کابانییا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-، بەلێ خودێ دڤێت هەوە ب وێ بجەرببنت کانێ هوین دێ گوهێ خۆ دەنە وی یان وێ!

ژ ڤێ گۆتنا وی ئاشکەرا دبت کو ئەو د عەدالەت و جامێرییا لایێ بەرانبەر دا ب گومان نەبوون، بەلێ ئەو ل وێ باوەرێ بوون کو ئەو بۆچوونا ئەو ل سەر یا دورست نینە، و ئەگەر ئەو گوهدارییا ئیمامی نەکەن، ئیمامی ب حوکمێ مەنصبێ خۆ حەقێ هەی شەرێ وان بکەن، و وان ل حەقییێ بزڤرینتە ڤە.

هەر چاوا بت.. مەسەلە ب وی رەنگی دەرباسبوو یێ بەری نوکە مە بەحس ژێ کری، و عەمماری پشکداری د شەرێ دژی لەشکەرێ طەلحە و زوبەیری دا کر، پاشی د گەل ئیمام عەلی و لەشکەرێ وی بەر ب شامێ ڤە چوو؛ دا بەرانبەر لەشکەرێ موعاویەی راوەستن.

ل صففینێ هەردو لەشکەر کەفتنە بەرانبەر ئێک، و شەر دەست پێ کر، رۆژا ئێکێ ب دووماهی هات بێی کو لایەک لایێ دی بشکێنت، رۆژا دویێ هەردو لەشکەران بەردەوامی دا شەری، ل دەمەکی لەشکەرێ ئیمام عەلی چەندەکێ پاشدا چوو، عەممار بۆ پێشڤە چوو و داخواز ژ هەڤالێن خۆ کرن کو سست نەبن و پاشدا نەچن؛ چونکی ئەو یێ ل سەر حەقییێ، و دەمێ بوویە ئێڤار ئەو و هاشمێ کورێ عوتبەیێ کورێ ئەبوو وققاصی -ئەوێ ئالایێ لەشکەری ڤێ- بۆ پێشڤە چوون و هەر دو نەزڤرین!

عەممار ب دەستێ کەسەکی ژ لەشکەرێ شامێ هاتە کوشتن ناڤێ وی ئەبوولغادیە بوو.. و دەمێ عەممار هاتییە کوشتن ژییێ وی ل دۆرێن نۆت و سێیێ بوو، و ئەو ب جلکێن وی ڤە وەکی وی شیرەتکری، و گۆتێ: ((ئەز زەلامەکێ خودان هەڤڕکیمە)) و هاتە ڤەشارتن بێی کو بێتە شویشتن، و ئیمام عەلی نڤێژ لێ کر.

پشتی خەبەرێ کوشتنا عەمماری د ناڤ هەردو لەشکەران دا بەلاڤبووی، نەرحەتییا مەزن پەیدابوو، ب تایبەتی د ناڤ خەلکێ شامێ دا؛ چونکی هندەک صەحابی د ناڤ وان دا هەبوون گوهـ ل پێغەمبەری بووبوو کو دەستەکا (باغی) یەعنی: سەرداچووی و تەعداکەر، دێ عەمماری کوژت، ڤێجا دەمێ وان دیتی عەممار ب دەستێ لەشکەرێ شامێ هاتییە کوشتن، وان گۆت: مەعنا یێن باغی و نەحەق ئەمین.. حەتا دبێژن: عەمرێ کوڕێ عاصی ب ترس ڤە چوو نک موعاویەی، گاڤا موعاویەی دیتی ڕەنگێ وی یێ هاتییە گوهارتن، گۆتێ: تە خێرە؟ وی گۆت: عەممار هاتە کوشتن! گۆتێ: ڤێجا؟ وی گۆت: من یێ گوهـ ل پێغەمبەری بووی -سلاڤ لێ بن- دبێژت: دەستەکا باغی دێ وی کوژت. هنگی موعاویەی گۆتێ: ڤێجا ما مە ئەو کوشتییە، وان ئەو یێ کوشتی یێ ئەو ئینایە شەڕی، و هاڤێتییە بەر شیرێن مە!

هۆسا موعاویەی ڤیا هەڤالێن خۆ تێ بگەهینت، و وان ب ڤێ (تەئویلێ) قانع بکەت، بەلێ د ناڤ وان دا هەبوون یێن قانع نەبووین و دەست ژ شەڕی ڤەکێشای و کۆما موعاویەی هێلای، و ئێک ژ وان صەحابییێ ناڤدار عەبدللاهێ کوڕێ عەمری بوو، و خۆ عەمر ب خۆ ژی ب تمامی ب ڤێ تەئویلی یێ قانع نەبوو، حەسەنێ بەصری ژ عەمرێ کوڕێ عاصی ڤەدگوهێزت کو جارەکێ وی گۆت: هیڤییا من ئەوە هەر کەسەکێ

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مری و حەزژێکری، خودێ وی نەبەتە ئاگری، هندەکان گۆتێ: یا ئەم دزانین وی حەز ژ تە دکر و هندەک کار ئێخستبوونە دەستێ تە.. عەمری گۆت: خودێ چێتر دزانت.. و یا ئەم دزانین وی حەز ژ عەمماری کوڕێ یاسری دکر.. وان گۆت: ئەو ئەو بوو یێ هەوە ل ڕۆژا صففینێ کوشتی. وی گۆت: ئەرێ ب خودێ مە ئەو کوشت!

ئیمامێ ذەهەبی د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((ئبن مولجم ل نک رافزییان مرۆڤێ ژ هەمییان بەختەرەشترە ل ئاخرەتێ، و ئەو ل نک مە سونییان ژ وانە یێن ئەم هیڤییا ئاگری بۆ دکەین، و ئەم نابژین: مومکن نینە خودێ ل وی ببۆرت.. و حوکمێ وی حوکمێ وییە یێ عوثمان و زوبەیر و طەلحە و سەعیدێ کوڕێ جوبەیری و عەممار و خارجە و حوسەین کوشتین، ئەم ژ وان هەمییان دبەرینە و مە ئەو نەڤێن، و ئەم حالێ وان دهێلینە ب هیڤییا خودێ ڤە)).

ئەڤە کورتییا بۆچوونا ئەهلێ سوننەت و جەماعەتێیە د ڤێ مەسەلێ دا.

## پشكا پێنجێ

# ژ خزمەتكارێن پێغەمبەر سلاڤ لێ بن

- زەیدێ كوڕێ حارثەی
- ئوسامەیێ كوڕێ زەیدی
- دەیكا ئەیمەنی و ئەیمەن
- ثەوبانێ كوڕێ بوحدوری
- ئەنەسێ كوڕێ مالكی
- عەبدللاهێ كوڕێ مەسعوودی

# زەیدێ کوڕێ حارثەی

هنگی هێشتا هەمی جهـ د ناڤ چەنگێ جاهلییەتێ یێ ڕەش دا بوون، بێفامییێ ڕەشمالا خۆ ب سەر هەمی لایێن ژیانێ دا گرتبوو.. عەرەب ل درێژی و پانییا وەلاتێ خۆ یێ وەکی دلێن وان هشک و زوها ژ دەستێ نەزانینێ دنالین، هیڤییەکا کێم وەکی وی چرایێ چو نەمای ڤەمرت د دل و سەرێن هندەک کەسان ژ زانایێن ئەهلێ کیتابێ و بەرمایێن حەنیفییان دا مابوو کو نێزیکە ڕۆناهییا پێغەمبەرینییێ ل دەور و بەرێن مالا خودێ ئەوا ئیبراهیمی ل مەکەهێ ئاڤاکری گەش بکەت..

ل ژێرییا وەلاتێ شامێ، کو دبتە ئوردونا نوکە، ل دەڤەرا ئویجاخا (کەلبییان) زەلامەکێ دگۆتنێ: حارثەیێ کوڕێ شوراحیلێ کوڕێ کەعبی، ب دلەکێ گرتی ڤە کارێ ژنکا خۆ (سوعدایا کچا ثەعلەبەیێ طائی) دکر، دا ئەو بۆ دەمەکی قەستا مالبابا خۆ ل دەڤەرا (بەنوومەعەن) بکەن ل ژۆرییا دەڤەرا (تیهامە) یان ل باکوورێ مەدینەیا نوکە..

سوعدایێ دەستویری ژ زەلامێ خۆ وەرگرتبوو کو ئەو زارۆکێ خۆ یێ هەشت سالی (زەیدی) ژی د گەل خۆ ببەت؛ چونکی هەدارا وێ نائێت ژێ دویرکەڤت.. پشتی حارثەی هەمی بەرهەڤی بۆ سەفەرا ژنکا خۆ کرین، و ئەو تەسلیمی کاروانی کرین و شیرەت ل کاروانییان کری کو ئەو باش چاڤێ خۆ بدەنە ژنکا وی و کوڕێ وێ، وی ب دو چاڤێن تژی ڕۆندک ڤە خاتر ژ وان خواست، ب وێ هیڤییێ کو ل دەمەکێ نێزیک ئەو بزڤرنە ڤە.

کاروان گەهشتە ناڤ مالێن مەعەنییان، کەیف ل سەر دێمێ سوعدایێ ئاشکەرابوو، ئەڤە دەمەکێ درێژە وێ جهـ و وار و کەس و کارێن خۆ نەدیتین، ئاخری مالا زەلامێ وێ گەلەک یا دویرە ژ مالبابا وێ، لەو هەیڤ و سال دبۆرن حەتا ئەو بشێت جارەکێ بێتە نک مرۆڤێن خۆ.. بەلێ ئەڤ کەیفا وێ گەلەک ڤەنەکێشا؛ چونکی سپێدەیەکا زوی هێشتا ئەو باش هشیار نەبووین و ژ بن خیڤەتێن خۆ دەرنەکەفتین، دەنگێ پێیێن هەسپا و هەوار مرۆڤان ئەو هشیارکرن: هلۆن.. هێرشەکێ ب سەر مە دا گرت!

ئویجاخا (بەنوولقەین) هێرشەک ئینا سەر ئویجاخا (بەنوومەعەن)، و پشتی ئەو د ڤێ هێرشێ دا ب سەرکەفتین و ل دویڤ شریعەتێ جاهلییەتێ، سەرکەفتییان هندی شیاین زەلام کوشتن، و مال تالانکر، و ژن و زارۆک ئێخسیرکرن.. و ئێک ژ وان یێن کەفتینە دەستێ هێرشکەران زارۆکێ حارثەیێ کەلبی زەید بوو!

دەیکا زەیدی ب دلەکێ سۆتی ڤە ب لایێ باکوورێ ڤە چوو دا ڤێ مزگینییا نەخۆش بگەهینتە زەلامێ خۆ، زەلامێ وێ ب دلەکێ سۆتیتر ڤە ئەڤ شعرە ب کورێ خۆ ڤەهاند:

بكيـــت عَـــلَى زيـــد ولم أدر مـــا فعـــل

أحـــي يرجـــى أم أتـــى دونـــه الأجـــل

فـــوالله مـــا أدري وَإِن كنـــت ســـائلًا

أغالـــك ســـهل الأرض أم غالـــك الجبـــل

فيـا ليـت شـعري هـل لـك الـدهرَ رجعـةٌ

فحســبي مــن الــدنيا رجوعــك لي بحــل

تذكرنيـــه الشـــمس عنـــد طلوعهـــا

وتعـــرض ذكـــراه إذا قـــارب الطفـــل

وَإِن هبـــت الأرواح هـــيجن ذكـــره

فيـــا طـــول مـــا حـــزني عليـــه ويـــا وجـــل

گرییا من ل سەر زەیدییە و ئەز نزانم کانێ چ ب سەری هاتییە، ئەرێ ئەو یێ ساخە دا ئەز یێ ژێ ب هیڤی بم؟ یان ژی ئەجەل ڤێرا گەهشتییە؟ ئەز ب خودێ کەمە ئەز نزانم، هەر چەندە ئەز یێ پسیارا تە دکەم ژی، کانێ دەشتەکێ تو داعویرای، یان ژی چیایەکێ تو رەڤاندی! وەی خوزی من زانیبا کانێ زڤڕینا تە زەمانەکی دێ هەبت یان نە؟! تشتێ من ژ دنیایا خۆ دڤێت هەما ئەوە جارەکا دی ئەز زڤڕینا تە ببینم.. دەمێ ڕۆژ دهەلێت ئەو بیرا من ل وی دئینتە ڤە، و گاڤا ئەو بەر ب ئاڤابوونێ ژی ڤە چوو دیسا ئەو دئێتە بیرا من، گاڤا بایەک ل من ددەت بیرا وی ل نک من دئارییێت، وەی بۆ درێژییا خەما من، و مەزنییا ترسا من..

و هۆسا وی نیهارا خۆ دانا، و ئەو د ناڤبەرا خەم و ترسێ دا ما، حەتا ڕۆژەکێ مزگینییا خێرێ گەهشتییێ.

سالەکێ هندەک مرۆڤ ژ ئویجاخا وی چوونە مەکەهێ ب ئنیەتا کرنا حەجێ، ب خافلەتی ڤە چاڤێن وان ب جحێلەکی کەفتن، وان شک ژێ برن کو هەر وەکی ئەڤە خولکێ زەیدێ کوڕێ حارثەیی ددەت، ڕاستە ئەڤە چەند سالەکە ئەو بەرزەبووی، و دەمێ ئەو بەرزەبووی هێشتا ئەو زاڕۆکەکێ هەشت سالی بوو، بەلێ خولکێ وی گەلەک نەهاتییە گوهاڕتن.. وان نەڤیا ڤێ دەلیڤەیێ ژ دەست خۆ بکەن، وان خۆ نێزیکی وی جحێلی کر، و چەند کەیفا وان یا مەزن بوو دەمێ وان زانی ئەڤە ئەوە یێ ئەو لێ دگەڕێن،

زەیدی گۆتە وان: بەلێ ئەز زەیدم، و بەری چەند سالەکان هندەکان ئەز گرتم و وەک عەبد فرۆتم، بەلێ نوکە ئەز یێ د ناڤ باشترین مال دا، بزڤرنە نک بابێ من و مزگینییێ بدەنێ کو تشتەک ژ من یێ کێم نینە..

ئێغبالا زەیدی دەمێ ئەو ژ ناڤ مالخالانێن وی هاتییە رەڤاندن و هێشتا ئەو زارۆکەکێ هەشت سالی، وەکی عەبدەکی سەرەدەری د گەل وی هاتەکرن، و ئەوێن ئەو گرتی ئەو بۆ فرۆتنێ برە بازارا (عوکاظێ)، هنگی زەلامەکێ قورەیشی ئەوێ دگۆتنێ: (حەکیمێ کورێ حزامی) ب سەر وی زارۆکی هلبوو، دلێ وی کەفتێ لەو وی ئەو کری و د گەل خۆ ئینا مەکەهێ، و پشتی دەمەکی وی ئەو وەک دیاری دا مەتا خۆ خەدیجایا کچا خوەیلدی؛ دا کار و بارێن وێ بۆ بکەت.. و هۆسا بەرێ زەیدی کەفتە مالا خەدیجایێ، و هەر ژ رۆژا ئێکێ خەدیجایێ وەک دەیکەکا دلۆڤان بەرێ خۆ دا ڤی زارۆکی، و ئەو وەک دیاری دا زەلامێ خۆ موحەممەدێ کورێ عەبدللاهێ هاشمی.

ئەڤە ئەو مال بوو یا زەیدی گۆتییە مرۆڤێن خۆ: ئەز یێ د ناڤ باشترین مالێ دا، و تشتەک یێ ژ من کێم نینە.. خودانێن ڤێ مالێ زەلام و ژن هەردو، وەکی عەبدەکی سەرەدەری د گەل زەیدی نەدکر، بەلکی ئەو وەک کورەک بۆ خۆ ددیت، و کانێ چاوا وان سەرەدەری د گەل زارۆکێن خۆ دکر وەسا وان سەرەدەری د گەل زەیدی ژی دکر.

مرۆڤێن زەیدی پشتی ب سەر وی هلبووین و ب جهێ وی کەفتین، وان ئەڤ خەبەرێ خۆش گەهاندە حارثەی، و گاڤا حارثەی ئەڤ چەندە زانی پێیێن وی ژ کەیفان دا خۆ ل عەردی نەگرتن، و هەر زوی داخواز ژ برایێ خۆ کەعبی کر کو ئەو خۆ ئامادە بکەت دا بەر ب مەکەهێ ڤە بچن، پشتی وان مالەکێ مەزن د گەل خۆ بری؛ دا زەیدێ پێ بکرن و ژ عەبدینییێ

ڕزگار بکەن.. و گاڤا ئەو گەهشتینە مەکەهێ وان پسیارا مالا موحەممەدی کر و چوونە نک و گۆتنێ:

- ئەی کوڕێ عەبدلموطەلبی! هوین جیرانێن حەرەمێنە و مالەکا خانەدانن، عەدەتێ هەوە ژ بەرێ وەرە ئەوە هوین د هەوارا کەسێ پێتڤی دچن، هوین یێ تەنگاڤ بەرددەن و قەدرێ ئێخسیری دگرن، ئەم ب کارەکی یێ هاتینە نک تە ئەگەر تو منەتەکێ ل مە بکەی ئەم دێ مەمنوونێن تە بین..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و هنگی هێشتا نەبووبوو پێغەمبەر، گۆتە وان:

- ئەو کارێ هوین پێ هاتین چییە؟

وان گۆت: کوڕێ مە زەید، ب زارۆکینی هاتبوو ڕەڤاندن و وەک عەبد هاتبوو فرۆتن، و نوکە ئەو یێ ل نک تە، ئەگەر تو وی بدەیە مە تە چەند فدیە بڤێت دێ دەینە تە.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ما ئەگەر ئەم تشتەکێ دی بکەین چاوایە؟

وان گۆت: ئەو تشت چییە؟

وی گۆت: ئەم دێ هنێرینە ب دویڤ زەیدی ڕا، و هوین هلبژارتنێ بدەنە وی، ئەگەر وی ڤیا د گەل هەوە بێت ئەو بۆ هەوەیە بێ فدیە، و ئەگەر وی ئەز هلبژارتم، ئەز ب خودێ کەمە ئەز دەستان ژ وی بەرنادەم یێ من هلبژێرت.

وان گۆت: ئەوا تە گۆتی ژ قەنجییێ ژی زێدەترە..

گاڤا زەید هاتی و بابێ خۆ و مامێ خۆ دیتین کەیفا وی گەلەک هات، ئەو چەند سال بوو وی ئەو نەدیتین:

- زەید! تو دزانی ئەڤە کینە؟

- بەلێ، ئەڤە بابێ من حارثەیە، و ئەڤە مامێ من کەعبە..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو یێن هاتین تە د گەل خۆ ببەنە مال، ڤێجا تو یێ ب کەیفا خۆیی، تە دڤێت د گەل وان هەرە و تە دڤێت بمینە ل نک مە.

حارثە و برایێ خۆ کەعب مەندەهووش و حێبەتی مان دەمێ وان گوهـ ل کورێ خۆ زەیدی بووی گۆتی: د سەرێ تە ڕا ئەز کەسەکێ د ڤێ دنیایێ دا ناهلبژێرم، تو بۆ من ژ بابی دلۆڤانتری!

وەی بۆ تە زەید! هۆسا بابێ وی گۆتێ، ئەرێ تو عەبدینییێ و زەلامەکێ بیانی چێتر ژ مە دبینی؟ ئەڤە چ گۆتنە تو دبێژی؟

بەلێ زەیدی ب یا وان نەکر، و یێ ڕژدبوو کو دەستان ژ موحەممەدی بەرنەدەت، ئەگەر خۆ ل نک وی عەبد یان خزمەتکارەک ژی بت.. گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ هەلویستە ژێ دیتی، وی ل پێش چاڤێن حارثەی و برایێ وی کەعبی دەستێ زەیدی گرت، و برە دیوانا مەزنێن قورەیشییان ل کەعبێ ئەوا دگۆتنێ: (دار الندوة) و ب دەنگەکێ بلند گازی کر:

- گەلی مرۆڤان هوین شاهد بن کو زەید کورێ منە، میراتێ من دگەهتە وی و یێ وی دگەهتە من!

ب ڤێ چەندێ، و ل سەر وێ ڕێبازێ یا عەرەبان ل وی دەمی کار پێ دکر و د گۆتنێ: (تەبەنی)، زەید د چاڤێن خەلکی هەمییێ دا بۆ کورێ موحەممەدی یێ فەرقا وی و کورێ ژ ڕاستی نەهەی، و ب ڤێ چەندێ ئەو ب ئێکجاری ژ عەبدینییێ ئازابوو و بوو مرۆڤەکێ سەربەست.. گاڤا بابێ وی حارثەی ئەڤ چەندە دیتی ئەو ژ پاشەڕۆژا کورێ خۆ پشتڕاست بوو، و

وی زانی کو ئێدی سەرەدەری وەک عەبد و کۆلە د گەل کورێ وی نائێتەکرن، بەلکی ئەو وەک ئەندامەک ژ مالباتا مەزنێ قورەیشییان عەبدلموطـطـەلبی دێ ئێتە هژمارتن، لەو ب دلـەکێ خۆش ڤە ئەو زڤڕی دەڤەرا خۆ، پشـتی کـو خاتر ژ کورێ خۆ خواستی..

عەبدللاهێ کورێ عومەری دبێژت: ((ڤەت مە نەدگۆتە زەیـدی: زەیـدێ کورێ حارثەی، بەلکی مە دگۆتێ: زەیدێ کـورێ موحـەمـمـەدی، حـەتا خـودێ ئەڤ ئایەتە ئینایە خوارێ: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾ (الأحزاب: ٥) پشـتی هنگـی مـە گـۆتێ: زەیـدێ کـورێ حارثـەی)). و ئاشـکەرایە کـو پشـتی مشـەختبوونێ ب چەنـد سـالان ژ نـوی ئـەڤ ئایەتـە هـاتبوو خوارێ.. مەعنا: ل سەر دەمێ مەکەهێ و چەند سـالان ژ دەمـێ مـەدینێ ژی خـەلکی هەمییێ دگۆتە زەیدی: کورێ موحەممەدی.



دەمـێ هـێشـتـا زەیـد زارۆکـەکێ بچویـک قـەدەرا وی، ئـەوا ئەگـەر ئـەم ب سەر ڤە بەرێ خۆ بدەینێ دێ بینی یا دژوار بوو د گەل وی، ئـەو ب نـک پاشەڕۆژەکا ڤەشارتی ڤە بر، وەکـی یووسـفی -سـلاڤ لـێ بـن- ئـەوێ ژ بـەر دلـێ بابێ وی هاتییەبرن و ب قەیدێن عەبدینی و غـەریبییێ هاتییە گرێدان، بـەلـێ ڤـێ چەنـدا هـە مفایـەکێ مـەزن گـەهاندییـە وی و مـالباتـا وی.. زەیـد هاتە ڕەڤاندن، و وەک عەبد هاتە فرۆتن، و قەدەرا وی ئەو بوو ل وی دەمـێ ئەو بۆ فرۆتنێ هاتییـە بـەرچاڤکرن برازایـێ خـەدیجایـێ یـێ ئامـادەبوو و وی ئـەو کـڕی و د گـەل خـۆ ئینـا مەکـەهێ و ب دیـاری دا مـەتا خـۆ، کابانییـا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و بەلکی هندەک جاران قەدەرا مـە ب تشـتـەکێ نەخۆش ل بەر مە بگـەڕییێت و ئـەم خـۆ ژێ بێنتـەنگ ببینـین، و ئـەو ب خـۆ فایدەیەکێ مەزن بۆ مە تێدا هەبت ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ خَيۡرٌ ﴾

(البقرة: ٢١٦) ڤێ قەدەرا بەرێ زەیدی دایە عەبدینییێ هەر ئەوو بوویە ئەگەر کو ئەو ژ ژێرییا دەڤەرا شامێ بێت و ببتە ئێک ژ ئەندامێن مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، پێغەمبەری و ژنکا وی خەدیجایا پاک و بژوین زەید هەر ژ زارۆکینییا وی ب خودانکر و وەکی وان دڤێت وان ئەو پەروەردەکر، و وەکی کورەکێ خۆ یێ خۆشتڤی سەرەدەری د گەل کر، لەو یا عەجێب نینە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەمی کسان پتر حەز ژ وی کربت.

زەید مەزن بوو، و بوو زەلامەکێ تمام، یێ تژی بزاڤ و ژین و لڤین، و هەردەم ئەو بۆ پێغەمبەری -یان بابێ خۆ وەکی خەلکی ددیت- وەکی سیبەرێ بوو، ژێ دویر نەدکەڤت، و د خزمەتا وی دا بوو، حەتا ئەو رۆژ هاتی یا رویدانەکا غەریب تێدا ل مالا وان چێببووی.. ل بەر زەیدی بووبوو تشتەکێ عەدەتی کو ئەو ببینت بابێ وی موحەممەد ژ مال دەرکەڤتە چیای و ل وێ شکەفتا بێ صەبر ئەوا دبێژنێ: (حراء) چەند شەڤ و رۆژان بمینت، پشتی کو خەدیجا مێدەکا وی یا خوارنێ بۆ وی ئامادە دکەت، و هنگی زەید ئەوێ ژییێ وی ژ بیست سالییێ دەرباسبووی پێش وی ڤە ب کار و بارێ مالێ رادبوو، رۆژەکێ زەید زڤری مال دیت بابێ وی خۆ یێ د ناڤ نڤینان را پێچای، و تا یا هاتییێ و لەشێ وی هەمی یێ ڤەدلەرزت و هێشتا یێ دبێژتە کابانییا خۆ: من بنخێڤن، من بپەچنن!

بۆ زەیدی -وەکی خەدیجایێ- بوو مەرەق کانێ ئەڤە چ ب سەرێ خۆشتڤییێ وان هاتییە، و پشتی تا ل سەر زەلامێ مالێ سڤکبووی، خەدیجایێ پسیار ژێ کر: تە خێرە؟ وی گۆت: شڤێدی دەمێ ئەز یێ ل شکەفتێ کەسەک هاتە نک من و ئەز گڤاشتم پاشی گۆتنەکا غەریب گۆتە من.. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرهاتییا خۆ و جبریلی و هاتنەخوارا

دەسپێکا سوورەتا (العلق) بۆ وان ڤەگێرا.. خەدیجایێ ب شارەزاییا خۆ زانی کو ئەڤە تشتەکێ مەزن و باشە د گەل وی چێبووی، لەو وێ دلەی دلەی وی دا، و گۆتێ: ئەز ب خودێ کەمە تو مرۆڤەکێ باش و جامێری لەو خودێ تە شەرمزار ناکەت. پاشی گۆتێ: من پسمامەکێ هەی مرۆڤەکێ خودێناس و شارەزایە هلۆ دا بچینە نک وی و پسیارا ڤی تشتی ژێ بکەین.. و گاڤا موحەممەدی سەرهاتییا خۆ بۆ وەرەقەیێ کوڕێ نەوفەلی ڤەگێرای، هندی دنیایەکێ کەیفا وەرەقەی هات، و هەر زوی مزگینی دایێ کو ئەوێ ل شکەفتێ هاتییە نک تە، هەر ئەوە یێ دچوو نک مووسا و عیسایی ژی، و تو دێ بییە ئەو پێغەمبەر یێ زانایێن کیتابییان ل هیڤییێ.. و گاڤا ئەو ب ڤێ مزگینییا خۆش ڤە زڤڕینە مال، خەدیجا ئێکەمین کەس بوو باوەری ب پێغەمبەرینییا وی ئینای، و زەید کەسێ دویێ بوو.

هۆسا ئەو (شەرەف) و بلندییا ب دەست زەیدی کەفتی ب دەست کەسێ دی نەکەفت.. و ب ڤێ چەندێ قووناغا ب وەستییان د ژیانا زەیدی دا دەست پێ کر، قووناغا پشتەڤانییا بابێ خۆ د گازییا وی دا، و بەلاڤکرنا ڤی دینی د ناڤ خەلکی دا.

هەر ڕۆژ سپێدێ وی بابێ خۆ یێ پێغەمبەر ددیت ژ مال دەرکەفت یێ ب تنێ، دچوو دا ڕۆناهییا خودێ بەلاڤ کەت، و ئێڤاری ب تنێ دزڤری، وەکی ڕۆژێ دەمێ سپێدێ ل سەر خەلکی دهەلێت یا ب تنێ، و ئێڤاری ب تنێ ژ ناڤ وان بار دکەت، بەلێ نە.. بابێ وی نەما یێ ب تنێ، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هەڤالێن وی زێدەدبوون، و گازییا وی بەرفرەهـ دبوو، سێ بوونە حەفت، و حەفت بوونە سیهـ، و سیهـ بوونە چل، ل سەری وان خۆ د مالا ئەرقەمی ڤە ئەوا دکەفتە پشت گرێ صەفایێ ژ دەرڤەی مەکەهێ ڤەدشارت،

و پشتی حەمزە و عومەر ژی گەهشتینە کاروانێ ڕۆناهیییێ، و موسلمان ب هێز کەفتین، ئێدی دەم هات گازی ب ئاشکەرا بێتە ڕاگەهاندن، و کافر دینبوون! چاوا هندەک د ناڤ مە دا هەبن بستە بکەن ئاشکەرا بێژن: ڕێبازا باب و باپیران نە یا دورستە، و لات و عوززا و هوبەل هندەک بەرێن ڕەقن نەدشێن چو مفایی نە چو زیانێ بگەهینن!

قووناغا عەزابدانێ دەست پێ کر، و پێغەمبەر ب خۆ ژی، هەر چەندە ژ بەر مامێ وی ئەبوو طالبی کافران بستە نەدکر نەخۆشییێ بگەهیننێ، بەلێ دیسا ئەو ژی ژ سەرێشکێن نەخۆشییێ خلاص نەدبوو، و هەما بەس بوو بۆ وی نەخۆشی کو ئەو ببینت هەڤالێن وی یێ دئێنە گرتن و عەزابدان و کوشتن و ئەو نشێت تشتەکی بۆ وان بکەت.

سالا نەهێ ژ گازییا ئیسلامێ هات، و ئەو سالەکا گران بوو ل سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مالباتا وی؛ چونکی قورەیشییان بڕیار دا بنەمالا قورەیشییان ل نهالا ئەبوو طالبی دووریێچ کەن، و نەهێلن کەس تشتەکی ژ وان بکڕت یان بفرۆشتێ، ژنەکێ بدەتێ یان ژێ بینت، حەتا ئەو ژ برسان دا دمرن، یان ژی موحەممەدی تەسلیم دکەن دا ئەو وی بکوژن! و تشتێ نەخۆشی دژوارتر لێ کری ئەو بوو خەدیجا و ئەبوو طالب هەردو ل وی دەمی مرن، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو پشتەڤانێن خۆ یێن مەزن ژ دەستدان، یێن کو بارێ وی سڤک دکرن.

پشتی مرنا ئەبوو طالبی ئێدی کافر ل سەر پێغەمبەری ب خۆ ژی بستە بوون، و وان نەخۆشی گەهاندە وی ژی، لەو وی هزر د هندێ دا کر ئەو ژ مەکەهێ دەرکەڤت، و ئەو بوو وی قەستا باژێرێ طائیفێ کر؛ دا دینێ خۆ ل وێرێ بەلاڤ بکەت، و ئەو هەڤالێ وی بۆ خۆ هلبژارتی دا د گەل وی بچتە طائیفێ کوڕێ وی زەید بوو..

سەرهاتییا چوونا وان بۆ طـائیفێ، و چاوانییا زڤڕینا وان، بـەری نوکـە مە د ژیاننامەیا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- ب بەرفرەهی ڤەگوهاستییە، لەو هەوجە ناکەت ل ڤێرێ دوبارە بکەین، ب تنێ من دڤێت بێژم: زەید ئـەو کـەس بـوو یـێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بـن- د کـارێـن خـۆ یێن گرنـگ دا ب تمامی پالددا سەر، لەو وی ژ ناڤبەرا هەمی صەحابییێن خۆ زەید د گەل خۆ برە طـائیفێ.

ل مــەدینێ ژی پشــتی مشــەختبوونا موســلمان، ل دویــڤ عــەدەتێ (تەبـەنیییێ) ئـەوێ د نـاڤ عـەرەبان دا هـەی خـەلکی بـەرێ خـۆ ددا زەیـدی وەکـی کـوڕێ پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن-، و پێغەمبـەری ب خـۆ ژی هـەر ب وی ڕەنگی بەرێ خۆ ددا وی، و ژ بەر ڤیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بـن- یـا زێـدە بـۆ زەیـدی، صـەحابییان ناسـناڤێ (حـب رسـول اللـه) یـەعنی: خۆشتڤییێ پێغەمبەرێ خودێ، ل سەر زەیدی دانابوو.

زەیـدی پشــکداری د شـەڕێ بـەدرێ دا کـر، و دەمـێ موسـلمان د وی شەڕی دا ب سەرکەفتین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەید هنارتە مـەدینێ؛ دا ئەو مزگینییا سەرکەفتنێ بگەهینتە خەلکی هێشـتا لەشکەر نـەزڤڕی.. و پشــتی هنگــی وی پشــکداری د وان هــەمی شــەڕێن دی ژی دا کــر یــێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دژی کافران کرین.

د ژیانا زەیدی دا ل مەدینێ دو سـەرهاتییێن بـەرچاڤ هەنـە مـە دڤێت چەندەکێ بەحس ژێ بکەین..



## سەرهاتییا ئێکێ:

ل دووماهییا سالا چارێ مشەختێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژ کچا مەتا خۆ (ئومەیمایێ) کر و ناڤێ وێ زەینـەب بـوو کـو ئـەو شـوی

ب زەیدی بکەت، زەینەب کچا جەحشێ کورێ ریئابێ ئەسەدی بوو، و بابکێ ئەسەدییان ئێک ژ بابکێن قورەیشییانە، زەینەب ژ لایێ بابێ ڤە ئەسەدی بوو و ژ لایێ دەیکێ ڤە هاشمی بوو، و ئەو ژنکەکا تێگەهشتی و بەرکەفتی بوو، و زەید ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەینەب بۆ خواستی، عەبدەکێ ئازاکری بوو، ڕاستە ئەو وەکی کورێ پێغەمبەری دهاتە قەبویلکرن و نیاسین، بەلێ هەر چاوا بت ئەو عەبدەکێ ئازاکری بوو، و عەبد -خۆ ئەگەر بێتە ئازاکرن ژی- د چاڤێن خەلکی دا وەکی مرۆڤێ ئازا نەبوو، ئەڤ شویکرنە ب دلێ زەینەبێ و یێ برایێ وێ عەبدللاهی ژی نەبوو، و وان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەڤە کێماسییە بۆ مە! بەلێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ داخوازا خۆ لێڤە نەبوو، ژ بەر کو وی ئەڤ کارە ب وەحییا خودێ دکر، و وی گۆتە زەینەبێ و برایێ وێ: زەید ژ ئویجاخەکا ب قەدرە و ئەو ژ مالەکا عەسلییە.. و هنگی ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ (الأحزاب: ٣٦) یەعنی: ئەگەر خودێ و پێغەمبەرێ وی حوکمەک دا چێ نابت بۆ مێرەکێ خودان باوەر یان ژنەکا خودان باوەر ئەو ب وی حوکمی نەکەت و حوکمەکێ دی هلبژێرت، و هەچییێ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی نەکەت ب ڕاستی ئەو ژ ڕێکا دورست دویرکەفت دویرکەفتنەکا ئاشکەرا.

گاڤا زەینەبێ و برایێ وێ زانی ئەڤە حوکمێ خودێیە ئەو پێ قانعبوون.. و زەینەبێ شوی ب زەیدی کر، و نێزیکی سالەکێ یان پتر ئەو مانە د گەل ئێک، بەلێ زەواجا وان زێدە یا رحەت نەبوو؛ چونکی زەینەبێ خۆ بلندتر ژ زەیدی ددیت، و د زەواجێ دا هەر جارەکا ژنێ خۆ ژ زەلامێ خۆ بلندتر دیت، ئەو زەواج یا سەرکەفتی نابت. گەلەک زەید دچوو نک

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بەر کو ئەو بابێ وی بوو، و کوڕخالێ زەینەبێ بوو، و گازندە ژ زەینەبێ دکرن، و هەر جار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتێ: ژنکا خۆ بگرە و تەقوایا خودێ بکە.. بەلێ دووماهیێ حەزکرنا خودێ ل سەر هندێ پێکهات کو زەید ژنکا خۆ بەردەت، و پشتی زەینەب هاتییە بەردان خودێ ئەو ل پێغەمبەرێ خۆ مارەکر، و ئایەتەک د ڤێ دەربارێ دا هاتەخوار ناڤێ زەید ب ئاشکەرا تێدا هات، و ب ڤێ چەندێ زەید ئێتە هژمارتن صەحابییێ ئێکانە یێ کو ناڤێ وی د قورئانێ دا هاتی: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾ (الأحزاب: ٣٧) یەعنی: دەمێ زەیدی ژنکا خۆ بەردای مە ئەو ل تە مارەکر؛ دا خودان باوەران بزانن کو دورستە مرۆڤ ژنا کوڕێ خۆ یێ (تەبەنییێ) مارە بکەت، ئەگەر هات و وی ئەو بەردا، و چو گونەه د ڤێ چەندێ دا نینە.

مە گۆت کو د جاهلییەتێ دا ل نک عەرەبان عەدەت بوو ئەگەر مرۆڤەکی کوڕەک ب خودانکربا و (تەبەنییا) وی کربا، یەعنی: ئەو بۆ خۆ کربا کوڕ، بلا کوڕێ وی یێ دورست نەبا ژی، ئەو د هەمی ئەحکامێن خۆ دا وەکی کوڕێ دورست لێ دهات، لەو دەمێ زەینەبێ شوی ب پێغەمبەری کری منافقان گۆت: موحەممەدی بویکا خۆ ل خۆ مارەکر! هنگی ئەڤ حوکمێ قورئانێ هاتەخوارێ و مەسەلا (تەبەنییێ) هاتە ڕاکرن.

هەر د ڤێ سەرهاتییێ دا بوو ئەو ئایەت هاتییە خوارێ یا بەری نوکە مە ڤەگێڕای: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِـَٔابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ ﴾ (الأحزاب: ٥)، و پشتی ڤێ سەرهاتییێ ژ نوی صەحابییان گۆتە زەیدی: زەیدێ کوڕێ حارثەی و حەتا هنگی وان دگۆتێ: زەیدێ کوڕێ موحەممەدی..

ئەڤ سەرهاتییە ل دووماهییا سالا پێنجێ مشەختی بوو.

**سەرهاتییا دویێ:**

ل سالا هەشتێ مشەختی چێبوویبوو، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قاصدێ خۆ (حارثێ کورێ عومەیری) ب کاغەزەکێ هنارتییە نک مەزنێ بوصرایێ ل شامێ (شورەحبیلێ کورێ عەمرێ غەسسانی) ئەوێ ب ناڤێ قەیصەری حوکم دکر، ئینا وی قاصدێ پێغەمبەری کوشت، و ئەڤ کارە ل سەر موسلمانان زێدە یێ گران بوو؛ چونکی نەبوویە جارەکێ قاصد بێنە کوشتن، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بریار دا ئەو لەشکەرەکی ب لایێ شامێ ڤە بهنێرت.. لەشکەر ژ سێ هزار کەسان پێکهات، و گەلەک صەحابییێن مەزن د ناڤ دا بوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- زەیدێ کورێ حارثەی کرە مەزنێ وان، و گۆت: ئەگەر تشتەک ل زەیدی هات جەعفەرێ کورێ ئەبوو طالبی دێ بتە مەزنێ هەوە، و ئەگەر تشتەک ل وی هات عەبدللاهێ کورێ رەواحەی دێ بتە مەزنێ هەوە.

لەشکەر ب سەرکێشییا زەیدی ب لایێ دەڤەرا مەعانێ ڤە چوو ل ژێرییا وەلاتێ شامێ، ئەو جهێ زەید ل حەفت هەشت سالییا خۆ ژێ هاتی، و قەت لێ نەزڤرییە ڤە، خەبەر گەهشتە موسلمانان کو لەشکەرێ رۆمێ ئەوێ ژ سەد هزار مرۆڤان پێک دهات یێ گەهشتییە دەڤەرا بەلقائێ، و نێزیکی سەد هزار عەرەبێن پشتەڤانێن رۆمێ ژی یێن گەهشتینە لەشکەرێ رۆمێ دا دژی موسلمانان شەری بکەن. موسلمانان دان و ستاندن د ناڤبەرا خۆ دا کرن کانێ ئەو چ بکەن، بەردەوامییێ بدەنە چوونا خۆ یان ژی ئێکی بهنێرنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا مەسەلێ بۆ روهن بکەت و داخوازا هندەک لەشکەرێ دی ژ وی بکەن، چونکی تشتەکێ گەلەکێ ب زەحمەتە سێ هزار کەس بەرانبەر دوسەد هزار کەسان شەری بکەن.

پشـتی دان و سـتاندنێ عەبـدللاهێ كـوڕێ ڕەواحـەی ئـەو هانـدان كـو پێشڤە بچن و نەترسن، و وان ب یا وی كر و پێشـڤەچوون حەتا گەهشـتینە توخوبێن بەلقائێ و ل نێزیكی گوندێ موئتە دانای، ئەو جهێ شەڕ لێ چێبووی.

مە نە ل بەرە سەرهاتییا ڤی شەڕی ڤەگێڕین؛ چونكی د ژیاننامەیا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- مە ئەو ب فرەهی یا ڤەگێڕای، ب تنێ مە دڤێت بێژین: ل دەسپێكا ڤی شەڕی ئالایێ موسلمانان د دەستێ زەیدێ كوڕێ حارثەی دا بوو؛ چونكی ئەو سەرلەشكەر بوو، و شەڕەكێ بێ یەمان ڕویدا، زەید ب قەهرەمانی و بێ ترس و دودلی پێشڤەچوو حەتا چوویە د ناڤ جەرگێ لەشكەرێ دوژمنی دا، و پشتی شەڕەكێ مەزن ئەو ب دەستێ كافرێن ڕۆمێ و پشتەڤانێ وان ژ عەرەبان هاتە شەهیدكرن، و بەری ئەو بكەفتە عەردی جەعفەرێ كوڕێ ئەبوو طالبی خۆ ل ئالایێ لەشكەری دا و ئەو بلند هلگرت، و ل جهێ هەڤالێ خۆ یێ شەهید سەركێشییا لەشكەری كر.

هەر ل وی دەمی و بەری لەشكەر بزڤڕتە مەدینێ، خودێ ب ڕێكا وەحییێ پێغەمبەرێ خۆ ب ئەنجامی ئاگەهداركر، لەو ئەوا د ناڤ خەلكی دا ڕابووڤە و ب دو چاڤێن گری ڤە خەبەرێ شەهیدبوونا زەیدی و جەعفەری و عەبدللاهی گەهاندە وان..

د ریوایەتەكێ دا هاتییە كو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پشتی هنگی چوو مالا زەیدی، كچا زەید ب نك ڤە هات و كرە گری، ئینا پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- هند كرە گری حەتا دەنگێ وی ب سەر كەفتی، ئینا سەعدێ كوڕێ عوبادەی گۆتێ: ئەڤە چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ پێغەمبەری گۆتێ: ئەڤە شەوقا خۆشتڤییە بۆ خۆشتڤییێ وی.

و چاوا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- موشتاقێ وی نەبت، و ئەو عەمرێ خۆ هەمییێ وەکی کورەکی بوو بۆ وی، و ئەو ئەو بوو یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەری مرنا خۆ ب دەمەکێ کێم د دەر حەقا وی دا گۆتی: ((وَإِنْ كَانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ ابْنَهُ هَذَا لأَحَبُّ النَّاسِ إلي بعده))[1] مرۆڤێ ژ هەمییان خۆشتڤیتر ل بەر من ئەو بوو، و پشتی وی کورێ وی ئەڤە خۆشتڤیترین مرۆڤە ل بەر من.

و کورێ وی مەخسەد پێ ئوسامەیە..

---

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

# ئوسامەیێ کورێ زەیدی

پشتی پتر ژ چار سالان ب سەر گازییا ئیسلامێ را بۆرین، و هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن خۆ یێن کێم د مالا ئەرقەمی ڤە دڤەشارتیبوون، ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و خەلکێ مالا وی د حالەکێ بەرتەنگ دا دژیان، خودێ وەسا حەزکر کەیفەک بۆ ڤێ مالێ چێ ببت، ئەو ژی بوونا زارۆکەکییە بۆ زەیدی، ئەوێ خەلکی دگۆتێ: زەیدێ کورێ موحەممەدی.. یەعنی: موحەممەدی نەڤیەک بوو، و موحەممەدی و خەدیجایێ ژی هەر وەسا بەرێ خۆ ددا وی زارۆکی یێ د مالا وان دا نوی پەیدابووی، وان ب دورستی ئەو حسێب دکر نەڤییێ خۆ یێ خۆشتڤی. نەخاسم ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینینە ڤە کو زارۆکێن وان یێن کورِ بۆ نەدمان.

ناڤێ (ئوسامە) ئەوێ د زمانێ عەرەبان دا ب مەعنایا (شێر) دئێت ئەو ناڤ بوو یێ بۆ مێڤانێ نوی هاتییە هلبژارتن: ئوسامەیێ کورێ زەیدێ کورێ موحەممەدی، و دگۆتنێ بابێ زەیدی.. و ئەوە یێ کو دێ مژارا گۆتنا مە یا ڤێ جارێ بت.

ئوسامە ب رەنگێ خۆ ڤە مرۆڤەکێ رەش بوو؛ ژ بەر کو وی دابوو ب دەیکا خۆ ڤە، ئەوا دگۆتنێ: (بەرەکە) و ئەو ژنەکا حەبەشی بوو، هەر چەندە بابێ وی زەید مرۆڤەکێ رەش نەبوو، دەمێ بابێ وی زەید ژ مەکەهێ بەر ب مەدینێ ڤە مشەختبووی ژییێ وی ل دۆرێن نەهـ سالییێ بوو،

مەعنا: ل قووناغا نەخۆشا مەکەهێ ئەو هێشتا زارۆک بوو، لەو وی زێدە نەخۆشی ژ دەستێ کافرێن مەکەهێ نەدیتبوو، و ژ بەر کو ئەو بچویکی مالێ بوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو نازدار دکر و گەلەک حەز ژێ دکر، حەتا ئەو د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((أحب النَّاسِ إِلَيَّ أُسَامَةُ، مَا حَاشَا فَاطِمَةَ وَلاَ غَيْرَهَا))[1] یەعنی: خۆشتڤیترین مرۆڤ ل نک من ئوسامەیە فاطما تێ نەبت و کەسێ دی نە.

ل مەدینێ ئوسامە فاما بوو، و بوو گەنجەکێ ژێهاتی و زیرەک، بەلێ ژ بەر کو ئەو هێشتا زارۆک بوو وی پشکداری د شەرێن دەسپێکێ دا نەکربوو وەکی بەدر و ئوحودێ، ل رۆژا ئوحودێ بەری شەر دەست پێ بکەت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لەشکەر تەفتێش کر دیت کۆمەکا زارۆکان یێن کێمتر ژ چاردەسالی د ناڤ دا بوون، وەکی: عەبدللاهێ کورێ عومەری و زەیدێ کورێ ثابتی و زەیدێ کورێ ئەرقەمی و ئەبوو سەعیدێ خودری، و ئوسامە ژی ئێک ژ وان بوو.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ لەشکەری ڤەدەرکرن، و گۆتە وان: پشکدارییێ د شەری دا نەکەن. ئارمانجا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بوو ئەو هێشتا زارۆکن و دەمێ شەر و کوشتن چێ دبت نە کو ئەو ژ مەیدانا شەری بڕەڤن ڤێجا شکەستنێ بێخنە ریزێن لەشکەری.

ئامادەبوونا ئوسامەیی و هەڤالێن وی یێن زارۆک ل مەیدانا شەری ب نیەتا پشکدارییا د جیهادێ دا نیشانا هندێیە کو جڤاکا موسلمانان جڤاکەکا ب بزاڤ و حەرەکە بوو و ئەو شیر و پێر دئامادەبوون بۆ خۆگۆریکرنا د رێکا خودێ دا.

---

(١) طەبەرانی ڤەدگوهێزت.

پشتی شەڕێ ئوحودێ ڕێ بۆ ئوسامەی هاتە ڤەکرن کو ئەو پشکدارییێ د جیهادێ دا بکەت؛ ژ بەر کو ئەو مەزنبوو و چاردەسالی دەرباسکر، ڤێجا وی پشکداری د وان شەڕ و غەزوەیان دا کر یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ ڕابووی، و د هندەک ڕیوایەتان دا هاتییە کو ئەو غەزوێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشکداری تێدا نەدکر وی شیرێ خۆ ددا عەلی یان ئوسامەی دا ئەو شەڕی پێ بکەن.

ژ سەرهاتییێن بەرچاڤ د ژیانا ئوسامەی دا ئەم دێ هندەکا ل ڤێرێ ب کورتی ڤەگێڕین:

پشتی صولحا حودەیبییێ ل سالا شەشێ مشەختی د ناڤبەرا موسلمان و کافران دا چێبووی، و بڕیار هاتییەدان دەهـ سالان ئەو شەڕی نەکەن، حەکیمێ کوڕێ حزامێ کوڕێ خویلدی (برازایێ خەدیجایێ ئەوێ زەید ژ بازارا عوکاظێ کڕی و ب دیاری دایە مەتا خۆ خەدیجایێ) و ئەو هنگی مرۆڤەکێ موشرک بوو و هێشتا موسلمان نەبووبوو، دیسا چوو بازارا عوکاظێ و ڤێ جارێ دیت کورکێ مەلکێ یەمەنێ (ذی یەزەنی) یێ دئێتە فرۆتن، وی ئەو ب پێنجی دەرهەمان کڕی، و ئەو هنگی پارەکێ مەزن بوو، و هندی هند وی حەز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر ئەو هاتە مەدینێ و ئەو کورک بۆ پێغەمبەری کرە دیاری، د ڕیوایەتەکێ دا هاتییە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەم چو دیارییان ژ موشرکان وەرناگرین[1]، پاشی گۆتێ: ئەگەر تو حەز بکەی ئەم دێ وی ب پارە ژ تە وەرگرین. و وەسا چێبوو، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ژێ کڕی و دانا

---

(١) ئەڤە چونکی حەکیم ژ مللەتەکێ شەڕکەر بوو بۆ موسلمانان، یێن کو د کتێبێن شریعەتی دا دبێژنێ: (محارب)، ئەگەر نە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیاری ژ موشرکێن نەموحارب وەردگرت، وەکی کو دیارییا موقەوقسی وەرگرتی.

سەر ملێن خۆ و ب سەر مینبەرێ کەفت بۆ خواندنا خوتبێ، صەحابی دبێژن: تشتەکێ وەسا تازە مە نەدیت.. پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کورک ب دیاری دا ئوسامەی. دەمێ حەکیمی ئەو کورک ل بەر ئوسامەی دیتی، گۆتێ: ئوسامە تو کورکێ (ذی یەزەنی) دکەیە بەر خۆ؟!

هەر وەکی دڤیا ئوسامەی ب وێ چەندێ کێم بکەت و ژێ عەجێبگرتی بیت کو چاوا عەبدەکێ ڕەشێ ئازاکری، و دەیک و بابێن وی ژی هەردو عەبدێن ئازاکری، کورکێ پاشایێ یەمەنێ بکەتە بەر خۆ!

ئوسامە، هەر چەندە ل وی دەمی هێشتا ل دۆرێن شازدە سالییێ بوو، ڤیا دەرسەکێ بدەتە حەکیمی و هەر کەسەکێ وەکی حەکیمی خەلکی ب تەرازییا جاهلییەتێ بکێشت، لەو گۆتێ: بەلێ.. ئەز ژ ذی یەزەنی چێترم، و بابێ من ژ بابێ وی چێترە، و دەیکا من ژ دەیکا وی چێترە..!

هوین دزانن بۆچی؟ چونکی ئوسامە و دەیک و بابێن وی موسلمانن و ذی یەزەن بلا پاشایێ وەلاتێ یەمەنێ ژی بت مرۆڤەکێ کافرە، و موسلمان ژ کافری چێترە؛ چونکی ئەو سەرێ خۆ بۆ مەزنییا خودێ دچەمینت و باوەرییێ ب دینێ وی دئینت.. ئەڤەیە ئەو عززەت و سەرفەرازییا ئیسلامێ د دلێ موسلمانی دا دچینت، کو ئەو شانازییێ ب ئیسلامێ ببەت و خۆ ژ کافری چێتر و بلندتر ببینت: ﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١٣٩ ﴾ (آل عمران: ١٣٩) گەلی خودان باوەران، هوین لاواز نەبن و ب خەم نەکەڤن، و یێن بلندتر هوینن ئەگەر هوین خودان باوەر بن.

ئەڤە ئەو سەرفەرازییە یا ئەڤرۆ (موعەسکەرێ کوفرێ) یێ ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاڤایی دڤێت ل نک مە نەهێلت، و کاری بۆ هندێ بکەت کو ئەم شەرمێ ژ ئیسلاما خۆ بکەین و بێژین: کافر ژ مە چێتر و بلندترن!

گاڤا حەکیمی گوهـ ل ڤێ ئاخفتنا ئوسامەی بووی، وی گۆت: ئەز زڤڕیمە مەکەهێ دا ڤێ گۆتنا ئوسامەی بۆ وان ڤەگێڕم حەتا ئەو ژی ژێ عەجێبگرتی ببن[1].

سەرهاتییا دی یا ژ لایەکی ڤە بهایێ بلندێ ئوسامەی بۆ مە ئاشکەرا دکەت و ژ لایەکێ دی ڤە دادی و عەدالەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرچاڤ دکەت ئەو بوو یا ل دەمێ فەتحا مەکەهێ ل سالا هەشتێ مشەختی چێبووی، دەمێ فاطمایا مەخزوومی (و مەخزوومی بابکەکێ ناڤدارێ قورەیشییانە) دزییەک کری، و مەسەلا وێ گەهشتییە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و دزی ل سەر ئیسباتبووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا کو دەستێ وێ بێتە بڕین.. ئەڤ بڕیارە ل سەر قورەیشییان ب گشتی و مەخزوومییان ب تایبەتی گەلەک یا گران بوو، چاوا دەستێ ژنەکا وان بێتە بڕین و خەلک هەمی پێ بحەسیێن؟

چ بکەن؟ چ نەکەن؟ هندەکان گۆتنە مرۆڤێن وێ ژنێ: ب تنێ ئوسامە بستە دکەت بێژتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو ئەو ڤێ ژنێ عەفوو کەت؛ چونکی پێغەمبەر گەلەک حەز ژ ئوسامەی دکەت، و ئەو دلێ وی ناهێلت. وان داخوازا خۆ گەهاندە ئوسامەی، و هنگی ئوسامە بەر ب هەڤدە سالییێ ڤە دچوو، گاڤا ئوسامەی داخوازا عەفوویێ بۆ ڤێ ژنێ کری، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هند عێجز بوو حەتا ڕەنگێ وی هاتییە گوهاڕتن، و گۆتە ئوسامەی: ((ئەرێ تو د حەددەکی ژ حەددێن خودێ دا مەهدەرێ دکەی؟)) پاشی ئەو ب سەر مینبەرێ کەفت و گۆت: ((إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ

---

(١) حاکم ڤەدگوهێزت.

وَايْمُ اللهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ ابْنَةَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)) هەما تشتێ یێن بەری هەوە برییە هیلاکێ ئەو بوو دەمێ مرۆڤەکێ مەزن و شەریف دزی دکر وان ئەو دهێلا، و دەمێ مرۆڤەکێ لاواز دزی کربا وان حەد ل سەر ب جه دئینا، ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر فاطمایا کچا موحەممەدی دزی کربا ئەز دا دەستێ وێ برم[1].

ئەی ئوسامە و ئەی ئوممەتا ئیسلامێ د پشت وی ڕا، هوین باش بزانن گاڤا وە ل هەوە هات قانوونا هەوە، عەدالەتا هەوە، شداندنا هەوە، حوکمەتینییا هەوە، ب تنێ ل سەر سەرێ فەقیر و ژاران ب جههات، و هەوە هەڤساری (حەفکستویران) بەردا دا ئەو ب کەیفا خۆ بکەڤن، هوین باش بزانن کو نێزیک هوین -وەکی ئوممەتێن بەری خۆ- دێ چنە هیلاکێ، و فایدێ هەوە ناکەت هوین بێژن: ئەم مرۆڤێن خودان باوەر و جامێرین.

سەرهاتییا دی یا ئوسامەی -بەری مە هەمییان- د ژیانا خۆ دا دەرسەکا مەزن بۆ خۆ ژێ وەرگرتی، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرییەکا لەشکەری هنارتییە دەڤەرا (جوهەینە) و ئوسامە د ناڤ وێ سەرییێ دا بوو، دەمێ شەڕ د ناڤبەرا هەردو لایان دا چێبووی، ئوسامەی دا ب دویڤ زەلامەکی ڤە، وی زەلامی گۆت: (لا إله إلا الله) د گەل هندێ ژی ئوسامەی ڕمەک تێ وەرکر و ئەو کوشت.. ئوسامە دبێژت: پشتی هنگی دودلی بۆ من ژ ڤی کارێ من چێبوو، گاڤا ئەم زڤڕینە مەدینێ، من سوحبەتا خۆ و وی زەلامی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر، وی گۆت: ((أَقَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَقَتَلْتَهُ؟)) ئەرێ وی گۆت: (لا إله إلا الله) و تە ئەو کوشت؟ گۆت: من گۆتێ: مانێ ژ ترسێن سیلاحی دا وی ئەو گۆت..

---

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ((أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لاَ ؟))[1] ئەرێ ما تە دلێ وی کەرکر دا بزانی کانێ وی ئەو گۆتن ژ دل گۆت یان نە؟ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ ئاخفتنا خۆ هند دوبارەکر حەتا ئوسامەی گۆتی: خوزی ئەڤرۆ ژ نوی ئەز موسلمان ببام! یەعنی: دا ئەڤ گونەهە ل سەر من نەهاتبا حسێبکرن.

کوشتنا مرۆڤەکێ بێژت: (لا إله إلى الله) ب هەر هێجەتەکا هەبت گونەهەکا هندە یا مەزنە ب دیتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و د وی شریعەتی دا یێ ئیسلام پێ هاتی حوکم ب سەرڤەیا مرۆڤی دئێتەدان، و تشتێ د دلان دا بەس خودێ پێ دزانت.

مە گۆت: ئوسامەی -بەری مە- دەرسەکا مەزن بۆ خۆ ژ ڤێ سەرهاتییێ وەرگرتبوو، ئەو ژی دەمێ فتنا مەزن د ناڤبەرا صەحابییان دا چێبووی پشتی شەهیدبوونا ئیمام عوثمانی، دەمێ ئەو بووینە دو دەستەک و وان کارێ شەڕی کری، د هندەک ریوایەتێن دورست دا هاتییە کو ئوسامە ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن خۆ ژ هەردو دەستەکا دایە پاش، و دەمێ ئیمام عەلی داخواز ژێ کری کو ئەو پشتەڤانییا وی بکەت و د گەل وی دەرکەڤت، ئوسامەی گۆتێ: ئەگەر تو دەستێ خۆ بکەیە د دەڤێ ئەژدەهایەکی دا ئەز دێ دەستێ خۆ د گەل تە کەمە د دەڤی دا، بەلێ کرنا شەڕێ مرۆڤەکێ بێژت: (لا إله إلا الله) نەء!! حەتا ئەز دگەهمە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی ژی ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن خۆ ژ فتنێ دایە پاش، و دەمێ زەلامەک چوویە نک دا وی قانع بکەت،

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

وی گۆتـه وی زەلامـی: ب خـودێ ئـەز شـەڕێ موسـلمانەکی ناکـەم، حـەتا خودانێ زکی شەڕی وی نەکەت! و مەخسـەدا وی ب خودانێ زکی ئوسامە بـوو، و دیـارە هنگـی ئوسـامە قەلـەو بووبـوو، زەلامـی گـۆتێ: مـا خـودێ نەگۆتییـە: شـەڕێ وان بکـەن دا نەبتـە فتنـە و دیـن هـەمی بـۆ خـودێ بـت؟ سەعدی گۆتێ: مە شـەڕکر حەتا نەبوویـە فتنـە، و تـە و هـەڤالێن خۆ دڤێت شەڕی بکەن دا ببتە فتنە!

د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ئوسامە ئێک ژ وان صـەحابییان بـوو یێن پشکداری د شەڕێ (موئتەیێ) دا کری، ئەو شەڕێ بابێ وی زەید تێدا شەهیدبووی، و ژییێ وی هنگی شازدە سال بوو.

سـەرهاتییا ئوسـامەی یـا ژ هـەمییێ بـەرچاڤتر ل سـەر زەمـانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بوو یا بـەری مرنـا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- ب دەمـەکێ کێم ڕویدای، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لـەشکەرەک ئامادەکری دا بهنێرتە شامێ بۆ شەڕێ رۆمێ.. و وی هژمارەکا صـەحابییێن مەزن دانە د گەل ڤی لەشکەری، وەکی ئەبووبـەکر و عومـەری بـۆ نموونـە، و وی ئوسامە کرە سەرلەشکەر، و هنگی ژییێ ئوسامەی هەژدە سال بـوو.. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- باوەری ب شیانا کسەکی هەبا، وی ئەو بۆ وی کاری هل دبژارت، بلا ژییـێ وی یـێ کـێم بـا ژی، هەر وەسا ئەڤ سەرهاتییە هندێ دگەهینت کو پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بن- دەلیڤەیەکا بەرچاڤ ددا گەنجان دا کو ئـەو شیان و بـەهرەیێن خۆ نیشـا خەلکی بدەن.

هندەک صەحابییان ئەڤ کارێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب کـارەکێ عـەجێب دیـت، چـاوا هنـدەکێن وەکـی ئەبووبـەکر و عومـەر و خالـدی ل بـن دەستێ جحێلەکێ وەکی ئوسامەی بن؟! هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ

نساخبوو ئەو نساخییا ئەو تێدا مری، د گەل هندێ ژی ئەو ب سەر مینبەرێ کەفت و گۆت: گەلی مرۆڤان، لەشکەرێ ئوسامەی بهنێرن، ئەگەر هوین ب چاڤەکێ کێم بەرێ خۆ بدەنە میراتییا وی بۆ ڤی لەشکەری بەری نوکە هەوە بەحسێ سەرلەشکەرییا بابێ وی ژی کربوو، و ئەو ب کێر میراتییێ دئێت کانێ چاوا بابێ وی ب کێر دهات، و پشتی بابێ وی ئەو خۆشتڤیترین مرۆڤە ل نک من..

بەری لەشکەرێ ئوسامەی دەرکەڤت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا خودایێ خۆ کر، و ئێکەمین کارێ ئەبووبەکری کری پشتی بۆ خیلافەتێ هاتییە هلبژارتن وی لەشکەرێ ئوسامەی هنارتە شامێ، ئەو لەشکەرێ چووی و بۆ جارا ئێکێ و دووماهییێ د دیرۆکا ئیسلامێ دا شەرکری و ب سەرکەفتی و زڤڕیەڤە بێی موسلمانەک بێتە کوشتن!

ل سەر زەمانێ خیلافەتی ئیمامێ عومەر، عومەری قەدرەکێ زێدە ددا ئوسامەی، حەتا وی راتبێ ئوسامەی کرە پێنج هزار، هەر چەندە وی هند راتب نەددا وان کەسێن ل رێز و (طەبەقەیا) وی، و عەدەتێ ئیمام عومەری بوو وی راتب ل دویڤ خزمەتا خودانی بۆ ئیسلامێ و زوی موسلمانبوونا وی دەسنیشان دکرن، حەتا کوڕێ وی عەبدللاهی جارەکێ گۆتێ: تە ئوسامە ب سەر من ئێخست، و ئەو جیهادا من کری وی نەکرییە.. یەعنی: خەما عەبدللاهێ کوڕێ عومەری ئەو بوو راتبێ وی ژ یێ ئوسامەی کێمتر بت، بەلێ خەما وی ئەو بوو ئەڤ چەندا هە دبتە نیشان کو جیهاد و خزمەتا وی بۆ دینی کێمترە! هنگی بابێ وی ئیمامێ عومەر گۆتێ: ((ئوسامە خۆشتڤیتر بوو ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ تە، و بابێ وی ژی ل نک پێغەمبەری خۆشتڤیتر بوو ژ بابێ تە..))

هەوە دیت مەزنییا عومەری د چ دا بوو؟

قیاسا وی بۆ کێشانا مرۆڤان ئەو بوو کانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند حەز ژ وی مرۆڤی دکر؟ و چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ هەمی کەسان پتر حەز ژ ئوسامەی و بابێ وی دکر، دڤێت قەدرێ وان ژ یێ هەر کەسەکێ دی پتر بت، خۆ ئەگەر ئەو ئێک کورێ خەلیفەی یان خەلیفە ب خۆ بت!

ل سەر زەمانێ خیلافەتا موعاویەی -خودێ ژێ رازی بت- ل دۆرێن سالا (٥٤)ێ مشەختێ ئوسامەی وەغەرا دووماهییێ ژ ڤێ دنیایێ کر، و هنگی ژییێ وی نێزیکی (٦٣) سالان بوو، و هندەک دبێژن: مرنا وی ل مەدینێ بوو.

# دەیکا ئەیمەنی و ئەیمەن

دو کەسێن دی بوون ژ وان یێن خودێ قەنجییا خزمەتکرنا پێغەمبەرێ خۆ ب رزقێ وان کری، و ما چ شەرەف و بلندی ژ وێ مەزنترە مرۆڤ خزمەتا وی بکەت یێ ملیاکەتێن خودێ د خزمەتا وی دا؟

دەیکا ئەیمەنی، ئەوا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو وەکی دەیکەکێ بۆ خۆ دهژمارت؛ چونکی وێ هەر ژ بچویکاتی ئەو ب خودان کربوو، ناڤێ وێ بەرەکەیا کچا ثەعلبەیێ حەبەشی بوو.. و وەکی ژ پاشناڤێ وێ دیار ئەو ژنەکا حەبەشی یا پیست ڕەش بوو، جارییەک بوو ل دویڤ تەرزێ وی زەمانی دهاتە کڕین و فرۆتن، و قەدەرا وێ ئەو بوو بەری بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب چەند سالەکان ئەو ژ لایێ عەبدللاهێ کوڕێ عەبدلموطەلبی ڤە هاتە کڕین؛ دا خزمەتا وی و ژنکا وی ئامینایا کچا وەهەبی بکەت، و دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتییە سەر دنیایێ ئەو کچا فامنا بوو، یا وەسا بوو کو بشێت چاڤێ خۆ بدەتە زارۆکان و وان ب خودان بکەت، لەو وێ د گەل ئامینایێ چاڤێ خۆ دا زارۆکێ وێ یێ پاشباب، و ئەو ب خودان دکر.

و چونکی بەرەکەیا حەبەشی جارییا عەبدللاهێ بابێ پێغەمبەری بوو، دەمێ بابێ وی مری ئەو ب میراتگری گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و کتێبێن سیرەتێ ڤەدگێڕن کو دەمێ دەیکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤیای بچتە باژێرێ یەثربێ (مەدینێ) دا سەرا قەبرێ زەلامێ خۆ عەبدللاهی بدەت ئەوێ ل وێرێ مری و هاتییە ڤشارتن، وێ کوڕێ خۆ یێ شەش سالی

د گەل دادۆکا وی یا حەبەشی د گەل خۆ برن.. و خودێ وەسا حەزکر ئامینا ژی ل وێ دەڤەرێ بمرت یا زەلامێ وێ لێ مری، و وێ زارۆکێ خۆ یێ ئێتیم و سێوی هێلا د دەستێ بەرەکەیا حەبەشی دا؛ دا ئەو وی بزڤرینتە مەکەهێ ل نک باپیرێ وی.

ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هێشتا زارۆک ل نک دەیکا خۆ پاشی باپیرێ خۆ پاشی مامێ خۆ ئەبوو طالبی، بەرەکەیا حەبەشی چاڤدێری لێ دکر و وەکی دەیکەکێ ئەو ب خودان دکر، و وەک زڤراندن بۆ قەنجییا وێ دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مەزنبووی وی ئەو ژ قەیدێن عەبدینییێ ئازاکر.

بەری هاتنا وەحییێ بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ ژییێ وێ ل دۆرێن سیهـ سالییێ وێ شوی ب زەلامەکێ حەبەشی کر ناڤێ وی عوبەید بوو، بەلێ پەیوەندییا وێ ب ڤێ چەندێ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەهاتە برین، و ئەو بەردەوام دهاتە مالا پێغەمبەری و خزمەتا وی دکر، ئەنجامێ زەواجا وێ ژ عوبەیدێ حەبەشی ئەو بوو وێ کورەک بوو ناڤێ وی کرە (ئەیمەن) و ژ وێ رۆژێ وەرە ناسناڤێ وێ بوو (دەیکا ئەیمەنی) حەتا وێ دەرەجێ نێزیک بوو خەلک ناڤێ وێ یێ دورست ژ بیر بکەت.

ل دەسپێکا هاتنا ئیسلامێ و مەعلوومە هنگی ژییێ وێ ژ چل سالییێ دەرباس بووبوو، زەلامێ وێ عوبەید مر، لەو وێ پشتی هنگی شوی ب زەیدێ کورێ حارثەیی کر، ئەوێ بەری نوکە مە ژیانا وی ڤەگێڕای، و ئەو بوو ژ بەرهەمێ ڤێ زەواجێ خودێ کورەکێ دی دایێ ئەو ژی ئوسامە بوو یێ ژیانا وی ژی بەری نوکە مە ڤەگێڕای.. و ئەندامێن ڤێ مالا بچویک هەمی ئەو بوون یێن نێزیک ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و پێغەمبەری گەلەک حەز ژێ دکر.. حەتا دبێژن: جارەکێ عەبدللاهێ کورێ

عومەری ل جهەکی یێ ڕوینشتیبوو مرۆڤەک هات نڤێژ کر و ژ لەزان دا رکووع و سجوودا خۆ ب تمامی نەکرن، پشتی خلاصبووی، عەبدللاهی گۆتێ: یا ژ تە ڤە تە نڤێژکر؟ بزڤڕە نڤێژەکا دی بکە تە نڤێژ نەکرییە. و پشتی ئەو چووی عەبدللاهی پسیار کر: ئەڤە کی بوو؟ هندەکا گۆتنێ: ئەڤە حەججاجێ کوڕێ ئەیمەنێ کوڕێ دەیکا ئەیمەنییە. عەبدللاهی گۆت: ئەگەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو دیتبا دا حەز ژێ کەت. یەعنی: ل نک وان تشتەکێ ئاشکەرابوو کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- حەز ژ ڤان مرۆڤان دکەت و هەر ئێکێ بگەهتە وان ژی!

د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو دەیکا ئەیمەنی ژ وان صەحابییان بوو یێن مشەختبووینە وەلاتێ حەبەشە، و ئەگەر ئەڤ ریوایەتە یا دورست ژی بت دیارە ئەو ژ وان بوو یێن زوی ڤەگەڕیاینە مەکەهێ؛ چونکی ئەو پشتی هنگی ژ وان بوو یێن مشەختبووینە مەدینێ.

ل مەدینێ بەرەکە و هەردو کوڕێن وێ ئەیمەن و ئوسامە و زەلامێ وێ زەید ژ وان کەسان بوون یێن بەردەوام د خزمەتا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- و پشتی دەیکا ئەیمەنی ئختیار و بێچارەبووی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەردەوام دچوو سەرا ددا، و چاڤێ خۆ ددایێ، و وی ژ مالێ خۆ ددایێ..

پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بازێڕێ مەکەهێ ژ دەستێن کافران ئینایەدەر ل سالا هەشتێ مشەختی، و قورەیشی هەمی هاتینە د ئیسلامێ دا، دو عەشیرەتێن عەرەبان یێن مەزن، کو هەوازن و ثەقیف بوون، و ئەو نێزیک ژ مەکەهێ دژیان، ژ خۆ ترسیان و گۆتن: پشتی موحەممەد ژ شەڕێ قورەیشییان خلاصبووی ئەو دێ دەست ب شەڕێ مە کەت، ڤێجا یا باش ئەوە بەری ئەو بێتە مە ئەم بچینە وی.. و پشتی زنجیرکا ڕویدانان

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب لەشکەرەکێ مەزن ڤە کو هژمارا وی نێزیکی دوازدە هزار کەسان بوو دەرکەفتە شەڕێ وان، و ل هەیڤا شەووالێ ژ سالا هەشتێ ئەو گەهشتنە وی جهی یێ دبێژنێ: (حونەین)، گاڤا موسلمانان ب تایبەتی ئەوێن ژ نوی پشتی ڤەکرنا مەکەهێ هاتینە د ئیسلامێ دا ئەڤ هژمارا خۆ یا مەزن دیتی گۆتن: د گەل ڤێ هژمارێ ئەم قەت نائێینە شکەستن. و ڕەنگەکێ ئیعجابێ بۆ وان چێبوو.

نەخشەیا کافران ئەو بوو مفایی ژ عەردنیگارییا وی جهی ببینن یێ شەڕ دێ لێ ئێتەکرن، کو نهالا حونەینێ بوو، ئەو ژی ب ڕێکا دانانا بویسەیان د ڕێکا موسلمانان دا، و دەمێ وان ئەڤ نەخشە ب جهئینای خافلەتی ب موسلمانان کەفت و وان ژ هەمی لایان ڤە هێرش برە سەر لەشکەرێ موسلمانان، و ژ ترسان دا پترییا لەشکەرێ موسلمانان پاشدا چوو، و گەلەک ژ وان ڕەڤین، هنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هژمارەکا کێم ژ صەحابییان مانە ل مەیدانا شەڕی، و ژ ئێک وان صەحابییێن کێم ئەیمەنێ کوڕێ دەیکا ئەیمەنی بوو.. ئەوێ د ڤی شەڕی دا شەهیدبووی.

پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕۆژەکێ ئەبووبەکری گۆتە عومەری و چەند هەڤالێن خۆ یێن دی: وەرن دا بچین سەرا ژنکەکێ بدەین هەر جار پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سەرا وێ ددا، و ئەبوو بەکری بەرێ وان دا مالا دەیکا ئەیمەنی، پیرەژنا حەبەشی یا ئختیار گاڤا دیتی ئەو ب ژۆر کەفتین و وەکی هەر جار پێغەمبەر د ناڤ وان دا نینە، وێ هند کرە گری حەتا گرییا مێڤانێن خۆ ژی ئینای، ئینا هندەک ژ وان گۆتێ: تو بۆچی دکەیە گری؟ ئەو جهێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویێ بۆ وی ژ ڤێرێ چێترە.. وێ گۆت: ئەز نە ژ بەر هندێ دکەمە گری، من دزانی کو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هەر دێ ڕۆژەکێ مرت، بەلێ ئەز یا بۆ وێ وەحیێ دکەمە

گری ئەوا ژ ناڤ مە هاتییە برین.. و ئەڤ گۆتنا وێ نیشانا تێگەهشتن و شارەزاییا وێ بوو، وێ دزانی کو ب مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەحی دێ ژ عەردی قەتعە بت، و نەمانا وەحیێ یەعنی نەمانا خێر و بەرەکەتێیە.

هندەک دیرکڤان دبێژن: پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب پێنج شەش هەیڤەکان دەیکا ئەیمەنی مربوو، و هندەک دبێژن: نەخێر، ئەو حەتا زەمانێ خیلافەتا ئیمام عوثمانی ژی یا ساخبوو، و دەمێ عومەر شەهیدبووی دیسا وێ کرە گری و گۆت: ئەڤرۆ ئیسلام سستبوو!

# ثەوبان کورێ بوحدودی

مرۆڤەکێ خەلکێ یەمەنێ بوو، پتر ژ تشتەکێ هەڤپشک د ناڤبەرا وی و زەیدێ کورێ حارثەیی دا هەبوو، ئەو ژی هێشتا یێ بچویک کەفتبوو دەستێ هندەک جەردەڤانێن بێ وژدان دا ژ وان یێن خەلکی تالان دکەن و بازرگانییێ ب مرۆڤان دکەن، ل وەلاتێ یەمەنێ ئەو ژ ناڤ مرۆڤێن وی هاتبوو رەڤاندن، و ل دەڤەرا حیجازێ وەک عەبد و کۆلە هاتە فرۆتن، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل مەدینێ ئەو کڕی و ئازاکر و گۆتێ: ئەگەر تو حەز بکەی بزڤڕە ناڤ مرۆڤێن خۆ ل یەمەنێ، و ئەگەر تو حەز بکەی بمینە ل نک مە و تو دێ ئێک بی ژ خەلکێ مالا مە.. وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هلبژارت و باوەری پێ ئینا، و گۆتێ: ئەز دێ ئێک ژ خزمەتکارێن تە بم.. و وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- نەدا ب مرۆڤێن خۆ، و جهێ ئەو لێ نە دا ب وەلاتێ خۆ، و خزمەتکرنا وی نەدا ب هەمی مال و مەنصبێن دنیایێ!

هندی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ژیانێ دا ئەو خزمەتکارەکێ گوهدار بوو بۆ وی، و ڤیانا وی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهشتبوو وێ دەرەجێ دەمێ رۆژەک ب سەر وی دا چووبا و وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا نەدیتبا ئەو نساخ دبوو، حەتا جارەکێ -وەکی ریوایەتەکا لاواز دا هاتی ژ لایێ سەنەدێ ڤە- دبێژن: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- رۆژەکێ چوو نک وی دیت رەنگێ وی -وەکی مرۆڤەکێ نساخ- یێ زەربووی، و ئەو یێ

لەغەربووی، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تـە خێـرە چ ل تە هاتییـە؟ وی گۆت: چو ل من نەهاتییە، و ئەز یێ نساخ ژی نینم، بەلێ ئـەز ژ تـە خەریبم بوو، و من هزرا خۆ د رۆژا قیامەتێ دا کر، و مـن زانـی کو تـو دێ د گەل پێغەمبەران بی، و خۆ ئەگەر ئـەز بێمـە بەحەشتێ ژی مەرتەبەیا مـن دێ یا نزمتر بت ژ یا تە و هنگی ئەز قەت تـە نـابینم.. هنگـی ئـەڤ ئایەتـە هاتە خوارێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ (النسـاء: ٦٩) یـەعـنـی: هـەچـییـێ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری بکەت، ئەو دێ د گەل وان بـن یێن خودێ بهایێ وان مـەزنکری، ژ پێغەمبـەر و ڕاستگۆ و شـەهید و چاکـان، و ئـەو چ بـاش هـەڤالن وان د بەحەشـتێ دا هـەین! ئـەو قەنجی و دانا هە ژ خودێیـە، و خودێ بەسـە کو ب حالێ بەنییێن خۆ یێ پڕزانا بت.

ثەوبانێ خزمەتکارێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ کو ڤێ جارێ دێ بەحسـێ وی کـەین، کـوڕێ بوحـدودی یـان جەحـدەری بـوو، دگـۆتنێ بـابێ عەبدللاهی، د بنیات دا ئەو خەلکێ جهەکی بوو ل لایێ یەمـەنێ دگۆتنێ: (سـەرات)، و هێڤێنـێ وی بـۆ حیمیـەرییان دزڤـڕت، ژ ئویجاخـەکێ بـوو دگۆتنێ: (ئیلهان).

وەکی مە گۆتی: ل دویڤ تـەرزێ جاهلییـەتێ ئـەو ژ نـاڤ مـرۆڤێن وی هاتە ڕەڤاندن و ل بازارێ وەک عەبد هاتـە فرۆتن، و ژ باشییا ئێغبـالا وی بەرێ وی بۆ مەدینێ هاتەدان؛ دا ئەو ل وێرێ بێتـە فـرۆتـن، پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ئەو کڕی و ئـازادکر، و هلبـژارتن دایێ کو ئەگەر وی بڤێت بزڤڕتـە وەلاتـێ خـۆ ل نـک مـرۆڤێن خـۆ، بـەلێ ژ بـەر کـو خـودێ ڤیانـا پێـغـەمـبـەرێ خـۆ هـاڤێتـە دلی، وی مانا ل مـەدینێ هلبژارت، و داخـواز

ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر ئەو وی وەک خولام و خزمەتکارەک بۆ خۆ قەبویل بکەت، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخوازا وی ب جهێنا و ب ڤێ چەندێ ئەو بوو ئێک ژ ئەندامێن مالا پێغەمبەری، و حەتا دووماهی رۆژ ژ ژیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو د گەل وی بوو.

پشتی خۆشتڤییێ وی ژ دنیایێ وەغەرکری، ئەو د گەل لەشکەرێ ئیسلامێ بۆ جیهادێ دەرکەفتە وەلاتێ شامێ و مصرێ، و وی پشکداری د ڤەکرنا گەلەک جهان دا کر، دەمەکی ئەو مابوو ل مصرێ، پاشی زڤری شامێ و دەمەکی ل باژێرێ رەملەیێ ل فلسطینێ ئاکنجیبوو، پاشی وی قەستا باژێرێ حمصێ ل سووریا نوکە کر، ل وێرێ وی خانییەک بۆ خۆ پەیداکر و حەتا مرنا خۆ ئەو مابوو ل وی جهی.

مرنا وی ل سەر زەمانێ خیلافەتا موعاویەی بوو ل سالا (٥٤) مشەختی، پشتی وەغەرکرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ژ بلی کرنا جیهادێ، ثەوبانی خزمەتەکا دی یا مەزنتر بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و موسلمانان کر ئەو ژی ڤەگوهاستن و ریوایەتکرنا گۆتن و سەرهاتییێن پێغەمبەری بوو، ئەوا ئەم دبێژینێ: (سوننەت)، ثەوبان ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن پشکەکا گرنگ ژ سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و حەدیسێن وی بۆ مە ڤەگێراین، و ژ بەر نێزیکییا وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مانا وی یا بەردەوام د گەل وی ئەو شیا هندەک تشتان ببینت و گوهـ لێ ببت، یێن گەلەک صەحابییێن دی نەدیتین و گوهـ لێ نەبووین.

ل ڤێرێ مە دڤێت هندەک ژ وان حەدیسان ڤەگێرین یێن ثەوبانی بۆ مە ریوایەتکرن: مەعدانێ یەعموری دبێژت: جارەکێ من ثەوبانێ مەولایێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیت، من گۆتێ: کارەکێ بۆ من بێژە، ئەگەر

ئەز زی کاری بکەم خودێ من پێ ببەتە بەحەشتێ، یان: بۆ من بێژە کانێ خودێ پتر حەز ژ کیژ کاری دکەت، گۆت: وی خۆ بێ دەنگ کر، من جارەکا دی پسیار ژێ کر، وی خۆ بێ دەنگ کر، جارا سێیێ وی گۆتە من: من پسیارا ڤی کاری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی گۆتە من: ((عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لله، فَإِنَّكَ لاَ تَسْجُدُ لله سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً))[1] یەعنی: گەلەک سەجدان بۆ خۆ ببە، چونکی تو سەجدەیەکێ بۆ خودێ نابەی ئەگەر ئەو دەرەجەیەکێ تە پێ بلند نەکەت، و گونەهەکێ بۆ تە پێ ژێ نەبەت.

ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە وەرگرتن کو هەچییێ گەلەک نڤێژان بکەت، یێن فەرض و سوننەت خودێ گونەهێن وی دێ ژێ بەت و دەرەجەیێن وی د بەحەشتێ دا بلند کەت.

جارەکا دی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ناڤ هندەک هەڤالێن خۆ دا بوو، وی گۆت: ((مَنْ تكفَّلَ لي أن لا يَسْألَ الناسَ شيئاً وأتكفَّلَ لـه بالجنـة))[2] یەعنی: کی دێ کەفالەتێ دەتە من کو ئەو داخوازا تشتەکی ژ خەلکی نەکەت، ئەز دێ کەفالەتێ ب بەحەشتێ دەمە وی؟ ثەوبانی گۆت: ئەز ئەی پێغەمبەرێ خودێ.. ژ بەر هندێ -دبێژن- پشتی هنگی ئەگەر ثەوبان ل سەر دەوارا خۆ با و قامچییا وی ژ دەستان کەفتبا، وی نە دگۆتە کەسێ: وێ بدەمە ڤ من، بەلکی ئەو دهاتە خوارێ و قامچییا خۆ هەل دگرت، و جارەکا دی ل دەوارا خۆ سویار دبوو.

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

(٢) ئەبوو داوود ڤەدگوهێزت.

ثەوبان دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ الله، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ الله))[1] یەعنی: چێترین دینار ئەوە یا زەلام ل سەر عەیالێ خۆ خەرج دکەت، و ئەو دینار یا زەلام ل دەوارا خۆ خەرج دکەت د رێکا خودێ دا، و ئەو دینار یا ئەو ل سەر هەڤالێن خۆ د رێکا خودێ دا خەرج دکەت.

ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە وەرگرتن کو د تەرازییا خودێ دا ئەو دینارا مرۆڤ ل سەر مالا خۆ و عەیالێ خۆ و هەوجەییێن وان خەرج دکەت چێتر و گرانترە ژ وێ دیارێ یا مرۆڤ خۆ ل سەر جیهادێ ژی خەرج دکەت، و دبت هندەک کەس هەبن هزر بکەن هەما خێر ئەوە یا ئەو ددەتە ئێکی ژ دەرڤەی مالا وی، و ئەو ب خۆ ئەو مالێ مرۆڤ ل سەر عەیالێ خۆ و مالا خۆ خەرج دکەت، دەمێ ئەو دبێتڤی، ئەو ل نک خودێ ژ هەمی خێرێن دی مەزنترە.

و ئەگەر ئەم ل کتێبێن سوننەتێ بزڤڕین دێ بینین ثەوبانی گەلەک حەدیس یێن بۆ مە ڤەگێڕاین کو علم و فایدەیەکێ مەزن ژێ دئێتە وەرگرتن، خودێ خێرا وی مەزن بکەت.

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

# ئەنەسێ كوڕێ مالكی

دەمێ وی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ جارا ئێكێ دیتی ژییێ وی دەهـ سال بوون، و دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ دنیایێ وەغەركری ژییێ وی بیست سال بوون، لەوا ئەو ژ صەحابییێن بچویك دئێتە هژمارتن، یێن بچویك ب عەمری ڤە، نە ب قەدر و قیمەتی ڤە؛ چونكی ئەو قەدر و قیمەتێ وی ب دەست خۆ ڤە ئینای كێم ژ صەحابییێن مەزن ب دەست خۆ ڤە ئینابوو، ب ئتتیفاقا زانا و دیرۆكنڤیسان ئەو ئێك ژ ئیمام و پێشەوایێن صەحابییانە، موفتییێ ئیسلامێیە، زانایێ قورئان و راوییێ حەدیسانە، گەلەك علم وی ژ صەحابییێن ژ خۆ مەزنتر یێ بۆ مە ڤەگێڕای، و ئەو دئێتە هژمارتن ژ وان صەحابییان یێن زێدە حەدیس ریوایەتكرین وەكی ئەبوو هورەیرە و ئبن عومەر و ئبن عەبباس و عائیشایێ، حەدیسێن وی -وەكی ئیمامێ ذەهەبی دبێژت- (١٢٠٨٦) حەدیسن.. ئەو دووماهی صەحابی بوو مری، مرنا وی ل سالا (٩٣) مشەختی بوو، و دەمێ ئەو مری ژییێ وی (١٠٣) سال بوو، و ئەڤە ژ بەرەكەتا وێ دوعایێ بوو یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل رۆژا ئێكێ یا ئەو تێدا دیتی بۆ كری، ئەو دبێژت: دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مشەختبوویە مەدینێ، و ژییێ من هنگی دەهـ سال بوو، دەیكا من دەستێ من گرت و ئەز ئینامە نك، و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! هەر مرۆڤەكێ ئەنصاری تشتەك دا تە، و من تشتەك نینە ئەز بدەمە تە، تشتێ من هەی ئەڤ كوڕێ منە، من ئەو

یـێ ئینـای دا خزمـەتا تـە بکـەت، ڤێجـا تـو وی ژ مـن قـەبویل بکـە و دوعایەکێ بۆ بکە.. گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعایەک بۆ من کر و گۆت: ((یا رەبی تو مالێ وی و عەیالێ وی زێدە کە و عـەمرێ وی درێژ کە))، ئەو بەحسێ تەئیسرا ڤێ دوعایێ دکەت و دبێژت: رەزێ من یێ تـری سالێ دو جاران بەر ژ خۆ ددا، و حەتا نوکە (١٢٩) کـەس ژ دووندەها مـن بێن یێن مرین.. و ب نسبەت عەمرێ وی ژی دەمێ ئەو مری چو صـەحابی د زێندی نەبوون.

ئەنەسـێ کـوڕێ مـالکێ کـوڕێ نەضـرێ خـەزرەجی یـێ ئەنصـاری، بـابێ حەمزەی، دبێژت: دەهـ سالان مـن خولامینییا پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- کـر، جارەکـا ب تنـێ وی ئـەز نـەقوتام، و گۆتنـەکا کرێـت نەگۆتـە مـن، و ناڤچاڤێن خۆ ل من نەکرنە گرێ!

دا بـەرێ خـۆ بـدەینـێ کانێ سەرهاتییا ئەنەسی د گەل ڤـێ ژیـانێ یـا ب چ رەنگ بوو؟!



ئەنەس وەکی -مە گۆتی- مرۆڤـەکێ خـەلکێ مـەدینێ بـوو، ژ ئویجاخا خەزرەجییان بوو، بابێ وی مالکێ کوڕێ نەضری ژ بابکێ نەجارییان بوو، و نەجاری مالخالانێن عەبدلموطـطـەلبێ باپیرێ پێغەمبـەری بـوون، بـابێ وی مالـک ل بـابێ خۆ یـێ شەشـێ عـامرێ کـوڕێ غـەنمی دگەهتـە سـەلمایا دەیکا عەبدلموطـطـەلبی، عەبدلموطـطـەلبی زارۆکینییـا خـۆ د نـاڤ خـالێن خۆ دا بۆراندبوو، بابێ پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- دەمێ چوویە مەدینێ و نساخبووی مابوو د ناڤ وان دا حەتا مری.

دەمێ پێغـەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- گەهشـتییە مـەدینێ، هـەر بابکـەکێ ئەوس و خـەزەرجییان داخـواز ژێ کـر ئـەو مـالا خـۆ بدانتـە تـاخێ وان، و دا

دلێ كس ژ وان نەمینت وی گۆتە وان: بەراهییا حێشترا من بەردەن، ئەو ل کیڤە بنیخییت ئەز دێ مینمە ل وی جهی.. و خودێ وەسا حەزکر حێشترا وی ل تاخێ نەججارییان نیخیا ل وی جهێ نوکە مزگەفتا وی یا پیرۆز دکەفتێ.

کەیفەکا مەزن بۆ نەججارییان چێبوو، و هەر ئێک ژ لایێ خۆ ڤە هات دا خزمەتەکێ پێشکێشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، هنگی رومەیصائا کچا ملحانێ نەججاری ئەوا دگۆتنێ: (دەیکا سولەیمی)[1] تشتەک د مالا خۆ دا نەدیت بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەتە دیاری، ئینا وێ دەستێ ئێتیمێ خۆ یێ دەهـ سالی گرت، و ئینا نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ژ بلی ڤی کورێ من ئەنەسی من تشتەک نینە، ئەو ژی بلا دیارییا من بت بۆ تە، بلا ئەو خزمەتا تە بکەت.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەڤیا دلێ وێ بهێلت، لەو وی ئەو دیاری ژێ قەبویلکر، و ب ڤی ڕەنگی ئەنەسێ کورێ مالکی ژ دەهـ سالییا خۆ و ل ڕۆژێن ئێکێ یێن هاتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ مەدینێ، کەفتە د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و حەتا دووماهی ڕۆژا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ما د خزمەتا وی دا.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- چوویە شەڕێ بەدرێ ئەنەس ژی د گەل دەرکەفتبوو، و ژییێ وی هنگی دوازدە سال بوو، ئەو دەرکەفتبوو دا خزمەتا پێغەمبەری بکەت، نە کو شەڕی، لەو وی پشکداری د شەڕی دا نەکربوو و دیرۆکڤان وی ئێک ژ خەلکێ بەدرێ ناهژمێرن.

---

(١) ئیمامێ بوخاری حەدیسەکێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت تێدا هاتییە: (دخلت الجنة فإذا أنا بالرميصاء، امرأه أبي طلحة) یەعنی: ئەز چوومە بەحەشتێ من رومەیصائا ژنکا ئەبوو طەلحەیی ل وێرێ دیت.

د وان هەمی شەڕ و غەزاییێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ ڕابووی ئەنەس یێ ئامادەبوو، و ژ هندەک حەدیسێن وی ریواتیەکرن دئێتە وەرگرتن کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک تشتێن خۆ یێن تایبەت بۆ وی ب تنێ دگۆتن.. ئەنەس دبێژت: من یاری د گەل زارۆکان دکرن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە نک مە، سلاڤ کر و دەستێ من گرت و ئەز ب کارەکێ خۆ هنارتم، و ئەو ل بەر سیبەرا بیستانەکی یان دیوارەکی ڕوینشت و خۆ گرت حەتا ئەز زڤڕیمە نک وی، و من ئەو پەیام گەهاند یا وی ئەز پێ هنارتیم، گاڤا ئەز زڤڕیمە نک دەیکا خۆ، وێ گۆتە من: بۆچی تو گیرۆبووی؟ من گۆتێ: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەز ب کارەکێ خۆ هنارتبووم، وێ گۆت: ئەو چ کار بوو؟ من گۆتێ: تشتەکێ نهێنی بوو. وێ گۆت: نهێنییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەشێرە. گۆت: ڤێجا من ئەو نهێنی پشتی هنگی نەگۆتییە کەسێ.

بەلێ ئەگەر ئەو تشتێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تایبەت بۆ وی گۆتین هندەک ئەحکامێن دینی و فقهی تێدا هەبن، یێن مفایێ وان بگەهتە موسلمانان هەمییان، وی پشتی هنگی ئەو دگۆتن، دا نەکەفتە د بن گونەها ڤەشارتنا علمی دا.

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەسا سەرەدەری د گەل ئەنەسی دکر دا بێژی ئەو کوڕێ وییە، و گەلەک جاران دەمێ گاڤی دکرێ دگۆتێ: کوڕێ من.. و ژ بەر وێ ڤیانا مەزن یا ئەنەسی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەی گرێدانەکا مەزن د ناڤبەرا وان دا هەبوو، حەتا وێ دەرەجێ پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب چەند سالان ئەنەسی دگۆت: شەڤەک ناچت ئەگەر ئەز خۆشتڤییێ خۆ تێدا نەبینم، و دکرە گری! یەعنی: هەر شەڤ وی ئەو د خەونا خۆ دا ددیت.

پسیار ژ مووسایێ کورێ ئەنسی هاتەکرن: بابێ تە پشکداری د چەند شەڕان دا کرییە د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-؟ وی گۆت: د هەشتان دا.

ئەنەس ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن گەلەک و گەلەک ل دویڤ سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دچوو و گۆتنێن وی کۆم دکرن، و هندی ژێ هاتبا چاڤ ل وی دکر، لەو ئەبوو هورەیرە د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: من نەدیتییە نڤێژا ئێکی هندی نڤێژا ئەنسی وەکی یا پێغەمبەری بت -سلاڤ لێ بن-. و دەمێ وی ددیت موخالەفا سوننەتێ یا دئێتەکرن ئەو گەلەک دئێشا و ب خەم دکەفت، دەمێ ئەو ل دیمەشقێ ل سەر زەمانێ خەلیفێن ئومەوییان یێن پاشییێ، وی دیت خەلیفە و حاشییا وی نڤێژتن خۆ گیرۆ دکەن، ئیمامێ زوهری دبێژت: جارەکێ ئەز چوومە مزگەفتا دیمەشقێ من دیت ئەنەس یێ ل وێرێ و یێ دکەتە گری، من گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: تشتێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی مایە د ناڤ هەمە دا بەس نڤێژە، و ئەو ژی هەوە هۆ لێ کر یا هەوە لێ کری. و جارەکێ وی گۆتە خەلکێ دیوانا خۆ: ئەز دبینم هوین هندەک کاران دکەن ئەو د چاڤێن هەوە دا ژ موی زراڤترن، ل سەر زەمانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مە ئەو ددیتن ژ وان کاران یێن مرۆڤی تێ دبەن!

ژ بەر ئیخلاص و دلسۆزییا وی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خودێ قەدر و کرامەتەکا زێدە دابوویێ، جارەکێ ل هاڤینێ ناطۆرڤانەکێ وی هاتە نک و گۆتێ: بابێ حەمزەی، عەردێ مە هشکبوو ئاڤ نینە ئەم بیستانی پێ ئاڤدەین، هنگی ئەنەس ڕابوو دەستنڤێژا خۆ گرت و دەرکەفتە چۆلی و دو رکاعەتێن نڤێژێ کرن و دوعاکرن، د گاڤێ دا عەوران خۆ لێکدا و باران هات حەتا بیستان باش ئاڤدای، هندەک ژ مرۆڤێن وی دبێژن: پشتی باران

ڕاوەستای ئەم چووین مە بەرێ خۆ دایێ کانێ حەتا کیڤە باران هاتییە، مە دیت هەما پیچەکێ ژ عەردێ ئەنەسی وێڤەتر هات بوو!



ل سەر زەمانێ ئەبووبەکری وی پشکداری د وان شەڕان دا کر یێن دبێژنێ: (حروب الردة) دژی وان کەسان یێن کافربووین، و وی پشکداری د شەڕێ یەمامێ ژی دا کربوو دژی موسەیلەمەیێ درەوین. و ئەبووبەکری ئەو هنارتبوو یەمەنێ دا داخوازێ ژ خەلکی بکەت کو ئەو د هەوارا لەشکەرێ ئیسلامێ دەرکەڤن.. و ژ بەر ئەمانەتا وی، و چونکی ئەو مرۆڤەک بوو خواندن و نڤیسین دزانی ئەبووبەکری ئەو هنارتبوو بەحرەینێ دا ئەو خێرێن وان کۆم بکەت، و دەمێ ئەبووبەکر مری ئەنەس ل بەحرەینێ بوو.

ل سەر زەمانێ عومەری، دەمێ لەشکەرێ ئیسلامێ قەستا عیراقێ کری، ئەو ژی د گەل دەرکەفت، و ئەو ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پشکداری د شەڕێ قادسییێ دا کری، ئەنەس دبێژت: ڕۆژا قادسییێ من دیت ئالایەکێ ڕەش د دەستێ (ئبن ئوم مەکتوومی) دا بوو. ناڤێ ئبن ئوم مەکتوومی عەبدللاهـ بوو، و ئەو مرۆڤەکێ کۆرە بوو پشکداری د جیهادێ دا کر و گۆتە مەزنێ موسلمانان: ئالای بکە د دەستێ من دا، ئەز مرۆڤەکێ کۆرەمە وان نابینم، ژێ برەڤم!

پشتی باژێرێ بەصرا هاتییە ئاڤاکرن ل سەر زەمانێ عومەری، عومەری ئەبوو مووسایێ ئەشعەری هنارتە وێرێ دا دینی نیشا خەلکێ وێ بدەت، و گۆتێ: ئەز دێ تە هنێرمە عەردەکی شەیطانی هێکێن خۆ یێن لێ دانایین و مەرقاندین ژی، ڤێجا تو وێ بۆ خەلکی بێژە یا تو دزانی و ژێ پشتڕاست، و خۆ نەگوهۆڕە دا خودێ دی تە نەگوهۆڕت.. هنگی وی گۆتە عومەری: ئەی ئەمیرولموئمنین، هندەک صەحابییان د گەل من بهنێرە؛ دا

ئەو هاریکارییا من بکەن. عومەری بیست و نەهـ صەحابی دانە د گەل وی ئێک ژ وان ئەنەسێ کورێ مالکی بوو. ئەنەس هاتە بەصرا و لێ ئاکنجیبوو و کارێ خۆ کرە نیشادانا قورئانێ و تەفسیرێ و فقهی بۆ خەلکی، و ئەگەر ئەنەس ئێک ژ زانایێن صەحابییان یێن مەزن نەبا عومەری ئەو د گەل ئەبوو مووسایی نەدهنارتە وی جهێ ب زەحمەت.

دەمێ فتنە د ناڤ ئوممەتێ دا پەیدابووی ئەنەس ژ وان صەحابییان بوو یێن خۆ دایە د گەل ئیمام عەلی و پشتەڤانییا وی کری، هەر وەسا ئەو ژ وان بوو یێن پشتەڤانییا عەبدللاهێ کورێ زوبەیری ژی کری دژی عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی، و بووبوو والییێ کورێ زوبەیری ل بەصرا، و دەمێ دەسهەلات بۆ عەبدلمەلکی ب تنێ مای و وی حەججاج کرییە مەزنێ عیراقێ، خەلکێ عیراقێ ب سەرکێشییا عەبدررەحمانێ کورێ ئەعەشی ب شۆرەشەکێ ڕابوون دژی ئومەوییان ب تایبەتی والییێ وان حەججاجی، ئەنەسێ کورێ مالکی پشتەڤانییا ڤێ شورەشێ کر، ب دەڤی نە کو ب دەستی؛ چونکی ئەو هنگی گەلەک یێ پیربوو. ژ بەر ڤان هەلویستێن وی حەججاجی زێدەگاڤی ل سەر وی کر، وەکی کو زێدەگاڤی ل سەر هژمارەکا صەحابییێن دی ژی کری و هندەک ژ وان کوشتین ژی!

هنگی ئەنەسی کاغەزەک بۆ عەبدلمەلکی هنارتە شامێ، تێدا گازندە ژ حەججاجی کرن، و گۆتە خەلیفەی: ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر جوهی و فەلەیان ئێک ژ وان مرۆڤان دیتبان یێن خزمەتا پێغەمبەرێن وان کرین، ئەو دا قەدرێ وی گرن، و من دەهـ سالان خزمەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر و هوین ب ڤی ڕەنگی سەرەدەرییێ د گەل من دکەن! عەبدلمەلکی کاغەزەک بۆ حەججاجی هنارت و تێدا نڤیسی: گاڤا کاغەزا من گەهشتە تە، بچی دەست و پییێن بابێ حەمزەیی ماچی بکەی، و وی رازی کەی،

ئەگەر ئەز دزانم دێ چ ب سەرێ تە ئینم. هنگی حەججاجی ب یا وی کر و ئەنەس رازیکر.

زانایێن دیرۆکی هەمی ل وێ باورێنە کو ئەنەس سالا دەهێ بەری مشەختبوونێ هاتبوو سەر دنیایێ، بەلێ ئەو د سالا مرنا وی دا ب خیلاف چووینە، و پتریا وان دبێژن: مرنا وی ل سالا (٩٣) بوو، مەعنا ژییێ وی دەمێ مری (١٠٣) سال بوو، و ئەو دووماهی صەحابی بوو مری.

گاڤا ئەو کەفتییە بەر نساخییا مرنێ، هندەکان گۆتێ: دختۆری بۆ تە نەئینین؟ وی گۆت: دختۆری ئەز یێ نساخ کریم.. پاشی وی گۆت: ل نک من بێژن: (لا إله إلا الله)، و وی ئەو د دویڤ وان دا گۆت، حەتا مری.

دەمێ ئەو مری موئەررقێ عجلی -و ئەو ئێک ژ زانایێن تابعییان بوو- گۆت: ئەڤرۆ نیڤا علمی چوو.. گۆتنێ: چاوا؟ وی گۆت: دەمێ زەلامەکێ موبتەدع ژ ئەهلێ دلچوونان هەڤرکی سەرا حەدیسەکێ د گەل مە دکر، مە دگۆتێ: وەرە دا بچینە نک وی یێ ئەو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بهیستی!

# عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی

خزمەتکارێ قورئانێ، و خزمەتکارێ پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن-، ژ بەر نێزیکییا وی یا زێدە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ ئەو نەنیاسیبا دا هزر کەت ئەو ئێک ژ ئەندامێن مالا پێغەمبەرییە، ئەبوو مووسایێ ئەشعەری دبێژت: دەمێ ئەز و برایێ خۆ ژ یەمەنێ هاتین، هەیامەکا درێژ مە هزر دکر ئەو ئێک ژ خەلکێ مالا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- هندی مە ددیت ئەو دەیکا وی دچوونە د مالا پێغەمبەری ڤە.

ڕۆژەکێ ئەو ب سەر دارەکێ کەڤت هەڤالێن وی پێیێن وی دیتن، و هندی ئەو دزراڤ و زەعیف بوون، وان پێ کرنە کەنی، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ((هوین ب چ دکەنە کەنی؟ پێیێن عەبدللاهی ڕۆژا قیامەتێ د تەرازییێ دا ژ چیایێ ئوحودێ گرانترن))[1].

عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی، ژ لایێ بابێ ڤە ئەو ژ ئویجاخا (هوذەلییان) بوو، و خەلکێ مەکەهێ نەبوو، باپیرێ وی غافلێ کوڕێ حەبیبی ئێکەمین کەس بوو ژ مالباتا وان هاتییە مەکەهێ و لێ ئاکنجیبووی و بوویە ئێک ژ حەلیفێن بابکێ زوهرییێن قورەیشی، دەیکا عەبدللاهی ئەوا دگۆتنێ (أم عبد) ئەو ژی ژ ئویجاخا هوذەلییان بوو.

ژ لایێ کەلەخی ڤە عەبدللاه مرۆڤەکێ هویر بوو، و یێ زەعیف ژی بوو، دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتی ئەو هێشتا یێ جحێل بوو، ژییێ وی ل دۆرێن پازدە سالییێ بوو، و کارێ وی هنگی

---

(١) ئەحمەد ڤەدگوهێزت.

شڤانی بوو، ئەو شڤانێ عوقبەییێ کورێ ئەبوو موعەیطێ قوریشی بوو، ئەگەرا موسلمانبوونا وی -وەکی د هندەک ریوایەتان دا ژ وی ب خۆ هاتییە ڤەگوهاستن- ئەو بوو جارەکێ ئەو ژ دەرڤەی مەکەهێ ل بەر پەزی بوو، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و ئەبووبەکر د بەر وی ڕا دەرباسبوون، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خورتۆ! تە هندەک شیر هەیە؟ وی گۆتێ: بەلێ، بەس ئەڤ پەزە ئێمانەتە ل نک من و ئەو نە یێ منە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: کانێ بزنەکا بێ شیر بینە.. گۆت: من ئێک برە نک وی، وی دەستێ خۆ ب گوهانان دا ئینا خوارێ و تشتەک پێڤە خواند و دۆت، من دیت شیر ژێ هات حەتا ئامان تژیبووی! وی و ئەبووبەکری شیر ڤەخوار و چوون.. گاڤا عەبدللاهی ئەڤ چەندە ژ وی دیتی، حێبەتی ما، ئەڤە چییە ل بەر چاڤێن من چێبووی؟!

عەبدللاهی ژ هندەک مرۆڤان بهیستبوو کو موحەممەد یێ دبێژت: ئەز پێغەمبەرم.. و ئەو گۆتنەکێ دخوینت دبێژت: ئەڤە گۆتنا خودێیە بۆ من ژ عەسمانی دئێتە خوارێ؟ ئەرێ تو بێژی ئەڤ گۆتنا وی ب گوهانێن بزنێ ڤە خواندی ئەو گۆتن بت یا ئەو دبێژت: ئەڤە گۆتنا خودێیە؟ پشتی عەبدللاهی ئەڤ موعجیزەیا پێغەمبەری ب چاڤێن خۆ دیتی وی گەلەک خۆ نەگرت، هەر زوی وی قەستا پێغەمبەری کر دا ل سەر دەستێ وی موسلمان ببت، و هنگی هێشتا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و خودان باوەرێن د گەل دا نەچووبوونە د مالا ئەرقەمی ڤە، هندەک نڤیسەرێن سیرەتێ دبێژن: ب تنێ بیست و دو کەس بەری عەبدللاهی موسلمان بووبوون.

عەبدللاهـ جحێلەکێ فەقیر بوو، مالباتا وی ژ وی و دەیکا ب تنێ پێک دهات، پشتی موسلمانبوونا وی و دەیکا وی ژی ئەو نێزیکی پێغەمبەری و مالا وی بوون، و وان خزمەتا وی دکر..

رۆژەکێ دەمێ هێشتا گازییا ئیسلامێ ل دەسپێکا ژییێ خۆ، و بەلکی هێشتا ئەو ل قووناغا مالا ئەرقەمی بت، صەحبییان دان و ستاندن د ناڤبەرا خۆ دا کر، ئێک ژ وان گۆت: هێشتا قورەیشییان گوهـ لێ نەبوویە مرۆڤەک قورئانێ ب دەنگەکێ بلند د ناڤ وان دا بخوینت، ئەرێ ئێک ژ هەوە هەیە بچت وێ ئاشکەرا د ناڤ وان دا بخوینت؟

عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی گۆت: ئەز دێ ب ڤی کاری رابم، وان گۆتێ: ئەم دترسین ئەو تشتەکی ل تە بکەن، ڤی کاری زەلامەکێ خودان عەشیرەت پێ دڤێت؛ دا عەشیرەتا وی بەرەڤانییێ ژێ بکەن، ئەگەر مەسەلێ ئەڤ چەندە خواست.. و ئاشکەرایە کو هنگی (تەعەصصوبا عەشیری) د ناڤ قورەیشییان دا یا گەرم بوو، و چو ئویجاخ و بابکان قەبویل نەدکر کەسەکێ بیانی تەعدایییێ ل ئێک ژ وان بکەت ئەگەر کو مرۆڤێ وان موسلمان ژی بت، و عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی قورەیشی نەبوو، بەلکی هوذەیلی بوو، و کەس ژ عەشیرەتا وی ل مەکەهێ نەبوون بەرەڤانییێ ژێ بکەن، لەو صەحابییان گۆتێ: تو ب کێر ڤی کاری نائێی و نەکو ئەو تە بێشینن. وی ئیصرار ل سەر گۆتنا خۆ کر، و گۆتە هەڤالێن خۆ: من بهێلن خودێ دێ هاریکارییا من کەت. پاشی عەبدللاهـ چوو حەرەمێ و ل نک مەقامی راوەستیا، و هنگی تێشتەگەهـ بوو، زەلامێن قورەیشییان هەمی ل (دار الندوة) درووینشتیبوون، عەبدللاهی ب دەنگەکێ بلند دەست ب خواندنا سوورەتا (الرحمن) کر، مەزنێن قورەیشییان مان.. ئێکی بەرێ خۆ دا یێ دی، پاشی گۆتنە ئێک و دو: ئەرێ ئەڤە کورێ (ئوم عەبد)ێ چ دبێژت؟ هندەکان گۆت: ئەو یێ وێ ئاخفتنێ دبێژت یا موحەممەد پێ هاتی.. هنگی ئەو رابوونە سەر خۆ ب نک وی ڤە چوون و ب سەر و چاڤێن وی دادان، و وی هەر قورئان خواند، حەتا وان سەر و چاڤێن وی

ڕەش و شین کرین، و وی سوورەت تمامکری! پاشی ئەو زڤری نک هەڤالێن خۆ، وان گۆتێ: ئەڤا ئەم ژ ڤێ دترسیاین ل سەر تە.. وی گۆت: بۆ خۆ نەکەنە خەم! ب خودێ ڤێ گاڤێ ژی ئەو ل نک من چو نینن، و ئەگەر هوین حەز بکەن سوباهی ژی دێ چم قورئانێ د ناڤ وان دا خوینم، وان گۆت: نە.. ئەڤە بەسە تە ئێکا هند کر وان گوهـ ل وی تشتی بت یێ وان پێ نەخۆش.

ئەڤ سەرهاتییە هندێ دگەهینت کو عەبدللاهـ مرۆڤەکێ ب جەرگ بوو و ئەو نەدترسیا.

گاڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایە صەحابییێن خۆ کو ئەو مشەخت ببن و بچنە حەبەشە، عەبدللاهـ ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن مشەختبووین، و پشتی هنگی ئەو ژ وێرێ ڤەگەڕیابوو و ب مشەختی چووبوو مەدینێ ژی.



پشتی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ژ مەکەهێ مشەختبووینە مەدینێ، عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن زوی ژ حەبەشە زڤڕینە مەدینێ بەری شەڕێ بەدرێ؛ ژ بەر کو ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن پشکداری د شەڕێ بەدرێ دا کرین، و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو ل ڕۆژا بەدرێ دو گەنجێن ئەنصاری ئەوێن گۆتنێ: (کوڕێن عەفرائێ) پشکداری د کوشتنا ئەبوو جەهلی دا کربوو، بەلێ دیارە ئەو تمام نەبووبوو، و دەمێ عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی کەلەخێ وی دیتی چوو هنداڤ و گاڤا زانی ئەو ئەبوو جەهلە، وی سەر و ڕیهێن وی کێشان و گۆتێ: ئەڤە تویی دوژمنێ خودێ؟ خودێ تو شەرمزارکری یان نە؟ وی گۆت: ئەوێ شەڕکری حەتا هاتییە کوشتن یێ

شەرمزار نینە! بیژە من: سەرکەفتن یا کێیە ئەڤرۆ؟ عەبدللاهی گۆتێ: یا خودێ و پێغەمبەرێ وییە.. پاشی عەبدللاهـ ب کەلەخێ خۆ یێ بچویک ڤە چوو سەر سنگێ وی، ئینا ئەبوو جەهلی گۆتێ: تو ب سەر جهەکێ ب زەحمەت کەفتی، شڤانێ کارکان! پاشی عەبدللاهی ئەو تمامکر و مزگینییا کوشتنا وی گەهاندە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.

ژ بلی بەدرێ عەبدللاهی د وان هەمی شەڕێن دی ژی دا یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرین پشکداری کربوو، و ئەو ئێک ژ وان بوو یێن ل ڕۆژا شەڕێ حونەینی مایە ل مەیدانێ و نەڕەڤی، دبێژت: ئەم نێزیکی حەشتێ گاڤان پاشپاشکی زڤڕین بێی پشتا خۆ بدەینە دوژمنی، پاشی ئەم بۆ پێشڤە چوون و مە خۆ ب پێغەمبەری ڕا گەهاندن، و شەڕکر.

ل مەدینێ حەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا خودایێ خۆ کری، عەبدللاهـ ئێک ژ وان کەسان بوو یێن خزمەتا پێغەمبەری دکر، و هەردەم -ب تایبەتی ل سەفەران- وی نڤین و سیواک و نەعالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هل دگرت، و بەری نوکە مە گۆتنا ئەبوو مووسایێ ئەشعەری ڤەگێڕا دەمێ ئەو دبێژت: وەختێ ئەز و برایێ خۆ ژ یەمەنی هاتینە مەدینێ، و ئەڤە پشتی ڤەکرنا خەیبەرێ بوو، دەمەکێ درێژ من هزر دکر عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی و دەیکا وی ژ ئەندامێن مالا پێغەمبەرینە -سلاڤ لێ بن- هندی هند ئەو دچوونە مالا وی.

ژ بەر نێزیکییا عەبدللاهی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو بووبوو ئێک ژ زانایێن صەحابییان یێن مەزن، ب قورئان و سوننەتێ، ئەو دبێژت: حەفتێ سوورەتێن قورئانێ من ژ دەڤێ پێغەمبەری ب خۆ یێن وەرگرتین، کەس هەڤڕکییا من ناکەت سەرا وان. و وی گەلەک حەدیس ژی ئێکسەر ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوهـ لێ بووبوون، و ژێ ریوایەت کربوون.

هندەک جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخواز ژێ دکر ئەو قورئانێ بۆ وی بخوینت و وی گوهێ خۆ ددایێ، ئێک ژ وان جاران ئەو بوو دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییێ: قورئانێ بۆ من بخوینە. گۆت: من گۆتێ: ئەز بۆ تە بخوینم و ئەو بۆ تە هاتییە خوارێ؟ گۆت: وی گۆتە من: ئەز حەز دکەم من ئەو ژ ئێکی دی گوهـ لێ بت. عەبدللاهی دەست ب خواندنا سوورەتا (النساء) کر، و دەمێ ئەو گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ۝ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ۝ ﴾ (النساء: ٤١-٤٢) هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: هندە بەسە، عەبدللاهـ دبێژت: من بەرێ خۆ دایێ چاڤێن وی یێن تژی رۆندک بووین[١].

و ژ بەر شارەزاییا عەبدللاهی د خواندنا قورئانێ دا، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَقْرَأَ القُرْآنَ غَضّاً كَمَا أُنْزِلَ فَلْيَسْمَعْهُ مِنِ ابْنِ مَسْعُوْدٍ))[٢] یەعنی: هەچییێ پێ خۆش بت قورئانێ تەڕ بخوینت وەکی کو هاتییە خوارێ، بلا ئەو گوهدارییا وێ ژ ئبن مەسعوودی بکەت.



ل سەر زەمانێ عومەری دەمێ وی عەمماری کوڕێ یاسری هنارتییە کووفە دا ببتە ئەمیر، وی عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی ژی د گەل هنارت؛ دا بۆ وی ببتە وەزیر، و وی کاغەزەک بۆ خەلکێ کووفە هنارت تێدا نڤیسی: ئەو هەردو ژ صەحابییێن ژێهاتینە و ژ خەلکێ بەدرێنە، ڤێجا هوین گوهدارییا وان بکەن، و چاڤ ل وان بکەن، و هەر چەندە من دڤیا

(١) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن.

(٢) ئەحمەد ڤەدگوهێزت.

عەبدللاهی بۆ خۆ بهێلم، بەلێ من هوین ب پێش خۆ ئێخستن.. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو ئیمامێ عومەر ب چاڤەکێ بلند بەرێ خۆ ددا عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی.

پشتی عومەری ئەو هنارتییە عیراقێ دا ئەو هاریکارییا ئەمیرێ کووفە بکەت و دینی بۆ خەلکی بێژت، و قورئانێ نیشا وان بدەت، ئەو ما ل وێرێ حەتا زەمانێ ئیمامێ عوثمان ژی.. و عەبدللاهـ دئێتە هژمارتن مەدرەسەیەک د خواندنا قورئانێ دا، و ڕەنگێ خواندنا وی ژ گەلەک شاگردەیێن وی یا هاتییە ڤەگوهاستن، و ئاشکەرایە کو قورئان ب گەلەک تەرزان دهاتە خواندن، و ئەو تەرز هەمی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن هاتینە ڤەگێڕان، و ئەو ئەون یێن دبێژنێ: (قرائات)، و هەر صەحابییەکی کانێ قورئان ب کیژ قرائەتێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرتییە وی ئەو ب وی ڕەنگی نیشا خەلکی ددا، و ژ بەر کو گەلەک ژ وی خەلکی ئەو بوون یێن ژ نوی هاتینە د ئیسلامێ دا، و ئەو ب دورستی د مەسەلا جودابوونا قرائەتان نەدگەهشتن، هندەک جاران هەڤڕکی د ناڤبەرا وان دا چێ دبوو سەرا خواندنێ، و دەمێ هندەک صەحابییێن مەزن بۆ جیهادێ دهاتنە عیراقێ یان شامێ یان مصرێ، و وان ئەو هەڤڕکییا خەلکی ل سەر خواندنا قورئانێ ددیت، و تەعەصصوبا خەلکێ هەر جهەکی بۆ خواندنا وی صەحابییێ قورئان نیشا وان دای، وان صەحابییان هەست ب (خەطەرەکا) مەزن دکر، و ترسا وان ئەو بوو ڕۆژەک بێت موسلمان د قورئانێ دا ب خیلاف بچن، و شەرێ ئێک و دو بکەن سەرا خواندنا وێ، لەو دەمێ ئەو دزڤڕینە مەدینێ وان ئاگەهدارییا ئیمام عوثمانی ب ڤێ چەندێ دکر، و داخواز ژێ دکر ئەو ئوممەتێ ژ ڤێ (خەطەرێ) ڕزگار بکەت، ژ بەر وێ چەندێ ئیمامی بڕیار دا لژنەیەکێ ژ هندەک صەحابییێن شارەزا پێک بینت،

دا ئەو دوبارە قورئانێ د ئێک موصحەفێ دا بنڤیسن، و هژمارەکا دانەیان ل بەر وێ نوسخێ بنڤیسن و ل سەر وەلاتێن موسلمانان بەلاڤ بکەن.. و مە گۆت: دوبارە؛ چونکی ل سەر زەمانێ ئەبووبەکری ئەڤ چەندە بۆ جارا ئێکێ هاتبووکرن، دەمێ ئەبووبەکر ب ڤی کاری ڕابووی وی ژی لژنەیەک ب سەرۆکاتییا زەیدێ کوڕێ ثابتی پێکئینابوو و وان نوسخەیەک ژ قورئانێ نڤیسیبوو و دانابوو نک ئەبووبەکری، پشتی ئەبووبەکری ئەو نوسخە مابوو ل نک عومەری، و دەمێ عومەر شەهیدبووی ئەو نوسخە مابوو ل نک کچا وی دەیکا موسلمانان حەفصایێ، دەمێ عوثمانی بڕیاردای نوسخەیەکا ئێککگرتی ژ قورئانێ بەرهەڤ بکەن، وی ژی -وەکی ئەبووبەکری- لژنەیەک پێکئینا و هەر زەید کرە سەرۆکێ لژنێ، و ژ بەر کو عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی هنگی ل کووفە بوو، ئەو د ڤێ لژنێ دا نەبوو، پشتی لژنێ نوسخەیەک بەرهەڤکری و د گەل نوسخەیا ئەبووبەکری هەڤبەرکری، عوثمانی بڕیار دا چەند نوسخەیەکان ل بەر بنڤیسن و بهنێرتە وەلاتێن موسلمانان، و وی فەرمان دا هەر نوسخەیەکا دی یا هەبت بێتە لادان و سۆتن؛ دا موسلمان د خواندنا قورئانێ دا ب هەڤڕکی نەچن، و ئەڤ کارێ ئیمامێ عوثمان کری مەزنترین خزمەت بوو وی بۆ قورئانێ و ئوممەتا ئیسلامێ کری، و کارێ وی ب دلێ هەمی صەحابییان بوو، و وان دەستخۆشی لێ کر، بەلێ ئەڤ کارە ب دلێ عەبدللاهی نەبوو! بۆچی؟

وی گۆت: ئەڤ ڕەنگێ قورئانێ یێ ئەز پێ دخوینم ئەوە یێ من ژ دەڤێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وەرگرتی، و دەمێ من ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قورئان ب ڤی ڕەنگی دخواند، زەید هێشتا زارۆک بوو یاری د گەل بچویکان دکرن! چاوا ئەز خواندنا خۆ بهێلم و ژ نوی وەکی وی بخوینم؟

هۆسا وی خۆ نەرازی کر، و نەرازیبوونا خۆ ئاشکەرا ژی کر، ئەڤ هەلویستێ وی ب دلێ گەلەک صەحابییان نەبوو، و ئیمامێ عوثمان ئێک ژ وان بوو، و وان ئەو هەلویست حسێبکر وەک ژێکڤەکرن بۆ ڕێزا موسلمانان، لەو عوثمانی فەرمان ل وی کر ئەو ژ کووفە بێت و بژڤڕتە مەدینێ، بەری ئەو ژ کووفە دەرکەڤت، خەلکێ کووفە گۆتێ: ئەگەر تو حەز بکەی نەچە، و ئەم ناهێلین نەخۆشییەک بگەهتە تە؟ وی گۆت: نەخێر! من بەیعە یا دایە عوثمانی، و دڤێت ئەز گوهدارییا وی بکەم، و من نەڤێت ئەز ئێکەمین کەس بم فتنێ د ناڤ ئوممەتێ دا پەیدا بکەم.. و ئەو زڤڕی مەدینێ.

ل ڤێرێ تێبینییەکا فەر هەیە دڤێت ئەم خواندەڤان لێ ئاگەهدار بکەین، ئەو ژی ئەڤەیە: دڤێت نەئێتە هزرکرن کو دەمێ عوثمانی موسلمان هەمی ل سەر نوسخەیەکێ کۆمکرین مەعنایا وێ ئەوە ئەو نوسخەیێن دی، یان ئەو قرائەتێن دی یێن قورئانێ هاتنە ژ ناڤبرن و ژبیرکرن و ئەو نەمان. نەخێر! ئەو قرائەت حەتا ئەڤرۆ ژی یێن ماین و دئێنە خواندن و ریوایەتکرن، و هەر ئێکێ ژ زانستێن قورئان و تەفسیرێ ئاگەهدار بت باش دزانت کو (موصحەفێن صەحابییان) وەکی بۆ دئێتە گۆتن، و قرائەتێن وان یێن ژێکجودا دئێنە ریوایەتکرن و خواندن ژی، و د تەفسیران دا بەحس ژێ دئێتەکرن، بەلێ (موصحەفا عوثمانی) وەک بنیات دئێتە هژمارتن، و ئەڤ موصحەفە بوو یا ل دەسپێکا دیرۆکا ئیسلامێ، دەمێ هێشتا موسلمانێن نوی ئەڤ مەسەلە باش فەهم نەکری، ژ جودابوون و لێککەفتنێ پاراستین، و ئەو ئێکگرتی هێلاین، لەو خودێ خێرا وان صەحابییان مەزن بکەت یێن ب ڤی کاری ڕابووین، و ئەڤ خزمەتا مەزن پێشکێشی ئیسلامێ و موسلمانان کری، و ل پێشییا هەمییان ئیمام عوثمان.

عەبدللاهـ مرۆڤـەک دەنـگ خـۆش بـوو ب قورئـانێ، و ئـەو مرۆڤـەکێ دلنازک بوو، هەڤالەکێ وی دبێژت: من دیت ژ بەر گرییێ دو خیچێن ڕەش ل بەر هەردو چاڤێن وی چێ بووبوون.

دەمـێ عەبدللاهـ کەفتییـە بـەر مرنـێ ئیمـام عوثمـان چـوو سـەرا دا، گـۆتێ: تـو گازنـدەیا خـۆ ژ چ دکـەی؟ وی گـۆت: ژ گونـەهێن خـۆ، عوثمـانی گۆتە: دلێ تـە دچتـە چ؟ وی گـۆت: ڕەحمـا خـودێ، عوثمـانی گـۆتێ: بـۆ تـە نەهنێرمە د دویڤ دختـۆرەکی ڕا؟ وی گۆت: دختـۆری ئـەز یـێ نسـاخ کریم. عوثمانی گۆتێ: ئـەم تشـتـەکی بدەینـە تـە؟ وی گـۆت: مـن هەوجـەیی ب چـو نینە.

مرنا کوڕێ مەسعوودی ل مەدینێ بوو ل سالا سیه و دوێ، و هنگی ژییێ وی شێست و تشتەک سال بوو، و ئەو ل بەقیعێ هاتە ڤشارتن.

## پشکا شەشێ

# بەری دووماهیێ..

- عەکرمە کوڕێ ئەبوجەهلی، ئەوێ بۆ ئیسلامێ شەهیدبووی
- حارثە، ئەوێ قەنجییا د گەل دەیکێ ئەو بریە بەحەشتێ
- حاطەب، ئەو بەحەشتییێ جارەکێ هلنگفتی
- ئەبوو هورەیرە، راوییێ پێغەمبەری
- عوکاشەی بەری تە ڕاکر
- جـابـانێ کوردی

# عەكرمە كورێ ئەبووجەهلی
# ئەوێ بۆ ئیسلامێ شەهیدبووی

نەخۆشترین رۆژ د ژیانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- وەكی وی ب خۆ گۆتییە عائیشایێ ئەو رۆژ بوو یا خەلكێ طائیفێ ب كرێتترین رەنگ بەرسڤا وی دا، ڤێجا ئەو ب عێجزی ڤە ژ بازێرێ وان دەركەفتی، و ژ قەهران دا رێكا خۆ خەلەت كری و مسافا شەڤەك و رۆژەكان ژ مەكەهێ دویركرفتی، هنگی خودێ ملیاكەتێ چیایان هنارتە نك وی و گۆتێ: ئەگەر تو حەز بكەی ئەز دێ هەردو چیایێن مەكەهێ ب سەر خەلكێ وێ دا ئینمە خوار، وی گۆت: نە.. ئەز هیڤی دكەم خودێ هندەك مرۆڤان ژ پشتا وان بینتەدەر پەرستنا خودێ ب تنێ بكەن و چو شریكان بۆ وی چێ نەكەن![1]

و وەسا چێبوو وەكی وی هیڤی كری.. نێزیكی دەه سالان پێڤە نەچوو، خودێ ژ پشتا كافرێن مەكەهێ یێن مەزن، یێن وەكی عوتبە و شیبە و ئەبووجەهلی هندەك مرۆڤ دەرێخستن نە ب تنێ تەوحیدا خودێ كرن، بەلكی ئالایێ تەوحیدێ ل گەلەك جهـ و وەلاتان ژی بلندكرن، و بەرێ گەلەك خەلكی دا ئیسلامێ.. و ئێك ژ وان عەكرمە بوو، ئەوێ ژ پشتا ئەبووجەهلی دەركەفتی، ئەبووجەهل ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتییێ: فیرعەونێ ڤێ ئوممەتێ!

---

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

عەكرمـە كوڕێ عـەمرێ كوڕێ هيشـامێ كـوڕێ مـوغيرەيێ مـەخزوومی بـوو، بـابێ وی عـەمر مـەزنێ بـابكێ مـەخزوومييێن قورەيشـی بـوو، و ئـەو مرۆڤـەكێ شـارەزا و تێگەهشـتی بـوو، ژ بـەر هنـدێ قورەيشـييان دگـۆتێ: (ئەبوولحەكەم)، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعايەک ژ خودێ كر كو ئـەو ئيسـلامێ ب وی يـان خـوارزايێ وی عومـەرێ كـوڕێ خـەطـطابی عـەزيز بكەت، و دوعايێ ژ خوارزايی گرت نە ژ خالێ!

عەمری ژ حەسويدی باوەری ب پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- نـەئينا، گۆت: ب خودێ ئەز دزانم موحەممەد درەوان ناكەت، بـەلێ مالباتـا هاشمی گـۆت: فـلان تشـت يـێ مەيـە، فـلان تشـت يـێ مەيـە، و حـەتا مـە شـياى ململانێ د گەل وان د وان تشتان دا بكەين، وان گۆت: پێغەمبـەر ژ مەيـە، ئەرێ چاوا دێ شێين ململانێ د ڤی تشتی دا د گەل وان كەين؟!

ژييێ عەكرمەيی نێزيكی يێ پێغەمبـەری بوو -سلاڤ لـێ بـن- دەمـێ ئيسلام هـاتـی ئـەو ل دۆرێن چـل سالييێ بـوو، ژ بـەر كارلێكرنـا بـابێ وی ل سەر وی، ئەو نە ب تنێ موسلمان نـەبوو بـەلكی وی ژی وەكـی بـابێ خـۆ ب ڕەنگـەكێ دژوار دوژمناتييـا ئيسـلامێ كـر، و وی ژی وەكـی بـابێ خـۆ و مـەزنێن دی يـێن قورەيشـييان نەخۆشی و عەزابـەكا زێـدە گەهانـدە هـەژارێن موسـلمانان، حـەتا ئـەو ڕۆژ هـاتی يـا موسـلمانان تێـدا مەكەهـ هـێلای و مشەختبووينە مەدينێ.

پشـتی بۆرينـا پتـر ژ سـالەكێ د سـەر مشـەختبوونا موسـلمانان ڕا بـۆ مەكـەهێ ڕۆژەكـێ خەبـەرەكێ نـەخۆش گەهشـتە مەكـەهێ، كـو موحەممـەد و هەڤالێن وی يێن چووينە د ڕێكا كاروانێ بازرگانی يێ قورەيشييان دا ئەوێ ب سەرۆكاتييا ئەبوو سوفيان ژ شامێ دزڤرِت، و ئـەبوو سـوفيانی هەوارێن خۆ يێن گەهاندينە خەلكێ مەكەهێ كو ئەو د هەوارا وی دەركەڤن.. مـەزنێن

مەکەهێ، و بەری هەمییان مەزنێ مەخزوومییان عەمرێ کورێ هیشامی، بریار دا ئەو لەشکەرەکێ هزار نەفەری ئامادە بکەن، و د هەوارا ئەبوو سوفیانی بچن، ب رێڤە ئەبوو سوفیانی جابەک دا وان کو ئەز شیام رێکا خۆ ڤەگوهێزم و کاروانی ژ دەستێ موسلمانان رزگار بکەم، ڤێجا بزڤرنە ڤە، ئەبووجەهلی ب لات و عززایی سویند خوار کو ئەم نازڤرین حەتا موحەممەدی نەشکێنین و نەچینە سەر کانیکێن بەدرێ و سێ رۆژان بمینینە ل وێرێ حەیوانان ڤەکوژین، و عەرەقێ ڤەخۆین، و ژن بۆ مە برەقسن!

بۆ ب جهئینانا سویندا خۆ، ئەبووجەهلی بەرێ لەشکەرێ خۆ دا دەڤەرا بەدرێ، و کورێ وی عەکرمە ژی د ناڤ وی لەشکەری دا بوو، ئەبووجەهل گەهشتە بەدرێ بەلێ ژێ نەزڤری ڤە؛ چونکی کەلەخێ وی ب دەستێن موسلمانان د چالەکێ دا هاتە ڤەشارتن، پشتی لەشکەرێ قورەیشییان ئێکەمین و مەزنترین شکەستن ب دەستێ موسلمانان خواری.

پشتی عەکرمە زڤرییە مەکەهێ، ل شوینا بابێ خۆ ئەو بوو مەزنێ بابکێ مەخزوومییان، و دوژمناتییا وی بۆ موسلمانان دو جاران هندی بەرێ لێ هات؛ چونکی مسەلا تۆلا بابێ وی ژی هاتە سەر.. عەکرمە، وەکی پترییا مەزن و ماقویلێن مەکەهێ ئەوێن مرۆڤێن وان ل رۆژا بەدرێ هاتینە کوشتن، ل هیڤییا وێ رۆژێ بوو یا ئەو تێدا د شەرەکێ دی دا بەرانبەر موسلمانان راوەستن؛ دا تۆلا بەدرێ بستینن، و ئەو رۆژ هات، ل شەووالا سالا سێیێ ئەو و موسلمان ل مەیدانا ئوحودێ گەهشتنە ئێک، ل وێ رۆژێ نە ب تنێ عەکرمە دەرکەفتبوو ئوحودێ، بەلکی وی ژنکا خۆ ژی ئەوا دبوو کچا مامێ وی حارثێ کورێ هیشامی د گەل خۆ بربوو؛ دا ئەو ژی د گەل ژنکێن قورەیشی هاندانا زەلامان بکەن بۆ ستاندنا تۆلا کوشتییێن خۆ.. د ڤی شەری دا ئەبوو سوفیان سەرکێشێ لەشکەرێ

قورەیشــییان بـوو، و خالـدێ کـورێ وەلیـدی مـەزنێ لایـێ ڕاسـتێ بـوو، و عەکرمـە مـەزنێ لایێ چـەپێ بـوو، و ل وی دەمـێ لەشـکەرێ قورەیشـییان شکەستی و نێزیک بوو ب ئێکجاری بڕەڤت، خالـد و عەکرەمـەیی دەورەکـێ مـەزن د گوهۆڕینـا ئـەنجامێ شـەڕی دا گێـڕا پشـتی وان دیتـی ڕمبـاز و تیرهاڤێژن موسلمانان ئەو گرێ ل پشت لەشکەری بەردای، هنگی ئەو ل دۆر لەشکەرێ موسلمانان زڤڕین و ژ پشـتێ ڤـە هـاتنێ، و دەمـەکێ درێژ پێڤـە نـەچوو وان شکەسـتنەکا لەشـکەری یـا دژوار ئێخسـتە ڕێزێن موسـلمانان، و عەکرمەیی وەکی هەڤالێن خۆ یێن دی گۆت: ئەڤە پێش ڕۆژا بەدرێ ڤە!

ل شەڕێ خەندەکێ ژی ل سالا پێنجێ، عەکرمـەیی دەورەکـێ بـەرچاڤ هەبوو، و دەمێ حیصارا کافران بۆ مەدینێ ڤەکێشای و بێنا وان تەنگبووی، ڕۆژەکێ عەکرمە د گەل هژمارەکا کافران شیان ل جهەکێ تـەنگێ خەندەکێ خۆ ب هەسپ ڤە بهاڤێنـە لایێ دی ب وێ ئنیـەتێ کـو هێرشـێ بدەنـە سـەر موسلمانان، بەلێ هندەک ژ هەڤالێن وی هاتنە کوشتن و ئەو شیا خۆ ڕزگـار بکەت و بڕەڤت و بزڤڕتە لایێ دی یێ خەندەکێ.

عەکرمـەیی بـەردەوامی دا دوژمناتییـا خـۆ بـۆ ئیسـلامێ حـەتا سـالا هەشتێ مشـەختی دەمێ وی وەکی هەمی خەلکێ مەکەهێ دیتی ژ نشکەکێ ڤە موسلمانان دۆر ل باژێڕی یا گرتی، هنگی مەزنێن مەکەهێ بڕیـار دا ئـەو بـاژێڕی تەسـلیم بکـەن، پشـتی وان زانـی کـو بـەرگری ب وان ڤـە نائێـت، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- فـەرمانا ل لەشـکەرێ خۆ کری کـو ئـەو شـەڕی نەکەن ئەگەر شەڕێ وان نەئێتەکرن.

بڕیـارا تەسـلیمبوونێ ب دلـێ عەکرمـەیی نـەبوو، لـەو وی و هژمارەکا کێم ژ هەڤالێن وی بڕیار دا شەڕێ هێرشکەران بکەن، ئەگەر خۆ ئـەڤ بڕیـارە وەکـی ڕەنگـەکێ خۆکوشـتنێ ژی بـت! هـەڤالێ وی یـێ بـەرێ خالـدێ کـوڕێ

وەلیدی کەفتە بەر سنگی، و خالد ئەوە یێ د ژیانا خۆ هەمییێ دا شەڕەک نەکری و ئەو لەشکەر شکەست بت یێ ئەو د گەل! هندەک ژ هەڤالێن عەکرمەی هاتنە کوشتن، و ئەوێن ماینە ساخ ژی وەکی وی ب ڕەڤا خۆ ڕا نەگەهشتن.. و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا هەمی کەس بێنە ئازاکرن، چەند مرۆڤەکێن کێم تێ نەبن، وی گۆتە صەحابییێن خۆ: خۆ ئەگەر هوین وان ببینن خۆ ب پاتەیێ کەعبێ ڤە ژی گرتی وان بکوژن! بۆچی؟ چونکی ئەو تاوانبارێن حەربێ بوون -وەکی نوکە دبێژن-، و ئێک ژ وان عەکرەمە بوو.. ئەڤ خەبەرێ نەخۆش گەهشتە عەکرمەی لەو وی بڕیار دا کو ب لایێ یەمەنێ ڤە بڕەڤت.

پشتی پاقژکرنا مەکەهێ ژ صەنەم و صەنەمپەرێسییێ و موسلمانبوونا پتریا خەلکێ وی، کۆمەکا ژنکێن قورەیشییان چوونە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا بەیعێ بدەنە وی و مسلمانبوونا خۆ ل نک وی ڕاگەهینن، و ئێک ژ وان کابانی و دۆتماما عەکرمەیی بوو، وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، عەکرمە ژ بەر تە یێ ڕەڤی چوویە یەمەنێ؛ چونکی تە خوینا وی یا حەلالکری، ڤێجا تو لێ ببۆرە و ئەمانێ بدێ خودێ ئەمانێ بدەتە تە.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: مە ئەمان دایێ ئەگەر بزڤڕت. گاڤا دەیکا حەکیمی ئەڤ خەبەرێ خۆش ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوهـ لێ بووی، هەر زوی وێ کارێ خۆ کر و قەستا یەمەنێ کر و ب دویڤ زەلامێ خۆ دا چوو دا وی قانع بکەت کو بزڤڕتە ڤە و موسلمان ببت.

ژنکا وی د ڤی کارێ خۆ دا ب سەرکەفت، و شیا وی ب هزرا خۆ قانع بکەت، پشتی ئەو پشتڕاست کری کو موحەممەد کەسەکێ دلفرەهە و نە وەکی مەزنێن دنیاییێیە، کەرب و کین جهێ خۆ د دلێ وی دا نابینت، و وی ئەمان یا دایە عەکرەمەی ئەگەر بزڤڕت و موسلمان ببت.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب زڤڕینا وی حەسیای کەیفا وی گەلەک هات، و گۆتە صەحابییێن خۆ: ئەڤە عەکرمە دێ ئێتە نک هەوە خودان باوەر و مشەخت، ڤێجا هوین ل نک وی خەبەران نەبێژنە بابێ وی؛ چونکی دانا خەبەران بۆ مرییان ساخان دئێشینت و ئەو ناگەهنە مرییان.. و دەمێ عەکرمە گەهشتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێغەمبەر ب لەز بەر ب وی ڤە چوو حەتا نەگەهشت کراسێ خۆ یێ ب سەر ڤە بکەتە بەر خۆ، و گۆت: ((مرحبا بالراكب المهاجر)) ب خێر بێت سویارێ مشەخت، و هۆسا وی هاتنا عەکرمەیی ژ یەمەنێ بۆ نک خۆ وەک مشەختبوون بۆ هژمارت.



عەکرمەیی جاهلییەت هاڤێتە پشت خۆ، و هەر ژ ڕۆژا ئێکێ وی بڕیار دا ئەو زوی ب خۆ ڕا بگەهت و ئەو عەمرێ وی یێ مایی هەمییێ بۆ خزمەتا ئیسلامێ تەرخان بکەت، گاڤا وی ئیسلاما خۆ ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕاگەهاندی، وی داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو داخوازا غەفراندنا گونەهان بۆ وی ژ خودێ بکەت، پاشی وی سۆز دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو کانێ چەند مال وی د نەیارەتییا ئیسلامێ دا خەرجکرییە ئەو دو جاران هند د خزمەتا ئیسلامێ دا خەرج بکەت، و چەند شەڕ وی دژی موسلمانان کرییە ئەو دو جاران هند شەڕی دژی کافران بکەت. و وی سۆزا خۆ ب جهئینا..

ل سەر زەمانێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێغەمبەری هندەک کار ئێخستنە دەستی، و دەمێ ئەبووبەکر ژی بوویە خەلیفە وی ئەو هنارتە دەڤەرا عوممانێ دا شەڕێ مورتەددان بکەت، و پشتی هنگی ئەبووبەکری ئەو هنارتە یەمەنێ ژی هەر بۆ وی کاری.

ل سەر زەمانێ خیلافەتا عومەری دەمێ شەڕێ (فتووحاتان) دەست پێ کری وی قستا دەڤەرا شامێ کر، و پشکداری د گەلەک شەڕان دا کر، و شەڕێ وی یێ دووماهییێ شەڕێ یەرمووکێ بوو.. ل سالا سێزدێ مشەختی، ل دەڤەرا یەرمووکێ، شەڕەکێ مەزن د ناڤبەرا موسلمان و ڕۆمێ دا چێبوو، عەکرمە و ژنکا وی و خەزویرێ وی کو مامێ وی بوو د ڤی شەڕی دا دئامادەبوون، و دەم هات عەکرمە سۆزا خۆ ب جه بینت.

بەری شەڕ دەست پێ بکەت سەرلەشکەرێ موسلمانان خالدێ کوڕێ وەلیدی ب نک دو شێرێن نەبەزێن لەشکەرێ خۆ ڤە چوو: عەکرمە و قەعقاعی، و داخواز ژ وان کر ئەو شەڕی دەست پێ بکەن، ئەو هەردو بۆ پێشڤە چوون و شعرێن حەماسی گۆتن، و داخوازا (موبارەزێ) ژ لەشکەرێ ڕۆمێ کر، و هنگی عەدەت بوو شەڕی ب موبارەزا هندەک قەهرەمانان دەست پێ دکر.

شەڕی دەست پێ کر.. ڕۆمێ ب هژمارا خۆ یا مەزن ڤە قیتکرە لەشکەرێ موسلمانان، و شیان لایێ ڕاستێ یێ لەشکەری پاشدا ببەن، و ب ڤێ چەندێ ڕێکەکێ بۆ خۆ د ناڤ ڕێزێن لەشکەری دا ببینن و پێشڤە بچن دا ل دۆر وی لەشکەری بزڤڕن ئەوێ ل نیڤێ، کو دلێ لەشکەری بوو و ئەو جه بوو یێ سەرلەشکەر خالد و هەڤالێن وی ژ قەهرەمانێن مەزن لێ، نێزیکبوو شکەستن بکەفتە لەشکەرێ موسلمانان، و هندەک ژ وان پاشپاشکی زڤڕین، ژنکان ل پشت وان دار ڕاکرن و ل وان دان و ئەو هاندان کو بزڤڕنە مەیدانا شەڕی، و بێژن: هنگی ژنکا عەکرمەی شیا پازدە جندییێن ڕۆمێ ب ئاسنی بکوژت..

وی دەمی عەکرمە وەکی شێرەکێ بریندار ل مەیدانێ ل کافران دخوڕی و بۆ پێشڤە دچوو و خۆ دهاڤێتە ناڤ لەهییا لەشکەرێ ڕۆمێ، وی کاڤلانێ

شیرێ خۆ شکاند، و ژ هەسپی هاتە خوارێ و ب هەمی هێزا خۆ دانا کافران، هندەک هەڤالێن وی شیرەت لێ کر کو وە نەکە، پاشدا وەرە و خۆ بپارێزە، وی گۆت: رۆژا من بۆ لات و عوززایی شەرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، ئەز نەدرەڤیم، ئەڤرۆ پشتی کو ئەز بۆ خودێ شەری دکەم ژ رۆمێ برەڤم؟!

پاشی وی ب دەنگەکێ بلند گازی کر: گەلی موسلمانان، کی دێ بەیعێ ل سەر مرنێ دەتە من؟ مامێ وی و خەزویرێ وی حارثێ کورێ هیشامی و ضرارێ کورێ ئەزوەری و چارسەد کەسێن دی گۆتێ: ئەم دێ بەیعێ دەینە تە.. وان خۆ دا بەر خالدێ کورێ وەلیدی دا وی بپارێزن و شەرەکێ بێ یەمان کر حەتا پترییا وان شەهیدبووین.

شەر ب سەرکەفتنا موسلمانان ب دووماهی هات، و موسلمان ل کوشتی و برینداریێن خۆ گەریان دا ببینن کانێ کی مایە و کی چوویە، وان سێ بریندار دیتن، د سەکەراتێ دا بوون، ئەو ب نک ڤە چوون بەرێ خۆ دانێ ئێک ژ وان عەکرەمەیێ کورێ ئەبووجەهلی بوو پتر ژ حەفتێ برینان د لەشێ وی بوون، یێ دی حارثێ برایێ ئەبووجەهلی بوو، مامێ عەکرمەی و خەزویرێ وی، و یێ سێیێ سوهەیلێ کورێ عەمری بوو، و ئەڤ هەر سێیە ژ وان مرۆڤان بوون یێن حەتا فەتحا مەکەهێ ژی مەزنترین دوژمن بۆ ئیسلامێ! عەکرمەی گۆتە موسلمانەکی فرەکا ئاڤێ بدە من، دەمێ ئەو چووی دا ئاڤێ بدەتێ وی دیت مامێ وی حارث ژی یێ داخوازا ئاڤێ دکەت، ئینا وی گۆتە وی موسلمانێ ئاڤ د دەستان دا: ئاڤێ بدەتە حارثی، و بەری حارث ئاڤێ ڤەخۆت، دیت سوهەیل یێ داخوازا ئاڤێ دکەت، وی گۆت: ئاڤێ بدە سوهەیلی، حەتا ئەو چوویە نک سوهەیلی وی دیت سوهەیل تمامبوو، زڤری نک حارثی ئەو ژی تمامبوو، و دەمێ ئەو چوویە نک

عەکرمەی دیت ئەو ژی یێ تمامبووی بێی ئێک ژ وان ئاڤێ ڤەخۆت، هەر ئێکی هەڤالێ خۆ ب پێش خۆ ئێخست، و وان ب ڤێ چەندێ نموونەیەکێ (ئیثارێ) یێ بێ وێنە د دیرۆکێ دا تۆمارکر.

دەمێ عەکرمە مری ژیێ وی شێست و دو سال بوو، و وی چو کورِ نەبوون، و دبێژن: ب مرنا وی دووندەها ئەبووجەهلی قەتعبوو.

## حارثەیێ كوڕێ نوعمانێ خەزرەجی
## ئەوێ قەنجییا د گەل دەیكێ ئەو برییە بەحەشتێ

ئەگەر ئوەیسێ قەرەنی د ناڤ تابعییان دا ئەو كەس بت یێ قەنجییا د گەل دەیكێ ئەو بربتە بەحەشتێ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەدحێن وی ب ڤێ چەندێ كرین، بەری وی د ناڤ صەحابییان ژی دا ئێكێ ب وی ڕەنگی هەبوو، قەنجییا د گەل دەیكێ ئەو بربوو بەحەشتێ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شاهدەیی بۆ وی ب ڤێ چەندێ دابوو..

ناڤێ وی حارثەیێ كوڕێ نوعمانێ كوڕێ نەفعێ خەزرەجییێ ئەنصاری بوو، وەكی ژ پاشناڤێ وی دیار ئەو ژ خەلكێ مەدینێ بوو، ژ ئوبجاخا خەزرەجییان و ژ بابكێ نەجارییان یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل تاخێ وان دانای و مالا خۆ و مزگەفتا خۆ لێ ئاڤاكری. و دیارە ئەو ل سەر دەستێ موصعەبێ كوڕێ عومەیری فێری ئیسلامێ بووبوو، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتییە مەدینێ، بەری مشەختبوونێ دا ئیسلامێ د ناڤ وان دا بەلاڤ بكەت و دینی نیشا بدەت.

دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و هەڤالێ وی ئەبووبەكر گەهشتینە مەدینێ، و پشتی حێشترا وی ل تاخێ نەجارییان نیخیای، و وی بڕیاردای ئەو ل وێرێ بمینت و مزگەفتا خۆ ئاڤا بكەت، حارثە ئێك ژ وان كەسان بوو یێن كەیفا وی گەلەك هاتی، و كەیفا وی هێشتا پتر هات دەمێ وی زانی كو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیارا دای كو حەتا مالا وی و

مزگەفتا وی بێتە ئاڤاکرن ئەو ل مالا ئەبوو ئەیووبی بمینت، ئەوا دکەفتە ب ڕەخ وی جهی ڤە یێ بڕیار هاتییەدان مزگەفت لێ بێتە ئاڤاکرن؛ چونکی مالا حارثەی دکەفتە ب ڕەخ مالا ئەبوو ئەییووبی ڤە، مەعنا: پێغەمبەر ڤێ گاڤێ و پشتی مالا خۆ ئاڤا دکەت ژی دێ جیرانێ وی بت.

نێزیکی حەفت هەیڤان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل مالا ئەبوو ئەییووبی ما، حەتا مەزەلکێن وی و مزگەفت هاتییە چێکرن، و ل وی دەمی هەر جارەکا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هەوجەی خانییەکی با، بۆ خۆ یان بۆ مرۆڤەکێ خۆ یێ نێزیک، حارثەی مرۆڤێن خۆ دبرن و مالا خۆ بۆ وی ڤالا دکر، بۆ نموونە دەمێ خەلکێ مالا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و عەیالێ ئەبووبەکری هاتینە مەدینێ، حارثەی ئەو ل مالا خۆ ئاکنجی کرن، دا ئەو نێزیکی پێغەمبەری بن -سلاڤ لێ بن-، و حارثە ب شەڤ و ڕۆژ د خزمەتا وان دا بوو.. و دەمێ فاطمایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شوی ب عەلی کری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: خانییەکی بۆ خۆ پەیدا کە.. وی خانییەک پەیداکر یێ دویربوو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: من دڤێت تو یێ نێزیکی من بی.. عەلی گۆتێ: بێژە حارثەیێ کوڕێ نوعمانی دا ئەو مالا خۆ بۆ مە ڤالا کەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: حارثەی هند جاران مالا خۆ بۆ مە یا ڤالاکری ئێدی ئەم شەرم ژێ دکەین! گاڤا ئەڤ ئاخفتنە گەهشتییە حارثەی ئەو هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! من یێ زانی تە دڤێت فاطمایێ نێزیکی خۆ بکەی، و مالا من نێزیکترین مالێن نەجارییانە بۆ تە، و ئەز و هەر تشتەکێ من هەی بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وینە، و ئەز ب خودێ کەمە ئەو تشتێ تو ژ من وەردگری ل نک من چێترە ژ وی یێ تو دهێلی..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو ڕاست دبێژی و خودێ بەرەکەتێ بۆ تە بێختە مالێ تە، و هنگی فاطما و عەلی هاتن و ل مالا حارثەی ئاکنجی بوون حەتا وان مەزەلکەک بۆ خۆ ب ڕەخ مەزەلکا پێغەمبەری ڤە چێکری.

دو کسێن دی ژ بلی حارثەی د مالا وی دا دژیان، ئێک دەیکا وی بوو ئەوا دگۆتنێ: جەعدەیا کچا عوبەیدی نەججاری، و ژنکا وی دەیکا خالدی یا نەججاری، و ئەو هەردو ژ وان ژنکان بوون یێن هەر زوی باوەری ئینای و بەیعە دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەدرەکێ زێدە ددا دەیکا وی و هندەک جاران دچوو سەرا وێ ددا ل مالا وێ و ژ خوارنا وێ دخوار.

ڤێ ژنێ کوڕێ خۆ ب ڕەنگەکێ تازە پەروەردە کربوو، و ئەو فێری ئەخلاقەکێ باش کربوو، لەو دەمێ ئەو مەزنبووی و بوویە خودان ژن و عەیال ژی وی قەدرەکێ زێدە ددا دەیکا خۆ، و ئەو هند د گەل وێ یێ باشبوو حەتا سوحبەتا باشییا وی د ناڤ خەلکی هەمییێ دا بەلاڤبووی و پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- پێ زانی، و ئەڤ باشییا وی مەتەل پێ داهتنە گۆتن، ئەگەر کسەک بۆ دەیکا خۆ یێ باش با، دا بێژن: خۆ تو دبێژی حارثەیە!

و عەدەتێ قەنجییا د گەل دەیبابانە ئەو خودانێ خۆ ل دنیایێ و ئاخرەتێ سەرفەراز دکەت، کانێ چاوا خرابییا د گەل وان خودانی ل دنیایێ و ئاخرەتێ ڕویڕەش و شەرمزار دکەت.. قەنجییا حارثەی د گەل دەیکا وی سەرفەرازییەکا وەسا ب رزقێ وی کر حەتا ئەو برییە بەحەشتێ، و بوویە ئەگەر کو هێشتا ئەو یێ ساخ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مزگینییا بەحەشتێ بدەتە وی، عائیشا دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((دَخَلْتُ

الْجَنَّةَ، فَسَمِعْتُ فِيهَا قِرَاءَةً، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: حَارِثَةُ بْنُ النُّعْمَانِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَذَلِكُمُ الْبِرُّ كَذَلِكُمُ الْبِرُّ)) يەعنى: ئەز چوومە د بەحەشتێ دا -و بەلكى ئەڤە د خەونێ دا بت، و خەونێن پێغەمبەران وەحینە- دەنگێ خواندنەکێ هاتە من، من گۆت: ئەڤە کییە؟ گۆتنە من: ئەو حارثەیێ کوڕێ نوعمانییە. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: باشی یا وەسایە، باشی یا وەسایە[1].

مەخسەد ب پاشییێ ل ڤێرێ باشییا د گەل دەیکێیە.. مەعنا: ئەگەرا چوونا حارثەی بۆ بەحەشتێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ قەنجییا وی د گەل دەیکا وی زڤراند، و ئەگەر ئەو هندە د گەل دەیکا خۆ یێ باش نەبا، بەلکی ئەڤ قەنجییە د گەل وی نەهاتباکرن.

حارثە ژ وان صەحابییان یێن پشکداری د وان هەمی شەڕان دا کری یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ژیانا خۆ دا پێ ڕابووی، و ئەو ئێک ژ وان موجاهدان بوو یێن ل ڕۆژا بەدرێ ئامادەبووین، ئەوێن خودێ گۆتییێ: ((اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ)) هوین چ دکەن بکەن، من گونەهێن هەوە یێن غەفراندین[2].

ژ وان شەڕێن حارثەی پشکداری تێدا کری، و وی جبریل تێدا دیتی، وەکی ژ وی ب خۆ هاتییە ڤەگوهاستن شەڕێ بەنوو قورەیضە بوو، و شەڕێ حونەینێ..

دەمێ شەڕێ خەندەکێ ل سالا پێنجێ مشەختی ب دووماهی هاتی، پشتی کو جوهییێن بەنوو قورەیضە خیانەتکری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

---

(١) حاکم ڤەدگوهێزت.

(٢) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن.

فەرمان ل صەحابییان کر ئەو کارێ شەڕی بکەن و بچن قەستا جوهییێن خائین بکەن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د بەر هندەک صەحابییان بۆری دیت وان کارێ شەڕی یێ کری و ڕێزێن خۆ یێن دورستکرین، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: کەسەک د بەر هەوە ڕا بۆرییە؟ وان گۆت: بەلێ، دوحیەیێ کەلبی ل سەر هێستەرکێ بوو، وی فەرمان ل مە کر ئەم چەکێ خۆ هلگرین و خۆ ب ڕێز کەین، و وی گۆتە مە: ئەڤە پێغەمبەرێ خودێ یێ دئێت.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وان: ئەو جبریل بوو..

ل سالا هەشتێ مشەختێ ژی دەمێ شەڕێ حونەینێ چێبووی، و پشتی موسلمان کەفتینە کەمینا کافران، پتریبا لەشکەری ڕەڤی، هژمارەکا کێم تێ نەبت، ئەو ل جهێن خۆ مابوون، و حارثە ئێک ژ وان بوو. پشتی شەڕی حارثە د بەر پێغەمبەری ڕا بۆری دیت زەلامەک یێ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئاخڤت، حارثە دەرباسبوو و سلاڤ نەکر، پشتی هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی تە سلاڤ نەکر؟ وی گۆت: من دیت تو و زەلامەک دئاخفتن، ڤێجا من نەڤیا ئاخفتنا هەوە ببڕم.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تە ئەو دیت؟ وی گۆت: بەلێ.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو جبریل بوو، و ئەگەر تە سلاڤ کربا ئەو دا بەرسڤا تە دەت.

ژییێ حارثەی درێژ بووبوو و ئەو مابوو حەتا خیلافەتا موعاویەی، و دبێژن: ئەو ل دووماهییا ژییێ خۆ کۆرە بووبوو، مرنا وی ل سالا (٥١) مشەختێ بوو.

## حاطەبێ لەخمی
## ئەو بەحەشتییێ جارەکێ هلنگفتی

صەحابییێ ڤێ جارێ ئەم بەحس ژێ دکەین هەر چەندە بوبوو ئێک ژ کورێن مەکەهێ و بازرگانێن وێ یێ ناڤدار د دەلیڤەیا کرین و فرۆتنا ئەرزاق و خوراکی دا، بەلێ ئەو نە ژ خەلکێ مەکەهێ بوو، یان بلا بێژین: نە ژ ئویجاخا قورەیشییان بوو، و جڤاکا عەرەبان ئەوا -هنگی- ل سەر بناخەیێ عشیرەتێ دهاتە ئاڤاکرن، قەبویل نەدکر کەسەک ژ ئویجاخەکا بیانی بێت و د ناڤ ئویجاخێ دا بژیت ئەگەر کەسەک ژ ئویجاخێ پشتەڤانییێ لێ نەکەت، و (وەلائا) خۆ نەدەتێ، و هنگی ئەو کەسێ بیانی وەکی (مەولا) بۆ وی کەسی دهاتە نیاسین یێ پشتەڤانی لێ کری، و ب وی دهاتە نیاسین.. ئەڤە ئەو قانوون بوو یا جڤاکا عەرەبان قەت پێ لێ نەددانا.

ئەڤ صەحابییە ژ ئویجاخا لەخمییان بوو، و لەخمی ژ عەرەبێن قەحطانی دئێنە هژمارتن ئەوێن بنیاتێ وان بۆ یەمەنێ دزڤرت، پاشی ئەو ژ وێرێ پێن بەلاڤبووین، و ئەو عەرەبێن بەری هاتنا ئیسلامێ دەولەتەک ل (کندە) ل ژێرییا عیراقێ ئاڤاکری د نسەبا خۆ دا بۆ ڤێ ئویجاخێ دزڤرن.

حاطەب، و ئەو ناڤێ وی صەحابییە یێ نوکە دێ سەرهاتییا وی ڤەگێرین، کورێ عەمرێ کورێ عومەیرێ کورێ سەلەمەیێ لەخمییە، بەری

هاتنا ئیسلامێ ئەو مرۆڤەکێ بازرگان بوو، بازرگانییا قویت و خوارنێ دکر، د گەڕیانێن وی دا بۆ بازرگانییێ جارەکێ بەرێ وی کەفتە مەکەهێ، و ئەو جهـ ل دلێ وی هات لەو وی بڕیار دا ل وێرێ ئاکنجی ببت، بەلێ حەتا ئەو بشێت بمینتە ل مەکەهێ دڤێت ئەو کەسەکێ قورەیشی ببینت وەلائا خۆ بدەتێ، و ل سەر ناڤێ وی ئەو ببتە ئێک ژ ئاکنجییێن مەکەهێ، و ئەو کەسێ ئەڤ خزمەتە بۆ کری زوبەیرێ کوڕێ عەووامێ ئەسەدی بوو، ئەوێ دبوو کورمەتێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و بەلکی بازرگانییێ ئەو گەهاندبنە ئێک و نیاسینی د ناڤبەرا وان دا پەیدا کربت.

حاطبێ لەخمی یێ قەحطانی، بوو مەولایێ زوبەیرێ قورەیشی یێ عەدنانی، و بوو ئێک ژ کوڕێن مەکەهێ و بازرگانێن وێ یێ ناڤدار.. ژ ڤێ یا مە گۆتی زێدەتر دیرۆکێ چو ژ سەر و بەرێ ژیانا وی بەری ئیسلامێ بۆ مە ڤەنەگێڕایە، گاڤا ئیسلام هاتی و هەر ل ڕۆژێن ئێکێ زوبەیرێ هەڤالێ حاطبی ب ڕێکا ئەبووبەکری موسلمانبوو، و هەر چەندە دیرۆک بەحس ناکەت ژی، بەلێ دویر نینە زوبەیری دەور د هندێ هەبت کو هەڤالێ وی حاطب ئیسلامێ بنیاست و کەیف پێ بێت و ئەو ژی هەر زوی وەکی هەڤالێ خۆ موسلمان ببت، و هنگی ژییێ وی ل دۆرێن هەڤدە سالییێ بوو.

سەرهاتییێن ژیانا وی زێدە ب فرەهی نەهاتینە ڤەگێڕان، بەلێ ئاشکەرایە کو ئەو مرۆڤەکێ بازرگان بوو، و دبت گەلەک دەمێ خۆ وی ژ دەرڤەی مەکەهێ ب کاروانان ڤە بۆراند بن، لەو گەلەک بەحسێ وی نائێتەکرن.. ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن مشەختبووینە مەدینێ، بەلێ دیارە پشتی چوونا وی بۆ مەدینێ هێشتا هندەک مرۆڤێن وی یێن نێزیک و هندەک (مەصلحەتێن) وی یێن بازرگانی ل مەکەهێ مابوون،

وەکی دێ بۆ مە ژ سەرهاتییا ڤەکرنا مەکەهێ ئاشکەرا بت، و ل مەدینێ ئەو ئێک ژ موسلمانێن ڕاستگۆ و چاک بوو، یێن بەردەوام د فەرمانا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن-، و چونکی ئەو تیرهاڤێژەکێ سەکڤان و زیرەک بوو وی پشکداری د پتریا وان شەڕ و غەزایان دا کربوو یێن پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ ڕابووی، وەکی بەدرێ، و ل ڕۆژا ئوحودێ ئەو ئێک ژ وان صەحابییێن کێم بوو یێن ماینە ل مەیدانا شەڕی پشتی ڕمبازان جهێ خۆ بەردای و ڕەڤ کەفتییە ڕێزا موسلمانان، و دبێژن دەمێ ئەو هاتییە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و دیتی دێمێ وی یێ هاتییە بریندارکرن و ددانێ وی یێ هاتییە شکاندن، وی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کێ ئەڤە د گەل تە کرییە؟ وی گۆتێ: عوتبەیێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی.. هنگی ئەو و سەعدێ برایێ عوتبەی ژی د دویڤ دا چوون و لێ گەڕیان؛ دا وی بکوژن، بەلێ حاطەب ڤێرا گەهشت، و ئەو کوشت و هەسپێ وی بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا.

ل سالا پێنجێ د شەڕێ خەندەکێ ژی دا ئەو یێ ئامادەبوو، هەر وەسا ل صولحا حودەیبییێ ژی ل سالا شەشێ، و ئەو ئێک ژ وان صەحابییان بوو یێن بەیعە ل بن دارێ دایە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەوێن خودێ د دەر حەقێ دا گۆتی: ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾ (الأحزاب: ١٨) و ئەڤە باشترین شاهدەییە بۆ وان کو خودێ یێ ژ وان رازییە.

ژ بەر ئەمانەت و ئیخلاصا وی بۆ خودێ و پێغەمبەری، پشتی صولحا حودیبییێ ل سالا شەشێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتە مصرێ دا کاغەزا وی بۆ (موقەوقسی) ببەت، و گاڤا ئەو چوویە دیوانا مەزنێ مصرێ وی گۆتێ: زەلامەکی بەری تە حوکم ل ڤێرێ دکر دگۆت: ئەز

خـودايـێ بلـندتـرم، خـودێ تـۆل پـێ ستاند پاشـى تـۆل ژێ ستاند، و ئـەو ب دژوارى گرت، ڤێجا تو عيبرەتێ بۆ خۆ ژێ بگرە، و خۆ نەكە عيبـرەت بـۆ خەلكێ دى.. و وى كاغەزا پێغەمبەرى -سلاڤ لێ بن- كرە د دەستان دا، پشـتى وى كاغـەز خوانـدى و ڕەنگـەكێ نـەرميێ نيشـاداى، وى دان و ستاندنەک د گەل حاطـەبى كر، ل دووماهييا دان و ستاندنێ وى گۆت:

- تو دبێژى كو هەڤالێ تە پێغەمبەرێ خودێيە..

حاطـەبى گۆت: بەلێ، ئەو پێغەمبەرێ خودێيە.

موقەوقسى گۆت: دەمێ مللەتێ وى ئەو دەرێخستى، ئـەرێ بـۆچى وى نفرينەک ل وان نەدكر؟

حاطـەبى گۆتێ: ما تـو نـابێژى عيسـايێ كـوڕێ مـەريـەمێ پێغەمبـەرێ خودێيە؟

وى گۆت: بەلێ..

حاطـەبى گۆت: باشە دەمێ مللەتێ وى ئەو گرتى و ڤيـاى وى بكـوژن بۆچى وى نفرينەک ل وان نەدكر؟

هنگى موقەوقسى گۆتێ: سەحەت خۆش! تو مرۆڤـەكێ حـەكيمى و يـێ ژ نک ئێكێ حەكيم هـاتى.. پاشـى وى داخـوازا كسـەكى كـر كـو عـەرەبييێ بزانـت، و بەرسـڤا پێغەمبـەرى -سـلاڤ لـێ بـن- ب عـەرەبى نڤيسـى، تێـدا هاتبوو: ((بۆ موحەممەدێ كوڕێ عەبدللاهى ژ موقەوقسێ مەزنێ قبطـييان، سلاڤ ل تە بت، من كاغەزا تە خواند، و ئـەز تـێ گەهشـتم و مـن زانـى تـو بۆ چ گازى دكەى، من دزانى پێغەمبەرەكێ ماى بەلێ من هزر دكر ئەو دێ ژ شامێ دەركەڤت، من قەدرێ قاصدێ تە گرت، و دو جـاريـيێـن ب قـەدر ل نـک قبطـييـان مـن بـۆ تـە هنـارتن، و هنـدەک جلـک و هێسـترەک وەک ديارى دا لێ سويار ببى، و سلاڤ ل تە بت)).

هۆسا حاطـەبی ب قاصدییەکا سەرکەفتی زڤڕی ڤە پشتی کو ئەو پێنج ڕۆژان مایە ل مصرێ.. و ئێـک ژ وان جارییان مارییا قبطـی بـوو دەیکا ئیبراهیمێ کوڕێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و هێستر ئەو بوو یا ب ناڤێ (دلدل) دئێتە نیاسین.



بـەرچاڤترین سـەرهاتی د ژیانـا حاطـەبی دا، یـا کـو ئایەتـەکا قورئـانێ تێدا هاتییە خوارێ، کو مەزنترین دەرس ژێ دئێتە وەرگرتن، ل سالا هەشتێ مشەختی چێبووبوو، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بـڕیـاردای مەکـەهێ ژ دەستێن کافران بینتەدەر، وی نەڤیای سوحبەتا دەرکەفتنا خۆ ب ڕەنگەکێ ئاشکەرا بۆ هەمی کەسان بێژت؛ دا دەنگ و باس نەگەهنە کافرێن مەکەهێ، و ئـەو کـارێ خۆ بـۆ شـەڕی نەکـەن، و وی دوعـا ژ خودایێ خۆ کر کـو ئـەو مەسەلەیا وان ل بەر کافران ڤەشێرت.

حاطـەب ئێک ژ وان کەسێن کێم بـوو یێن سوحبەتا ڤێ دەرکـەفتنێ و جهـێ دەرکـەفتنێ ب دورسـتی دزانـی، و ئەڤـە نیشـانا هندێیـە کـو حاطـەب ئێک ژ وان کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بـاوەری پـێ هـەی، گاڤا حاطـەبی مەسەلە زانی، ئەو ڕابوو کاغەزەک بۆ هندەک مـەولایێـن خۆ ل مەکەهێ نڤیسی؛ دا ئـەو ئـاگەهـدارییـا مەزنێن مەکەهێ بکـەن و ئاگەهـ ژ خۆ هەبت!

د زمـانێ سیاسـەت و لەشـکەرییێ دا ئەڤـە خیانەتـەکا مەزنـە، و هەلویستەکێ (خەطـەرە)، خودێ ب ڕێکا وەحییـێ پێغەمبـەرێ خۆ ب ڤـی کارێ حاطەبی ئاگەهدارکر، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بـن- گۆتـە عـەلی و زوبـەیری و مقـدادی: هەڕنـە فـلان جهـی، ل وێـرێ دێ ژنـەکێ لـێ بینن، کاغەزەکا د گەل دا ژێ بستینن و بینن..

گاڤا ئەو گەهشتینە وی جهی و وان ئەو ژن ل وێرێ دیتی، وان گۆتێ: وێ کاغەزا د گەل تە هەی بدە مە، وێ گۆت: چو کاغەز د گەل من نینن، وان گۆتێ: یان دێ کاغەزێ دەیە مە، یان دێ جلکێن تە دەرنشیف کەین! هنگی ئەو ترسیا و کاغەزەک ژ ناڤ کەزییێن خۆ دەرێخست و دا وان، دەمێ وان کاغەز دایە پێغەمبەری و وی کاغەز ڤەکری زانی کو حاطەبی ئەو بۆ هندەک خەلکێ مەکەهێ یا نڤیسی و تێدا بەحسێ دەرکەفتنا پێغەمبەری یا کری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە حاطەبی: ئەڤە چییە حاطەب؟ وی گۆت: لەزێ د حوکمی دا ل سەر من نەکە، ئەز مرۆڤەکم د ناڤ قورەیشییان دا دژیم بەلێ ئەز نە ژ وانم، و ئەو موهاجرێن د گەل تە هەین وان هەمییان هندەک مرۆڤ ل مەکەهێ یێن هەین دێ کەس و کارێن وان ل مەکەهێ پارێزن، ئەز تێ نەبم، من چو مرۆڤ ل وێرێ نینن کەس و کارێن من بپارێزن، لەو من حەزکر قەنجییەکێ ل وان بکەم؛ دا ئەو کەس و کارێن من بپارێزن و چو نەخۆشییێ نەگەهینە وان، و ئەڤ کارێ من کری من نە ژ کافری کرییە، و ئەز ل دینێ خۆ ژی لێڤە نەبوویمە.

مەعنا: حاطەبی ڤیا (ئجتهادەکێ) بکەت، و بەلکی ژ لەزان دا، یان ژی ژ کێم شارەزاییا وی ب کارێن لەشکەری و سیاسی، وی هزر کربت ئەڤ کارە گەلەک یێ مەزن نینە، و ئەو زیانەکا مەزن ناگەهینتە کەسێ، مەسەلە هەمی ئەوە قورەیشی دێ کارێ خۆ کەن، و بەلکی ئەڤ کارێ وی ببتە ئەگەر کو ئەو چو نەخۆشییێ نەگەهیننە مرۆڤێن حاطەبی! بەلێ سوحبەت گەلەک ژ هندێ مەزنتر بوو.

ژ لایەکێ دی ڤە ئەڤ سەرهاتییە هندێ دگەهینت کو مرۆڤێ باش و موخلص ژی دبت د هندەک دەلیڤەیێن لاوازییا خۆ دا تووشی خەلەتییەکا مەزن بت، بەلێ ئەڤ خەلەتییە هندێ ناگەهینت کو ئەو (منافقە) یان

کسەکێ (دلپیس) و دوژمنە بۆ ئیسلامێ، نەخێر! چو مرۆڤ خۆ ئەگەر صەحابی ژی بت، و ژ خەلکێ بەدرێ بت، یێ پاراستی و (مەعصووم) نینە ژ خەلەتی و گونەهی..

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چ هەلویست ژ حاطەبی و ڤی کارێ وی وەرگرت؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گاڤا گوهـ ل بەرسڤا حاطەبی بووی، وی گۆتە صەحابییێن خۆ: وی ڕاستییا خۆ بۆ هەوە گۆت.. هنگی عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بهێلە ئەز ستویێ ڤی منافقی لێ بدەم، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەو ل بەدرێ ئامادە بووبوو، و ما تو چ دزانی بەلکی خودێ بەرێ خۆ دابتە خەلکێ بەدرێ و گۆتبتێ: ئێدی هوین چ دکەن بکەن، من گونەهێن هەوە بۆ هەوە یێن غەفراندین، هنگی ڕۆندک ژ چاڤێن عومەری هاتن و گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن(١).

د ڤێ سەرهاتییێ دا دەسپێکا سوورەتا (الممتحنة) هاتەخوارێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِي سَبِيلِي وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِي ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ① ﴾ ئەی ئەوێن باوەری ئینای، هوین دوژمنێن من و دوژمنێن خۆ بۆ خۆ نەکەنە دۆست و سەرکار، دلێ خۆ بدەنێ و دەنگ و باسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ ببەن، و نهێنییێن موسلمانان بۆ بێژن، و وان کوفر ب وێ حەقییێ کرییە یا بۆ هەوە هاتی ژ باوەری ئینانا ب خودێ و پێغەمبەرێ وی و ئەو تشتێ

---

(١) بوخاری و موسلم ژ عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی ڤەدگوهێزن.

هاتییه خواریَ ژ قورئانێ، ئەو پێغەمبەری و هەوە ژی -گەلی خودان باوەران- ژ مەکەهێ دەردئێخن؛ چونکی هەوە باوەری ب خودێ خودایێ خۆ و تەوحیدا وی ئینایە، ئەگەر هوین -گەلی خودان باوەران- پێخەمەت جیهادا د ڕێکا من دا مشەخت بووینە؛ دا ڕازیبوونا من ب دەست خۆ بێخن، هوین وەلائا خۆ نەدەنە دوژمنێن من و دوژمنێن خۆ، کو ب نەپەنی ڤە حەز ژ وان بکەن، و ئەز ب وێ یێ زانامە یا هەوە ڤەشارتی.و یا هەوە ئاشکەرا کری، و هەچییێ ژ هەوە وێ چەندێ بکەت ب ڕاستی ئەوی ڕێکا ڕاست یا ل بەر خۆ بەرزەکری و یێ ژ حەقییێ دەرکەفتی.

هەر وەکی خودێ ڤیا ڤێ سەرهاتییێ د سوورەتەکا قورئانێ دا تۆمار بکەت؛ دا ئەو ببتە دەرسەکا بەردەوام بۆ خودان باوەران کو ئەو نەفسێن خۆ پێ پەروەردە بکەن، و بزانن کو خودان باوەر، خۆ ئەگەر صەحابی ژی بت، مرۆڤە، و مرۆڤ هندەک جاران دکەفتە ژێر گڤاشتنا واقعی، و ئەو مرۆڤەکێ پاراستی نینە ژ خەلەتی و گونەهێ، ئەگەر خۆ ئەو گونەهـ گونەهەکا مەزن ژی بت، بەلێ پێتڤییە ل سەر دەسهەلاتێ و مرۆڤێن کاربدەست بزانن چاوا ب ڕەنگەکێ دورست دێ سەرەدەرییێ د گەل حالەتێن ب ڤی ڕەنگی کەن.

هەر چەندە ئەو کارێ حاطەبی کری ل دویڤ قیاسێن لەشکەری ڕەنگەکێ خیانەتێ بوو -وەکی مە گۆتی- و ئەگەر مرۆڤ -وەکی عومەری- ب سەر ڤە بەرێ خۆ بدەتێ بەلکی هزر بکەت ئەڤە ڕەنگەکێ منافقییێیە، بەلێ خودێ و پێغەمبەری مەسەلە ب ڕەنگەکێ دی هلسەنگاند و ژ لایەکێ دی ڤە ئەو نیشا مە دا، مرۆڤی نەفسەکا عەجێب هەیە، یا تژی کەند و کوورە، و ئەو ژ لاوازییێ قەت خلاص نابت، و ئەگەر خودێ بەردەوام مرۆڤی نەپارێزت، ئەو کییە ژ نەفسێ و هەوایێ وێ بێتە پاراستن؟ حاطەب موسلمانەکێ ڕاستگۆ بوو، و موهاجرەکێ دلسۆز بوو، و هەما بەسە

بێژین: ئەو ئێک ژ وان موجاهدان بوو یێن پشکداری د شەڕێ بەدرێ دا کرین.. بەلێ ئەڤێ هەمییێ ئەو ژ هندێ نەپاراست کو جارەکێ ئەو بهلگڤت و بکەفتە ژێر پێیبەستا نەفسێ، و پەیوەندییێن مرۆڤایەنییێ بەرێ وی چەندەکێ ژ ڕێکێ لادەت، و بەری بەرهەمەکێ خراب ب خەلەتییا وی ڤە بێت خودێ ئەو پاراست، و حالێ وی بۆ پێغەمبەری ئاشکەراکر، و پێغەمبەری ب نەرم و حەلیمییا خۆ، و شارەزییا خۆ د پەروەردەکرنا نەفسان دا، شیا ڤێ خەلەتییا هەڤالێ خۆ یێ نێزیک ڕاست بکەت، و شکەستنا وی ڤەگرت، و ئێکا هند ژ صەحابییان چێ بکەت کو ئەو نەبنە هاریکار بۆ شەیطانی ل سەر برایەکێ خۆ، و ب سنگەکێ فرەهـ پێشوازییێ لێ بکەن، پشتی وی (حەجمێ) خەلەتییا خۆ زانی، و ژێ پەشێمانبووی!



ل سەر زەمانێ خەلیفێن راشد حاطب یێ بەردەوام بوو ل سەر خزمەتا خۆ بۆ ئیسلامێ، و وی پشکداری د جیهادێ دا کربوو، و ل پاڕێزێ مەدینێ و ل سالا سیهێ مشەختی، ل سەر زەمانێ ئیمام عوثمانی، حاطەبی وەغەرا خۆ یا دووماهییێ کر، و ئیمام عوثمانی نڤێژ ل سەر کر، و هنگی ژییێ وی ل دۆرێن شێست و پێنج سالییێ بوو.

## ئەبوو هورەیرە
## راوییێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن

هەر چەندە ئەو نێزیکی چار سالان ب تنێ مابوو د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ئەڤە دەمەکێ کێمە ئەگەر ئەم د گەل مانا گەلەک صەحابییێن دی قیاس بکەین بەلێ ئەو گۆتن و حەدیسێن وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگوهاستین ژ یێن هەمی صەحابییێن دی پترن، و ئەڤە بۆ هندێ دزڤڕت چونکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دوعایەک بۆ وی کربوو کو هەر تشتەکێ وی گوهـ لێ ببت خودێ ژ بیرا وی نەبەت.. و وەسا چێبوو، هەر تشتەکێ وی ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گوهـ لێ بووی، یان صەحابییەکێ دی گوهـ لێ بووی و بۆ وی ڤەگێڕای ما ل بیرێ و حەرفەکا ب تنێ ژی قەت ژ بیرا وی نەچوو.. جارەکێ مەروانێ کوڕێ حەکەمی ڤیا ئمتیحانەکێ پێ بکەت بێی ئەو پێ بحەسیییت، ئینا مەروانی هنارتە ب دویڤ ڕا، و هنگی مەروان والییێ مەدینێ بوو، و گۆتێ: هندەک حەدیسان بۆ مە بێژە، و مەروانی فەرمان ل کاتبێ خۆ کربوو کو ئەو ل پشت پەردەی خۆ ڤەشێرت، و وان حەدیسان بنڤیست یێن ئەو دبێژت.. پشتی پتر ژ سالەکێ بۆری، جارەکا دی وی هنارەتە ب دویڤ ڕا، و گۆتێ: ئەو حەدیسێن پار تە بۆ مە گۆتین، بۆ مە بێژە ڤە، و وی فەرمان ل کاتبێ خۆ کر کو بەرێ خۆ بدەتە نڤیسینێ، پشتی وی حەدیس هەمی گۆتینە ڤە، مەروانی گۆتە کاتبێ خۆ: ها.. چاوا بوو؟ وی گۆت: ئەی ئەمیر! ب خودێ وی حەرفەکا ب تنێ ژی خەلەت نەگۆت!!

ژ بەر کو پتربیا سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی یا پاراستی و بۆ مە ڤەگێڕای، دوژمنێن سوننەتێ هەر ژ بەرێ وەرە کەربا خۆ یا هاڤێتییێ، و هندی ژێ هاتی بێبەختی یێ ب دویڤ ڤەناین، و کار بۆ هندێ یێ کری وی د چاڤێن خەلکی دا کرێت کەن، و وەکی مرۆڤەکێ درەوین نیشا وان بدەن؛ دا مە وە تێ بگەهینن کو ئەو کەسێن ئەڤ دینە بۆ مە ڤەگێڕای نە یێن باوەرێ بوون، لەو دڤێت ئەم چو تشتان ژ ڤی دینی وەکی ڕاستییەک وەرنەگرین! بەلێ خودێ سەرتیرا وان ل بەری دا، و ڤیانا ڤی صەحابی و هەمی صەحابییێن دی کەفتە دلێ خودان باوەران ڕاست و دورست، و نەڤیانا وان کرە نیشان ل سەر منافقییا خودانێ خۆ!

صەحابییێ ڤێ جارێ ئەم بەحس ژێ دکەین، راوییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و پارێزڤانێ گۆتن و سوننەتا وی عەبدررەحمانێ کوڕێ صەخرێ دەوسییە، و (دەوس) ئویجاخەکا عەرەبێن یەمەنییە، ژ چەقێ قەحطانییانە، د جاهلییەتێ دا ناڤێ وی (عەبد شەمس) بوو، بەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وی گوهاڕت و کرە (عەبدررەحمان)، ناڤێ دەیکا وی مەیموونایا کچا صەخری بوو.

ل وەلاتێ یەمەنێ ئەو هاتبوو سەر دنیایێ، و د ناڤ ئویجاخا دەوسییان دا ئەو هاتبوو پەروەردەکرن، و ئاشکەرایە کو ئویجاخا دەوسییان هنگی ئێک ژ ئویجاخێن عەرەبێن کۆچەر بوو، ل دەشتێ و ل بن خیڤەتان ئەو مەزنببووبوو، پشتی فامابووی وی شڤانی بۆ مالا خۆ دکر، ئەو بەحسێ خۆ دکەت و دبێژت: دەمێ من شڤانی دکر جارەکێ ل چۆلی من پشیکەکا کیڤی دیت، من ئەو ئینا و کەهی کر، بابێ من ئەو د کۆشا من دا دیت، گۆتە من: ئەو چییە؟ من گۆتێ: ئەڤە پشیکا منە، وی گۆتە من تو: (ئەبوو هورەیرە)یی یەعنی: باب یان خودانێ پشکێ، و هەما ژ هنگی وەرە ئەز

د نـاف مـرۆڤێن خـۆ و خـەلكی ژی دا ب ڤـی ناسـناڤی هاتمـە نیاسـین و ناڤدار بووم، و ئەڤ ناسناڤێ وی هندە بـەلاڤبوو حـەتا وێ دەرەجێ خـەلكی ئێدی ناڤێ وی یێ دورست ژ بیركر.

دەمێ هێشتا ئەو یێ بچویک بابێ وی مر، ئینا دەیكا وی چاڤێ خۆ دایێ و ئەو ب خودانكر حەتا مـەزنبووی، و چونكی ئـەو خـەلكێ (بـادیییێ) بوو و مرۆڤەكێ بێ خودان بوو ئەو كسـەكێ هـەژار و بەردەست تـەنگ بـوو، دەنگ و باسێن وی بەری موسلمان ببت ب فرەهی نەهاتینە زانـین؛ چـونكی ئەو ل مەكەهێ نەبوو و كەسێ ئاگەهـ ژ وی نـەبوو.. مـالا وی ئـەو و دەیكـا وی ب تنێ بوون، د گەل رەشمالەكێ كو ل پشتا حێشترێ دكر، و دەمێ خۆ ب شڤانیییێ ڤە دبۆراند، نان و زک وەكی ئەم ب كوردی دبێژین!

بەری وەحی بۆ پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- بێـت ب نێزیكـی شـەش سالان ئەبوو هورەیرە هاتبوو سەر دنیایێ، و هنگی ئەو ل وەلاتێ یـەمـەنـێ بـوو -وەكی مـە گۆتـی- پشتی گازییا ئیسلامێ دەست پێ كری ل سێ چـار سـالـەكـان، دەمـێ ژیـیـێ ئەبوو هورەیرەی ل دۆرێـن دەهـ سالییێ، ئێـک ژ ماقویلێن ئویجاخا دەوسییان، كـو ئویجاخا ئـەبوو هـورەیرەی بـوو، و نـاڤێ وی (طـوفـەیلێ كـورێ عـەمرێ دەوسـی) بـوو، هاتـە مەكـەهێ، مـەزنێن قورەیشییان پێشوازی لێ كر، و قەدر و بهایـەكێ زێدە دایێ، و گۆتێ: مـە دڤێت تە ل مەسەلەیەكێ هشیار بكەین، ئـەو ژی ئەڤەیـە: مرۆڤـەكێ درەویـن د ناڤ مە دا یێ دەركەفتی طـەعنێ ل دینـێ بـاب و بـاپیرێن مـە ددەت، و خەلكی ژێكڤە دكەت، وە نەبت تو خۆ نێزیكی وی بكەی یان باوەر ژ گۆتنا وی بكەی.. طوفەیلی باوەر ژ گۆتنا وان كر، و كار بـۆ هندێ نـەكر كـو ئـەو پێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- ببینت و گوهدارییا گۆتنا وی بكـەت.. بـەلێ ئەگەر خودێ تشتەک حەزكر، كەس نەشێت رێكێ لێ بگرت، بەری طوفـەیل

ژ مەکەهێ بزڤڕتە وەلاتێ خۆ، ئەو چوو کەعبێ دا طەوافەکێ بکەت، خودێ وەسا حەزکر ئەو دەمێ طوفەیل تێدا چوویە کەعبێ پێغەمبەر ژی -سلاڤ لێ بن- ل وێرێ بوو و وی قورئان دخواند، گاڤا طوفەیلی گوهـ ل قورئانێ بووی ئەو کەفتە دلی، لەو وی خۆ نێزیکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر؛ دا بزانت ئەو کییە؟ و ئەڤە چ گۆتنە ئەو دخوینت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێ وی گرت و ئەو برە مالا خۆ، و بەحسێ ئیسلامێ و قورئانێ بۆ وی کر، د گاڤێ دا ئەو موسلمانبوو، پاشی وی دەستویری ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خواست کو بزڤڕتە ناڤ ئویجاخا خۆ، دا ئەو ئیسلامێ د ناڤ وان دا بەلاڤ بکەت.

دەمێ طوفەیل زڤڕی وی ژ مالا خۆ دەست پێ کر، بابێ وی ژی موسلمانبوو، بەلێ دەیکا وی ل بەر نەهات، و هەر چەندە طوفەیل و بابێ وی ژ ماقویلێن ئەوسییان بوون ژی، بەلێ چونکی ئەوسی ژ (ئەعرابییان) دهاتنە هژمارتن، ئەو دهشک و زڤر بوون، لەو ئیسلام زوی ب زوی د ناڤ وان دا بەلاڤ نەبوو، ئێک ژ وان مرۆڤێن کێم یێن باوەری ب ئیسلامێ ئینای و ل سەر دەستێ طوفەیلی موسلمانبووین ئەبوو هورەیرە بوو، و بەلکی ئەو هنگی ل دۆرێن پازدە سالییێ بت.

ل ڤێرێ دەنگ و باستێن ئەبوو هورەیرەی دئێنە برین حەتا دەسپێکا سالا حەفتێ مشەختی، ل ڤی دەمێ ژییێ ئەبوو هورەیرەی ل دۆرێن بیست و پێنج سالییێ بوو، و حالێ وی هەر وەکی بەرێ بوو، ئەو و دەیکا خۆ د شڤانی و هەژارییا خۆ دا دژیان، ل ڤێ سالێ هندەک گوهۆڕینێن بەرچاڤ ب سەر گازییا ئیسلامێ دا هاتن، صولحا حودەیبییێ د ناڤبەرا موسلمان و کافرێن مەکەهێ دا هاتە بەستن، و بڕیار هاتەدان دەهـ سالێن دی شەڕ نەئێتەکرن، و هەر لایەکی ماف هەیە گازییا خۆ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ

بکەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قاصدێن خۆ هنارتنە گەلەک وەلاتان، و ئیسلام بۆ مەزنێن وان پێشکێش کر، و گەلەک ئویجاخان بڕیار دا وەفدێن خۆ بهنێرنە مەدینێ؛ دا ژ نێزیک ب گازییا ئیسلامێ ئاگەهدار بن، هەر وەسا ئەو موسلمانێن مشەختبووینە وەلاتێ حەبەشییان زڤڕینە مەدینێ.. و گەلەک کەس ژ وەلاتێ یەمەنێ ژی پشتی موسلمانبووین بڕیار دا مشەخت ببنە مەدینێ، و ئێک ژ وان ئەبوو هورەیرە بوو.

ل وی دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب ڤەکرنا خەیبەرێ ڤە یێ موژیل، طوفەیلێ کوڕێ عەمرێ دەوسی د گەل حەفتێ حشتێ مالێن دەوسی ژ یەمەنێ گەهشتنە مەدینێ، و ئێک ژ وان مالان مالا ئەبوو هورەیرەی یا بچویک بوو، ئەوا ب تنێ ژ وی و دەیکا وی پێک دهات، هەر چەندە دەیکا وی موسلمان نەبووبوو ژی، و نەڤیانا ئیسلامێ ژی د دلی دا بوو، بەلێ هندی هند ئەبوو هورەیرە بۆ دەیکا خۆ یێ باش بوو، و رەحم پێ دبر وی دەیکا خۆ نەهێلا ب تنێ ل یەمەنێ، و ئەو قانعکر کو د گەل وی بێتە مەدینێ بلا هەر ل سەر دینێ خۆ بت! دەیکا وی ژی ژ لایێ خۆ ڤە دلێ وی نەهێلا و د گەل وی هاتە مەدینێ.



ل وان سێ چار سالێن ئەبوو هورەیرەی ل مەدینێ بۆراندین ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو یێ نێزیک بوو ژ پێغەمبەری، پتریا دەمێ خۆ وی ل مزگەفتێ دبۆراند، ل وی جهێ دگۆتنێ: (الصفة)، و ئەو بەرسفکەک بوو بانێ وێ وەکی کەپرێ ب چەڤێن دارقەسپان هاتبوو ڕائێخستن، و صەحابییێن زوگورد ژ موهاجر و غەریبان لێ دمان، و خەلکی ئەو ب خودان دکرن، ئەبوو هورەیرە دەمەکێ درێژ مابوو ل وێرێ، جار ئەو ل سەر صەحابییان دگەڕیا ژ وان فێری قورئانێ دبوو، هەر وەسا

حەدیس و سەرهاتییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێن بەری هنگی چێببووین ژ وان وەردگرتن، و جار ژی خزمەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر و د گەل وی دهات و دچوو، و پشکدارییا وی د سەفەر و جیهاد و دەرکەفتنێن وی دا دکر..

تشتێ دلێ ئەبوو هورەیرەی نەخۆش دکر ل دەسپێکا مشەختبوونا وی بۆ مەدینێ ئەو بوو دەیکا وی یا مجدبوو ل سەر کوفرا خۆ، و هندی ئەبوو هورەیرەی ئیسلام ل بەر وێ شرین دکر وێ دگۆت: ئەز دینێ باب و باپیرێن خۆ ناهێلم.. پشتی ئەبوو هورەیرە ژێ بێ هیڤی بووی، رۆژەکێ ئەو هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و وی دکرە گری، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تە خێرە؟ وی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر جار من داخواز ژ دەیکا خۆ دکر کو ئەو موسلمان ببت، وێ قەبویل نەدکر، ئەڤرۆ جارەکا دی من ئەو داخواز ژێ کر، وێ هندەک گۆتنێن من پێ نەخۆش د دەر حەقا تە دا گۆتن، ڤێجا ئەزێ هاتیمە نک تە دا تو دوعایەکێ بکەی کو خودێ بەرێ دەیکا من بدەتە ئیسلامێ. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- داخوازا وی ب جهئینا و دوعایەک بۆ دەیکا وی کر، ئەبوو هورەیرە دبێژت: هنگی ئەز زڤریمە نک دەیکا خۆ، من دیت ئەو ب نک من ڤە هات و شاهدە دا، ئینا ئەز زڤریمە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ژ کەیفان دا من کرە گری، و من گۆتێ: مزگینییا من ل تە بت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خودێ بەرێ دەیکا من دا ئیسلامێ.

هندە ئەبوو هوریرەی حەز ژ دەیکا خۆ دکر، و د گەل وێ یێ باش بوو، و خێر بۆ وێ دڤیا، دبێژن: هندی دەیکا وی یا ساخ ئەو نەدچوو حەجێ، دا خزمەتا وێ بکەت، و ژێ دویر نەکەڤت، و پشتی ئەو مری ژ نوی ئەو چوو حەجێ.. و ژ وان سەرهاتییێن ڤیانا وی بۆ دەیکا وی ئاشکەرا دکەن ئەوە

دەمێ ئەو دبێژت: ڕۆژەکێ ئەز ژ برسان دا دەرکەفتمە مزگەفتێ، و دیارە ئەو وەخت نە ئەو بوو یێ خەلک لێ دچتە مزگەفتێ، گۆت: من هندەک صەحابی ل وێرێ دیتن، وان پسیارا من کر: بۆچی ڤی وەختی تو دەرکەفتی؟ وی گۆت: ژ برسان دا ئەز یێ دەرکەفتیم. وان گۆت: ب خودێ ئەم ژی وەکی تە ژ برسان دا یێن دەرکەفتین، ئەبوو هورەیرە دبێژت: ئەم ڕابووین چووینە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینا وی گۆتە مە: هوین ڤی وەختی دەرکەفتینە چ؟ وان گۆت: ئەم ژ برسان دا یێن دەرکەفتین، گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- تەبەقەکا قەسپان ئینا و هەر ئێک ژ مە دو قەسپ دانێ و گۆت: ئاڤێ ب سەردا کەن ئەڤرۆ ئەو دێ تێرا هەوە کەن. ئەبوو هورەیرە دبێژت: من قەسپەک خوار، و ئێک ژ ناڤ جلکێن خۆ دا ڤەشارت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی تە وە کر؟ وی گۆت: من ئەو بۆ دەیکا خۆ هلگرت! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: وێ ژی بخۆ، ئەم دێ دوێن دی دەینە تە بۆ دەیکا تە.

ئەبوو هوریرەی جارەکێ بەحسێ حالێ خۆ یێ بەرێ کر و گۆت: ئەز یێ ب ئێتیمی مەزن بوویم، و دەمێ ئەز مشەختبوویم ئەز مرۆڤەکێ هەژار بووم، و من ب کرێ بۆ بوسرەیا کچا غەزوانی کار دکر، نان و زک، و ب سویاربوونا دەواری، من خزمەتا وان دکر، ئینا خودێ وەسا حەزکر وێ شوی ب من کر، ڤێجا حەمد بۆ وی خودایی بت یێ ئەڤ دینە کرییە جهێ ڕاگرییێ، و ئەبوو هوریرە کرییە ئیمام.

ئەبوو هورەیرە مرۆڤەکێ ب صەبر و تەحەممول بوو، صەبر ل سەر نەخۆشییا فەقیرییێ کر، و صەبر ل سەر وەرگرتنا علمی کر، حەتا ڕۆژەک ب سەر دا هاتی خودێ بەرەکەت بۆ هاڤێتییە مالێ وی و عەیالێ وی و علمێ وی ژی، و ئەو د ناڤ خەلکی دا بوویە ئیمام و پێشەوا. و پشتی

ئەو گەهشتییە ڤێ دەرەجێ ژی، وی بۆرییێ خۆ قەت ژ بیرا خۆ نەدبر؛ دا هەردەم شوکرا خودێ ل سەر ئەزمانێ وی بت.. رۆژەکێ ئەو بێنژی وی کراسێ خۆ یێ کتانی دا بەر دەڤێ خۆ، پاشی وی گۆت: هەی هەی! ئەبوو هورەیرە کراسێ کتانی ددتە بەر دفنا خۆ! و ئەز ئەو بووم یێ د ناڤبەرا مینبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و مەزەلکا عائیشایێ دا ژ برسان دا دلگرتی دبووم و دکوفتمە عەردی حەتا خەلکی هزر دکر ئەز یێ دینبوویم و طەب دئێنە من، و ئەو ب خۆ ژ برسان دا ئەز دکەفتم!

د ژیانا خۆ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتر ژ جارەکێ ئەو هنارتبوو بەحرەینێ بۆ هندەک کاران.. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو باوەرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب وی دهات، و دزانی کو ئەو ب کێر هندێ دئێت کار بمیننە ب هیڤییا وی ڤە. ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ ئیمام عومەر بوویە خەلیفە، وی ل سەری ئەبوو هورەیرە د گەل عەلائێ حەضرەمی هنارتە بەحرەینێ، دا ئەو دینی نیشا خەلکی بدەت، و حەدیسان بۆ وان بێژت، و فەتوایان بدەت.. و پشتی عەلائێ حەضرەمی مری ل سالا (٢١) مشەختی عومەری ئەو کرە والییێ بەحرەینێ، و عەدەتێ عومەری بوو دەمێ وی کەسەک دکرە والی ل جهەکی، وی ب هویری دویچوونا والی دکر، و حسێبەکا دژوار د گەل دکر، پشتی دەمەکی ل سالا (٢٣) عومەری ئەو ژ ویلایەتێ ئێخست و داخواز ژێ کر ئەو بزڤرتە مەدینێ، گاڤا ئەو هاتی عومەری گۆتێ: تە چاوا والیاتی دیت؟ وی گۆت: دەمێ تە ئەز کریمە والی ب دلێ من نەبوو و من پێ خۆش نەبوو، پشتی من حەز ژێ کری تە ئەو ژ من ستاند!

پاشی عومەری گۆتێ: تە چەند مال د گەل خۆ ئینایە؟ وی گۆت: بیست هزار، عومەری گۆتێ: دوژمنێ خودێ و کیتابا وی! تە ئەو ژ کیڤە

ئینایـە؟ وی گـۆت: ئـەز نـە دوژمنـێ خـودێ و کیتابـا ویمـە، ئـەز دوژمنـێ دوژمنێ وانم، من هندەک مال هەبوو من بازرگانی پێ کر و خودێ بەرەکەت هاڤێتێ و ئەو زێدەبوو، عومەری گۆتێ: سەرمالێ تە چەند بوو بۆ خۆ ڕاکە، و یـێ دی بزڤڕینـە (بیـت المـال)ێ، و هنگـی عومـەری دوازدە هـزار ژێ سـتاندن، و کرنـە د نـاڤ مـالێ دەولـەتێ دا.. گاڤـا ئـەبوو هـورەیرەی ئـەڤ چەندە ژ وی دیتی گۆت: خودێ ئەمیرولموئمنینی بغەفرینت.

پشتی دەمەکی عومەری هنارتە ب دویڤ وی ڕا و گـۆتێ: ئـەز دێ تـە کەمـە والـی.. وی قـەبویل نـەکر، و گـۆت: ئـەز والیـاتییێ ناکـەم. عومـەری گۆتێ: ئێکێ ژ تە باشتر داخوازا ویلایـەتێ کریـوو کـو یووسفە -سلاڤ لـێ بن- ڤێجـا بـۆچی تـو قـەبویل ناکـەی؟ وی گـۆت: یووسـف پێغەمبـەر بـوو و کوڕێ پێغەمبـەری بـوو، و ئـەز ئـەبوو هورەیرەیێ کـوڕێ ئومەیمایێمـە! پشـتی هنگی ئەز دترسم هوین سێ و دویان د گەل من بکەن. عومـەری گـۆتێ: مـا بۆچی تو نابێژێ: پێنجان؟ وی گۆت: نە، ئەز دترسم بێ علم باخڤم، و بێ حلم حوکمی بکەم. و ئەز دترسم قامچی ل پشتا من بێنـەدان، و مـالێ مـن ژ من بێتە ستاندن، و خەبەر بێنە من!

ل سـەر زەمـانێ ئەبوویـەکر و عومـەری ئـەبوو هوریرە ئێـک ژ جندییێن ئیسـلامێ بـوو، و وی ب دەسـتێ خۆ پشـکداری د گەلـەک ژ وان شـەڕان دا کربوو یێن چێبووین، وەکی شەڕێ مورتەددان، و شەڕێ یەرمووکێ، و شەڕێن فەتحا عیراق و وەلاتێ فورسێ.

* * *

دەمـێ فتنـەچی دژی عوثمـانی ڕابووین، و هاتینـە مـەدینێ و حیصـار دانایە سەر مالا عوثمانی، ئەبوو هورەیرە ل مەدینێ بوو، و ئەو ئێـک ژ وان صـەحابییان بـوو یـێن چـەکێ خـۆ هلگرتـی و چـووی بـەرەڤانییێ ژ ئیمـامی

بکەت، و ئەگەر نە ژ بەر هندێ با عوثمانی نەهێلا ئەو شەڕی بکەن، ئەو دا بەر سنگێ فتنەچییان گرن، و وان پاشدا بەن.. و هەر چەندە عوثمانی نەهێلا ئەو بەرەڤانییێ بکەن ژی، بەلێ ئەبوو هورەیرە حەتا گاڤا دووماهییێ ژی ل بەر دەرێ ئیمامی بوو، و شیرێ وی د دەستان دا بوو، و هەر ژ بەر وێ چەندێ دەمێ ئەبوو هورەیرە مری کوڕێن عوثمانی سندریکا وی هلگرت حەتا برییە بەقیعێ و ل وێرێ هاتییە ڤەشارتن، و دەمێ موعاویە ژی بوویە خەلیفە وی شیرەت ل والییێ خۆ ل مەدینێ کر کو ئەو قەدرێ عەیالێ ئەبوو هورەیرەی بگرن.

پشتی خیلاف د ناڤبەرا صەحابییان دا چێبووی ل سەر دەمێ ئیمام عەلی، ئەبوو هورەیرە ژ وان صەحابییان بوو یێن خۆ ژ هەردو لایان دایە پاش، و ئەڤە یا غەریب نینە ئەگەر ئەم بیرا خۆ ل هندێ بینینە ڤە کو ئەو ئێک ژ وان صەحابییانە یێن ئەڤ حەدیسە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگوهاستی: ((سَتَكُونُ فِتَنٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنْ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنْ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنْ السَّاعِي، وَمَنْ يُشْرِفْ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ، وَمَنْ وَجَدَ مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ))[1] یەعنی: هندەک فتنە دێ پەیدا بن ئەوێ تێدا ڕوینتە خوارێ چێترە ژ وی یێ ژ پێیان ڤە بت، و ئەوێ تێدا ب ڕێڤە بچت چێترە ژ وی یێ بکەتە غار، و هەچییێ ب نک ڤە بچت ئەو دێ وی د گەل خۆ بەت، و هەچییێ جهەکی ببینت بلا پەنایێ بەتێ و خۆ ژێ بپارێزت.

و هەر چەندە ئەبوو هورەیرەی بەیعە دابوو ئیمام عەلی، بەلێ ئەو د گەل وی دەرنەکەفتە شەڕی دەمێ خیلاف د ناڤبەرا وی و طەلحە و زوبەیری دا چێبووی، پاشی د ناڤبەرا وی و موعاویەی دا، و وی خۆ نە دا

(١) بوخاری ڤەدگوهێزت.

د گەل لایێ دی ژی، و ئەڤە هەلویستێ پتریبا صەحابییان بوو، بەلێ د گەل هندێ ژی و ژ بەر بەرەڤانییا وی ژ ئیمام عوثمانی حەتا ڕۆژا دوومـاهییێ ئومەوییان، ب تایبەتی پشتی حوکم کەفتییە دەستێ وان، قەدرەکێ زێدە ددا ئـەبوو هـورەیرەی، حـەتا گەلـەک جـاران والییـێ مـەدینێ مـەروانێ کـوڕێ حەکەمی دەمێ ژ مەدینێ دەردکەفت و دچوو حەجێ، وی ئەبوو هورەیرە ددانا جهێ خۆ، و هندەک جاران دەمـێ موعاویـە ژ مـەروانی عێجـز دبـوو، ئـەو دئێخست و ل شوینا وی ئەبوو هورەیرە دکرە والی.. ئـەڤ چەنـدا هـە بووبـوو ئەگـەر کـو دوژمنـێن صـەحابییان -ب گشـتی- و دوژمنـێن موعاویـەی و ئومـەوییان -ب تایبـەتی- بێبـەختییان ب دویـڤ ئـەبوو هـورەیرەی ڤـەنن، و بێـژن: ئـەو دژی ئیمـام عـەلی و مالباتـا وی بـوو، و ئەڤـە درەوەکـا زیـق و ئاشکەرایە.

و ژ تەواضعا وی دەمێ ئەو ئـەمیرێ مـەدینێ ئـەو ل کـەرێ خۆ سـوار دبوو، و هندەک جاران دچوو داران و ئەو ل پشتا خۆ دکرن، و دەمـێ د بـەر خەلکی ڕا دبۆری، بـۆ ترانـە دا بێـژت: ڕێکـا ئـەمیری بکـەن، بـارێ وی یـێ گرانـە! و دەمـێ هـەڤالێن وی ئـەو ژ ڤـێ چەنـدێ ددا پـاش، و ئـو وە تـێ دگەهاند کو ئەڤە کێماسییە بۆ ئەمیری وی گوهێ نەددا وان، و ب گۆتنا وان نەدکر.

ل سـالا (٥٩) مشـەختی ل سـەر زەمـانێ موعاویـەی، دەمـێ عـەمرێ ئـەبوو هـورەیرە حـەفتێ و هەشـت سـال، ئـەو ل بـاژێڕێ مـەدینێ کەفتـە بـەر نساخییا مرنێ، هەڤالێ وی ئەبوو سەلەمە چو سەرا بدەت، دوعایەک بۆ کر و گۆت: یا رەبی تو شفایێ بدەیە ئەبوو هورەیرەی. ئەبوو هورەیرەی دو جاران گۆت: یا رەبی تـو مـن نـەزڤرینی.. پاشـی گـۆت: ئـەبوو سـەلەمە، ئەگـەر تـو بشێی بمری بمرە، ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا ئەبوو هـورەیرەی د دەسـتان دا

نێزیکە زەمانەک ب سەر مرۆڤێن زانا دا بێت، مرن ل بەر ئێک ژ وان ژ زێرێ سۆر چێتر بت، یان نێزیکە زەمانەک ب سەر خەلکی دا بێت، زەلامەک د بەر قەبرێ موسلمانەکی ڕا ببۆرت و بێژت: خوزی ئەز خودانێ ڤی قەبری بامە.

هەر د ڤێ نساخییێ دا ئەبوو هورەیرەی کرە گری، هندەکان گۆتێ: بۆچی تو دکەیە گری؟ وی گۆت: ئەز نە بۆ ڤێ دنیایا هەوە دکەمە گری، بەلێ ئەز بۆ دویرییا سەفەرا خۆ دکەمە گری و کێمییا زادێ خۆ، ئەز یێ بەر ب نشیڤییەکی ڤە دچم سەری دکێشتە بەحەشتێ و جەهنەمێ، و ئەز نزانم کانێ دێ من ب کیژ لایی دا بەن.

پشتی ئەو مری والییێ مەدینێ وەلیدێ کوڕێ عوتبەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی نڤێژ ل سەر کر، و ژ صەحابییان عەبدللاهێ کوڕێ عومەری و ئەبوو سەعیدێ خودری د گەل جەنازێ وی دەرکەفتنە بەقیعێ، و کوڕێن عوثمانی سندریکا وی هلگرتبوو، و مەروانێ کوڕێ حەکەمی ژی د گەل دا بوو، و ڤەشارتنا وی ل بەقیعێ بوو.

ژنکا وی -وەکی مە گۆتی- بوسرەیا کچا غەزوانی بوو، خویشکا صەحابییێ ناڤدار عوتبەیێ کوڕێ غەزوانی، و پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی ژن ئینابوو، و گەلەک جاران وی حەمدا خودێ دکر کو ئەڤ ژنکە بوویە رزقێ وی، سێ کوڕ و کچەک وی هەبوون، و کچا وی شوی ب تابعییێ ناڤدار سەعیدێ کوڕێ موسەییبی کربوو.



تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر ل نک ئەبوو هورەیرەی ریوایەتا وی یا زێدە بوو بۆ حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر چەندە دەمێ مانا وی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ چار سالان زێدەتر نەبوویە، و

ریوایەتا وی یا زێدە بۆ حەدیسان، کو ژ یا هەمی صەحابییان پترە، قیاس د گەل وی دەمێ کێم یێ وی د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هێشتا ل سەر دەمێ وی بووبوو جهێ پسیارێ ژ لایێ هندەک کەسان ڤە، لەو پتر ژ جارەکێ وی بەرەڤانی ژ خۆ دکر کو هێز و شیانا ل سەر ریوایەتێ بۆ پتر ژ ئەگەرەکێ دزڤڕت، و بەری هەمییان بۆ هزرا وی یا تیژ و شیانا وی یا زێدە بۆ ژ بەرکرنێ، و بەرەکەتا ڤێ چەندێ بۆ وێ گۆتنێ دزڤڕت یا ئەبوو هورەیرە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت، دەمێ وی گۆتییە هندەک مرۆڤان: هوین دبێژن: ئەبوو هورەیرە گەلەک حەدیسان ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگێڕت، و ژڤانێ مە ل نک خودێیە، ئەز مرۆڤەکێ مسکین بووم، من نان و زک خزمەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، موهاجر ل سویک و بازاران دموژیل بوون، و ئەنصاری ب مالێ خۆ ڤە دموژیل بوون، جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((کی دێ کراسێ خۆ ڤەکەت ئێدی ئەو تشتەکێ ژ من گوهـ لێ بووی ژ بیر ناکەت؟)) من کراسێ خۆ ڤەکر، حەتا گۆتنا وی تمامبووی، من کراسێ خۆ گرت، ئێدی تشتەکێ من گوهـ لێ بووی من ژ بیر نەکر[1].

هەر وەسا ئەبوو هورەیرە مرۆڤەکێ بستە بوو ل سەر داخوازا علمی، ئوبەییێ کوڕێ کەعبی یێ صەحابی دبێژت: ئەبوو هورەیرە مرۆڤەکێ زێدە بستە بوو، وی هندەک پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکرن، مە بستە نەدکر وان پسیاران ژ وی بکەین.

ئەبوو هورەیرە دبێژت: ئەز شەڤا خۆ دکەمە سێ پشک، پشکەکێ ئەز نڤێژان دکەم، و پشکەکێ ئەز دنڤم، و پشکەکێ ئەز حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل بیرا خۆ دئینمە ڤە. و خودێ وەسا حەزکر هندەک فەقی و

---

(١) موسلم ڤەدگوهێزت.

شاگردەیێن زیرەک ب رزقێ وی کرن حەدیس ژ وی وەرگرتن، ژ بەرکرن و نڤیسین و ب ئیمانەت بۆ موسلمانان ڤەگوهاستن، و ژ وان زاڤایێ وی ئیمامێ تابعییان سەعیدێ کورێ موسەییبی، هەر وەسا هەممامێ کورێ مونەببهی ژی و گەلەکێن دی.

ژ بلی ڤێ چەندێ ئەو گەلەک ل دویڤ حەدیسان دچوو و پسیارا وان ژ صەحابییێن ژ خۆ مەزنتر دکر یێن کو دەمەکێ درێژتر د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆراندی، و وی ئەو حەدیس ڤەدگێڕان، یەعنی: ئەو حەدیسێن وی ڤەگێڕاین نە هەمی ئەون یێن وی ئێکسەر ژ پێغەمبەری گوهـ لێ بووین. و هەر چەندە ئەبوو هورەیرە مرۆڤەکێ نەخواندەڤان ژی بوو، بەلێ وی هندەک شاگردەیێن خواندەڤان هەبوون حەدیسێن وی دنڤیسین، و دیرۆکا علمێ حەدیسێ بۆ مە ڤەدگێڕت کو زانایێ تابعی هەممامێ کورێ مونەببهی گەلەک حەدیس ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەگوهاستبوون و بۆ خۆ د کتێبەکێ دا نڤیسیبوون و ناڤێ وێ کربوو (الصحیفة الصحیحة) وەکی (الصحیفة الصادقة) ئەوا عەبدللاهێ کورێ عەمری یێ صەحابی بۆ خۆ نڤیسی، و ئەڤ هەردو (صەحیفە) یان کتێب ب تمامی یێ هاتینە ڤەگوهاستن بۆ مە، و ئەو هندێ دگەهینت کو هەر زوی، بەری سالا (٥٩)ێ مشەختی حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ لایێ صەحابی و تابعییان ڤە هاتبوونە کۆمکرن و نڤیسین، نە وەکی هندەک نەزان هزر دکەن دەمێ دبێژن: دەمەکێ درێژ حەدیس نەهاتبوونە نڤیسین، لەوا ئەو نە جهێ باوەرێنە.

ل دووماهی وەک زانینەکا کورت مە دڤێت بێژین: ئیمامێ بوخاری و موسلم (٦٠٩) حەدیس ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەگوهاستینە، و خودان هەر چار سونەنان د گەل ئیمام مالکی (١٦٠٩) حەدیس ژێ ریوایەتکرینە.

خودێ خێرا وی مەزن بکەت.

# عوكاشەيێ كوڕێ محصەنى
# ئەوێ بەرى هەمييان ڕاكرى..

گۆتنەكا هەى د ناڤ خەلكى يا بەلاڤە، دەمێ كەسەك تشتەكى بكەت، و ئێكێ دى بەرى وى ڕاكربت، دێ بێژنێ: ((سبقك عكاشة)) يەعنى: عوكاشەى بەرى تە ڕاكر.. ڤێجا عوكاشە ئەوێ بەرى هەمييان ڕاكرى كى بوو؟ و سەرهاتييا وى د بەرێڕاكرنێ دا چ بوو؟

دا بەرێ خۆ بدەينێ..

عەبدللاهێ كوڕێ عەبباسى ددەتە زانين كو جارەكێ كۆمەكا صەحابييان دڕوينشتيبوون پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە د ناڤ وان، و گۆت: ئوممەت بۆ من هاتنە پێشچاڤكرن، من ديت پێغەمبەرەك چوو زەلامەك د گەل دا بوو، و پێغەمبەرەك چوو دو زەلام د گەل دا بوون، و زەلامەك چوو كۆمەكا كێم د گەل دا بوون، و پێغەمبەرەك چوو كەس د گەل دا نەبوو.. و من ڕەشاتييەكا مەزن ديت بەربەرێ عەسمانى هەمى گرتبوو، من هيڤى كر ئەو ئوممەتا من بت، بۆ من هاتە گۆتن: ئەڤە مووسا و ئوممەتا وييە، پاشى بۆ من هاتە گۆتن: بەرێ خۆ بدێ.. من ديت ڕەشاتييەكا مەزن بەربەرێ عەسمانى هەمى گرتبوو، و بۆ من هاتە گۆتن: هۆسا ژى بەرێ خۆ بدە و هۆسا ژى.. من ڕەشاتييەكا مەزن ديت بەربەرێ عەسمانى گرتبوو، بۆ من هاتە گۆتن: ئەڤە ئوممەتا تەيە، و د گەل وان حەفتێ هزار بێ حسێب دێ چنە بەحەشتێ.

ئبن عەبباس دبێژت: خەلک ڤەرەڤین، بێی بۆ وان بێتە ئاشکەراکرن، ئینا صەحابیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دان و ستاندن کر، و وان گۆت: هندی ئەمین ئەم هاتبووینە سەر دنیایێ موشرک، پاشی مە باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینا، بەلێ ئەڤە زارۆکێن مەنە.. سوحبەت گەهشتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی گۆت: ((هُمُ الَّذِينَ لاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَكْتَوُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)) یەعنی: ئەو ئەون یێن (تەشائوم) و بێ ئیفلەحییێ ب تشتان ناکەن، و پێڤەخواندنێ ناخوازن، و کەواندنێ ب کار نائینن، و خۆ دهێلنە ب هیڤییا خودێ ڤە.

هنگی عوکاشە ڕابوو ڤە و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز ژ وانم؟

وی گۆت: ((بەلێ)).

ئێکێ دی ڕابوو ڤە و گۆت: ئەز ژی ژ وانم؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە وی: ((عوکاشەی بەری تە ڕاکر))[1].

ئەڤە مەزنترین مزگینی بوو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەهشتییە عوکاشەی کو ئەو ئێک ژ وانە یێن ڕۆژا قیامەتێ بێ حسێب دچتە بەحەشتێ، ڤێجا عوکاشە کی بوو؟ و وی چ کربوو حەتا ئەڤ خەلاتێ مەزن وەرگرتی؟

عوکاشە ئێک ژ صەحابییێن نە قورەیشی بوو، هەر چەندە ئەو ئێک ژ خەلکێ مەکەهێ دهاتە هژمارتن ژی، هێڤێنی وی ژ ئویجاخا (بەنوو ئەسەد) بوو، هێشتا بەری هاتنا ئیسلامێ ئەو یان مالباتا وی هاتبوونە مەکەهێ و ل وێرێ خۆجھ بوون، و بوو ژ حەلیفێن مالباتا (عەبدشەمس)

---

(١) بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن.

یا قورەیشی، و ناڤێ وی یێ دورست هەر عوکاشە بوو، بابێ وی محصەنێ کورێ حورثانێ کورێ قەیسێ ئەسەدی بوو.

بەری هاتنا ئیسلامێ ب نێزیکی بیست و دو سالان ئەو هاتبوو سەر دنیایێ، و وی ژیانا خۆ ل مەکەهێ دبۆراند، و دبێژن: هەر ژ جحێلینییا خۆ ئەو مرۆڤەکێ ناڤدار بوو ب لاوینی و عەقلداری و بستەییا خۆ ل سەر گۆتنا حەقییێ، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو ئێک ژ وان کەسان بوو یێن هەر ژ سالێن ئێکێ ژ هاتنا ئیسلامێ خۆ ب کاروانێ خودان باوەران ڕا گەهاندی، و هاتییە د ناڤ ڕێزێن موسلمانان دا، و وی ژی وەکی گەلەک صەحابییێن دی نەخۆشی و ئازاردان ژ دەستێن کافرێن قورەیشییان دیت.

سەرهاتییێن ژیانا وی ل مەکەهێ ب بەرفرەهی بەری مشەختبوونێ مە نەزانینە، بەلێ ئاشکەرایە کو ئەو و خەلکێ مالباتا وی هەمی، حەتا خویشک و برایێن وی ژی ژ وان خودان باوەران بوون یێن مال و حالێ خۆ ل مەکەهێ هێلاین و قەستا مەدینێ کرین، دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستویری دایە صەحابییێن خۆ کو ئەو مشەخت ببن.

ل مەدینێ، عوکاشە وەکی هەمی مشەختییان بوو ئێک ژ ئەندامێن جڤاکا موسلمانان یا نوی، و ئەو ژی ژ وان کەسان بوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل کار و باران دا پالدا سەر، و دەمێ دەستویری بۆ موسلمانان هاتییەدان کو ئەو بەرەڤانییێ ژ خۆ بکەن، و ب چالاکییێن لەشکەری ڕابن، و هێشتا بەری شەرێ بەدرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هندەک (سەرییە) هنارتینە ژ دەرڤەی مەدینێ دا ب هندەک کارێن (ئەمنی) و (عەسکەری) ڕابن، وی عوکاشە هلبژارت دا ببتە ئێک ژ ئەندامێن وێ سەرییێ یا وی ل رەجەبا سالا دویێ مشەختی هنارتییە دەور و بەرێن مەکەهێ، وان فەرمانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب جهئینا و چوون حەتا

گەهشتینە وی جهێ دبێژنێ: (نەخلە) د ناڤبەرا مەکەهـ و طائیفێ دا، ل وێرێ وان کاروانەکێ بازرگانی یێ قورەیشییان دیت، و دەمێ وان زانی کو کاروانییان ئەو دیتن و نیاسین، مەزێ وان عەبدللاهێ ئەسەدی گۆت: وان ئەم دیتین و نیاسین و ژ مە ترسیان، ڤێجا بلا ئێک ژ هەوە سەرێ خۆ بتراشت و بچت خۆ نیشا وان بدەت دا ئەو هزر بکەن ئەم بۆ عومرێ یێن هاتین، ڤێجا ژ مە پشتڕاست ببت. هنگی عوکاشەی گۆت: ئەز دێ ب ڤی کاری ڕابم، و گاڤا وان ئەو دیتی ئەو پشتڕاست بوون و کاروانێ خۆ دانا..

هنگی ئەندامێن سەرییا موسلمانان د ناڤبەرا خۆ دا کەفتنە دان و ستاندنێ کانێ ئەم چ بکەین؟ هندەکان گۆت: ئەڤە هەیڤا رەجەبێیە، و ئەو ئێک ژ هەیڤێن حەرامە و شەڕ تێدا چێ نابت، لەو دڤێت ئەم شەڕی نەکەین. و هندەکان گۆت: ئەگەر ئەم وان بهێلین ئەو ئەڤ شەڤە دێ گەهنە مەکەهێ، و دێ سوحبەتا مە بۆ کافران کەن، و مسۆگەر ئەو دێ دەنە ب دویڤ مە ڤە، و دبت مە بگرن و بکوژن، پشتی دان و ستاندنەکا کورت، ئەمیرێ وان عەبدللاهێ کوڕێ جەحشێ ئەسەدی بڕیار دا هێرشێ بدەنە سەر وی کاروانی، مرۆڤ کوشت و دو ئێخسیرکرن و ئێک ژی ڕەڤی..

گاڤا خەبەر گەهشتییە کافرێن مەکەهێ وان ئەڤ کارە ب تشتەکێ زێدە کرێت ددیت و گۆتن: موحەممەد و هەڤالێن وی شەڕ د هەیڤێن حەرام دا کر. و ئەو تشتەکێ حەرام بوو ل نک عەرەبان، و بەلکی ئەو ئێک ژ بەرماییێن شریعەتێ ئیبراهیم و ئیسماعلی بت..

پشتی سەرییا موهاجران زڤڕییە مەدینێ، و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب کارێ وان زانی، وی ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو و گۆتە وان: من نەگۆتبوو هەوە شەڕی د هەیڤا حەرام دا بکەن. ب ڤێ چەندێ پسیارەک د ناڤ جڤاکا صەحابییان دا هاتە ئازراندن: ئەرێ حوکمێ کرنا شەڕی

د هەیڤێن حەرام دا چییە؟ و دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ ﴾ (البقرة: ٢١٧) یەعنی: ئەی پێغەمبەر، کافر پسیارا هەیڤا حەرام ژ تە دکەن: کانێ شەڕ تێدا دورستە یان نە؟ تو بێژە وان: شەڕ و خوینرێتن د هەیڤا حەرام دا ل نک خودێ کارەکێ مەزنە، و پاشڤەبرنا هەوە بۆ خەلکی کو نەئێنە د ئیسلامێ دا ب رێکا ترساندن و عەزابدانێ، و کافرییا هەوە ب خودێ و پێغەمبەرێ وی و دینێ وی، و نەهێلانا هەوە کو موسلمان بێنە مزگەفتا حەرام، و دەرێخستنا پێغەمبەری و مشەختییان ژێ و ئەو خەلک و خودانێن وێنە، ئەو ل نک خودێ گونەهـ و تاوانەکا مەزنترە ژ کرنا شەڕی د هەیڤا حەرام دا..

ب ڤێ چەندێ تەنگاڤی ژ سەر ئەندامێن وێ سەرییێ هاتە ڕاکرن کو عوکاشە ئێک ژ وان بوو.

پشتی ڤێ سەرهاتییێ ب پتر ژ هەیڤەکێ، دەنگ و باس گەهشتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو کاروانەکێ قورەیشییان یێ بازرگانی یێ دەرکەفتییە شامێ، و پتریا وی مالی یێ ئەڤ کاروانە پێ دەرکەفتی ئەو مالە یێ موسلمانان ل پاش خۆ هێلایە ل مەکەهێ، کافران دەستێ خۆ دانابوو سەر و ئەو بۆ خۆ بربوو، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بڕیار دا رێ ل ڤی کاروانی بێتە گرتن، و ل هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا دویێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل سێسەد و تشتەک زەلامان ژ موهاجر و ئەنصارییان دەرکەفت دا رێکێ ل کاروانی بگرت، و عوکاشە ئێک ژ وان زەلامان بوو یێن د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرکەفتی، و پشتی زنجیرەکا سەرهاتییان خودێ وەسا حەزکر شەڕەک د ناڤبەرا موسلمانان دا ئەوێن

هژمارا وان نێزیکی سێسەد و چاردە زەلامان و نە بۆ شەڕی دەرکەفتین، و کافران دا ئەوێن هژمارا وان نێزیکی هزار مرۆڤان و بۆ شەڕی دەرکەفتین، چێبوو، ئەو شەڕێ ل نهالا بەدرێ ڕویدای و دئێتە هژمارتن ئێکەمین شەڕ د ناڤبەرا موسلمان و کافران دا چێبووی.

د ڤی شەڕی دا یێ تژی موعجیزە و کرامەت، خودێ کرامەتەک ل سەر دەستێ عوکاشەی پەیداکر، دیرۆکڤانێن سیرەتێ دبێژن: ل ڕۆژا بەدرێ عوکاشەی شەڕەکێ وەسا کر حەتا شیرێ وی د دەستان دا شکەستی و ئەو مایە بێ چەک، وی خۆ گەهاندە سەرلەشکەرێ موسلمانان کو پێغەمبەر بوو -سلاڤ لێ بن- و گازندەیا حالێ خۆ بۆ کر، دارەک د دەستێ پێغەمبەری دا بوو -سلاڤ لێ بن- وی ئەو دا عوکاشەی و گۆتێ: هەرە شەڕی ب ڤی بکە.. و ئەو خودایێ گۆپالێ مووسایی وەرگێڕای و کرییە مارەکێ زێندی؛ دا بۆ وی ببتە موعجیزە، وی ئەو دارێ د دەستێ عوکاشەی ژی دا کرییە ئاسن؛ دا ئەو شەڕی پێ بکەت، و دا بۆ وی ببتە کرامەت! عوکاشە دبێژت: ئەو دار د دەستێ من دا بوو ئاسنەکێ سپی، و من شەڕێ کافران پێ کر حەتا خودێ ل بەر سنگێ مە شکاندین. ئەڤ شیرە ئەوێ عوکاشەی ناڤێ وی کرییە (العون) -هاریکار- ما د گەل وی، و ل هەمی شەڕێن پشتی هنگی وی د ژیانا خۆ دا کرین، وی ئەو شیر ب کاردئینا.

پشتی بەدرێ عوکاشە د وان هەمی شەڕ غەزوێن دی ژی دا یێ ئامادەبوو یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کرین، وەکی ئوحودێ و خەندەکێ و حودەیبییێ و ڤەکرنا مەکەهێ..

ئبن ئیسحاق د سیرەتێ دا دبێژت: گەهشتە مە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: باشترین فێرسێ عەرەبان ژ مەیە. گۆتن: ئەو کییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ وی گۆت: عوکاشەیێ کوڕێ محصەنی. ئینا ضرارێ

کوڕێ ئەزوەرێ ئەسەدی گۆت: ئەو ژ مەیە ئەی پێغەمبەرێ خودێ.
پێغەمبەری گۆت: ئەو نە ژ هەوەیە ئەو ژ مەیە ژ بەر کو حەلیفێ مەیە.

و ئەگەر هات و ئەڤ حەدیسە یا دورست بت ئەو دێ باشترین شاهدەیی بت بۆ عوکاشەی کو ئەو باشترین فێرس و عەگید بوو د ناڤ عەرەبان دا.. و ب ڕاستی زیرەکییا عوکاشەی د شەڕان دا ب تایبەتی ڕمبازییا وی تشتەک بوو خەلکی مەتەل پێ دئینا، و ئەڤ زیرەکییا وی پتر ل ڕۆژا غەزایا (الغابة) بەرچاڤ بوو، و ئەڤ غەزایا ل سالا شەشێ مشەختی بوو، و سەرهاتی ب کورتی ب ڤی ڕەنگی بوو:

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بیست حێشترێن ئاڤس هەبوون دانابوونە جهەکێ دبێژنێ: (الغابة) ل نێزیکی مەدینێ، و زەلامەکێ غیفاری و ژنکا وی دانابوو بەر.. عویەینەیێ کوڕێ حصنی و هەڤالێن وی هاتن و هێرش دا سەر، وان زەلام کوشت و ژنکا وی د گەل حێشتران برن.. ئینا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گەل پێنجسەد زەلامان ب دویڤ وان دا دەرکەفت حەتا گەهشتییە دەڤەرا (ذیقەرەد) د ناڤبەرا مەدینێ و خەیبەرێ دا، و ل وێرێ ئەو گەهشتنە دووماهییێن وان، ئەوێن ب لەز دڕەڤین.. زەلامەکێ دبێژنێ: (ئەوثار) و کوڕێ وی (عەمر) هەردو ل سەر هەسپەکی بوون، عوکاشەی ڕمەک تێوەرکر و ب دریەکی هەردو پێکڤە کوشتن، و ئەڤە بۆ جهێ حێبەتییا خەلکی.

پشتی ڤێ سەرهاتییێ و پتر ژ جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- عوکاشە کرە ئەمیرێ هندەک ژ وان (سەرییان) یێن وی دهنارتنە دەڤەرێن جودا جودا، ب تایبەتی دەڤەرا (بەنوو ئەسەد) کو عشیرەتا عوکاشەیی بوو.



پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل هەیڤا سێیێ ژ سالا یازدێ مشەختی، هندەک عەشیرەتێن عەرەبان، ب تایبەتی ژ ئەعرابێن کۆچەر لێڤەبوون و جارەکا دی ل کوفرێ زڤرین، و هندەک مرۆڤێن درەوین پەیدابوون گۆتن: ئەم پێغەمبەرین. و دەستەکا منافقان ل مەدینێ خورتبوو و وان سەرێ خۆ ڕاکرەڤە و حەتا حەددەکی خۆ ئاشکەراکر، دەمێ ئەبووبەکر بوویە خەلیفە ئێکەمین بڕیارا وی دای ئەو بوو ئەو شەڕێ (مورتەددان) بکەت، و ئێک ژ وان کەسێن مورتەدبووین طولیحەیێ کوڕێ خوەیلدێ ئەسەدی بوو، ئەوێ گۆتی: ئەز پێغەمبەرم، و هندەک کەسان ژ عەشیرەتا وی ئەسەدەییان دویکەفتنا وی کر، و هندەکان ژ غەطەفانی و عەبس و ذوبیانییان ژی خۆ دا د گەل.

دەمێ خەبەرێ وان گەهشتییە مەدینێ، خەلیفەی بڕیار دا لەشکەرەکی بهنێرتە وان دا شەڕێ وان بکەت، و وی خالدێ کوڕێ وەلیدی کرە سەرۆکێ ڤی لەشکەری. و ژ بەر کو لەشکەری قەستا دەڤەرا ئەسەدییان کر، عوکاشەیێ ئەسەدی ب فەر دیت ئەو ل پێشییا ڤی لەشکەری بت، ئاخری کەسێ هندی وی خێر بۆ ئویجاخا وی نەڤێت، و ئەو قەبویل ناکەت پشتی ڕۆناهییا ئیسلامێ د ناڤ مرۆڤێن وی دا گەشکری ژ نوی کەسەکێ درەوین بێت و بەرێ وان ژ حەقییێ وەرگێڕت، عوکاشەی شیرێ خۆ (العون) هلگرت و د گەل لەشکەرێ خالدی قەستا جیهادێ کر.

هنگی ژییێ عوکاشەی (٤٥) سال بوو، خالد ب لەشکەرێ خۆ ڤە گەهشتە وی جهی یێ دبێژنێ: (بوزاخە) و بەری ئەو ڕوی ب ڕوی نەیارێ خۆ بن، خالدی لەشکەر ئامادەکر، و دا کو ئەو ب سەر چو ڕوودانێن دل نەخواز نەبت وی دو کەس بەری لەشکەری هنارتن دا سەح و سوی و ئەخباران بۆ وی بینن، ئەو هەردو ثابتێ کوڕێ ئەقرەمێ ئەنصاری و

عوكاشەیێ ئسەدی بوون.. دەمێ ئەو بۆ پێشڤە چووین، ژ نشکەکێ ڤە وان خۆ بەرانبەر کۆمەکێ ژ لەشکەرێ طولەیحەی و برایێ وی مەسلەمەیێ ئسەدی دیت، حیبالێ کورێ مەسلەمەیی ژ ناڤ کۆما وان دەرکەفت و داخوازا (موبارەزێ) کر، عوکاشە ب نک وی ڤە چوو و قەبخوازییا وی قەبویلکر، و هەردو ب شیران چوونە ئێک و دو، و دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو عوکاشەی ئەو ب وی شیری یێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل رۆژا بەدرێ دایێ هەڤرکێ خۆ وەرگێرا عەردی و کوشت.

گاڤا مەسلەمەیی دیتی عوکاشەی کورێ وی کوشت، ئەو وەکی مرۆڤەکێ دین ب نک عوکاشەیی ڤە چوو و خۆ تێوەرکر و هەردویان خۆلێکدان کر، طولەیحە ترسیا عوکاشە برایێ وی ژی بکوژت، لەو وی دەلیڤە ئستغلال کر و شیرەک د عوکاشەیی وەرکر و کوشت، پاشی ئەو و برایێ خۆ هەردو چوونە ثابتی و وان پێکڤە ئەو ژی کوشت.

گاڤا خالدی دیتی هەردو زەلامێن وی گیرۆبوون، وان دا رێ پاشی ب سەر کەلەخێن هەردویان هلبوون و دیتن کو گەلەک برین یێن کەفتینە لەشێ وان، ڤی دیمەنی زێدە ئەو ب خەم ئێخستن، خالدی بریار دا ئەو هەردو ب جلکێن وان ڤە ل وێرێ بێنە ڤەشارتن. و هنگی ژییێ عوکاشەی نێزیکی چل و پێنج سالییێ بوو وەکی مە گۆتی.

هۆسا کاروانێ ژیانا عوکاشەیی ئەوێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مزگینی ب چوونا بەحەشتێ بێ حساب دایێ، ب شەهیدبوونێ ب دووماهی هات، پشتی کو وی جوانییا نەفسێ د گەل جوانییا دێمی ل نک خۆ کۆمکری..

هەژی گۆتنییە کو (طولەیحە) ئەوێ ژ درەو خۆ کرییە پێغەمبەر و عوکاشە و ثابت هەردو کوشتین، بەری هنگی ئێک ژ صەحابییان بوو، و

ئەو مرۆڤەکێ قەهرەمان بوو، ل سالا نەهێ مشەختی موسلمان بووبوو، پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو (مورتەد) بوو، و ئەبووبەکری شەڕێ وی و هەڤالێن وی کر، و دەمێ ئەو بەرانبەر لەشکەرێ خالدی شکەستین، طولەیحە ڕەڤی و چوو شامێ ل نک غەسسانییان، پاشی وی دوبارە باوەری ئینا و بوو موسلمانەکێ باش، و دەمێ ئەو هاتییە حەجێ ئیمامێ عومەر ئەو دیت، گۆتێ: طولەیحە پشتی تە عوکاشە و ثابت کوشتین ئەز حەز ژ تە ناکەم.. و دەمێ طولەیحە د گەل لەشکەرێ سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی دەرکەفتییە جیهادێ ل عیراقێ، عومەری کاغەزەک بۆ سەعدی هنارت تێدا گۆتێ: بۆ کار و بارێن شەڕی ڕەئیا طولەیحە وەرگرە، بەلێ چو کاران نەئێخە دەستێ وی! و ل ڕۆژا شەڕێ نەهاوەندێ طولەیحە شەهیدبوو.

خودێ ڕەحمێ ب وان هەمییان ببەت.

# جابانێ کوردی

یا ئاشکەرابوو کو پەیاما پێغەمبەرێ ئیسلامێ -سلاڤ لێ بن- هەر ژ دەستپێکێ پەیامەکا گشتی بوو بۆ مرۆڤان هەمییان، و ئەو ژ هندێ بلندتر بوو کو بۆ ئویجاخەکا دەسنیشانکری یان مللەتەکێ تایبەت هات بت، لەو ئەو گازییێن دخوازن ئیسلامێ د چارچووڤەیێ بەرتەنگ دا کۆم بکەن یان مە وە تێ بگەهینن کو پێغەمبەر مەزنەکێ نەتەوەیی بوو یان زەعیمەکێ عەشائری بوو ئەو ژ ڕاستییێ ددویرن، خودێ د قورئانێ دا فەرمانێ ل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- دکەت: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ﴾ (الأعراف: ١٥٨) یەعنی: ئەی پێغەمبەر تو بێژە: ئەی گەلی مرۆڤان، ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بۆ هەوە هەمییان.. ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دبینین هەر ژ دەسپێکا گازیا ئیسلامێ د ناڤ صەحابییێن پێغەمبەری دا هندەک کەسێن نە قورەیشی، و نە عەرەب ژی هەبوون، و دەمێ جڤاکا موسلمانان یا ئێکێ ل مەدینێ هاتییەدانان، ئەو ل سەر بناخەیێن چو نەتەو و ئویجاخان نەهاتبوو ئاڤاکرن، و د ڤێ جڤاکێ دا -وەکی مە گۆتی- گەلەک کەس ژ ئویجاخێن عەرەبان یێن جودا جودا هەبوون، و هندەک کەسێن نەعەرەب ژی هەبوون، و ئەڤە بۆ مە باش ئاشکەرا دبت دەمێ ئەم وان کتێبان دخوینین یێن د دەر حەقا ژین و سەرهاتییێن صەحابییان دا هاتینە نڤیسین، ژ وان هەبوون حەبەشی وەکی بیلالی بۆ نموونە، ژ وان هەبوون رۆمی وەکی صوهەیبی، و ژ وان هەبوون فارس وەکی سەلمانی، و ژ وان

هەبوون ئسرائیلی وەکی عەبدللاهێ کورێ سەلامی، و بەلکی ل بەر هندەک ژ مە تشتەکێ غەریب بت دەمێ ئەم دبێژین: د ناڤ صەحابییان دا کورد ژی هەبوون، و ئەو ب ناسناڤێ (کوردی) دهاتنە نیاسین!

دەسپێکا پەیوەندییا کوردان د گەل ئیسلامێ بۆ بەری زەمانێ (فوتووحاتان) دزڤڕت، هێشتا ل سەر زەمانێ پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- کوردان ئاگەهـ ژ ئیسلامێ هەبوو، و کەسەکێ کوردْ هەبوو قەستا مەدینێ کربوو و ل سەر دەستێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمان بووبوو و بووبوو ئێک ژ صەحابییێن وی.

دەمێ ئەم ل کتێبێن حەدیسێ و ژیاننامەیا صەحابییان دزڤڕین، پتر ژ جارەکێ ناڤێ ڤی صەحابییێ کورد ب بەر چاڤێن مە دکەڤت، و ئەو ئاشکەرا ب ناسناڤێ (الكردي) دئێتە ناساندن، ئیمامێ طەبەرانی ئەو ل سالا (٣٦٠) مشەختی مری د هەردو کتێبێن خۆ دا (المعجم الصغير) و (المعجم الأوسط) دا چەند حەدیسەکا ژ ڤی صەحابی و کورێ وی ڤەدگێڕت، و وان ب ناڤێ (جابان الكردي) و (ميمون الكردي) ددەتە نیاسین.

هەر وەسا زانایێ ناڤدار ئبن حەجەرێ عەسقەلانی د کتێبا خۆ دا (الإصابة في تمييز الصحابة) ناڤێ جابان د ناڤ صەحابییان دا ڤەدگێڕت، بەلێ مخابن پەیڤا (الكردي) ب خەلەتی ڤە یا بوویە (الصردي) لەو ل بەر خواندەڤانان یا بەرزەبووی.

مخابن د ژێدەرێن بەردەست دا چو زانین د دەر حەقا ڤی صەحابی دا نەهاتینە، لەو ئەم نزانین کانێ ئەو ل کیژ سالێ و ل کیڤە هاتبوو سەر دنیایێ، و ل کیژ سالێ و ل کیڤە مربوو، و سالا چەندێ وی خۆ گەهاندبوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و باوەری پێ ئینابوو، بەلێ ژ وان ریوایەتێن

ئیمامێ طـەبـەرانـی ژ وی و کـوڕێ وی ڤەگوهاستین هندەک تشـتێن کـورت د دەر حەقا وی و کوڕێ وی دا ئەم دشێین بێژین، ئەو ژی ئەڤەنە:

- ناڤێ ڤی صەحابی وەکی د کتێبێن حەدیسان دا هـاتی (جابـان)ە، و ئەو ناڤەکێ کوردییە، هزر بۆ هندێ دچت کو گابان (یـان گاڤـان) بـت، بـەلێ چـونکی دەنگێن (گ) و (ڤ) د زمـانێ عـەرەبان دا نینن دبت ئـەو هاتبنـە گوهاڕتن.

- د ریوایەتەکێ دا ئیمامێ طـەبەرانی دبێژت: ئەحمەدێ کوڕێ قاسـمێ بەرنی ل بەغدا بۆ من گۆت، موحەممەدێ کوڕێ عەببادێ مەککی گۆتە من، بابێ سەعیدێ مەولایێ بەنی هاشمییان بۆ مە گۆت، بـابێ خەلـدەیی گـۆت: مـەیموونێ کوردی بۆ مە ژ بابێ خۆ ڤەگوهاست گـۆت: نـە جـارەکێ و نـە دو جـاران و نـە سـێ جـاران، بەلکی دەهـ جاران ژی مـن گوهـ ل پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- بوویە وی دگۆت.. و حـەدیسـێ ڤـەدگوهێزت[1]. و بـەلکی ژ ڤـێ گۆتنـا بـابێ مـەیموونی بێتـە وەرگـرتن کـو دەمـێ مانـا وی د گـەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمەکێ کێم نەبوویە، لەو وی حەتا دەهـ جـاران ژی گوهـ ل پێغەمبەری بوویە وی ئەڤ گۆتنە گۆتی.

- د ریوایەتەکا دی دا ئیمامێ طـەبەرانی هەر ب ڤێ سـەنەدێ ژ ئـەبوو خەلـدەیی ڤـەدگوهێزت، دبێـژت: جـارەکێ مـەیموونێ کـوردی ل نـک مـالکێ کوڕێ دیناری یێ ڕوینشـتیبوو، ئینا مالکی گۆتێ: بۆچی شێخ حەدیسـان بـۆ مـە ژ بـابـێ خـۆ ریـوایـەت ناکەت؟ مانێ بابێ تـە گەهشـتبوو پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن-! وی گۆت: بابێ من گەلەک حەدیس ژ پێغەمبـەری -سـلاڤ لێ بن- بۆ مە ریوایەت نەدکرن ژ ترسێن هندێ دا کو ئەو تشتەکی لێ زێدە بکەت یان ژێ کێم بکەت، و دگۆت: من یێ گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ

(١) ئیمامێ طەبەرانی: (المعجم الأوسط) ٢٣٧/٢.

بن- بووی وی دگوّت: ((مَنْ كَـذَبَ عَـلَيَّ مُتَعَمِّـدًا فَلْيَتَبَـوَّأْ مَقْعَـدَهُ مِـنَ النَّـارِ))
یەعنی: هەچییێ ژ قەستا درەوەکێ ژ کیس من بێژت بلا جهێ خوّ ل ناڤ ئاگری دورست بکەت[1]. ژ ڤێ ریوایەتێ بوّ مە ئاشکەرا دبت کو جابانێ کوردی ژ بەر تەقوایا خوّ نەدوێریا گەلەک حەدیسان ریوایەت بکەت، دترسیا ئەو هندێ ژێ کێم بکەت یان لێ زێدە بکەت.. و بەلکی ژ بەر کو ئەو کورد بوو و دبت زێدە د عەرەبییێ دا یێ شارەزا نەبت، یان وەکی صەحابییێن عەرەب بوّ ژبەرکرنا گوّتنێن عەرەبی یێ شارەزا نەبت، وەکی گەلەک حەدیس ریوایەت نەکرین.

- مەیموونێ کورێ جابانی، تابعی بوو، سالا بوونا وی و مرنا وی ژی ئەم نزانین، بەلێ د هندەک کتێبێن (الجرح و التعدیل) دا هاتییە کو پسیارا وی ژ ئیمامێ مەزن یەحیایێ کورێ مەعینی هاتەکرن، وی گوّت: ئەو مروّڤەکێ چاک بوو، مەولایێ عەبدللاهێ کورێ عامری بوو[2]، و ئەڤ عەبدللاهە ژ مالباتا عەبدشەمسێ قورەیشی بوو و ئەو ئێک ژ صەحابییان بوو، ل دوّرێن سالا (٥٩) مشەختی مربوو. و ئاشکەرایە کو (وەلائا) بوّ عەشیرەتەکێ ئێک ژ وان سیستەمان بوو یێن عەرەبان ل وی دەمی کار پێ دکر، و دویر نینە جابان ب خوّ ژی وەکی کورێ خوّ ژ مەولایێن ڤێ مالباتا قورەیشی بت.

- مەیموون ئەوێ دبێژنێ: بابێ نەصیری، یان بابێ بەصیری، خوّجهێ باژێرێ بەصرا بوو، لەو ئەم دویر نابینین کو بابێ وی جابان پشتی مرنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئێک ژ وان صەحابییان بت یێن ژ مەدینێ هاتین و ل بەصرا ئاکنجی بووین، لەو کورێ وی پشتی وی مابتە ل وێرێ.

---

(١) ئیمامێ طەبەرانی: (المعجم الأوسط) ٦/٢١٠.

(٢) أبو حاتم: (الجرح والتعدیل) ٢٣٨/٨.

و د هندەک ریوایەتان دا هاتییە کو مەیموونێ کوردی حەدیس ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ژێ ڤەگوهاستینە، هەر وەسا وی حەدیس ژ بابێ عوثمانێ نەهدی ڤەگوهاستینە، و ئەو مرۆڤەک بوو گەهشتبوو زەمانێ جاهلییەتێ، و ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- موسلمان بووبوو بەلێ وی پێغەمبەر نەدیتبوو چونکی ل سەر زەمانێ عومەری ژ نوی هاتبوو مەدینێ.

ژ ڤان هەمی گۆتن و ریوایەتان دئێتە زانین کو جابانێ کوردی ئێک ژ صەحابییێن پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- یێن ئەو دیتی و حەدیس ژێ ریوایەتکرین، و بەلکی ئەو ئێکەمین کەسێ کورد خودێ نعمەتا ئیسلامێ و دیتنا پێغەمبەرێ خۆ و هەڤالینییا وی ب رزقێ وی کربت. ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو ئێک ژ وان کوردانە یێن دڤێت ئەم شانازییێ پێ ببەین، و خۆ پێ سەرفەراز ببینین.

ئەو حەدیسا وی نێزیکی دەهـ جاران گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، یا ئیمامێ طەبەرانی ژێ ریوایەت دکەت، ئەڤەیە: ((أَيـمَا رَجُـلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً بِمَا قَلَّ مِنَ المَهْرِ أَوْ كَثُرَ لَيْسَ فِي نَفْسِهِ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَيْهَـا حَقَّهَـا، خَـدَعَهَا، فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهَا حَقَّهَا، لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهُوَ زَانٍ، وَأَيمَا رَجُلٍ اسْتَدَانَ دَيْنًا لَا يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَى صَاحِبِهِ حَقَّهُ، خَدَعَهُ حَتَّى أَخَذَ مَالَهُ، فَـمَاتَ وَلَمْ يُـؤَدِّهِ، لَقِـيَ اللهَ وَهُوَ سَارِقٌ)) یەعنی: هەر زەلامەکێ ژنەکێ ب مەهرەکێ کێم یان یێ زێدە مارە بکەت، و د نیەتا وی دا نینە ئەو وی مەهری بدەتێ، ئەو خاپاند، وەر بێی حەقێ وێ بدەتێ، رۆژا قیامەتێ ئەو دێ چنە نک خودێ زناکەر، و هەچی زەلامێ دەینەک ژ ئێکی وەرگرت و نیەتا وی نینە ئەو وی بۆ خودانی بزڤرینت، ئەو خاپاند حەتا مالێ وی بری، و مر بێی حەقێ وی بدەتێ، دێ چتە نک خودێ دزیکەر.

پاشگۆتن

# صەحابی
# هندەك مرۆڤێن بژارە بوون

خواندەڤانێن هێژا! ل ڤێرێ گەشتا مە د گەل صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب دووماهی دئێت، هیڤییا مە ئەوە گەشتەكا ب خێر و بەرەكەت بت، و تژی مفا بت.. ئێكەمین تشتێ دئێتە سەر هزرا مە دەمێ ناڤێ صەحابییان دئێتە گوهێن مە ئەوە ئەم هزر دكەین صەحابی -ژ بەر پیرۆزییا وان د چاڤێن مە دا- هندەك كەسێن بێگونەهن، و ئەو چو جاران خەلەت نابن، لەو دڤێت سەرهاتییێن ژیانا وان ژی هەمی نموونە بن و چو كێماسی تێدا نەبن.. و هەڤە هزرەكا خەلەتە!

یا خەلەتە چونكی نە خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو وەكی هندەك مرۆڤێن بێگونەهـ و (مەعصووم) نیشا مەداینە، و نە وان ب خۆ ژی خۆ ب وی ڕەنگی ب مە دایە نیاسین، بەلكی وان پێكڤە و هەردەم ئەم وە تێگەهاندینە كو صەحابی، هەر چەندە ئەو هندەك مرۆڤێن بژارە بوون، و خودێ ئەو بۆ هەڤالینی و پشتەڤانییا پێغەمبەرێ خۆ هلبژارتبوون، و شەرفا هلگرتن و بەلاڤكرنا ڤی دینی هلپسارتبوو وان، و وان ئەو ئەرك ب تمامی و دورستی پێكئینابوو، بەلێ مەعنایا ڤێ ئەو نینە ئەو چو جاران خەلەت نەدبوون، یان گونەهـ نەدكرن، یان دەمێ وان دەمەكێ بێ كێماسی بوو، نەخێر! دڤێت ئەم ڤێ هزرێ ژ وان نەكەین؛ چونكی هەر جارەكا مە ئەڤ هزرا خەلەت ژ وان كر، پاشی د ناڤ بەرپەرێن دیرۆكێ دا ئەم ب سەر

خەلـەتی یـان کێماسـییەکا وان هلبـووین، ئـەم دێ وان ژ ئاسـتێ وان یـێ دورست ئینینە خوارێ و مافێ وان خۆین، کانێ چاوا بەری هنگی مە ئەو ژ ئاستێ وان یێ دورست بلندتر لێ کربوون، و مافـەکێ نـە یـێ وان دابـوویێ، و د هەردو حالـەتان دا ئەم دێ دزۆردار بین.

ژیانا صـەحابییان دڤێت بۆ مە دەرس و عیبرەت بـن، دەرس د بلنـدییێ دا، و دەرس د چاوانییـا دەرکـەفتنا ژ تـەنگاڤییان دا، و دەرس د چاوانییـا خۆڕاگرییا پشتی هلنگفتنێ دا.. ژیانـا صـەحابییان دڤێت بـۆ مـە گرنگـترین ژێدەرێ خۆپەروەردەکرنێ بت، و ئـەو بـۆ مە نابتە ئەڤە چەندە ئەگـەر ئـەم وان ل سەر ڕاسـتی و حەقیقـەتا وان نەنیاسین، دویـر ژ (غلـو) و (موبالـەغێن) نەدورست ب هێجەتا ئەڤینداریا مە بۆ وان.

بەلێ ل عەینی دەمی چێ نابت ب هێجەتا کو صەحابی ژی وەکی مـە مـرۆڤ بـوون، ئـەم وان بینینـە ڕێزا خـۆ، یـان بێـژین فـەرقا مـە و وان نینـە، دیسا دێ بێژین: نەخێر! ڕاستە ئەو ژی وەکی مە مرۆڤ بوون، بەلێ ما کێ گۆتییە مرۆڤ هەمی وەکی ئێکن؟!

پسـیار ژ ئیمامـەکێ پێشـییان هاتـەکرن: ئـەرێ عومـەرێ کـوڕێ عەبدلعـەزیزی چێتـر بـوو یـان موعاویـە؟ وی گـۆت: ئـەو تـۆزا چوویـە دفنـا موعاویـەی د گـەل پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ژ عومـەرێ کـوڕێ عەبدلعـەزیزی چێتـرە! بـەلێ.. هـەڤالینییا پێغەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- مەرتەبەیەکا کێم نینە خودێ ب رزقێ مرۆڤـی بکـەت. گەلـەک جاران دەمـێ ئەم شعرا شاعرەکی شرۆڤە دکـەین، ئـەم پالددەینـە سـەر گۆتنـا هەڤالێن وی یـێن د گـەل وی ژیـاین، ئـەم دبێـژین: ئـەو چێتـر ژ زاراڤ و گـۆتنێن وی دگـەهن؛ چـونکی ئـەو د گـەل وی ژیـابوون، ئەڤـە بـۆ شـعرەکێ، ئـەرێ چاوا تێگەهشتنا مە بۆ قورئان و سونەتێ دێ ژ یا صـەحابییان چێتـر بـت و ئـەو

ئەو بوون یێن د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژیاین و هەڤچاخییا هاتنا دینی کری؟

د ڤێ کتێبێ مە بەحسێ ژیانا هژمارەکا صەحابییێن جودا جودا کرییە؛ دا ئەم ژ نێزیکی ب سەرهاتییێن وان ئاگەهدار بین، و مفایی بۆ خۆ ژێ وەربگرین، و د ناڤ وان صەحابییان دا هندەک ئەون یێن د ژیانا خۆ دا تووشی هندەک هلنگفتنان بووین، و هندەک ئەون یێن (ئجتیهاد) کری بۆ هندێ دا بگەهنە هندەک حوکمێن دورست، و دبت ئەو د ڤێ ئجتیهادا خۆ دا دخەلەت بن، ئەڤە هەمی دا ئەم ب رەنگەکێ (عەمەلی و واقعی) بزانین کو صەحابی نە هندەک ملیاکەت بوون ل سەر عەردی دژیان، و چو جاران خەلەت نەدبوون، دیسا بۆ هندێ دا ئەم خۆشی و نەخۆشییێن دیرۆکا خۆ ئاگەهدار ببین، و ب وێ کرێتکرن و (تەشویهێ) ژی ئاگەهدار ببین یا نەیارێن ئیسلامێ ب گشتی ، و نەیارەێن صەحابییان ب تایبەتی، پێ رابووین، دا دلێ مە ژ دیرۆکا مە سار بکەن، تشتەکێ زێدە گرنگە ئەم دیرۆکا خۆ ژ ژێدەرێن وێ یێن زەلال وەرگرین، و پال بدەینە سەر ریوایەتێن دورست دویر ژ کەرب و کینا وان کسان یێن نەڤیانا صەحابییان بۆ خۆ کرییە دین و رێباز، و کرێتکرنا دیمەنێ زەلالێ دینێ مە بۆ خۆ کرییە مەزنترین ئارمانج!

هیڤییا مە ژ خودایێ مەزن ئەوە ئەو ڤیانا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی، و مرۆڤێن چاک، د دلێ مە دا زێدە بکەت، و بەرێ مە بدەتە رێکا خۆ یا راست.

## ناڤەرۆك